www.iqra.ahlamontada.com

منتدى إقرأ الثقافي

# ڕامان

90

- نالی و فەلسەفەی جوانی... د. عەبدوڵڵا خدر مەولوود
- دەلاقەیەک بەسەر..... و/ ئیسماعیل ئیسماعیل زادە
- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ (د. شێرزاد نەجاڕ)ی ڕووناکبیر
- فەرهەنگی ئەستێرەگەشە و...... عەزیزی مەلای ڕەش
- سەردەمی ڕۆشنگەری و ڕۆمانتیکی.. و/ ڕەحیم سابیر
- چارەنووسی ئایندەی جیهان.... عومەر عەلی محەمەد
- ڕۆمان و کۆمەڵگەی ئازاد.......... و/ سلێمان دڵسۆز
- کوردستان لە کێشەی... دڵشاد مەحموود عەبدوڕەحمان

مانگانەیەکی ڕۆشنبیریی گشتییە
بەڕێوەبەرایەتی گۆڤاری ڕامان دەری دەکات

# ڕامان

90

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی گشتییە
بەڕێوەبەرایەتی گۆڤاری ڕامان دەری دەکات
خوولی دووەم - ساڵی نۆیەم
تشرینی دووەم / 2004

**خاوەنی ئیمتیاز**
شەوکەت شێخ یەزدین

**سەرنووسەر**
ئازاد عەبدولواحید

**داڕێژەری هونەری**
سەرکەوت وەلی

**ناونیشان**
هەولێر - تەنیشت سینەما سەلاحەدین

**E-mail:**
raman@raman-media.net

**تەلەفۆنی گۆڤاری ڕامان**
٢٢٣٠٥٨٢

**تەلەفۆن و مۆبایلی سەرنووسەر**
٤٤٩٤٦٦٢
٢٢٢٨٥٠٦

**چاپ**
چاپخانەی حاجی هاشم

**نرخ**
(١٠٠٠) دینار

## ناوەرۆک

له پەراوێزی کولتوورەوە

# با سیمای شارەکانمان نەشێوێنین

سەرنووسەر

* یەکێک لە سیما گرنگەکانی ڕەسەنایەتی هەر میللەتێک، دێرینی و مێژوویی بوونی شارەکانی ئەو میللەت و نەتەوانەن کە بە درێژایی مێژووی چەوسانەوەی ئەو میللەتانە ماونەتەوە، ئەمەش سەلیقە و وردەکاری و هونەر و خەیاڵ و داهێنان و دەسڕەنگینی ئەو نەتەوەیە دەگەیەنێ کە بە درێژایی ئەو ساڵانە بەسەر لۆچەکانی نێوچەوان و هەنیەی تەمەنی گەڕەکی کۆن و سیمای شاری مێژوویی و کەلەپووریدا دەمێنێتەوە و شێوەی نەخش و نیگاری تەلارسازی ئەو شارانەی پێ جیا دەکرێتەوە و دەناسرێنەوە.

* ئەم لایەنە گرنگەی ژیانی کولتووری میللەتانی دنیا و هەست کردن بەو تایبەتمەندییە کارێکی وای کردووە وڵاتانی دنیا بەردەوام لەسەر پاراستن و مانەوەی ئەو سیماو ئادگارە دێرینە سووربن، بۆیە (دەوڵەت) ئەگەر میللەت خواپێداو بوو دەوڵەتی هەبوو، ئەم بینایانە وەک سامانێکی نەتەوەیی تەماشا دەکات و دەیانکڕێ و دەیانپارێزێ، هەروەها بەبێ پرس و ڕا وەرگرتنی دەوڵەت کەس تخوونیان ناکەوێ و دەسکارییان ناکات، چونکە ئەو سامانە مافی گشتێن و کەس ئەو مافەی نییە لەبەر تەماعی دنیا و چاوچنۆکی خۆی و بۆ گیرفان پڕکردن و قازانج تێکیان بدات و بیانشێوێنێ.

* بۆیە بەبێ ئیستیسنا وڵاتی دیکتاتۆری بێ یان دیموکراتخواز گرنگی بەو کەلەپوورەی خۆیان دەدەن و دەستی پێوە دەگرن، تەنانەت پاراستنی ئەو کەلەپوورە بە بەڵگەی زیندووی پێشکەوتنی بیری نەتەوەیی و مێژوویی و کەلەپووری هەر میللەتێک دەزانرێ.

ڕژێمی بەعس بە هەموو دڕندایەتی خۆیەوە لە سەرەتای ساڵانی هەشتایەکاندا لیژنەیەکی لە پسپۆڕەکانی یونسکۆ و وڵاتی توونس بۆ ئەو مەبەستە پێک هێنا، تا لە بارودۆخی گەڕەکە کۆنەکان و بیناگەلی کەلەپووری ناو شاری بەغدا بکۆڵنەوە و پێشنیاری خۆیان سەبارەت بە چۆنیەتی پاراستن و بووژانەوەیان بخەنە ڕوو، تەنانەت لە ساڵانی پێش ڕووخانیشیدا کە باری ئابوورییان زۆر خراپ بوو کاریان بۆ بووژانەوەی گەڕەکی (الفضل) و (قەمبەر عەلی) و (شەقامی کیفاح) دەکرد و لە دەستی گۆڕین و شێواندن بە دووریان دەخستەوە.

* لە وڵاتێکی وەک تورکیاشدا گەڕەکی زۆر هەن لەبەر ئەوەی مێژوویی و کەلەپوورین پارێزراون وەک (مەحموود پاشا) و (تۆپ قاپی) و (مەیدانی سوڵتان ئەحمەد) و (تاش حەمامی) و (بایەزید) و (زانکۆ) و (سوڵتان سولەیمان)ی لە ئەستەمبوڵ پارێزراون و ناهێڵن تێک بدرێن.

لە وڵاتی ئێرانیشدا کار هەروایە و هەر بۆ نموونە هەموو بینا کەلەپوورییەکانی شاری (سنە) لەلایەن حکوومەتی ئێرانەوە کڕاون و سەرپەرشتی دەکرێن و پارێزراون، تەنانەت لە وڵاتێکی وەک (سۆماڵ)یشدا کاتێ سەرۆکی پێشوو (محەمەد سیاد بری) ویستی گەڕەکێکی کۆن بکڕێ و لە شاری (مقادیشو)ی پایتەخت خانووەکانی بڕووخێنێ و کۆشکی نوێی کۆماریی تێدا دروست بکات، خەڵکی گەڕەکەکە بەوە ڕازی نەبوون و لە دادگا شکایەتیان لە سەرۆک کۆمار و دەوڵەت کرد و پاشان بڕیاری دادگا لە بەرژەوەندی گەڕەکەکە دەرچوو.

* پێش ڕاپەڕین هەر کارێکی تێکدەرانە و نامەسئولانە بکرایە، کورد بەوە لێکی دەدایەوە کە دوژمن و داگیرکەر کردوویەتی و بۆیان دەچووە سەر، بەڵام ئێستا کە وڵات وڵاتی خۆمانە و کارەکان بە دەستی خۆمان نەخشەیان بۆ دەڕێژرێ و ڕادەپەڕێنرێن، دەبێ بەزەییمان بەو قەیسەری و حەمام خان و بینا کەلەپوورییانەدا بێتەوە و بیانپارێزین، بگرە دەبێ بیر لە بەرنامەی (ستراتیژی) بکەینەوە و کاری هەرەوەزانە بکەین بۆ ڕێگە گرتن لە شێواندن و لەناوبردنی ئەو کەلەپوورە، تا هەوڵەکانمان پەرشوبڵاو نەبن، بۆ ئەو مەبەستەش پێویستە هەرچی زووە:

(١) لیژنەیەکی کارا بۆ پاراستنی گەڕەکە کۆنەکان و بینا کەلەپوورییەکان پێک بێت، کە ئەرکی ئەو لیژنەیە مەسحی مەیدانیی گەڕەک و بینایەی کەلەپووری بێ کە تەلاری کۆنی تێدایە ئەو لیژنەیە پێوەندیی بە بەرزترین دەسەڵاتی هەرێمەوە هەبێ و هەموو شار و شارۆچکەکانی وەک (کەرکووک، خانەقین، مەندەلی، کفری، کۆیە، هەولێر، زاخۆ، ئامێدی، تەوێڵە، بیارە، هەڵەبجە، سلێمانی، ئاکرێ و تاد) بگرێتەوە و ئەو کەلەپوورە شارستانییە نەفەوتێ.

(٢) شارەوانی لە شارەکانی کوردستان ئەو بڕە بیناو کۆڵان و گەڕەکە کۆنانەی ماون بیانپارێزێ و چیتر نەهێڵێ دەستی ڕووخاندنیان بگاتێ و لە جێگەیان دوکان و بازاڕ قوت بکرێنەوە تا ئەو سیما و مۆرکە کەلەپووریانەی هەیانە وەک خۆیان بمێنن و لەسەر هەمان دەستووریش نۆژەن بکرێنەوە، بگرە دەبێ حکوومەت بە پرۆژەی یاسایەک ئەو بینا کەلەپووری و مێژووییانە بپارێزێ.

* پاراستنی ئەو هونەر و مێژووە دێرینە زۆر خزمەت بە ئەندازەی بیناسازی کەلەپووری نەتەوەکەمان دەکات، بەتایبەتی ئەگەر لە کاتی دروستکردنی بینا نوێیەکاندا زیندوو بکرێنەوە، هەروەها دەکرێ زۆر لە قوتابیانی بەشی ئەندازیاری سوود لەو هونەر و نەخش و نیگارانە وەربگرن و لێیان وردبینەوە و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی و ئەندازیاریی لە بارەیانەوە بنووسن، هەروەها هونەرمەندانی شێوەکاریش دەتوانن سوود لەو هونەرە کەلەپوورییە وەربگرن، ئەوە بێجگە لەوەی دەکرێ بۆ نمایش کردنی شانۆیی سوود لەو بینایانە وەربگیرێ، یان هەندێ لە پێشانگای هونەری شێوەکاری بۆ نیشاندانی تابلۆ هونەرییەکان سوودی لێ وەبگرن.

# «جان باتیست غرنوی»
# یان
# سەرگوروشتەی عەتارێکی حەرامزادەی بکوژ و کاریزما

هاشم سەراج

رۆمانی «عەتر» شاکارێکی دەگمەن و دانسقەی جیهانی نووسین و داهێنانە، نەوەتانێ سەرلەبەری مرۆڤ و شوێن و شتگەلەکانی شار و شارۆچکەی وڵاتی فەرەنسای چاخی هەژدەیەم بە گڕەی بۆنی پیس و ناخۆش و دژوێن پرکی دەکرد و سەرپاکی حەوشە و بانیژە و پەیژە و باڵکۆنەکان شەرای بۆنی پاشەرۆگی مرۆڤ و هەڵمی یورپای میزیان لێ هەڵدەستا، خیابانەکان تەژی بە بۆ گنخی تەختەداری رزیو و سەرگین و قەرسەقول و گوومشک و غوباری شێدار، ژووری خەوتن بۆنی تەڕەشوح و چەرچەف و پێخەف و شڕە و شیتاڵی چەور و لەشی مرۆڤەکان بۆدرنی ئارەقە و بۆگەی پەنیری کۆن و پۆشاکی چڵکن و دەمیان بۆدگانی رزیو و سک بۆنی پیاز و شیری ترشا و بۆگەی دەرد و وەرەم سەرپاکی وڵاتی فەرەنسای تەنیبوو، هەتا بۆنی زنخ و پیس و قێزەون لە رووبار و دار و بەرد و گۆڕەپان و پرد و بن پرد و لە کڵێسەکانیش پرکی دەکرد و «پاشا»ی شاریش بۆنی ئاژەڵێکی درندەی لێ دەهات، هەر لەو سەردەمەیشدا سەری کۆنترین گۆڕستانی ئەو شارە هەڵدەدرێتەوە و ملیۆنەها کەللەسەر و ئێسک و پرووسکی رزیو کۆما کۆما دەکرێن و بۆنی پیسی مەرگ سەراپای کۆشک و تەلار و خانووبەرە و خیابانەکان دادەگرێت.

هەر لەوێ لەژێر عەرەبانەی ماسی فرۆشیدا، ئەو ئافرەتەی کە لە تەنیشت عەرەبانەکەدا وەستاوە و بە چەقۆیەک پوولەکەی ماسی دادەماڵێ و هەر لەوێ دووچاری ژان و ژوور دێ و کۆرپەکەی لەژێر عەرەبانەکە دادەنێ و بەهەمان چەقۆش ناوکی دەبڕێ و نیازیەتی بە دەرد و چارەنووسی چوار کۆرپەکەی پێشووی بەرێت، یان بەرەو گۆڕستان یان رووە و رووباری ڕابماڵێ و شوونبزری بکا.

کەچی ئافرەتەکە کە تەمەنی بیست ساڵە و لەپڕ دەبووژێتەوە و چەقۆکەی بەدەستەوەیە و کۆرپەکەش چەشنی بارستێک خوێن لە تەنیشتیەتی و لەژێر عەرەبانەکەوە دەقیژێنێ و کە پۆلیس دەیدۆزنەوە لەنێوان سەلکی ماسی ئەنجن ئەنجن کراو و شخل و شڵخەی مێش و مەگەزدا دەری دێنن و دایکە وەک تۆمەتبارێک بەرە و «مقصلە» دەبردرێت و کۆرپەکەیش دەنێردرێتە «دێرسان میری» لە شەقامی «سان مارتان» لەوێ لە ئاوی پیرۆز هەڵدەکێشرێت و بە «جان باتێست غرنوی» نێوزەد دەکرێت.

ئەمە وەک پێشەکییەکی تەقلیدی ویستم چۆنیەتی لەدایکبوونی کاراکتەری رۆمانەکە روون و ئاشکرا بێت.. بەڵام با بزانین «باتریک زوسکیند»ی نووسەری رۆمانی «عەتر» چلۆن کاری لەم رۆمانەدا کردووە. دەتوانم بڵێم «باتریک» سوودێکی زۆری لە چەندین گوفتاری خەتەرناکی «دۆستۆیفسکی» وەرگرتووە و چەندین

خەسڵەت و سیفات و ئادگاری کەسایەتی «سمیردیاکۆف»ی ڕۆمانی «برایانی کارامازۆف» لە ڕەفتار و کەسایەتی «جان باتیست غرنوی»دا بەرجەستە کراوە.. لەوانە چرکەی لەبارنەچوونی «سمیردیاکۆف» وەک کۆرپەلەیەک کە زیاتر بە حاڵەتێکی قەدەرییەوە دەبەسرێت، هەروەک دەزانین، باوکی «ئیڤان، ئەلیوشا، دیمتری» کە لە چرکەیەکی بەدمەستیدا دەگەڵ کۆمەڵە برادەرێکی سەرمەست، بە بەر دیواری کڵێسایەک تێدەپەڕن، لەوێ چاوی بە چڵکنترین و کرێتترین سواڵکەرێک دەکەوێت کە «ئەلیزابێث»ە، برادەرەکانی بێزیان لێی دەبێتەوە و ئەو لەو نیوەشەوە تاریکەدا، مومارەسەی سێکسی دەگەڵ دەکات و سکی پڕ دەبێ.. سەیرترین حاڵەت لەوەدایە کە «ئەلیزابێث» ژان و ژووری دێتێ و هەوڵ دەدات خۆی بگەیەنێتەماڵی مێردە ناشەرعییەکەی، جا مۆجیزەکە لەوەدایە لە بڵندترین شوێنی شووراکەوە خۆی هەڵدەداتە نێو تەلارەکە، کەچی کۆرپەلەکەی لەبار ناچێت.. جا «جان باتیست» وەک کۆرپەیەک هەر بەڕێکەوت پۆلیس دەربازی دەکەن، ئەگەرنا چەشنی چوار کۆرپەکەی پێشوو، چارەنووسی نێو ڕووبار و گۆڕستان بوو، ئەنجا سیفاتی دووەمی هاوبەش و بەیەکچووی ئەم دوو کاراکتەرە.. «سمیردیاکۆف» لە قۆناخی هەرزەکاریدا خولیا و هەوەس و مەراقی




هەڵواسین و ئیعدامکردنی پشیلە و بەچکە پشیلە بوو، پشیلەی بە تەنافا هەڵدەواسی و پاشان بە چەقۆ پارە پارەی دەکرد. «جان باتیست غرنۆی» کاتێ گەیشتە ترۆپکی هونەر و بەهرە و کارامەیی عەتاری وەک عەتارێکی کاریزما.. بەچکە پشیلەی دەکوشت و لە ئاودا دەیخووساند و بە ڕێگەی «ڕۆنی سارد» داو دەرمانی لێ دەگرتەوە و بۆنی لێ دروست دەکرد، پاشان قێزبوونەوە و دوورکەوتنەوە لە شکڵ و سەر و سەکوتی ئەو مرۆڤە ڕەزاگرانانەی کە شێوە و دیمەنی کرێت و قێزەونیان ئازار و ئەشکەنجەی چاو و ڕۆحی مرۆڤ دەدەن و هەروەها ڕادە و پلەی گوزارشت و دەربڕین لە عیشق و ئەڤین و جوانی لە جیهانی ڕۆمانەکەی دۆستۆیڤسکی دا گەیشتنە بە ڕادەی پارە پارە و تیکە تیکە خواردنی جەستەی ناسکی «مەعشوق»، بەڵام «باتریک زوسکیند»ی لەدایکبووی ساڵی (١٩٤٩)ی شاری (ئەمباخ) و دەرچووی زانکۆی (میونخ)ی بەشی مێژوو، وا دیارە کۆرسێکی تەواو و تایبەتی بۆ زانینی جۆرەکانی گوڵ و گوڵناسی و کەرەسە و ئامرازەکانی عەتر و بۆن و بەرامە دروستکردن وەرگرتووە، چونکە ڕۆمانی «عەتر» تێکستێکە تەژی لە زۆرترین چەشن و جۆرەکانی گوڵ و کەرستە و ئامرازی کارگەکانی عەتر، بەڵام تێکستی عەتر بەهێزێکی ئیکسیری سەرپاکی هزرە پەرشوبڵاوەکانی پێشوو، ئەوەی ئاماژەمان بۆدا لە دنیای دەقدا قڵپ دەکاتەوە و پرۆسەی نووسین کردەکانی بە خوێن و جەستە ئەنجام دەدات و تێکڕای حاڵەتە کوشندە و توند و تیژ و خەتەرناکەکان لەنێو ڕۆحی «جان باتیست غرنۆی»دا بەرجەستە دەکرێت و ئەمەیش بە چەمکی «نیچە» (چونکە نیچە نەی نووسیوە بۆ ئەوەی شت دابهەزرێنێت، بەڵکو بۆ ئەوەی بنەماکانی ئاوەز سەراوژێر بکات). (نووسین لای نیچە بریتییە لە هەستکردن بە بوون و دەربڕینی «دەیان وزە» کە وا لە فۆرمەکەی دەکات کراوە بێت لەسەر سەما و کەرنەڤالی پێکەنین و ئاهەنگ و ئێسکسووکی و خولانەوە و سەراوبنکردنی هێما و دابونەریت و سرووتەکان..

یاریکردنێکی توند و جەنگاودرانە لە گەڵیاندا، لەپێناو بەدیهێنانی بەختەوەری لەبننەهاتوو و چێژی هەمیشەیی، نووسین لای نیچە مانای دانیشتنە لەسەر بروسک و بورکانەکان و بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان و کەوتنە بەر لەعنەتی خودا و چوونە ناو ئەشکەوتە دوور و درێژەکان و تەڕایی هەمیشەیی نێو زەوی).

پاشان «باتریک» زۆر کارامانە هەوڵی داوە کار لەسەر

چەندین چەمکی گوتە و گوفتاری فەیلەسووف و قدیسانی خودگەرای وەک نیچە و باسکال و قدیس ئۆگستین، بکا و ئەمەیش بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و پەنهان و پرژوبلاو لە جیهانی ڕۆمانەکەدا ڕەنگی داوەتەوە کە مەبەستی سەرەکی بەخشینی چێژ و لەززەتە بە تێکست و بوون، ئەمەش بەهۆی ژێر و زەبەرکردنی عەرش و سەڵتەنەتی ئیستێتیک و مۆراڵ و ترادیسیۆنە تەقلیدییەکان ئەنجام دراوە.

دیالۆگی نێوان «جان بوسی»ی دایان و «تیریر»ی ڕاهیب و شێواندنی سیفات و مۆجیزەکانی «مەسیح» کاتێ «جان بوسی» بە ڕووی «تیریر»دا هەڵدەشاخێ و دەقیژێنێ و دەڵێ: ئەو کوڕیە حەرامزادەیەی کە کوڕی ئافرەتە منداڵکوژەکەی شەقامی ئۆقرە، لای بەن و حەز ناکەم ئەو کوڕیە نەوسن و چڵێس و شەیتان نشینە لەنێو ماڵی مندا بمێنێ.

تیریری ڕاهیب ئێژێ: کێ دەڵێ ئەمە ڕۆحی شەیتانی تێدا ڕسکاوە، جارێ خۆ نەبۆتە خاوەن ڕۆحێکی کامڵ، ئایا.. قسان دەکا، گورزە ڕووناکی درەوشاوەی لێ بەرزدەبێتەوە، شتگەلی ئەم ژوورە دەجووڵێنێت. بۆنی گەمار و ناخۆشی لێ دێت..

بەڵام «جان باتێست غرنوێ» لەخۆوە و زگماک وەک مەلۆتکەیەک خاوەن بەرهەستییەکی هێجگار بەهێز و لووتێکی مۆجیزە ئامێزە و هەر شتێک بۆن بکا و هەڵیدەمژێ و دووبارە دەری دەهاوێژێتەوە.. هەروەها پەرەی لووتی، چەشنی چاوە و هەموو شتێکی پێ دەبینێ. «تیریر» هەست دەکا قوماشەکە بۆنی ئارەقە و سرکە و پۆشاکی نەشۆردراو و گەڵای پێچراوی لێ دێ و یەکەوسەر هەترەشی دەچێ و تومەز بۆدڕنی لەشی خۆبتی و مەلۆتکەکە هەڵیمژیوە و بە ڕاستی خەڵقەندەیەکی سەیر و نامۆیە و ئاژەڵێکی درندەیە. گەر لە خودا نەترسابام ئەو بوونەوەرەم چەشنی جاڵجاڵۆکە ئاودیوی دۆزەخ دەکرد.. سەرەتا دەیلاواندەوە دادا دادا دادا، ئەمێستا بەرەو گەرەکی «سان ئەنتوان» و «دێر مادلین» پێشەکی کرێی دوو ساڵ بە دایانەکە دەدات.

«غرنوی» پەرەی لووتی چەشنی چاو بۆ بینینی شتگەل و مرۆڤەکان بەکار دەهێنا، بەڵام «مەدام غابار»ی لەلە دەیزانی «غرنوی» جۆرەها بەهرەو توانستی تیا ڕسکاوە، وەک بەرگەی دژی پەتاو نەخۆشی کوشندە، پێشبینی، جیاکردنەوەی جۆر و چەشنی بۆنەکان، گۆشەگیری، جەسووری، تا دێ ئەم بوونەوەرە سەیر و بەهێز و نامۆیە گەشە دەکا و لای «غریمال»ی دەباغ.. کە دووچاری خورشت و جەمرەی خەبیسە دێت، کەچی زیرەکانە چارەسەری خۆی دەکا و تەنیا ئاسەواری چەند دومەڵ و زیپکەیەک لە ڕوخسار و لاملیدا دەمێنێتەوە.

غرنوی بە پەرەی لووتە ئەفسووناوییەکەی شیلە و ڕەحیقی بۆن و بەرامە خۆشەکان هەڵدەمژی لەنێو یادگە و زاکیرەیدا دەیپاراستن، هەر چرکەساتێ ویستبای ئامادەی دەکردن، وەک بۆنی کوتاڵی حەریر و ئاوریشم، بۆنی تێکەڵ بە عەتر و شەرابی زەعتەر، بۆنی شانەی لە پشتی کیسەڵ دروستکراو، بۆنی دەریا، یەکەمین جار بوو کە بۆنی عەتری گوڵە بەیبوون و میسک و ئاوەدۆنی شازادە و نارنج و میسکی ڕۆمی و یاسەمەن و بەرامەی سروەی گالیسکەی خانەدانان بکا، هەروەها بۆنی گوگرد و ئاوەدۆن و خوێی بارووتی دەکرد و «غرنوی» نیازی بوو، گیانی بۆنەکان دەسەمۆ بکات، یا بەیدەستکردنی عەتر و بۆنەکان لەپێناو خاترجەمی و دڵنیای دڵ، بۆ نموونە بۆنی کافوور و دەرزی سنەوبەر و لیمۆ و نارنج و سەروو، میسک و گوڵە یاسەمین و نەرگز و شیر و هەنگوین..

غرنوی شارەزا و بەڵەدی بۆنی جەستە بوو، جەستەی خەڵقەندەکانی خودا، شەیدا و هەڵوەدای تاقە بۆنێکی یان عەترێکی ناب و بژوێن و موصەفای خوداییە، دوایین جار ئەم عەترە لە جەستە و قژی «لوور»دا دەدۆزێتەوە.

«غرنوی» لە بۆنی مرۆڤ گەیشتبوو دەیزانی لەشی پیاو بۆنی قێزەونی زنخ و گەماری میزاوی تێکەڵ بە ئارەقەی تون و بۆدڕن و بۆگەی پەنیری کۆنی لێ دێ و جەستەی ژنیش بۆدڕنی ماسی گەنیو، کەواتە ژیانی ئەو لەم گەردوون و زەمەنەدا چ مانایەک دەبەخشێ ئەگەر بێتو نەشئەی ئەو عەترە خوداییەی کە بە دوایدا وێڵ و سەرگەشتە و عەودالە بۆی دەسگیر نەکرێ. «غرنوی» درندە یەکەمین قەتڵ کە ئەنجامی دەدا لەپێناو بەیدەسکردنی عەترێکە لە ڕۆحی جەستەیەکی پاکیزەوە دەپژێ و بە بەرهەستی لووتە سیحراوییەکەی دەیدۆزێتەوە. خنکاندنی کچێکی پەری شێوەی پرچ سووری باڵا بەرزی لاواز و بنێس، کە لە بەر هەیوانی ئاندینەکەدا خەریکی قاشکردنی «ئالوو باڵووە»، دوای خنکاندنی، سەراپای لەشی بۆن دەکا.. بۆن کردنێک لە تەوقە سەری تا نێو لنگانی و ڕەحیقی عەتری جەستەی لەنێو دورجی یادگەی خەتەرناکیدا دەپارێزێ و وەک بۆن و بەرامەیەکی پیرۆز دەیپەرستێ، عەترێ سەرچاوەی ئەمری و جاویدییە، غرنوی بیر لە سیحری جوانی شێوە

ناکاتەوە، یا ڕەونەقی تەلیسمی ڕوخسارە زیباکان لە قووڵایی یادگەیدا ناپارێزێ. ئەو شێت و شەیدای ئیکسیری عەتری پاکیزانە و ئەو عەترەی کە لە نەغمەی میسک و بەرامەی شەونمی دەریا و شیلەی نارنج و بەیبوون دەکان.

«غرنوی» دەزانێ کە عەتر لەگەڵ زەمەندا دەژی و بە قۆناخەکانی منداڵی و تافی لاوی و پیریی و زووهانیدا تێدەپەڕێ. لێرە تێکست ئاماژە بە گوتەیەکی «باسکال» دەدا، (بەدبەختی مرۆڤ لەوەوە دێ کە نایەوێ بە کپی لە ژوورەکەیدا جێنشین بێ)، ئەمەیش خۆی لە خۆیدا حاڵەتی ئاماژەی زمانی ناڕاستەوخۆی «دەق»ە بۆ ئەو گۆشەگیرییە کوشندەیەی «غرنوی» کە دوایین جار لە تونێلی ئەشکەوتێکی قەبرئاسا بۆ ماوەی حەوت ساڵ خۆی لە بۆنی پیس و گەماری مرۆڤ دەپارێزێ.. «غرنوی» بۆ یەکەمین جار لە هەموو ژیانیدا، وەک شاگردێکی دەباخانە چاوی بە کارگەی (بۆن و عەتر)سازی «بالدینی» بازرگان دەکەوێ. شێت و شەیدا و شاگەشکە و موبتەلا و سەرسام و سەرسوڕماو لەم بەهەشتی عەترخانەیە ڕادەمێنێ، کۆگا و هونەری عەتاری لای ئەو حەرامزادەیە هونەری هەڵکشانی ڕۆح و دەروونە و موبتەلابوونە بە وەجدی عەتری ئیلاهی، ئەگەرنا ئەو ژیانە پڕوپووچەی کە ئاقیبەت مرۆڤ مانەندی کرمێکی بێ نموود لەنێو دەچێ، چ چەمک و مانایەکی هەیە، گەڕان و وێڵبوون بە دوای ناوازەترین و دانسقەترین عەترێکی نەمر، عەترێک کە جەبەرووتی زەمەن پێی نەوەستێ.

«غرنوی» لەم فیردەوسی عەترخانەیەدا، هێدی هێدی چاو دەگێڕێ و لەم جیهانە فەنتازییە ڕادەمێنێ، لەنێو قووڵایی یادگەیدا خەسڵەتی عەتر و بۆنەخۆشەکان بە دنیای مۆسیقاوە پەیوەست دەکا.. پاشان کەسیرە و سەرمەست و حەیران لە بۆتە و لەگەن و لەنگەری و حەوزە ڕەنگاوڕەنگەکان ورد دەبێتەوە، ئامرازی نەمساوی، قاپ و قاچاخی عەترسازی موبتەلای (مێزە پان و پۆرەکە) دەبێ، ئەو مێزە جوانە کاری عەترسازی لەسەر ئەنجام دەدرێ، چی دەبێ ئەگەر ئەو مێزە لەگەڵ خۆم بەرەو «میسینا» بەرم..

«بالدینی» خاوەن کارگە و بازرگانێکی ڕژد و دڵڕەقە، «بیلیسییە»ی وەستای عەترکار بۆن و بەرامەی «ئەڤین و ڕۆح»ی بۆ دروست دەکات و عەتری (ئەڤین و ڕۆح) لە پوختەی شیلەی ئاوەدۆنی پرتەقاڵ و لیمۆی شیرین و ڕۆنی قەنەفڵ و ئاوەدۆنی گوڵ و ڕۆحی نارنج و شەونمی دەریا و میسک و عەبهەر دروست دەکرێت.. بالدینی هەست دەکات «غرنوی» شاگردی دەباخانەکە پێستی خۆشکراوی بۆ هێناوە، بوونەوەرێکی ئەفسوونکاری خاوەن بەهرەیەکی خەتەرناکی عەترسازییە. ئیتر بالدینی بە بڕی (٢٠) لیرە «غرنوی» لە «غریمال»ی وەستای دەباخانەکە دەستێنێ و غریمال پارەکە بە شەراب دەدا و تا بەرەبەیان دەخواتەوە و جا خۆی هەڵدەداتە نێو ڕووبار و بە بەرچاوی «غرنوی»دا ئاوا و ئاو دەچێت و نە ئاوڕی لێ دەداتەوە و نە فریاشی دەکەوێ.. ئەمە دیمەنی مرۆڤێکی ڕۆمانی (السقطه)ی «کامۆ»م بیردەخاتەوە وەک حاڵەتێکی هزری وجوودی گوزارشتی لێ کراوە، بەڵام غرنوی لەوێ لە عەترخانەکەی بالدینی دا چ دەکا؟.. غرنوی خاوەن بەهرەیەکی زگماک و خودایی و شێت و دێوانە، هەوڵی دروستکردنی عەتری «شەوی نابولی» دەدات، غرنوی گوێ ناداتە ڕێژە و پێوانە و پێودانگی عەترسازی و کێش و تەرازوو و ڕەحەتی و تێکڕای ئامرازەکان فەرامۆش دەکات، ئەو حەزی لە بەرپاکردنی زەماوەندێکی خەتەرناکی پڕ ئاژاوەی جوانی عەتر و عەترسازییە! چونکە ڕێژەکانی عەتر لەنێو ڕۆح و دەروون و زەینی دایە!

«غرنوی» دەتوانێ لەم جینانی کارگەی بۆن و بەرامەخانەیە جۆرەها عەتری نایاب و دانسقەی وەرزی دروست بکات، عەترخانەی «بالدینی» بەشێوەیەک نێوبانگ دەردەکات خەڵکی لە گشت شوێنەوە ڕووی تێ دەکەن، لەپڕ «غرنوی» نەخۆش دەکەوێت و دەگاتە حاڵەتی گیانەڵا و سەرەمەرگ، کەچی بالدینی بەخۆ بەدەفتەرەوە لەپاڵ سەری ڕوودەنیشێت و پرسیاری ڕاز و نهێنییەکانی عەترسازی لێ دەکات و یەک یەک زانیارییەکان تۆمار دەکات، بەڵام دوای چەند ڕۆژێ تەندروستی باش دەبێ، چونکە «غرنوی» بەرگەی هەموو جۆرە نەخۆشییەکی کوشندە دەگرێت و دەتوانێ خۆی لە درم و پەتاش دەرباز بکات، کەچی خەتەرناکترین زانیاری کە لە بالدینی فێری دەبێ.. ئەوەیە کە لە باشووری فەرەنسادا بە ڕێگەی (ڕۆنی سارد) بۆن و بەرامە و عەتر دروست دەکرێت. ئیتر وەک موسافیر و تۆریستێکی بێ موبالات و گومڕاه سەر هەڵدەگرێ و کارخانەکەی بالدینی جێدێڵێ و دوای سەرهەڵگرتنی ئەو کۆشک و تەلاری جوزبیە بالدینی دادەڕمێ و خۆیی و ژنەکەی دەمرن! حاڵەتێکە و ڕاڤە ناکرێت! بڕیاری

یەکجارەکی دوورکەوتنەوە و خەڵوەت و گۆشەگیری و لاتەریک بوون لە بۆنی مرۆڤ! لە بۆنی خەڵقەندەکانی سەرزەمین، «دۆستۆیڤسکی» لە زیندانی سیبریادا کە «ئینجیل»ی لێ دەدزن گارانی مرۆڤ بە ڕشانەوە دەشوبهێنێ.

سەفەرێک ڕووە نادیارترین شوێنی باشوور و گەیشتن بە ترۆپکی خەڵوەت و گۆشەگیری «غرنوی» دڵنیایە لەوەی کە ئادەمیزاد بە بۆنی پیس و زنخ و گەماری جەستەی پاکێتی سروشتی پیس و چەپەڵ کردووە. مرۆڤ بارستێکە لە پیسییەکانی شاراوە و گەنی.. ئەو تەنها لەگەڵ عەتری کچە پرچ سوورەکەدا دەژی.. ئەو کیژۆڵەیەی کە میوەی «ئاڵووباڵوو»ی قاش دەکرد، ئیتر بە تاقی تەنێ بەرەو زنجیرە چیای «سنترال»ی ناوچەی «ئوڤرج» هەنگاو دەهاوێژێ، لە مانگی ئابی ساڵی (١٧٥٦) دەگاتە ئەوێ و لەسەر دوند و ترۆپکی چیای «بلومب دوکانتال» دەوەستێ و سەراپای لەشی دەخاتە بەر تیشکی خۆر و هورووژمی گڤە گڤی با و بۆران و سەرما و سۆڵە و چەشنی «سیدهارتا»ی هیرمان هیسە، دەیەوێ بەهۆی کەرەسە و ئامرازە توندوتیژەکانی سروشت چڵک و زنخ و گوناهەکانی ڕۆح و جەستە لابەرێ و لەوێ لەسەو دوندی چیای «بلومب دوکانتال»دا دووبارە جارێکی تر دوای حەوت ساڵی ڕەبەق بە ڕووت و قووتی دەوەستێ و تا لە شەرای بۆنی جلوبەرگە چڵکنەکەی دەربازی بێ. «غرنوی» لە دەروون را هەست دەکات کە تاقە مرۆڤێکی تەنیای ئەم گەردوونەیە و بەس! لە خۆشیان هێندە بەختەوەرە یەکبەدەنگی هاوار دەکا و دەقیژێنێ.. هەست دەکا فاوست ئاسا دەستی بەسەر «لۆگۆس»دا گرتووە و بۆتە خاوەندی سەرتاسەری سروشتی بێ پایان، غرنوی وەک بکوژێک و حەرامزادەیەکی ئەفسوونکار و بەهرەمەند بەدوای چرکە ڕۆحییەکانی بەختەوەریدا دەگەڕێ، بەشێوەیەکی بەردەوام لە دنیای ئەمارەتە خودی و غەیبانییەکەیدا چرکە عەتراوییەکانی یادەوەری بە هێزە ئیکسیرییەکانی زەینی شێواو و سیحری نوستالژی ئامادە دەکا و چێژ و لەززەتی بێ پایان لەو چرکەساتە گوناهکارییانە وەردەگرێت.

لەوێ لەو تونێلی ئەشکەوتەدا، وەک درندەیەکی بەلەسە و حەرامزادەیەکی بەهرەمەند! دوور لە بۆنی چەپەڵی مرۆڤ بە خواردنی گیاوگۆڵ و قەوزە و کرم و مار ژیانێکی لاتەریک و تەنها و گۆشەگیر دەگوزەرێنێ و لای ئەو کاتە تەقلیدییەکانی وەرز و سات و ساڵ و چرکەکانی زەمەن تێکەڵ دەبن و ئەو هۆگر و ئاشنا و شەیدای عەتری خۆڵ و بەرد و تەوەن و تەڕایی سرووشتە و لە ئەمارەتە تەماوییەکەیدا لە غەیبەوە سەبەتەی پڕ میوەجاتی شەرانگێزی و پەیژەی ئەفسووناوی بۆ دێ!

«غرنوی» وەک کەسایەتییەکی رووکەش و هێمایەکی رووت، کە بکوژێکی دڵڕەق و درندە و کارامە و پسپۆرە لە کردەی کوشتارکاریدا، دەلالەتی توخم و ڕەگەزە دزێو و کرێت و پیس و چەپەڵ و ناشیرینەکانی خەسڵەتی نەست و نائاگایی مرۆڤ و بەتایبەتی مرۆڤی سەردەم دەگەیەنێ، ئەو نەست و نائاگاییەی کە لێوانلێوە لە ئێرەیی و ڕژدی و بەخیلی، ڕووبینی و دووفاقی، چاپلووسی و گوناه و تاوانی شاراوە، تەماحکاری و بێ ویژدانی، دزی و جەردەیی و درۆزنی، بوغز و کینە و دڵپیسی و خاڵی بوون لە عیشق و ئەڤین و مەحەببەت.. پاشان مرۆڤ کە هەڵگری سیستمی تاقە زمانێکی موقەددەسی ڕەفتار فاشییە، سیستمێک پڕ لە گوناه و تاوان و بوغز و کینە و ڕووبینی و درۆ و دەلەسە و ناڕاستگۆیی شاراوە. کەواتە مرۆڤ هەرگیزا و هەرگیز نابێتە خاوەنی خەسڵەت و سیفاتی پاکی و خاوێنی و عیشق و فەزیلەت، بەڵام هێما قووڵ و ئاڵۆز و جوانەکەی کەسایەتی «غرنوی» پەیوەستە بە سیفات و خەسڵەتەکانی «پرۆمیسیۆس»ی ئاگردز، کە بڵێسەی ئاگری ئیلاهی دەدزێ، کەچی «غرنوی» پرۆمیسیۆسێکی عەتردزە و جەستەی پڕ لارولەنجەی پاکیزەکانی مەملەکەتی خودا دەدزێ و دەیکاتە موڵکی تایبەتی خۆی تا دڵ و دەروون و ڕۆحی خاترجەم و دڵنیا و بەختەوەر بێ!

ئەو عەترە موصەفا و ناب و بزوێنەی کە هێشتا بە تاوان و گوناهەکانی مەرگ و قەدەر و ئاڵۆشەکانی سێکس پیس و پوچەڵ نەبووە، ئەو عەترە پڕ عیشقە تا نەبێتە موڵکی لاشەیەکی گەنیو و دوایین جار بە ڕووگەی هەددەر بسپێردرێ، هەر بۆیەش «غرنوی» چەشنی عەتارێکی شێت و کاریزما و درندە و هەمیشە هۆشمەند!.. تەنها دوو جار تنۆک تنۆک، دڵۆپ دڵۆپ.. عەترەکە دەپژێنێ و بڵاوی دەکاتەوە، جارێ بۆ دەربازبوونی لە شایی لۆغانەکەدا، جاری دووەم، عەتری کەرنەڤاڵی مەرگی خۆیەتی، عەتری تەفروتووناببوونی ڕۆح و جەستە بە عیشق و هەوەس و شێتێتییەوە، ئەو مانەندی فاوست، خاوەندی «٢٥» شووشە عەتری جەنان و جینانی خودایە و ئەو پاژێکە لەو بارستە تاریکییەی کە نوور و ڕووناکی لێی خوڵقێنراوە!

ئەو خوداوەندێکی ئیبلیس سیفەتە، کەواتە دەبێ لەنێو ڕۆح و جەستەی گرۆی پیاوکوژ و چەقۆکێش و سۆزانی و گەنجە لاسارەکاندا تەفروتوونا بێت و پێویستە بخۆرە چڵێسەکانی گۆشتی ئادەمی تیکە تیکە سەراپای جەستەی هەڵلووشن. جەستەیەک کە بە خورد و خۆراکی گیاوگۆڵ کرم و مار و دووپشک و قەل و شەمشەکوێرە و شنۆی بۆنی سروشت و عەتری خەتەرناکی یادەوەرییە غەمگین و عیشقاوییەکان پەروەردە کراوە.

ئەمێستا «غرنوی» قژی گەیشتۆتە سەر چۆکی و ریشیشی تا سەر ناوکی شۆڕبۆتەوە و نینۆکەکانی چەشنی چرنووکی فرندە گۆشتخۆرەکانە.. دوا ڕمانی ئەشکەوتەکە و دەربازبوونی بەهۆی پەیژەی غەیبانییەوە، دەڵێی ئەنکیدیۆیە و بەرەو شاری (بێرڤور) هەنگاو دەهاوێژێ خەڵکی لێی تۆقیون.. وا هەست دەکەن یەکێکە لە هۆزی دڕندەی «شایان»ی هیندی. بەرەو شاری «غراس» لێرەش بۆن و بەرامەی کچە پرچ سوورەکەی خیابانی «دی ماریە»ی بۆ دێ.. دوای خۆشتن و قژتاشینی لەوێ لەو شارە دەتوانێ لە عەترخانەی «دی فینان» و لای مەدام ئەرنولفی دابمەزرێ و کارە جەرگبڕەکانی قەتڵ و کوشتار بەرپاکات.

غرنوی وای بۆ دەچێ کە تەرمی مرۆڤ چەشنی گوڵی قرتێنراو وایە، هەر زوو سیس و پەژمووردە و گەنی دەبێ، بۆیە شێت و شەیدای دزینی عەتری بۆنخۆشی بوونەوەرە زیندووەکانە! سەرەتا غرنوی لەوێ لە شاری «غراس»دا بۆنی لە کەرەسەی مردوو دروست دەکرد، وەک بەرد و دەسکی دەرگە و پەنجەرە.. پاشان مێش و مەگەز و جرج و بەچکە پشیلە و گوجیلەی ڕاو دەکرد و دەیهێنا و لە ڕۆنی قرچاوی نقووم دەکردن و تا «بۆن»یان لێ دروست بکات. غرنوی وەک دڕندەترین مرۆڤێک لە سەرتاسەری ژیانیدا نەیزانیوە مانای ئەڤین و خۆشەویستی چییە، ئەو تەنیا بۆن و بەرامی جەستەی خۆشدەویست، تەنیا عەتر چی تر نا! ئەو عەترەی کە دەبێتە مولکی خودی خۆی!

دووەمین قەتڵی غرنوی لەم شارە.. کوشتنی کچە پازدە ساڵەکەیە کە جوانییەکەی لە هەنگوینی ڕەش دەکا! دەڵێن بکوژەکە پرچە ڕەش و درێژەکەی بڕیوە و جلوبەرگەکەشی داکەندوو و لەگەڵ خۆ بردوونی.. خەڵکی غەجەریان تۆمەتبار دەکرد، چونکە قەرەج لە جلوبەرگی کۆن و شرە و شیتاڵ ڕایەخ دروست دەکەن و بالیفەکانیش بە پرچی مرۆڤ دەئاخنن و لە پێست و دگانی لە سێدارەدراوانیش بووکەشووشە چێ دەکەن، پاشان تۆمەتیان خستە سەر کرێکارانی ئیتالی و یا باروکە دروستکەرانی یەهوود، گومانیان لە ڕاهیبە شەهوانییەکانی دێری «بندیکستی» و قەشە و کاردینالە ماسۆنییەکان و شێتەکانی نەخۆشخانەی «الرحمة» و کرێکارانی خەڵووز و سواڵکەران دەکرد، شاری «غراس» بە یەکجارەکی شڵەژا و خەڵکی ئەوەندە دەترسان دڵیان لەنێو دەستیان بوو، خۆ کەس بە تەمای گیانی کچی خۆی نەبوو. غرنوی دڕندە وەک بکوژێکی شاراوە و پەنهان توانی لە ماوەیەکی کورتدا بەهۆی تێلا تایبەتییەکەی «٢٤» کیژۆڵەی شۆخ و شەنگ و جوان و پەری شێوە لەنێو بەرێ و وەک پارسایەکی سروشت «٢٤» شووشە عەتری ناب و موصەفا لە بۆنی قژی ئارموشێن و لەش و جەستەی نەرم و نیان ئامادە بکات.. ئەم پارسای دڕندە و خەڵوەتنشینی شەڕانگێزی سروشتە خاوەندی سامان و خەزێنەی موقەددەسی ئیکسیرییە! شازادەی ئەمارەتی عەتری لەشی کچگەل و پاکیزەکان!، ئەی چلۆن و کەی هاوکێشەی ئێستێتیکە عەتراوییە شەڕانگێزەکەی لەلا تەواو دەبێ، ڕوو لە کامڵ بوون دەکات و یان کەی دەگاتە پلەی «فاوست» و دەبێتە خوداوەندی ئەمارەتی عەترە پەتی موصەفاکان، چونکە عەتری جەستەی کیژۆڵە بەدبەختەکان هێمای دوایین تنۆک و دڵۆپەی ڕۆحە و ڕۆحیش پابەندی عەتر و بۆن و بەرامەیە، کەواتە تەنیا ڕۆحە کە لە زیندانی جەستەدا هەردەم لە جووڵە و بزاڤ دایە و ڕۆحە و نەشئە و غەمزە و جیلوە و لارولەنجە و نەغمە و نەرم و نیانی و شەوق و ڕەونەقی جوانی بە جەستە دەبەخشێ.. ئیکسیری ڕۆح فۆنیمەکان بە لەنجە دێنێ و سەراپای ئاوێنەی بەژن و باڵا بە شەپۆلەکانی نوور دەدرەوشێنێ و ئاگرێکی فیردەوسین و مەزەدار لە هەودای پرچ و ئەگریجە بەردەدا!

«غرنوی» وەک دڕندەترین بوونەوەرێک ئەمێستا خودان کۆمەڵێک عەتر و ڕۆحە، ئەو بە هەوەس و ئارەزووی خۆی، بەهۆی لووتە ئەفسووناوی و ئەفسانەییەکەی بۆنیان دەکا و لەنێو یادگە و یادەوەرییەکانیدا وازی بە عەتر و بۆن و بەرامە و ڕۆح دەکا. «غرنوی» وەک دڕندەیەکی هێمن و کشومات هۆشمەندە و دەزانێ جەستەی مرۆڤ زەواڵ و فانیە و بۆنی زنخ و پەنیری کۆن و بۆدڕنی ئاردقە و ماسی لێ دێ. نەخاسما کە دەمرێ بە زووترین کات شەرای بۆنی گەمار و پیس دەردەکات، ئەوەتانێ «زوسیما»ی پیری موقەددەسی «برایانی

کارامازۆف».. ئەو پیرەی کە ڕۆژانە سەدان کەس سەردانیان دەکرد و دەستیان ماچ دەکرد و سوژدەیان بۆ دەبرد، چەند زوو لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا لاشە لاواز و بنێسەکەی بۆگەنی دەرکرد، کەواتە نەمری تەنیا لە عەتری ڕۆحە موصەفا و پاک و نابەکانی پاکیزاندایە.

هەڵبەتە دوایین نێچیری «غرنوی» خاتوو «لوور»ی کچی (ڕیتشی)یە.. ئەو تاقانە کیژەی کە جوانییەکەی لە ڕوخساری ماهی تابان دەکا و ڕیتشی دوای مردنی هاوسەرەکەی دووبارە ژنی نەهێنا و هەر بە دیار «لوور»ەوە ژیانی دەگوزەراند.

ڕیتشی کە سەیری شێوە و ڕوخساری «لوور»ی دەکرد هەستێکی سەیر و نامۆی پڕ ترس و شەرم کرۆکی گیانی داگیر دەکرد.. زۆر بە وردی و هۆشمەندانە لەو کردەی جەرگبڕی قەتڵ و قەتلکارییەی شاری «غراس»ی دەڕوانی و ڕیتشی خاوەن پلەوپایە و پێگەی ڕاوێژکاری لە سەڵتەنەتی دەوڵەتدا وەرگرتبوو، بە هێمنی ئەو هاوکێشەی شەڕانگێزی جوانناسییەی کوشتار و کوشتارگەی لێکدەدایەوە، دەیزانی دوای لەنێوبردنی (٢٤) کیژۆڵەی شۆخ و شەنگ و نەرم ونیانی شاری «غراس» ئیمجارە نۆرەی کچە تاقانەکەیەتی.. ئەم حاڵەتە خوێناوییەی شاری «غراس» تەنیا بە کوشتنی «لوور» کۆتایی پێدێ و هاوکێشەی شەڕانگێزیش دەگاتە لوتکە و ترۆپکی کامڵبوونی جوانی! بەڵام ڕیتشی وێڕای ئەوەی کە ڕاوێشکاری دەوڵەت بوو، خاوەن کەسایەتییەکی ڕاڕا و گومڕا و لێوڕێژ بە هەستی جوانی! یەکسەر بڕیاری جێهێشتنی شاری «غراس» دەدا و بەخۆ بە لووری کچە تاقانەکەی زۆر بە پارێز و نهێنی شار بەجێ دێڵن، بەڵام بۆ کوێ؟ بەرەو کوێ ڕێ دەکەن! ئاخر «غرنوی» دڕندە بەهۆی لووتە سیحراوییەکەی لە هەچ شوێنێ بێ دەیدۆزێتەوە! ئاخر ئەمەیان دوایین کەرنەڤاڵی مەرگ و قەتڵ و کوشتارکاری دڕندانەی «غرنوی»یە کە لە نیوەشەوی کشوماتی ژووری هۆتێلێکدا ئەنجامی دەدات، ئەو دڕندەیە بەهۆی پەیژەیەکی دارینە بە نهۆمی دووەمی هۆتێلەکە هەڵدەگەڕێ، لە پەنجەرەوە بە ژوور دەکەوێ و «لوور»ی مەلەک شێوە لە شیرین خەودایە و شەعشەعەی جەستە برۆنزییەکەی دەچریسکێتەوە!

ئەو دڕندەیە تێلا کوشندە و تایبەتییەکەی ئاراستەی تەوقەسەری دەکا و ئەنجا سەرجەم کەرەسە و ئامرازەکانی عەترکاری (بە ڕێگەی ڕۆنی سارد) پەرشوبلاوی سەر جەستەکەی دەکا تا بیگەیەنێتە قۆناخی مەرگی دووەم، مردنی ڕاستەقینەی هەڵمژینی عەتری جەستە بەهۆی پارچە کوتاڵە چەورەکان! لەگەڵ گەردی بەرەبەیان لە کوشتارکارییە قێزەونەکەی دەبێتەوە. کلافەی پرچە ئارمووشینەکەی «لوور» هەر لە کراس و ئاوەڵکراسەکەیدا دەپێچێ و تێکرای پارچە پەڕۆیەکانیش دەرباز دەکا و سوب سەحەرێکی سوور و خوێناوی، چۆلەکە خەرییکی جریوە و جووکەن و خۆر تازە گزنگی دەکەوێ. «غرنوی» دڕندەترین هەرماسی گەردوون، بەخۆ و بە بارگەی دانسقەی، ناوچەکە جێدێڵێ.. ڕیتشی کە دەرگای ژوورەکە دەکاتەوە هەست دەکا شەپۆل شەپۆل بڵێسە و نوور لە جەستەی لوور بەرز دەبێتەوە.. دەزانێ دەرەوشانەوەی مەرگ و هەڵکشانی دوایین پلەی کوشتارکاری جوانییە!

مەرگی «لوور» هەمە مەرگی «ئۆفیلیا»ی تێکستی «ڕامبۆ»یە کە تەرمە جوانەکەی بە جلوبەرگی تەنک و مەلەسی بووکێنی سەر ئاو کەوتووە و دەڵێی بارستێکە لە گەڵای خەزەڵوەری خودایی و «زیو»ی دەرەوشاوەی فیردەوس.. دەقی «عەتر» بە هەمان ئاست و پلە و هەست و دەربڕینی هونەری گوزارشتی لەم حاڵەتەی مەرگ و کوشتارکارییە کردووە. ئەمێستا «غرنوی» وەک عەتارێکی بکوژ و دڕندە خاوەندی بیست و پێنجەمین شووشە عەتری ڕۆحی جەستەی پاکیزە بێ گوناهەکانە.. خاوەندی هێز و جەبەرووتی دەسەڵاتێکی کاریزمییە و لە ڕادە و پایە و پلەی «فاوست»ی خوداوەندی شەڕانگێزدایە و ئەو گیانی بە شەیتان نەفرۆشتووە، بەڵکو خۆی بۆتە شەڕانگێزترین و کامڵترین شەیتانێک لە ئەمارەتی عەتر و لەززەتدا، دەتوانێ لە جیهانی ئاڵۆسکاوی خەیاڵگە و یادگە و یادەوەرییەکاندا گەمەی موقەددەسترین عەتری لەززەت ئەنجام بدات، بەڵام سوودی چییە کە وەک خوداوەندێکی خاوەن سەڵتەنەتی عەتر رووە و جیهان دەرکەویت و خۆت نەتوانی و توانستت نەبێ بۆنی عەتری لەش و جەستەی خۆت بکەی! ئاخر کێ دەتوانێ بگاتە ئەو ئاستە مەعریفییە خەتەرناکەی هۆشمەندی و بۆنی عەتری خودی ئاڵۆسکاوی خۆی بکا و هاوکات هەست بە پووچێتی بوون و گەردوون نەکا!

ئیتر کە «غرنوی» وەک بکوژێکی ڕاستەقینە دەسگیر دەکرێ، دوای دادگاییکردن بڕیاری لە سێدارەدانی دەدرێت و نزیکەی دە هەزار کەس ئامادەی زەماوەندی هەڵواسینەکە دەبن و خاوەن قوربانییەکان هەوڵی پارە

پارەکردنی دەدەن، کەچی «غرنوی» وەک پرۆمیسیۆسێکی عەتردز و کاریزمایەکی بەهێز و ئەنارشیزم بەهۆی بەکاربردنی دڵۆپە عەترێکی بۆنداری ڕەوحانی، عەتری جەستەی نەوڕەسیدەی خودایی، دەتوانی ئاڵۆشیرترین و ئیرۆتیکترین زەماوەندێکی باخوسی بەرپا بکا، کەرنەڤاڵێکی لەززەتداری دیۆنیزۆسی، زەماوەندێک بە بڵاوبوونەوەی دڵۆپە عەترێکی جاویدانەی پیرۆز، کە حەز و لەززەتی سەراپای حەشاماتەکە دەوروژێنێ و تێکەڵ و ئاوێزانی یەکدی دەبن. کەس بڕوا ناکا «غرنوی» بکوژ و تاوانبارێ بێ، بەڵکو وەک قەدیس و پیاوچاک و بێ گوناهێ سەیر دەکرێ و «ڕێتشی» بە نزا و تکا و لالانەوە لێی نزیک دەبێ.. «غرنوی» ئەی بکوژی کچانی «غراس» ببوورە تووخودا ببوورە، ببوورە ئەی کوڕە ئازیزەکەم، تۆ بۆنی لووتت لێ دێ، حەز دەکەم چەنێ حەز دەکەم بتکەم بە کوڕی خۆم و من و تۆ وەک کوڕ و باوک پێکڤە بژین، بەڵام غرنوی، عەتری پیرۆزی لوور لەنێو خوێنیدا دەپژا و غرنوی ئاخر گوڵ دوو جار دەمرێت جارێ کە دەقرتێنرێ و جارێ تریش کە شیلەی عەتری هەڵدەمژرێ..

غرنوی مویتەلای بۆن و بەرامەیە و بەس نە جەستە! غرنوی دەڕوا و شایی لۆغانەکە جێ دێڵێ و نیازیەتی هەمدیس ڕووە و سروشت زنجیرە چیاکانی «سنترال»ی ناوچەی «ئۆڤرج» سەرهەڵگرێ، کەچی پەژیوان دەبێتەوە، دوای نیوەشەوێکی درەنگ و خامۆش کە گۆڕ هەڵکەنەکان دەگەڕێنەوە و دووبارە جووڵەی ژیان شوێنە خاڵییەکان دەگرێتە خۆ و مرۆڤە هیچ و پووچ و بێ نموودەکان بە هەموو چەشن و جۆریانەوە بەدیار دەکەون.. دزەکان، پیاوکوژەکان، چەقۆکێشەکان، سۆزانییەکان، سەرسەری و ڕاکردوانی سەربازی، گەنجە لاسارەکان، لە گۆڕەپانەکەدا ئاگرێکی چکۆلە دادەگیرسێنن تا خورد و خۆراکی چکۆلە ئامادە بکەن، غرنوی مانەندی خەڵقەندەیەکی کاریزما تێکەڵ بەو گرۆیە دەبێ و لەپڕ دڵۆپە عەترێ لە گوڵاوخانەی ڕۆحی دەپژێنێ و عەتر بڵاو دەبێتەوە، عەتری مەرگ، عەتری فەنا و وەجدی شەڕانگێزی. تەنیا دڵۆپێک لەو (٢٥) شووشە عەترەی کە خۆی خوداوەندی مەملەکەتی عەترستانەکەیە.. تێکڕای خەڵقەندەکان لە ڕۆحەوە دەوروژێن و چەشنی مانگ و ئەستێرە حەلقە و بازنەی بەدەوردا دەبەستن و هێدی هێدی بە وریا دەخولێنەوە و دەخولێنەوە. لەپڕ جەستەی پیرۆزی لەت لەت و ئەنجن ئەنجن و پارە پارە دەکەن و بە سرووتێکی وەسەنی و بەوپەڕی نەوسنی و چڵێسی تیکە تیکەی لەشی دەخۆن. ئا بەم جۆرە خوداوەندی عەتری پاکیزەکان پێوستە لەنێو لەش و جەستە و دڵ و دەروون و گیانی گرۆی دز و جەردە و سەرسەری و چەقۆکێش و سۆزانی و ڕاکردووانی ئەرتەش و گەنجی یاخی و لاسار و سەرەڕۆدا تەفر و توونا و زەواڵ و فەنا بێ..

ئەمەیش وەهمی کردەی نووسینە و «ئەپیکۆر» گوتەنی ئەوەی بیەوێ سەراپای جیهان ژێر و زەبەر کات پێویستە بیر لە تەفروتووناکردنی خودی خۆی بکاتەوە. وەهمی نووسینیش وێڵ و سەرگەردانی دۆزینەوەی سەرچاوەگەلەکانی ئیستەتێک و ڕاز و نهێنییەکانی مەرگ و تراژیدیایە و خۆ ئاقیبەت مرۆڤ وەک بوونەوەرێک دەسکەوت و نێچیری هێزێکی نادیارە و پرۆسەی وەهمی نووسینیش پەیامێکی پەنهان و شاراوەی لەنێو وجوودی خۆیدا هەڵگرتووە و بوونێک لەنێو بازنەی زەمەندا دەژی و لێوانلێوە لە گوناه و جوانی، بەڵام لەودیو سنوور و تخووبی سیستمی کردەی نووسینی ڕۆمانی «عەتر»دا هالا و بڵێسەی ئاماژەگەلێک ئاگر و پۆلووی (دریدا - نیچە)یی دەدرەوشێنەوە و گوزارشت لە هزر و گۆشەنیگایەک دەکەن کە هەموو شتێکی ئەم گەردوونە پووچ و بێ مانایە و هەموو شتێک وەکو یەک وایە، چاکە و خراپە، جوانی و کرێتی، لەبەر ئەوەی دوایین جار تێکڕای شت و شتگەلەکان دەمرن و لەنێو دەچن، ئیتر شتەکان چ مانایەکیان نییە!.

**سەرچاوە:**

ڕۆمانی «العطر»، باتریک زوسکیند، وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: د. نبیل الحفار، لە ڕۆمانەکانی «المدى»، چاپی سێیەم، ساڵی ٢٠٠٣.

# ڕۆمانی (شەخەڵی دار بەڕوو- سنووری ستەم و ئازار)

پ. د. عومەر ئیبراهیم عەزیز (پەتی)
(کۆلێژی پەروەردە - زانکۆی سەلاحەددین)

(٢ - ٢)

**شێتبوون:**
بەهۆی هۆکاری نەویستەوە مرۆڤ هۆشی نامێنێت و دەکەوێتە باری بێ هۆشی و بێ ئاگاییەوە (وەکی چووینە جلکان لە ڕیێی لە (هەریرێ) لامـاندا، دوو نەفـەر دابەزین، لە (سیساوەی تێپەڕین لەسەر ئاوێ (سەرتا)ی (کەچۆ)مان دیت (کەچۆ: ئەحمەدە شێتی خۆشناوەتی، هەمـوو کـەس دەیناسی وەلیـیە) ڕاوەسـتابوو کـۆنە فانۆسێکی بەدەستەوە بوو، شوفێرەکە دەیناسی ڕای گرت و سواری کرد و دواندی.. هتد.

گوتییە حەمەدەمینی کوڕ «ئەوە دەچیە هەولێرێ؟ کوڕە ئاگـات لەخۆبێ، لە دەشـتی هەولێـرێ نەکـەویە بیـرێ! بیــریان گــەلێک قــووڵن، بەکــەس دەرنایێ ها! کـاروانچیـیەتیت کردییە؟» پێکەنی و گوتی «ترێ و هەنارت لە (سەنی)یە و (مرکی)یەی لە (کەندێناوە) و (قەراج)ێ یەک و چەند بەگەنم دەدا؟! دەوارنە ترێیان... دەوارنە هەناران دەشتەکی ناوپستێر شۆڕ لێت خڕدەبنەوە و دەڵێن «مام خۆشناو بڕمانت پێیە، وای هیزە جەفتت پێ بوایە، ئەرێن وای سرکەت پێ بوایە» گوتییە (مینە)ی «کوڕە ئاگات لەخۆت بێ سەگبابانە کانی و ڕووباریان نینە، هەر بیرە بیرەکەش گەلێک قووڵ و بێ بنە، بکەویە بیرێ بە کەس دەرنایێ ها..» ئەوە کەوتە بیرێ بێ بن، بە کـەسـیش دەرنایێ. لەم تازییـەی (کـەچۆ)م دیتـەوە، شێـوابۆوە، هەردوو چاوی بووبوونە گۆمی خوێنی، وەکی زولم و زۆرداریـیـەکی گــەورە ببــینی، تێک دەچێتەوە.»ل٧١-٧٢.

«پیرە شێـتێکی کەڕولاڵی لەڕولاواز، جل شڕ و ڕدێن بۆز و درێژیان لەناو کاولی دێیەکەدا بە قۆنداخە تفەنگان تەواوکـرد، لاشەکـەشیـان بە گـوللان کـردە سـەرەند و بێـژینگ. پاش بە زۆر ڕاگـوێزانی گـوندەکـان هەمـوو جوولانەوەیەک لە ناوچە خاپووکراوەکەدا قەدەغە کرابوو، بەلام شێـتە دێیە وێران کراوەکەیانی بەجێ نەدەهێشت. حەمە شێت تاکە برایەکی هەبوو، جار جارە، بە دزییەوە دەچوو حـەمـەی دەدۆزییـەوە و دەیهێنایەوە، بەلام ئەو کە مـتـووی گـوندەکـەیان ببـوو، وازی لە کـاولە گـوندەکـە نەدەهێنا، زۆر بە ڕک و بەکـەسـەرەوە سـەیری خـەڵکی گـوندەکـەیانی دەکـرد، بە دەست، بەهێـما کـردن، داوای گەڕانەوەی لێ دەکردن..» ل١٦٣.

**بووڕانەوە:** کرمانج کە بە منداڵی چاوی بە تەرمی باوکی دەکـەوێت لە هۆش خـۆی دەچێت، کـە لەنێـو خـەم و ئازاریشـدا گـەورە دەبێت و هەست بە سـتـەم و نارەوایی دەوروبەرەکـەی دەکـات، هەوڵ دەدات بیـانگۆڕێت، بەلام زۆر لەوە گـەورەترن کـە ئەو بتـوانێت، کـەچی ئەویش بە باوەڕەوە بەرنگاریان دەبێـتـەوە و بارەکەی ئەوەندە گرانە کە لەژێریا بەلادادێت و دەکەوێت و هەڵدەستێتەوە، ئەو شـەوەش لەنێـو دەریای خـەمـەکـانی پیـرەژنێکی ولاتە بریندارەکەی مەلە دەکات، بەلام ئاگـاتە هیچ کـەنارێک، ئازار و خەمی میللەتەکەی و بێباکی و دڵڕەقی سەرانی

جیهان و پاڵپشتیکردنی ئ.دوایان (دەنگ و باسی ڕادیۆکە) ناهێڵێت شەو چاوی بچێتە خەو، ڕۆژی دووەمیش چاوەڕوانی دایکی و ژنی و منداڵەکانی دەکات، کەچی خەبەری هەڵدێرانیان وەردەگرێت. کە لە ئەنجامدا لەخۆدەچێت:

«.. شڵەژا، ڕەنگی هەڵبزڕکا، لاقەکانی لەرزین سەری گێژی خوارد، بەرچاوی لێڵ بوو و کەوت».ل٧٩.

«دلێر..! کرمانج! باوکی ئازادی..! ئەتۆ نازانی من و دایکت هاتووینە سەردانت هەی بەساقەت بێن... «ئێرە کێندەرە؟ ئێمە لە کوێین؟ ئەنگۆش لەناو ترومبێلی مردن؟ ئەدی کوڕەکان؟» دایکی گوتی: بەقوربانت بێن، هەموو وا لێرەینە، ئەوە بۆ وات لێ هاتووە؟ وەکی چاوی بەتەرمی باوکیشی کەوت ئەوهای..»ل٨٥.

**زمانبەستران**: شەوچرا بەڵێن دەداتە باوکی ئەو دوو ساوایە دایک مردووانە کە ئەو ئامادەیە جێگەی دایکیان پڕ بکاتەوە: «شەوچرا: ئەوە تۆ دەڵێی چی کاکە شێرکۆ؟ من کچی دایک و باوکی خۆم نەبم ئەگەر لە هەموو دایکێکی سەر ئەم زەمینە بۆیان خەمخۆرتر و دڵسۆزتر نەبم. ئەوانە تەنیا منداڵی تۆ نینە.»ل٩٩.

بەڵام لە ڕێگەدا فڕۆکە بردومانیان دەکات و چەندین دیمەنی زۆر تراژیدی و ترسناک دەبینێت و بەرگەیان ناگرێت لە ئەنجامدا زمانی دەبەسترێت و توانای قسەکردنی نامێنێت:

«کاروانچییەکە پیرەژنی دابەزاند و تریانەکەی کردەوە و دایگرت، لایەکی تریان و بەرماڵە ڕەش و سپییەکە دڕابوون، منداڵێکی دەرهێنا، منداڵەکە سەری جووڵاندەوە و گریا، قۆنداخەکەشی بەخوێن ببوو، ئەوی دیکەی بەدەستی چەپی بڵند کرد، خوێنی لێ دەتکاوە، شەوچرا لە دەستی دەرهێنا، قۆنداخە بە خوێنەکەی کردەوە و سەیریان کرد، چ سەیر بکەن! تلیشە ئاسنێک لە سەرەوەی ناوکە تەڕەکەیەوە کچەکەی کردۆتە دوو لەت، شەوچرا زرووکاندی، سەر و تیتکی خۆی ڕنییەوە: کچێ بێ باوک و دایکەکەم! مەلۆتکە بێ کەسەکەم، ئەمن چ وەڵامی خۆم بدەمەوە.

لە شوێن خۆیا حەپەسا و زمانی گیرا... لە ڕێگەدا چەند جارێک بە منداڵەوە ساتمەی کرد و کەوت و هەڵستایەوە، بارگیرێکی بینی لە قەراخ ڕێگاکەوە کەوتبوو، خوێنێکی زۆری لەبەر ڕۆیشتبوو، پەلێکی پێشەوەی بڕابۆوە، خاوەنەکەی کورتانەکەی لێ دەکردەوە، لەولاتر ژنێکی سکپڕی بریندار دەیناڵاند، خەڵکێکی زۆر بە حەپەساوی گەمارۆیان دابوو،... ئازاد بانگی کرد: دایە!.. دایە!.. مەترسە! مەترسە ئێمە سەلامەتین. تۆ بۆ لە جێگەی بۆمباکان بەجێ مای..؟.. بەڕاکردن و بە لرفەلرفە گەیشتەوە کەرەکە، ویستی بڵێ زامدار نەبووینە، هەستی کرد قسەی بۆ دەرناکرێت، بە هەردوو دەست شێتانە، نیشتمانی لەتەپڵی سەریەوە تا نینۆکی پێی پشکنی، دەستە بە خوێنەکەی بینی و زۆرتر ترسا، بەڵام کوڕە گەورەکەی کە نیشتمانی لە پێشە خۆیەوە گرتبوو گوتی: ئەوە دەستت لەکوێ بە خوێن بووە؟ دەستت بریندارە؟

... چەند جارێک دەم و زمانی جووڵاندن، بەڵام لە لوغەلوغ بەملاوە هیچی دی بۆ دەرنەدەکرا، سەری بۆ ئاسمان بەرزکردەوە، هەموو باڵندەکان بەهێمنی تێک دەسووڕان و بەرەو زەوی نزم دەبوونەوە،.. باشووکەیەک لە ئاسمانا پەلاماری فەرەندەیەکی پەڕ ڕەنگینی دا، باڵندە پەڕ ڕەنگینەکە، باشووکەکەی بەدواوە بوو؟ خۆی کوتایە ژێر دەست و پێی شەوچرا، هاواری کرد: نەکەی... نەکەی... وازی لێ بێنە».ل١١٦-١١٨.

هەزاران هۆکاری جۆراوجۆری وروژێنەر لە دەوروبەری مرۆڤدا هەن، هەندێکیان خۆشین و بڕێکیشیان ناخۆشین، بەپێی هێز و شوێن و کاتەکانیان کار لە مرۆڤەکان دەکەن. کە ئادەمیزاد ڕووبەڕوویان دەبێتەوە کاردانەوە و وەڵامدانەوەی دەبێت، وەڵامدانەوەکانیش بە لایەنی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤیەوە، کار لە کەسایەتی تاک دەکەن، لێرەدا سەرەڕای فشاری خەم و ترسێکی تۆقێنەر، کە بوردومانی فڕۆکە و دیمەنی زۆر تراژیدی چەندین کارەساتی ترسناک و دڵتەزێن دەبینێ، بەرگەیان ناگرێت و لە ئەنجامدا زمانی بۆ ماوەیەک دەبەسترێت، دواتریش کە باڵندە پەڕ ڕەنگینەکە لە ترسی دوژمنە ستەمکارەکەی خۆی، هانای بۆ دێنێت، (وەکو خۆی دێتە بەرچاو و هەست بە هەموو ترس و ئازارەکانی دەکات) و ئەویش دەسەڵاتی بەسەر دوژمنەکەی ئەودا دەشکێت، هێز و توانای دێنەوەبەر و لە خەمی باڵندەکەدا بەبێ دەستی خۆی ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێ خۆی و خەمەکانی خۆی لەبیر دەکات و هەموو هەستەکانی ڕووبەڕووی دەربازکردنی یەکێکی لەخۆی بێ دەسەڵاتتر دەکاتەوە، لەو کاتەدا بەزەیی هاتنەوە و دەمارگیرانەکەی دەیهێننەوە سەر دۆخی جارانی و دووبارە زمانی دەکرێتەوە. لەم چەند دیمەنەدا لایەنەکانی هونەری و دەروونزانی و ژیانی ڕاستەقینەی کەسەکان و خەیاڵ زۆر بەهرەدارانە تێکهەڵکێش کراون و خراونەتە نێو تابلۆکانەوە!

زمانگیرانی مینە: «باوکی ئەم کیژەش لە حەژمەتان، حەفت مانگی پڕ، زمانی بەسترا، چەند باوکی من لە گۆڕستانێ هاتەوە و چووە ناو ئاوەدانی و قسەیەکی کرد ئەویش هەر هێندە، ورتەیەک چییە لە زاری نەهاتە

دەرێ، چەند دوعا و نوشتەمان بۆکرد، کن سەد چاک و پیران... لە دختۆری دونیاتیمان گێڕا، داو و دەرمانی دختۆر و حەکیمان نەما بەدەمیەوە نەکەین. خودا و قورئانی پیرۆز و (شێخی باڵەک) کردیان، هوردە هوردە هاتەوە سەرەخۆ.»ل٧٥.

**دەست و پێ شکان:** کە ترسێکی زۆر گەورەی وەک ئیزرایل شاڵاو بۆ مرۆڤێکی ترسنۆک یا گیانداریکی دیکە دێنێت هەست و هۆش نەتوانن بەرگری بکەن، ئەوا کاردانەوەکە ئەوەندە پڕ تەوژم دەبێت کە ئیتر مێشک و جەستە وەک پێویست ناتوانن ڕەفتار بکەن بەڵکو هێزی جوولانەوە و هەڵاتنیشی نامێنێت، وەک ئەوەی مشکێک پشیلە بگاتە سەری و دەرفەتی ڕاکردنی نەمێنێت، ئەم ورەبەردان و قەڵەمشکانەش هەر بەهۆی کاریگەری ژینگەکەوە تووشی دەبێت: «دزە بچکۆلەکەیان کە هاوتەمەنی برایەکەی من دەبوو. قەڵەمی دەست و پێی شکا. وەک دوو برایەکانی نەیتوانی بەسەرچیلەکەدا سەربکەوێت و دەرباز بێت، کەوتە بەردەستم، کە دارێکم لە گێزەرەی ملی دا، دەمی هێندەی دەمی حەزیایەک بەش کردەوە، هاواری لێ هەڵستا: «بابەڕۆ کوشتمی، (کاکە گورگۆ) بەجێم مێلە مردم..»ل١٧٩.

«چەند جار سەربازمان لە شەڕگەدا بە دیلی گرتووە، ساغ ساغ بووە، بەبێ زامدار بوون و ئازار پێگەیشتن، چۆن وەک منداڵە بچووکە دزەکە. هێزی ئەژنۆی شکابوو توانای ڕۆیشتنیشی نەبووە.»ل١٧٩.

**بێباکی (العبثیة واللامبالاة)**

کە بەسەرهاتێکی زۆر دڵتەزێن بەسەر مرۆی بێ ورە دێت وەک کەسێکی زۆر خۆشەویستی بمرێت یاخود چارەنووسێکی ڕەش و بێچارە بەرۆکی بگرێت ئەوا بەرچاوی لێڵ دەبێت و بڕوای بە دوارۆژ نامێنێت و بایەخ بەهیچ شتێک نادات: چەندین تاوانی زۆر گەورە ڕووبەڕووی شێخۆ دەکەنەوە کە ئەنجامەکەی لە سێدارەدانە، بەڵام ئەو بەبێباکی وەڵام دەداتەوە: «شێخۆ نکوڵی لە هیچ کردەوەیەک و تاوانێکی نەکرد بەبێباکیشەوە گوتی:

من چەند زۆرداری و ستەمم کردووە، ئەم خەڵکەش دە ئەوەندیان لە ئاستی مندا کردووە، من لە منداڵیشمدا تامی خۆشی و خۆشەویستیم نەکردووە، بەشی من هەر چەوساندنەوە و سەرکوتکردن و ئازارچێشتن بووە.. تەنیا ساتێکیش ئاسوودەییم نەدیوە، هیچ بوونەوەرێکیش هەستی بەهاوار و ناڵینم نەکردووە، ئەم خەڵکەی دەوروبەرم هەمیشە بە چاوی زڕدایک دەنوارنە من و بە دەستە ئاسنینەکەی ئەویش سیخورمە لە دڵ و دەروونم دەدەن، ئەگەر هەستم بکردایە هێندەی سەگێک خۆشیان دەویم هەڵبەتە منیش خۆشم دەویستن و هەرگیز بیرم لە تۆڵەسەندنەوە نەدەکردەوە»ل٢٠٨-٢٠٩. «ئەگەر بە کوشتنی منیش کارتان ساز دەبێت چش لە من، من هەر لە منداڵییەوە کوژراوم و هەموو ڕۆژێکیش دەکوژرێم و دەکوژرێمەوە»ل٢٠٤.

ئەم بێباکییەش لە یادگەی مرۆڤدا شتێکی کاتییە، بەرەبەرە لەبیر دەچێتەوە، لەبیر چوونەوەی ڕووداوە ترسناک و دڵتەزێنەکانیش بەخششێکی خواییە، ئەگەر نا ژیان بەردەوام نەدەبوو، چونکە مرۆڤ بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەرگەیان ناگرێت، کاریگەری و لە بیرچوونەوەی ئەم شتانەش بەپێی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و بارودۆخی خێزان و گونجان و گوزەران و باری ئابووری و... هتد لە تاکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێت.

## چەندین بابەتی دیکەی دەروونزانی

**منداڵان لاسایی گەوران دەکەنەوە:** کە کاری ڕۆژانەی کۆمەڵگەکەمان چەکداری و کوشتن و برین و زۆرداری بێت، منداڵەکانیش کە چاودەکەنەوە و دەوروبەری خۆیان دەبینن و چاو لە گەورەکانیان دەکەن، ئەمەشیان گیروگرفتەکانی کۆمەڵگەکە ئاڵۆز و دژوارتر دەکات، حەزی چەکداری لە ناخیاندا گەشە دەکات و بۆ چارەسەرکردنی تەنگو چەڵەمەکانیان بیر لە بەکارهێنانی چەک دەکەنەوە. ئێستاشی لەگەڵدابێت منداڵانی کورد، نەک تەنیا داوای کڕین و بەکارهێنانی چەک دەکەن، بەڵکو لە باخچەی ساوایان یان لە قوتابخانەی سەرەتایی کە داوای وێنە و نیگاریان لێ بکەن، ئەوا یەکسەر وێنەی زرێپۆش و تانک و فڕۆکە و مەترەلۆز و چەکی دیکەدەکێشن، ئەمەشیان ڕەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵگەی کورددەواریمانە، کە هەر شەڕ و تۆقاندن و جۆرەها چەک لە دژیا بەکارهێنراوە.

«منداڵە نێرینەکانی دێ، یەک و داریان بە دار و تیلمە پەڕۆ بەستابوو، وەک تفەنگ کردبوویانە شانیان، وەک شانۆگەرییەکیان دیتبێ و ئەوان دووبارەی بکەنەوە، دەستیان بە وازی کرد، بوون بە دوو بەش، بەشێکیان زۆر و بەشێکیان کەمتر، بەشە کەمەکە بەڕاکردن چوونە سەر بڵندایییەکەی پشت گۆڕستانە بچووکەکە. خۆیان لە بۆسە داگرت، ئەوانی دیکەش لە سێ لاوە بە پارێز، بە خشێن و چوار چنگە بۆیان دەچوون، ئازاد و ڕزگار پتر تێیان ڕادەمان، نەیان دەزانی چی دەکەن، بەڵام لاسایی ئەوانیان دەکردەوە، کاتێک هاواریان لێ هەڵسا: بیگرە،

کوڕە بیکوژە، لێیدە، دەربازی نەکەی، نیشانە لە کەللەی سەر و دەفەی سنگیان بگرن..

دار تفەنگۆکەکانیان بەرامبەر یەک ڕادەگرت بە دەم هاواریان دەکرد، «تە.. تە.. تە..، کوشتم ئەرێ بەخوای من کوشتم» دواتر خۆی بە زەویدا دەکێشا وەک ئەویش پێکرابێ، یەک دوو جوولەی دەکرد، ئەویش خۆی دەمراند، هێندێک لەزۆرەکان وەک تانک دەیان نەڕاند، سمکۆڵیان دەکرد: گڕ گڕ گڕ، بەمب.. بەمب. (بە دەنگێکی بەرزتر) گە گە گە.. زۆری نەخایاند زۆرەکان شکان، بڵاوەیان کرد، بە ڕاکردن بۆ دواوە گەڕانەوە، دووانیان بە دیل گیران.. دوایی هەموویان سەرلەنوێ کۆبوونەوە، گیراوەکانیان دادگایی دەکردن.. هتد»ل١١٩.

بەڵام لە دادگاییکردنی منداڵەکاندا بەزەقی دیارە کە لە ئاستی هۆش و بیری ئەواندا نییە، نووسەریش درکی پێکردووە و پاساوی بۆ هێناوەتەوە کە دەڵێ: «وەک لاسایی دادگاییکردنێک بکەنەوە کە بە چاوی خۆیان لە بارەگای (پ. م.)ەکانی گوندەکەیاندا دیبییان.»ل١١٩. لە شێوەزاری منداڵەکانیش وا پیشان دەدات کە شارە دێیەکە ماڵی غەوارە و هەڵاتووی تێدایە.

**بیرکردنەوەی منداڵانە:** نووسەر بە تەواوی بوویتە ئەم کچکۆڵەیەی کە هەموو جیهان بریتییە لە خۆی و لانکۆڵە و بووکۆکەکەی و داپیرەی: «بەشەرمێکی منداڵانەوە گوتی: مامە! ئەتۆ کیژێکی جوانت هەیە؟ مامە کیژی تۆش لانک و بووکۆکەی هەیە؟... مامەی خستبووە ژێر نشتەری پرسیاران، کاتێک سەری لەمامە خوار کردەوە و گوتی: مامە ئەوە بۆ دەگریێی؟ کێ لێی داوی؟! بە دایکم بڵێی لێی دەداتەوە،»ل١٠٦.

نووسەر کە باسی جیهانی منداڵان دەکات و بە لانکۆکە و بووکۆکە و داپیرەی دەست پێدەکا، سەرەتای دەست پێکردن و ژیان و بنیادنانی کەسایەتییە، لێرەدا بە گەشبینی و خۆشییەوە دەڕوانێتە ژیان، کەچی یەکسەر کاتێک سەر لە مامە خواردەکاتەوە، مامە دەگری، ئەمەشیان لایەنێکی دیکەی ژیانە، کە ناخۆشییە، ژیان (تاڵی و شیرین)یە، بۆیە دەبێ نەوەکانمان وا پەروەردە بکەین کە بەرگەی هەردوولایەنی (خۆشی و ناخۆشی) بگرن.

بۆ جوانکاری بابەتەکە وا پیشان دەدات کە سروشت و دەوروبەری مرۆڤەکان هەست و نەستیان دەردەبڕن و بەشداری خۆشی و خەمناکییان دەکەن، نموونەش: «دار و دیواری شارەکە، قەڵات و بازاڕەکە لە خۆشییان گەشابوونەوە و هەڵدەپەڕین» ل٢٤. «خوڕەی ئاوی چەمەکە بوو بە ئاوازێکی غەمگین، سەردوولکەیەکی بەسۆزبوو، شەهیدێکی بێ نازی دەلاواندەوە، هەرچەندە شەپۆلی نەپساوەی رووبارێک دەبینم، خەبات و کۆڵنەدانی تۆم دێتەوە یاد. هەرچەندە هاژەی نەبڕاوەی چەمێک دەبیستم، بە هاوار و هاندانی تۆی دەزانم.»١٣٨.

«تۆو بەهۆی خاک و ئاو و بارودۆخێکی لە بارەوە چەکەرە دەدات، چەکەرەکەش دەبێتە ڕەگ و قەد و گەڵا، ڕەگ بە ناخی خاکدا دەچێتە خوارەوە و لەگەڵیا تێکەڵاو دەبێت و لێی جیا نابێتەوە، قەد: گەڵا و گوڵ دەردەکات، گوڵ دەبێت بە بەر، بەریش دەبێتەوە تۆو!!.. خاک وڵاتە، ڕەگ و قەد و گەڵا گەلە، گوڵ خوێنی ئاڵی شەهیدانە، بەر، سەربەستی گەل و نانی ڕەنجدەران و ئازادیی نیشتمانە..»ل١٣٨.

**هەستی شەشەم**

«شێرکۆ! دایکت بۆ نەهاتەوە؟ ئەو دەیگوت ئەمن بەخۆم مامانی کیژی خۆم دەکەم، دڵم دەڵێ هیوای کوڕم لەگەڵ دایکت گیراون.. وەختە بۆ هیوا شێت ببم، دەمەوێ گوێم لە دەنگی هیوا بێت، ببینم، ماچی بکەم، حەزدەکەم لەبەر چاوما هاتوچۆ بکات، دەمەوێت دواجار بیبینمەوە، دەزانی دڵم چەند تەنگە؟ نازانم هەستی شەشەم بوو یا پەیامێکی نهێنی دەروونی بوو، لەگیانەڵا هەواڵی گیرانی هیوا و دایکی شێرکۆی پێ گوتبوو... چونکە لە ڕاستیدا ئەوان لە هەولێر زیندانی کرابوون و سەردانیشیان قەدەغە بوو.»ل٩٠.

**نواندنی کەسایەتی و جیاوازی چینایەتی:**

ئەگەر سروشتی مرۆڤایەتی لە دید و بۆچوونی هەردوو زانای کەسایەتی (باندروا و ولترز) شیتەڵ بکەینەوە کە جەخت لەسەر کرداری فێربوونی زانیارییەکان لەنێو کۆمەڵگەدا دەکەنەوە و کاریگەرییەکانی دەرەکی و ناوەکی (خودی) بە یەکەوە پەیوەست دەکەن و واشی بۆ دەچن کە خەڵکی هان نەدراون هێزی زگماکیان (سگەخوو- غەریزە) بەرجەستە بکەن (بە پێچەوانەی «فرۆید» کە وای بۆ دەچێ) هەروەها پێویستییەکانی گەرەک نییە (بە پێچەوانەی بۆچوونی «ماسلو».).

ئەو ڕەفتارانەی خەڵک پەیڕەوی دەکەن بریتین لە تێبینی کردن و لاساییکردنەوەی ڕەفتارەکانی خەڵکانی تر (صالح، ١٩٨٨، ل٢١٨). (باندروا) وای بۆ دەچێ کە مرۆڤ توانای هێنانەکایەوەی ژینگەی تایبەتی هەیە، هەتاکو ئەگەر بەشێوەیەکی پچڕپچڕیش بێت. کە فێری

ڕەفتاری خەراپ دەبێ هەروەکو فێربوونی ڕەفتار و داب و نەریتی باشە وایە. هەردوو جۆرە ڕەفتار لە ژینگەی کۆمەڵایەتییەوە بە هەمان شێواز فێردەبێ (صالح، ١٩٨٨، ل٢١٩).

لە بەشی (مار پێیوەدا) لە ل١٨دا، کە باسی ڕوخسار و جلوبەرگ و شێوەی دەموچاوی (نەنە) دەکات، بەشێوەیەکی ڕێک و پێک کەسایەتی (نەنە) پیشان دەدات. دواتر جیاوازی چینایەتی (ئاغا و کرمانج) دەردەخات و ئاوڕێکیش لە لایەنی کۆمەڵایەتی دەداتەوە. دواتر بەدوای ئەمە باسی لایەنێکی تری ژیان دەکات، ئەویشیان (ڕەشبینی)یە و لە پاڵ ئەمەشدا بایەخی بە هەڵچوون داوە کە لایەنێکی گرنگی دەروونییە بەتایبەتی (گریان)، هەروەک شانۆنامەیەک ئەم دیمەنە دەنوێنێت.

**بەها کۆمەڵایەتییەکان:** لە بەشی ٦- یاسای جەنگەڵدا دەڵێت: «بەگاڵتە پێکردنێکی ساردەوە: ئێمە خۆمان بۆ خاک و گەلەکەمان بەخت کردووە، پیاو کە بەسەربەستی نەژی، مردن بە پارە بکڕێ باشترە... هتد» ل١٠٣.

چەندین بەهای گرنگی کۆمەڵایەتی بە (گاڵتە پێکردنی ساردەوە) دەخاتە ڕوو... دیسان دەبێ ئەوە بزانین کە ژیانی کۆمەڵگەی کوردەواری و بارە کۆمەڵایەتییەکەی خاوەن چەندین بەهای بەنرخن، وەکو دەڵێ: «کە پیاو بەسەربەستی نەژی بمری باشترە» یا وەکو پەند و قسەی نەستەقی کوردی هاتووە: «بەرخی نێر بۆ سەر برینە»، «پیاوی ئازا هەر جارێک دەمرێ، بەڵام ترسنۆک هەموو ڕۆژێ جارێک دەمرێ»، «کەم بژی و کەڵ بژی»... لە بەها ئاینییەکانیشەوە دەڵێ: «خۆشەویستی نیشتمان لە باوەڕەوەیە».

«حوسێنە فەندی: هەندێک هەرچی و پەرچی بێ سەروبەر، هەڵپەهەڵپێک دەکەن، چەند کەسێک بەتراندن دەدەن و ماڵی برێکیش کاول دەکەن (بە دەست و بە دەم) هی ئەم دیوە دەبنە نۆکەری ئەو دیوی هی ئەو دیویش دەبنە کرێگرتەی ئەم دیوە. لە دواییشدا، تێک بەردەبن و یەکدی دەخۆنەوە.»ل٣٩.

**پروپاگەندە و شەڕی دەروونی:** ڕۆماننووس لێزانانە مامەڵەی لەگەڵ پروپاگەندە کردووە: «لەم دواییەدا لە بیانوویێک دەگەڕان لەنێویان ببەن، زۆر بەنهێنی بردنیان و لە شیوێک لەولای سەربازگەکەوە لە دوو دار چناریان بەستانەوە ئینجا شێخۆیان نارد ئەویش کوشتیانی و چاوی دەرهێنان و ئەندامی نێرینەیانی برین و خستنیە نێو دەمیانەوە و چەکەکانی بردن و بە دەستگەرمیش چەند دەسترێژێکی ڕووەو سەربازگەکە کرد، ئینجا بەرەو چیا بۆی دەرچوو..

هێزێک لە سەربازگەکەوە بەرەو شوێنی تەقەکان چوو و تەرمەکانی هێنانەوە. سەربازانی سەربازگەکەیان کۆکردەوە و کەوتنە هاندان و تووڕەکردن و ڕکیکردنەوەیان... جار جار بە ڕقەوە و جار جاریش بەسۆزەوە بە بەرزەگۆ هاواریان دەکرد: بڕوانن! بڕوانن! بە چاوی کەللەی سەری خۆتان ببینن، تاوانبارە نیشتمان فرۆشەکان دژی مرۆڤی عەرەبن، لە پێناوی ئاغا بیانییەکانیاندا تاوانی ئەوتۆ ئەنجام دەدەن کە مرۆڤ لە ئاستیدا شەرمەزار دەبێت. ئەوەی دەستی نەچێتە.. ئەوانە ئاگر پەرست و بێچووە جندۆکەی شەڕانگێزن، چەتە و ڕێگر و ئاژاوە چین، بە هەموو ئاینێک کوشتنیان غەزایە.» ل١٨٩- ١٩٠.

لێرەدا ڕۆماننووس لە ڕووی دەروونزانییەوە زۆر جوان پروپاگەندەی لە شوێنی خۆیا بەکارهێناوە، ئامانجەکەشی وەستایانە پێکاوە، ئامانج و بەرژەوەندی دوژمن لەوەدابووە کە زیانەکانیان دیزە بەدەرخۆنە بکەن و ئامانج و مەبەستە ڕاستەقینەکانی ناخیان داپۆشن، لە هەمان کاتدا، بە زمانی لووس و دروشمی ڕەونەقداری بە درۆ و بێ ناوەرۆک بە شان باڵی کورد هەڵبدەن و بە هاوڵاتی خۆیان و دڵسۆزی نیشتمانیان ناوبێنن، لە لایەکی دیکەشەوە وا پیشان بدەن کە کوشتنیان بە هەموو ئاینێک غەزایە، بۆ ئەوەی خەڵکی ساویلکە و سادە دەست لە پاکتاوکردنیان نەپارێزن، ورەی دوژمنەکانیان برووخێنن و ورەی لایەنگرەکانیان بەرزبکەنەوە و دەوروبەریشی پێ چاوبەست بکەن، ئەم پەرەگرافەی خوارەوەش بۆچوونەکان دووپات دەکەنەوە:

«عەدنان خیراللە تولفاح وەزیری بەرگری ئێراق لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەگەریدا دەڵێت: کوردەکان هاووڵاتی خۆمانن و دڵسۆزی نیشتمانن، بەڵام چەند بەدکارێک کە کرێگرتەی زایۆنیزم و هاوپەیمانەکانیانن بەناوی کوردانەوە دەیانەوێت گێرەشێوێنی بکەن و ئاژاوە بنێنەوە، بەم زووانە ئەم گومڕا و ئەڵقە لەگوێیانە لەناو دەبەین و سوپاکەشمان زۆر لەوە بەهێزترە کە پێویست بەبەکارهێنانی چەکی کیمیایی بێت.»ل٧٥-٧٦.

«هەر لە هەمان نیوەڕۆوە بۆ هەڵستاندنەوەی ورەپێوی هێزە داهێزراوەکەیان، ژن و پیاوە کۆچەرییەکە و شێتە کەرولاڵە درێژەکە و دوو تەرمی دیکەش، هەر پێنج تەرمیان بە لوولەی تۆپی پێنج تانکانەوە هەڵواسین و لەگەڵ حەفت تانکی دیکە و چەند لۆری (ریۆڵ)ی پڕ سەرباز، بە هەراوهۆریا، بەناو سەربازگە گەورەکەدا هاتنە خوارێ، بە مەبەستی داپۆشینی زیانی خۆیان و چاوشکاندن و ڕووخاندنی خەڵکی ناوچەکە، ڕووەو شارە

بچکۆلە دڵتەنگەکە، بە نەرەنەڕ و گۆرانی و هەڵپەڕین ڕێیان گرتە بەر، ڕوویان کردە شارێیە سەرەکییەکەی ناوەندی شارۆچکەکە، بە بەرزە گۆ:

هاووڵاتییانی دڵسۆز! مژدەیەکی خۆش.. مزگێنی و سەرفرازی سەرکەوتن، وەرن بە چاوی خۆتان ببینن، بە هەموو هەستەکانتان بڕوانن، ئەم کەلاکە تۆپێندراوانە! ئەم بکوژ و تێکدەرانە، کە بە فیکەی ئیمپریالیزم و بە زوڕنای بیانییەکان و بە دەهۆڵی کۆنەپەرستان و ئاوازی دوژمنانی گەل و نیشتمان و نەتەوەکەمان هەڵدەپەڕن..»ل١٦٨. «ئەگەر ئەم خۆفرۆش و دەستە بەکرێگیراوانە نەمێنێن، میری نیشتمانی وڵاتەکەمان دەکاتە جوانترین و خۆشترین سەیرانگە و دڵگیرترین بەهەشتی سەر زەمین، بە دڵنیاییەوە دەڵێین، بە تەفروتووناکردنی ئەم تاقمە ناپاکە ئێمە و ئێوە، ئاسوودە دەبین..»

شەڕی دەروونی لە جیهانی ئیمڕۆدا بایەخێکی تایبەتی زۆر گرنگی هەیە، وێڕای ئەمە نووسەر بە قووڵی لە واتای هەڵسەنگاندن گەیشتووە و دەزانێ کە هەڵسەنگاندن لووتکەی تێگەیشتن و وەرگرتن و پیادەکردنی زانست و شیتەڵکردن و پێکهێنانە، مرۆڤیش لەمیانی هەڵسەنگاندنی بابەتییانەوە دەتوانێت بڕیاری گونجاو دەربکات. ئەمەشیان ڕاستەوخۆ لەگەڵ قووچەکەکەی بلۆم و هاوڕێکانی (١٩٥٦) یەک دەگرێتەوە کە ڕەهەندی زانیاری ژێری بەسەر ئەم شەش ئاستەی خوارەوە دابەش کردووە:

١- زانیاری. ٢- وەرگرتن. ٣- پیادەکردن. ٤- شیتەڵکردن. ٥- پێکهێنان. ٦- هەڵسەنگاندن.

**بڕوانە هێڵکاری قووچەکەکەی بلۆم**




**بیرتیژی و گێڕانەوە:** بیرتیژی و گێڕانەوە، بابەتێکە لە بابەتە گرنگەکانی دەروونزانی کە پێوەندی بە (یادگە)وە هەیە، سێ جۆرە یادگە هەیە: (یادگەی هەستی و یادگەی کورتخایەن و یادگەی درێژخایەن). نووسەر بۆ گێڕانەوەی دیمەن و ڕووداوە دڵتەزێن و خۆش و ناخۆشەکان پشتی بە هەر سێ جۆریان بەستووە.

لە (بەشی ١٠- هێزی نارەوا ئەژنۆ شل و بێ هەناوە) دەڵێت: «کە ماڵمان لە دێیەکەی خۆماندا بوو، هێشتا خوێندنی سەرەتاییم تەواو نەکردبوو. هاوینان لەم تاریک تا ئەو تاریک، لەناو باخەکەماندا خەریکی زەوی کێڵان و کێڵگە بژارکردن و ئاوەدان و میوە ڕنین و سەوزە چنین بووین.. لای ژووری باخەکەمان تەلان بوو. داری هەنار و هەرمێ و هەنجیر و هەڵووچکە و گەراز و چەقەڵە باوی و سماق و دار مێو، جۆرەها داری بەردار و بێ بەری تێدابوو.. هتد. هەر چوار کەناری تەختاییەکە، دەکرایە کوولەکەی حاجی و کودی ئاوی و کاڵەکی نۆ مانگی. توولی کودییە ئاوییەکان زۆر درێژ دەبوون، بەسەر دارەکاندا هەڵدەگەڕان، کوولەکەی خڕ و مل درێژ و خواریان شۆڕ دەکردەوە. کە بۆ ئاوکێشان و بێچووە کەو بەخێوکردن زۆر نایاب بوون.»ل١٧٧.

بیرتیژییەکی تێدایە کە وردەکاری ڕووداوەکان بە ورد و درشتەوە دەگێڕێتەوە، هەروەک دەزانین یادگەش کردارێکی ژیرییە و لە ڕوانگەی ئەوەوە تۆمارکردن و پاراستن و مانەوە و گەڕاندنەوەی زانیاری و شارەزایی پێشوو لە شێوەی بیرۆکە و مەیل و درک پێکردن دەگێڕدرێتەوە. جگە لەمەش (یادگە) بە کۆمەڵەی بنەڕەتی چالاکییەکانی ڕەهەندی زانیاری و ویژدانی و جوولەیی دادەندرێت، هەر شتێکیش مرۆ ئەنجامی بدات پشت بەم یادگەیە دەبەستێت! ڕۆماننووس لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا زیرەکانە سوودی لە یادگەی منداڵی و هەرزەکاری و گەورەیی وەرگرتووە:

«ئاخ خ خ... هەرزەکاری، چەند پڕ گڕ و گوڕی چۆشی، ئەوەندەش پڕ شەرمەزاری.. خانوویەکی گەورە لە بەرد و قسڵ دروست کرابوو، دوو بەش بوو. بەشێکیان ڕووی دەرگای حەوشەکەی لە گۆڕەپانەکە بوو، بەشەکەی دیکەشی ژوورێک و هەیوانێک و ناندینێک بوو، دوو دەرگای هەبوو دەرگایەکی بچکۆلەی دەیڕوانییە کۆڵانە تەنگەبەرەکە. دەرگا گەورەکەشی لە تەنیشت دەرگای بەشەکەی دیکە بوو، پیرە دارتوویێکی زۆر گەورە، لەنێوان هەردوو دەرگاکاندا هەبوو، بەهاران ئەوەندە ڕەشەتووی دەگرت، هەرچەندی منداڵی گەڕەکەکە لێیان دەخوارد بنی نەدەهات، بە ڕاستی مزر و خۆش و بەتام بوو، منیش وا ئێستا بێزووی بۆ دەکەم، بووبووە لیسی چۆلەکە و کوکوختییان، چەند بێچووە چۆلەکەمان لەسەر دەکوشت. زستان و هاوین لەگەڵ ئەودا جۆڵلانەمان لەسەر هەڵخستبوو، هاوتەمەن و هاوپۆل بووین، نیوەی تەمەنی منداڵیمان بەیەکەوە لەژێر ئەم دار تووە بەسەر بردووە. ڕۆژێک کاتی تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ بوو، زوو هاتینەوە، کە گەیشتمە بن دارەکە، بینیم، توو زەوی ژێردارەکەی ڕەش کردووە، سەیرم کرد وا شەوچرا خەریکی

تو لێکردنەوەیە..هتد» ل٤٦. زۆربەی زانیارییەکان دەکەونە ژێر ڕەهەندی زانیاری ژیرییەوە، کە ئەویش لایەنێکی زۆر گرنگی کەسایەتییە.

**ڕۆڵی ژینگە:** لە بەشی «١١- شێخۆی خانە خراو» لە ل(١٨٩)دا باسی تۆڵەسەندنەوە لە لایەک و لەلایەکی تریشەوە دەستنیشانی گومان دەکات: ««لەکاتی خۆیدا ویستبوویان کوژرانی (مرێ)ی خوشکی شێخۆی بقۆزنەوە و شێخۆی نۆکەر بەناوی تۆران و تۆڵەسەندنەوە بنێرنە نێو یاخییە چەکدارەکانی چیا، بەڵکو چەند خەنجەرێک لە دواوەڕا بوەشێنێت، بەڵام دەبێت کارێک بکات ڕابردووی ڕەشی خۆی لە چاوی ئەواندا بسڕێتەوە و بروای پێبکەن.»

لە ل٦٥ و ٦٦دا شۆڕدەبێتەوە و ڕۆڵی کاریگەری دەوروبەر (ژینگە) لە دروستبوونی کەسایەتی شێخۆ دەنوێنێت، «شێخۆ، کەچەڵێکی ڕیویلەی ڕەنگ تەڵخ..» (پێشتر تۆمارمان کردووە) وەستایانە لەم بارەیەوە مامەڵەی لەگەڵ ڕووداوەکان کردووە، چونکە لە ڕووی دەروونزانییەوە دوو هۆکاری زۆر گرنگ (بۆ ماوەیی و ژینگەیی) هەن کە کار لە دروستبوونی کەسایەتی دەکەن. ئەمەشیان خۆی لەخۆیدا گرنگی و بایەخ پێدانە بە دەروونزانی. ناتوانرێت ڕێژەی (٪) کاریگەری هەریەک لەم دوو هۆکارە (بایۆلۆژی و ژینگە) بە تەواوی دەستنیشان بکەین، بەڵام هۆکاری بۆماوەیی لە سەرەتادا کاریگەری پترە. لە دوای لە دایک بوونیش نابێ ڕۆڵی دەوروبەر لەبیر بکرێت، کە مرۆ دەورووژێنێت و زۆر کار لە کەسایەتییەکەی دەکات.

**خاوەن باوەڕ نابەزێت و نارەوایی هەرەس دێنێت:** لە لاپەڕە (٢١٦)دا دەڵێت «لە دۆڵ و بناری چیاکاندا ڕەوە تانک و زرێپۆش و لۆری سەربازی، لە پێدەشتەکانیشدا تۆپی نەمساوی و ڕاجیمە و ڕۆکێت بە ژمار نەدەهاتن. پۆلە فڕۆکەی جەنگی لە جۆری مێگ و سیخۆی و تۆبۆلیف و...، کۆیتەری سەمتی پەروانەداری گواستنەوە وەک داڵ و سیسارکە کەچەڵ بۆ کەلاک بە هەموو لایەکدا دەسووڕانەوە و نەڕەیان دەهات، سەربازی پیادە و سوارە لە گشت شوێنێکدا وەک شارە مێرووڵە لە جوولەدابوون. دیمەنەکەی پتر لە جەنگێکی جیهانی، یا لێکدانی نێوان دوو دەوڵەتی زلهێز دەچوو، بەڵام بە شەڕی ناوەخۆی نێوان میری نیشتمانی و بەرهەڵستکارانی خۆفرۆش ناو دەبرا.»

دیمەنەکان بە ڕاشکاوی دەری دەخەن کە ڕژێمێکی دەسەڵاتداری نەتەوەپەرستی توندڕەو دەیەوێت ناسنامەی نەتەوەیەکی بێ پشتیوانا بسڕێتەوە.. بەڵام لە هەمان کاتدا دەری دەخات کە نەیانتوانیوە و ناشتوانن ئامانجە گڵاوەکانیان بێننە دی:

«لە کاتێکدا بادەی سەرکەوتنی دوا هێرشیان دەنۆشی و دەگەڕانەوە، داربەڕووە سووتاوەکانیان بینی شەخەڵیان داوەتەوە، لە گوندە چۆلکراوەکان و لە کێڵگە و لە شارەکانیشدا شەڕی پارتیزانی لە هەموو لایەکەوە بەشێوەیەکی توندتر دەستی پێکردووتەوە، قوڕگیان تاڵ بۆوە و نائومێدییەکی تاریک بەرچاویانی گرت و گەیشتنە ئەم بڕوایەی کە تاکو کەللە سەرانێک مابن و هەست بکەن ولاتیان داگیر کراوە و ئازادی و سەربەستییان لێ زەوت کراوە، ئەوا هەرگیز دوا هێرش بە چاوی خۆیان نابینن و ناشحەسێنەوە..»ل٢٣٦.

ئەگەر بابەتەکانی هونەری و زمان و جوگرافیا و مێژوو و.. هتدی نێو ڕۆمانەکە تۆژینەوەی لەلایەن شارەزایانەوە بۆ بکرێت، ئەوا پانۆڕامای ڕووداوەکان جوانتر دەردەکەون و نرخاندنی بەرهەمە ئەدەبییەکانیشمان پتر پەرە دەسێنێ.

**سەرچاوەکان:**


١- ئەبوبەکر، سەدرەدین نورەدین (٢٠٠٤) ڕۆمانی شەخەڵی داربەڕوو یا سنووری ستەم و ئازار، چاپخانەی کشتوکاڵ، چاپی یەکەم.

٢- چەند دانیشتنێک لەگەڵ ڕۆماننووس (سەدرەدین نوردەین ئەبوبەکر).

٣- دافیدوف، لندا. ل (مدخل علم النفس): وەرگێرانی سید طواب و ئەوانی تر، (١٩٨٣)، دار ماکجروهیل للنشر، چاپی چوارەم.

٤- الحفني، عبدالمنعم (١٩٩٥) الموسوعة النفسية- علم النفس في حياتنا اليومية، مكتبة مدبولي، چاپی یەکەم.

٥- صالح، قاسم حسين (١٩٨٨)، الشخصية بين القياس والتنظير، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي/ بغداد.



# نالی و فەلسەفەی جوانی (ئیستێتیکا)

د. عەبدوڵلا خدر مەولوود
(زانکۆی سەلاحەدین- کۆلێژی پەروەردە)

سروشت و جوانی و شیعر، جوانی و شیعر و سروشت، شیعر و سروشت و جوانی سێیانییەکی تێک ئاڵاون، لای نالی هەر یەکێکیان دووانەکەی تر تەواو دەکەن.

**ماعادلك البان ولا اللينة لينا**
**اذ عدلك الباريء حسنا و جمالا ٤٩**

واتە: ئەگەر باری تەعالا بە گەورە و مەزنی خۆی جوانی و شۆخ و شەنگی بە جوانێک ببەخشێ، دەبێ ئەو پەری جوانە بەچی بچوێندرێ؟ چ شتێک هەیە بتوانێ مونافەسە و ڕکەبەری لەگەڵ بەژن و باڵای، نەرم و نۆڵی، ناسکی و تەواوی لە ڕادە بەدەری بکا. لە زمانی ئەبوو حەبیانی تەوحیدی دەگێڕنەوە گوتوویەتی (قسە کردن لەسەر قسە زۆر زەحمەت و گرانە)«١». منیش دەڵێم قسە کردن لەسەر جوانی شیعرەکانی یا فەلسەفەی جوانی و جوانکاری لای نالی دەبێ چەند ئاسان بێ!!؟

نالی شاعیرێکی دەسەڵاتدار و بە توانایە، بەهرە و کەرەسەکانی شیعر لەبەر دەستی وەستاون و لە خزمەتی ئەودان لە هەموو ئەو بابەت و زانیارییانەی بە شێوە و ناوەرۆکی شیعرەوە پێوەندندارن.

**کوڕ تازووە تەڕ مادام سادە وەکو خوشکی بێ**
**ئەمما کە ڕووا سەبزە دیبا کوڕ و زیبا کچ ١٣٧**

لە دێڕە شیعرەکانی وەکو وشە و بە سێ زمان وشەی جوان هاتووە (جەمال)ی عەرەبی، (زیبا)ی فارسی، (جەوان)«٢» یا (جوانی) کوردی. بە دەیان وشەی تر بەرامبەر بە وشەی جوانی ڕاگیراون و بەکاری هێناون وەکو وشەی جوانی، هاو واتای، زۆر نزیک لە ئەو. ئێمە هەندێکیان پێش چاو دەخەین و دوو دێڕیش وەکو نموونە دەهێنینەوە«٣»:

**تۆ کە حۆری وەرە نێو جەننەتی دیدەم چ دەکەی**
**لەم دڵەی پڕ شەرەر و سینەیی سۆزانم دا ٤٦**

وشەی حۆری بەرامبەر بە جوان وەستاوە، لێکچوواندنی ئەو بە (حۆری) واتە مەحبووبەی نالی حۆریە، سەرەداوەکەی ئەو پێوەندییە تەنیا جوانییە و ڕێک بەرامبەر بە یەک لەنگەریان گرتووە.

**سەد حەیفە لەبۆ کەعبەیی حوسنت کە بەسەریا**
**نەجاشی خەتت هاتووە نەزدیکە خورووجی ١١٩**

لەو دێڕەش وشەی حوسن بە واتای جوان هاتووە و توانیویەتی شوێنی ئەو پڕ کاتەوە. نالی وەکو شاعیرێکی هەست ناسک، هونەرمەندێکی گەورە دیوانەکەی دەکرێ بکرێ بە گەلەرییەک و پێشانگای گەورە و تایبەتی و بەردەوامی تێدا پێشکەش بکرێ. وەک جوانی پەرستێک تابلۆ و نیگارەکانی بە هەرلاو گۆشەوە تەماشا بکرێ جێی سەرسوڕمانە و بینەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ. وێنە و تابلۆکان لای نالی ڕەنگاوڕەنگن، سروشتین، جاری وا هەیە ڕەش و سپین، وێنەیان تێدایە بە تەواوی جوانییەکەی لێ بەرجەستە دەبێ، هی واشی هەیە بە پارچەکردن یا هەر بەشێکی وەرگری جوانییەکەی لە دەست نادات. (هەر وێنەیەکی مەزن مێژوویەکی خۆی هەیە، ئەویش بەردەوام لە تێکەڵی و تێکچرژانی بیرو ئەفسانە دایە)«٤».

نالی خەمی گەورەی شیعر بووە، هەر بۆیە هەموو جوانییەکانی لە هەست و نەستییا هەبووە تەوزیفی دێڕە شیعرەکانی کردووە (ئامانجی «فەلسەفەی جوانی» یا زانستی جوانی گەیشتنە بە کەمال و تەواوی لە ڕێگای زانستە هەستییەکانەوە)«٥». هەموو ئەزموون و زانیاری و کەرەسەکانی شیعری کە لە بەردەستیدابوون تەنیا لە ڕێی جوانی و بەرزی دێڕەکانی خەرج کردووە. شێوەو ناوەڕۆک، هەریەکە و بەجیا، وێنەی هونەری شیعری کە تا دنیا دنیایە هەموو ساڵێک، بەڵکو هەموو وەرزێک کراسی خۆیان دەگۆڕن و یەکێکی زۆر جوان و قەشەنگتر لەبەر دەکەن. لە ترپە و کێش و هونەرەکانی ڕەوانبێژیش هەر مەپرسە. بۆ زیاتر ئاشنا بوون بە جیهانی جوانی نالی و جوانی پەرستییەکەی، بۆ هەر یەکێک لەو سەرە بابەتانە. وێنە و تابلۆ قەشەنگەکانی وەکو نموونە نیشان دەدەین. (شیعری مەزن کاریگەری زۆری بەسەر گیانی زەمانەوە هەیە)«٦». نالیش زمانزانێکی گەورە بووە، بە هەوەسی خۆی و بەپێی پێویستییەکانی جوانی دێڕە شیعرەکان جێگۆڕکێی بە وشەکان کردووە. وشە لەبەر دەستی نالی وەکو هەویر یا قوڕی خۆشکراو بووە، دێڕی هەیە بە وشەکان شێوەی بەسەر ناوەڕۆک لەنگاندووە یا بە پێچەوانە، دێڕی تری هەیە تەڕیی و لێوڕێژن لە وێنەی شیعری و هونەرەکانی ڕەوانبێژی... تاد. بەدەیان دێڕی هەیە تێیدا گرنگی بەشێوەی داوە، دیارە (ڕێک و پێک کردنی شێوەش خۆی لە خۆیدا بەهایەکی جوانکاری تەواوی هەیە)«٧».

**بێش و کەم بێ شکەم و حیرس، وەکو تیفلی ڕەزیع**
**زاویە بێشکەوم و، بێ شکم و بێ حیبەلم ٧٨**

ئەو دێڕەش بۆچوونەکەمان زیاتر بەهێز دەکا:

**بڕۆت هەر چین و پەرچەم چین لەسەر چین**
**ئەوەندە چینە قوربان پێم بڵێ چین ٨٦**

ئەو دێڕانەی نالی کە ناوەڕۆکی بەسەر شێوەکەیدا زاڵ کردووە:

**جامی تاقی مەیکەدە میشکاتی قەندیلی دڵە**
**شیشە پڕ قەرقەف لە ڕەفرەف شاهی عالی ڕەفرەفە ٩٧**

هەر بۆ ئەو مەبەستە دیسان دەڵێ:

**هەرچەندە گوناهی دەمەکەت بارە لەسەر لێو**
**حەددی چییە (نالی) کە بڵێ ماچە کەفارەت ٥٩**

هەر لە دیوانەکەی بەدەیان دێڕی تۆمار کردووە، کە ئاستی شێوە و ناوەڕۆکی تێدا پارێزراوە و بەچاوێک تەماشا کراوە:

**گوتی: (نالی) ئەتۆ بمرە ئەمن دێم**
**خوداکەی بێ خوداکەی بێ خودا کەی ١٢٦**

هەمان شت لەو دێڕەش کێشەکانی شێوە و ناوەڕۆک و زۆر لێک نزیکن:

**نەی کە ساحێب سڕڕە سەرتاپای بە ئایەی کون کونە**
**با تینی قیف قیف عەلا سڕڕی بە زاهیر قەف قەفە ٩٦**

جارێکیان دۆستێکم لە جوانی و قەشەنگی، ڕێک و عەجەبایی شارێک دەیگوت: هەر چۆنێک و لە هەر شوێنێک بە هەر شێوە و گۆشەنیگایەک تەماشای بکەی و بڕوانی دار و دیواری، باڵەخانە و شەقامەکانی، کووچە و کۆڵانەکانی وەک تابلۆ و نیگاری گەورەترین وێنەکێش و شێوەکار دێنە بەر هەستەکان و خۆشی و ئارامی بە گیان و دەروون دەبەخشن. هەر بۆیە (وای دەبینین کە وێنەی هونەری پردێک بێت لە نێوان گیان و سروشت هەروەها لەنێوان بە ئاگاو بووندا)«٨».

**لە خەوفی تەڵعەتی ڕۆژ هەر وەکو شێت**
**بە ڕوو زەردی هەڵات و کەوتە کێوان ٨٠**

شیعر و دێڕەکانی نالیش هەر چۆنی سەیر دەکەی لەگەڵ

وێنە و تابلۆکانی ئەو شارەی باسکرا هەر بەراورد ناکرێ، چونکە ئەوانەی ئەوێ وێنەکـان وشک و برینگ و بێ گیانن، بەڵام وێنە هونەرییەکانی نالی خوێن لە دەمارەکانیان دەگەڕێ و لەگەڵ مرۆ دێنە گۆتن و پێشدەکەنن.

**دەخیلت بم نەخیلی یا ڕوتابی**
**وەها شیرین و سینە نەرم و دڵ ڕەق ٦٩**

بۆ ڕەوانبێژیش دەڵێین گشت ئەو نموونانە و دێڕەکانی تری نێو دیوانەکەی لێوان لێون لە هەموو هونەرەکانی ڕەوانبێژی، دەبا نالی ئەو مافەی شیعری جێبەجێ بکردایە، لەبەر ئەوەی ڕەوانبێژی وەکو کۆڵەگە و ئەستوندەکانی تر شیعری کلاسیکی لەسەر وەستاوە.

ئەو نموونانەی سەرەوە نیشاندانێکی کورت و چڕ بوون بۆ ڕوانین و کەرەسەکانی جوانی لای نالی، کە بە ڕاستی هەموو تیشکەکانی چاوی دڵ و هەستەکانی لەپێناو جوانی و پێش چاوخستنی تا دوا هەناسەی لە کاردا بوونە. عیشق و جوانی، غەم و مەراق، نەمری و جاویدانییان بە نالی و شیعرەکانی بەخشیوە.

**بەریقەلبەسەر لەبەر بەرقی تەلەئلوئی لە ئالی**
**خەسەفەلقەمەر لە ئیشراق قیامەتی جەمالی ١٢١**

گریکەکان پێش ئەفلاتوون و ئەرستۆ ئاگاداری جوانی (جمال) بوونە و هەستیان پێکردووە لە نووسین و بابەتەکانیان باسیان لێوە کردووە، لە لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکانیشیان هاوشان لەگەڵ بابەتی تر وەک: چاکە و ڕاستی باسی کراوە (ترۆپکی گەشە و پێشکەوتنی بیرەکانی جوانی لەسەردەمی کلاسیک و ماوەی نێوان سەدەی شەش و سێی پێش زایین بە دەست هاتووە)«٩». وەک سەرچاوەکان ئاماژەیان پێکردووە گریکەکان هیچ زانیارییەکیان لەسەر جوانکاری واتە (ئیستێتیکا) نەبووە، بۆیە هیچ ئیشارە و هێما لە نووسینەکانیاندا نییە. ئیستێتیکا وەکو وشە و پاشانیش وەکو زاراوەیەک ساڵی (١٧٣٥) (باومجارتن) لە نووسینێکیدا بەکاری هێناوە«١٠».

لەبەر ئەوەی جوانکاری بابەتێکی تازە و کاریگەرە، تەوەر و لایەنێکی فەلسەفەش پێکدەهێنێ، ئەگەر بەتاڵە مووەکیش بێت بە هەموو دڵ و هەست و دەروونەکان لێک بەستراوە، بۆیە بیروڕاو بۆچوون لەسەر لێکدانەوە و پێناسەکردنی پانتاییەکی زۆری گرتووە، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت تێڕوانین و پێناسەکەی باومجارتن لە هەموویان زیاتر لە گیانی بابەتەکە نزیکتر و تەواوتر خۆیان دەنوێنن کە دەڵێ جوانکاری (زانستی تیۆرە زانیارییە هەستییەکانە)«١١».

**ئەڵلا ئەڵلا کە چ عەقڵ و چ کەماڵێکی هەیە**
**لەگەڵ ئەو عەقڵ و کەماڵە چ جەماڵێکی هەیە ١١٣**

ئەو جوانی و جوانکارییەی لە شیعرەکانی نالی دەتکێن و بە ڕووی هەستەکانی مرۆ دەتەقنەوە چێژ و خۆشی بە گیان و دڵ دەبەخشن و بە هۆش و دەروونیش وردی و ئارامی. بە ڕاستی ئەو نەک هەر وەک شاعیری ڕابەر و پێشەنگ و مەزن، بەڵکو وەک هونەرمەندێکی گەورە و بێ هاوتاش بووە. لە جۆر و بیرکردنەوەی زۆر ورد و هۆشمەندی بێ وێنەی.

لە تێڕوانین و تەماشای دەبێ چاوەکانی نالی چ جۆرە هاوێنە و زەڕڕەبینیان هەبووبێت بۆ ڕەسمکردن و وێنەگرتنی ئەو نیگار و وێنانە کە تا دنیا دنیایە نە تێکدەچن و نە ڕەنگیش دەدەنەوە. دەڵێن (نابێ دنیا «بەو شێوەیەی کە هەیە» باشتر و جوانتر و داهێنەرانەتر بێت لەوەی کە هەیە و پێش چاوە)«١٢». ئەو گۆتەیەش سێبەر یا ڕاڤەی ئەو فەرموودەیە کە لە قورئاندا هاتووە (... وخلق كل شيء فقدره تقديرا)«١٣». واتە (هەموو شتێ لە ڕادەی خۆی دروست کرد و ئەندازەی گرت)«١٤». باری تەعالا ئەو سروشتەی ئێمە و ئەو گەردوونە پان و پۆڕە بێ کۆتاییانەی خوڵقاندووە و دایەزراندووە، حسێب بۆ هەموو کار و جووڵە گەورە و بچووکەکانی دەوروبەر و چەرخ و گەردوون زۆر بە وردی کراوە، هەر بۆیە دڵ و هۆش و هەستەکان بە سەرسوڕمان و چاوی ئەبڵەقەوە تەماشا و سەیری دیاردەکانیان دەکەن. (ئەوەیان نموونەی ئەو شیعرەیە کەوا خۆشیمان پێدەبەخشێ، لەبەر ئەوەی ئارەزووی دلۆڤانی و دڵنەرمی مرۆڤ بۆ ڕێک هێنان و تەواوی دابین دەکات)«١٥».

**ئاسمانی حوسنی مەحبووبم بە ئەبرۆ و زولف و ڕوو**
**دوو هیلال و دوو شەو و دوو ماهی تابانی هەیە ١١٤**

نالی دێڕ و شیعری هەیە دەبێ لە سەرەوەی جوانکاری و حسێبی بۆ بکرێ، چونکە (زانستی جوانی- ئیستێتیکا- «وەک زانست» بایەخ بە دۆزینەوەی چییەتی جوانی دەدات، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی

ڕواڵەتەکانی جوانی فۆنیمەکانی «واتە یەکەکانی جوانی» لە بابەتەکاندا و جیاوازییەکانی لەلای مرۆڤ و سروشت، لە ڕواڵەتەکانی دیکەی ژیان)«١٦». گەنجینەکانی ئەو بە چ پێوانە و تەرازووەک بکێشرێ بۆ سەوداکردن و ئاڵوگۆڕکردنیان.

**هەناسەم زولفەکەی لاداو و مەیلێکی نەکرد چاوی**
**نسیم ئەنگوت و شەو ڕابرد و نێرگس هەر لە خەودایە**
**١١٣**

پاش خوێندنەوە و هەڵگێڕ و وەرگێڕکردنی سەرچاوەکانی بابەتی جوانکاری (ئیستێتیکا) یا هەر وەکو قوتابخانەیەکیش ئەگەر سەیری بکەین دەبینین دامەزراوێکە بۆ جۆشدان و تازەبوونەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێ و ڕێبازی وای بۆ دانراوە ڕەخنەی ئەدەبی نوێ ڕەگ و ڕیشە داکوتێ و بەرەو پێشەوەشی ببا، هەر بەهۆی ئەو تەوەرە دامەزراوانەی نێوەندی ئەو قوتابخانەیە دەتوانرێ هەموو لایەنەکانی جوانی و پاشانیش جوانکاری شرۆڤە بکرێت، چونکە بمانەوێ و نەمانەوێ (خودی جوانیش بۆتە مەیدان و گۆڕەپانی جوانکاری)«١٧». ئەو هاوکێشەیەش شتێکی بەڵگە نەویستە ئەگەر جوان و جوانی نەبێت، جوانکاریش هەر بوونی نابێت.

**توڕەت وەکو تۆماری شکستە و سەری کوڵمت**
**بۆ نووری سەوادم بووەتە شەمعی موتاڵا ٤٩**

بۆ سەیر و تەماشای جوانی و دواتر داهێنانی بەرهەمێک کە پڕاو پڕی جوانکاری بێت نالی تەنیا متمانەی بە چاوی سەر و هەستەکانی خۆی و دواتر چاوی دڵ کردووە و بەس، ئەو هیچ پێوەندی بە بینین و سەیر و جۆری تەماشای ئەم و ئەوەوە نەبووە، ڕقیشی لە لاساییکردن بۆتەوە.

**خەراباتی دڵی (نالی) مەفەرموو چانییە قوربان**
**بە مەرگی تۆ قەسەم چاوم بە زیکرت بەیتی مەعموورە**
**٩٤**

بناغە و دروست بوونی ئەو نالییەی کە بەم شێوەیە خۆی بنیاد نا لەسەر ئەو خاڵانە و چەند خاڵێکی تر دروست بووە. نالی هیچ گوێ ناداتە هەموو ئەو خەڵک و کەسانەی چاوی خێل بە ناشیرن دەبینن و دەزانن، فەلسەفەی جوانی ئەو لە تێڕوانینی خۆی دروست دەبێ، جوانی و جوانکاریش ئەوەیە کە ئەو لە ژوورەوە هەستی پێکردووە و وێنەی کێشاوە، نەک ئەو جوانییەی کە بە سادە و سانایی دەبینرێت (ئەو جوانییەی ئێمە بە هەستەکانمان دەرکیان پێدەکەین، ئەمانە جەوهەر و کاکڵی جوانی نین، بەڵکو تەنیا دەرککردنە بەو جوانییە و بەس)«١٨».

**پێم دەڵێن مەحبووبە خێل و قیچە مەیلی شەڕ دەکا**
**خێل و قیچە یا تەرازووی نازی نەختێ سەر دەکا**
**خێل و قیچە یا بە غەمزە بۆ نیشانەی دڵ بە چاو**
**مەیلی ڕاست ناوێتنی مۆژگانی دڵ پەیکەر دەکا**
**عەکسی چاوی تۆ لە چاویدا بە خواری تێ دەگەی**
**کە چ نەزەرکەی فەرقی خوارو ژوور و خێر و شەڕ دەکا**
**٥٤**

دەڵێن و ناڵێن دەبێ چ نرخ و بەهایەکی لای نالی هەبووبێت، ئەو بە ئازایی و ئازادی ژیا، بە ئازادی و بە ئازاییش سەری نایەوە، هەر ئەم جمکە وشانەش نەمری و جاویدانی پێ بەخشێ، ئەو بە ڕێگایەک گوزەری کردووە پێش ئەو هیچ مووتەنەفیسێک ڕێگاکەی نەکوتاوەتەوە. بە وردبوونەوە لە شیعرەکان و ئەو قسانەی سەرەوە، دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە تێڕوانینی یا وردبوونەوەی لە جوانی و جوانکاری کەسی یا خودی بووە ناک بابەتی، باشترین نموونەش قەسیدەکەیەتی کە بۆ ماهشەرەف خانمی ئەردەڵانی (مەستوورە)ی نووسیوە. وای تێدەگەم نالی لەو قەسیدەیە لە زۆر لایەنی کەسی و مەبدەئی و ڕەوشتی خۆی داماڵیوە و بەرامبەریان دوورە پەرێز وەستاوە تەنیا بۆ ئەوەی کۆمەڵە وێنە و سیفەتێکی شیعری وا بێنێتە ناوەوە بە هۆیانەوە مەستوورە توانی بە سانایی و بێ بەربەست لە دەرگاکانی نەمری بدا و جوانییەکەی بە خامەیەکی وا تۆمار کراوە نە دەژاکێ و نە سیس و لۆچ لۆچی بە خۆ دەبینێ.

**مەستوورە کە حەسناو و ئەدیبە بە حیسابێ**
**هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێک و عیتابێ ١٦٢**

**کاسەیکی بلوورین و نوخوونی لەسەرا بێ**
**نەختێکی لەبەر مەوجی لەتافەت قەڵیشابێ ١٦٣**

**دورجێکی موجەوهەر کە هەموو حوسن و بەها بێ**
**دوڕڕێکی مونەووەر کە هەموو ئاوی سەفا بێ ١٦٤**

دنیا یا بۆشایی ئاسمانی جوانکاری شاعیر و هونەرمەندی ئازادی دەوێ، دەبێ پەڕ و باڵی خەیاڵ کراوە و ڕەها بێت و کۆت و زنجیرەکانی ورد و خاش کرابن، ئەو کۆت و زنجیرانەی بە هەر ناوێکەوە بووبێت هەر بۆ ئەوەی بێن بە بەربەست و ئاستەنگ، وێنە هونەری و ڕەسەنەکان چاپ نەکرێن و لە دایک نەبن. لەو قەسیدەیە نالی پشتی لە هەموو شتەکان کردووە و هەموو گیانی بۆتە چاو و تەماشای مەستوورەی پێدەکا، خامەکەی ئەو دەوری کامیرایەکی یەکجار حەسساس دەبینێ و وێنەی هونەری قەشەنگی وامان نیشان دەدا نەک ئێمەی خوێنەر بەڵکو خودی مەستوورەش پێیان سەرسامە و ئافەرینی دەست ڕەنگینی خامەکەی نالی دەکا (شیعر دووبارە کردنەوە یا گێڕانەوەی باشتر و چاکتری ڕووداوەکانە بە شێوەیەکی خەللاق و بە توانایەکی مکوم)«١٩».

**بورجی درەختی سەوزی بڵندە وەک ئاسمان**
**پێوەی شکۆفە هەر وەکو نەجمن بە ڕەوشەنی**

ئەگەر ئامانجی جوانکاری چێژ و خۆشی بەخشین بێت، لووتکەی ئەو چێژ و خۆشییانە لە دێڕ و وێنە هونەرییەکانی نالی بەدەست دێت و تێیدا ویژدانیش نەفەسێک هەڵدەکێشێ و ئاسوودە دەبێت. هێنانەوەی نموونە و وێنەی جوانی هونەری شیعری لای نالی ئەوەندە زۆرە، بۆیە ئێمە لە ترسی دووبارە بوونەوە و درێژدادری بۆ ئەم بابەتە بەوەندەی وازمان هێنا وەک دەڵێن (مشتێک نموونەی خەروارێکە). هەر ئەوەندە ماوە بڵێم:

**زارم وەکو هیلال و نەحیفم وەکو خەیاڵ**
**ئایا دەکەومە زار و بە دڵدا دەکەم خوتوور؟(*)**

**پەراوێز و سەرچاوەکان:**

١- حسين خمري (د)، بنية الخطاب النقدي، الطبعة الاولى، دار الشؤون الثقافة العامة، بغداد، (١٩٩٠)، ص٣٩.

٢- لە زۆر شوێنا لە دیوانەکەی نالی وشەی (جەوان) وەک لاو و گەنج بەرامبەر بە پیر بەکارهاتووە، لەو دێڕەی کە وەک نموونە تۆماری دەکەین ئەوەی لێ دەفامرێتەوە بە (جوان)یش بخوێندرێتەوە، نالیش هەر وای نووسیوە (جوان):

**ئەو پیری خەرەف ئافەتی مەرواو سەفا بوو**
**تۆ شۆخ و جەوان دوور بی لە ئافات و خورافات**
**(تۆ شۆخ و «جوان» دوور بی لە ئافات و خورافات)**
**١٣٦**

لە نوسخە و چاپی تر هەر (جوان) تۆمارکراوە. نالی (دیوان) ل ١٤١.

٣- لەبەر ئەوەی لەو وشانەدا هەیە کە لە جارێک زیاتر بەکارهاتوون، ئێمە تەنیا ژمارەی یەک لاپەڕە و دێڕمان بۆ هەمووان نووسیوە:

زەهرا-ل٤٤-٣، خووبان-ل١٣٤-٥، مەهرووو-ل٨٦-٦، خان و مان-ل١٥٣-٢، شۆخ-ل٥٦-٤، گوڵچەهرە-ل١٣٢-٨، مەلیح-ل١٢٢-٣، غەڕرا-ل٦٦-٧، دڵرفێن-ل١١٣-٥، دڵفریب-ل٩٣-٧، سەباحەت-ل١٢٢-٣، زیب-ل١٣٧-٨، فەڕ-ل٢٤٨-٣.

٤- جاستون باشلار، جماليات المكان، ترجمة غالب هلسا، كتاب الاقلام (١)، دار الجاحظ للنشر، بغداد، ١٩٨٠، ص٦٩.

٥- م. اوفسيانيكون- ز. سمير نوفا، موجز تاريخ النظريات الجمالية، تعريب باسم السقا، دارالفارابي، بيروت ١٩٧٥، ص١٦١.

٦- جاستون باشلار، جماليات المكان، ص٢٩.

٧- جيروم ستولنيتز، النقد الفني، ترجمة: د. فؤاد زكريا، الطبعة الثانية، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، (١٩٨١)، ص٣٥٣.

٨- غيورغي غاتشف، الوعي والفن، ترجمة: د. نوفل نيون، عالم المعرفة (١٤٦)، الكويت، (١٩٩٠)، ص١٢٢.

# هونەری لێکچوواندن و خوازە و خواستن لە شیعری نوێی کوردیدا

## (سەلاح شوان وەک نموونە)

کەریم شارەزا

**پێشەکی**

سەلاح شوان (کەرکوک: ١٩٤٧) شاعیرێکی نوێکاری کوردە، لە دوا دوای شەستەکان و سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابوردوودا، وەک شاعیرێکی نوێکاری تایبەتمەند جێ پێی خۆی لەسەر زەمینەی ئەدەبی هاوچەرخی کوردی کردەوە، بە چەپکێکی جوان و ڕازاوە لە هۆنراوەی ریالیستی ڕەخنەگریی ئاودراو بە ڕۆمانسییەت چەند چینێکی ناوازەی خستە سەر تەلاری شیعری نوێباوی نەتەوەکەی.

لە ساڵی (١٩٧٨)دا دیوانێکی شیعری نایابی بەناوی [دڵدارەکەم پایزە گەواڵەیەک نییە] بەچاپ گەیاند و سەرنجی ڕەخنەگرو شیعردۆستانی بۆ هونەری شیعرەکانی ڕاکێشا؛ چونکە لەوە گەیشتبوو کە هۆنراوەی سەرکەوتوو زادەی هەست و سۆزی هەڵچوو و ئەندێشەی قووڵی شاعیری بەهرەدارە. لە ڕێگەی بەخششی سرووشەوەش لە باری بێ ئاگایی هۆشی شاعیر بۆی دەخولقێ.

هەرچەندە شاعیرییەتی ئەم شاعیرە لە نیوەی دووەمی شەستەکانی سەدەی ڕابوردووەوە دەست پێدەکات، بەڵام تا پێی نەنایە حەفتاکان و سەرەتای سەرهەڵدانی بزووتنەوەی (ڕوانگە) خۆی ئاشکرا نەکرد، نەبووە ئەو شاعیرە نوێکارەی کە ئەمڕۆ بە درەنگ وەختی لە شیعرەکانی دەکۆڵینەوە. بەڵگەی ئەم بۆچوونەشمان ئەو پێنج هۆنراوەیەتی کە لە بەشی دووەمی دیوانەکەیدا بڵاوی کردۆتەوە مێژووی (١٩٦٧)یان بەسەرەوەیە، هەست دەکەین شیعرەکانی ئەو سەردەمەی بەتەواوی نەگەییون و وەک سەرنجیش دەدەینە هۆنراوەکانی حەفتاکانی، هەست دەکەین پێشکەوتنێکی تەواویان پێوەدیارە، تا بڵێی هۆنراوەی ناسک و سۆزدارن و زۆربەی هەرە زۆری لەسەرکێشی (٨) برگەیی (٤+٤)ی خۆماڵی کوردین، هەندێکیشی لەسەر کێشی (١٠) برگەیی (٥+٥)ن و بە وشەی سادە مانای جوانی خولقاندووە.

دیوانەکەی کراوە بەسێ بەش و بەشی یەکەمیان (٤٠) هۆنراوەی کورت و درێژی گرتۆتە خۆ، لەوانە (٣٩) هۆنراوەیان بەوشەی شیرینی (دڵدارەکەم) دەست پێدەکات، تاکو بیسەلمێنێ کە ئەو دڵدارییەی بۆ یارە خۆشەویستەکەی هەمیشەییە نەک (پایزە گەواڵەیەک) بێت و دایبارێنێ و زوو بڕوات.

بەتێکڕایی زۆربەی هۆنراوەکانی هەر سێ بەشەکە پتەون و مایەی ئەوەن ئاوڕیان لێبدرێتەوە و بخرێنە بەر تیشکی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە.

**جوانکارییەکانی شاعیر لە هونەری شیعردا**

شاعیری نوێکار لەوە گەیشتووە کە لەپاڵ هەست و سۆز و ئەندێشەوە، جوانی خولقاندن لە شیعردا لە قاڵبێکی هونەریدا مەرجێکی سەرەکییە بۆ بەرهەمهێنان و داهێنانی چەمکی پتەو و ڕازاوە بۆ ڕوخساری هۆنراوەکانی، ئەو جوانکارییەش لە ڕێگەی پێکەوەنانی وێنەی شیعری و بەکارهێنانی ڕەمز و ئەفسانەی ڕەسەنی خۆماڵی و بیانی کە ململانێی نێوان هێزی خێرو هێزی شەڕی تێدا بەدی بکرێ، بەم کارەش چەمک و ناوەڕۆکی هۆنراوەکە خەست و خۆڵ دەبێت و خوێنەر و گوێگری

دەقەکە باشتر وەری دەگرێ و لەگەڵیدا دەگونجێ.

دەبێ ئەو ڕاستیەش بڵێین کە لەم سەردەمەدا، هیچ شتێکی نا شیعریی نییە و شاعیری بەهرەدار دەتوانێ لە هەموو شتێکی جوان و ناشیرین بە هەست و سۆزی هەڵچووی و بە ئەندێشەی قووڵی و لە ڕێگەی وێنەی شیعرییەوە جوانی لە هۆنراوەکەیدا بخوڵقێنێ.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم پێوەرو بۆچوونانەی باسمان کردن، دەکەوینە گەڕان بەدوای ئەو جوانکارییانەی کە شاعیر لە ڕێگەی وێنەی گەش و گوڵی شیعریی و چەمکی ڕەمزی ئەفسانەیی خۆماڵی و بیانی پێشکێشی کردووین.

### وێنەی شیعریی لە دیوانی [دڵدارەکەم پایزە گەواڵەیەک نییە]

لە زۆربەی هۆنراوەکانی ئەم دیوانەیدا لەپاڵ وەسفکردندا لە ڕێگەی هونەرەکانی لێکچوواندن و خوازە و خواستن و بەکارهێنانی ڕەمزی ئەفسانەییەوە، وێنەی جوان و ناسکی شیعریی بۆ خوڵقاندووین، بەڵام دەبێ ئەو ڕاستیەش بزانین کە تەنیا وەسف و لێکچوواندن و خوازەو خواستن بەس نین بۆ خوڵقاندنی وێنەکان، بەڵکو دەبێ بەهێزی هەست و سۆز و ئەندێشەی شاعیری بەهرەدار ئاو بدرێن و شاعیر لە باری بێ ئاگایی هۆشیەوە بۆی دروست بووبێ.



سەلاح شوان

دەبێ ڕاستیەکی دیکەش بزانین کە وێنەی شعریی لە هونەری لێکچوواندن ڕوونتر دەخوڵقێ نەک لە وەسفکردنی و لە هونەری (خوازە و خواستن)یش لە هەمووان جوانترو گەش و گوڵتر دروست دەبێ. کەواتە هونەری (خوازە) و (خواستن) شادەماری جەستەی ئەو وێنانەن و شاعیر تا زاڵتربێ بەسەریاندا لە کرداری بەکارهێنانەکەیان لە شیعردا سەرکەوتووتر دەبێ.

هەروەکو فەیلەسووفی ناوداری گریک ئەرستۆ گوتوویەتی: «زاڵبوونی شاعیر بەسەر پێکەوەنانی (خوازە) بەشێوەیەکی جوان لە شیعردا نیشانەی بلیمەتی و بەهرەدارییەتی ئەو شاعیرەیە(١).»

باشترین وێنەی شیعریی ئەو نموونانەن کە پێوەندییان بە کەسێکی دیاریکراو و کات و سەردەمەوە نەبێ، چونکە زۆر وێنە هەنە لەگەڵ گۆڕانی بارو سەردەم و لە ڕووەت کەوتنی کەسەکان لە کەڵک دەکەون و نرخی جارانیان نامێنێ، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی تایبەتمەندییەکانی وێنەی شیعریی، دەبێ ئەوەش روون بکەینەوە کە ئەم هونەرە دوو جۆری هەیە: «جۆری وەستاو» و «جۆری جووڵاو» و هەر وێنەیەکیش بە پێی وشەکانی و ئەو هەست و سۆزەی لە ناوەڕۆکی شیعرەکەوە وەردەگیرێن، لە ڕێگەی هەستێکی خوێنەر، یان گوێگری دەقەکەوە دەرکی پێدەکرێ(٢).

بەپێی ئەم پێناسە و تایبەتمەندییانە، دەکەوینە گوڵ چنینی چەپکێک لە وێنە شیعریەکانی ئەم دیوانەی شاعیری نوێکارمان و کەمێک شییان دەکەینەوە تا بزانین چۆن دروستبوون و چ جۆرێکن و بەچ هەستێک لە هەستەکانی مرۆڤ وەردەگیرێن.

لە هۆنراوەیەکیدا بەناوی (ئاگر و پووش) لە ڕێگەی هونەری لێکچوواندنێکی ڕەوانەوە، دڵدارەکەی دەکاتە پەلکە زێڕینەی دوای بارانی خەونی بەهاری شارەکەی خۆی و دەربڕین و گوزارەیەکی جوان و ناسک لەو کارە هونەرییەیدا دەخوڵقێنێ:

**دڵدارەکەم**
**پەلکە زێڕینەی دوای وەشتی**
**خەونی بەهاری شارەکەم ل:٦**

ئایا چ دەربڕینێک لەوە ناسکتر هەیە کە ئەو یارە دڵدارەکەی بە پەلکەزێڕینەیەک بچوێنێ کە لەدوای باران هەڵدێ و ئەو بارانەش بارانێکی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو مەجازییە و (بارانی خەونی بەهاری شارەکەیەتی). ئەم چەمکەش بووەتە هونەرێکی ناسکی (خوازە) و وێنەکەش لە جۆری وەستاوە و بەهەستی بینین وەردەگیرێ و کار لە هەست و هۆشی گوێگر و وەرگری دەقی شیعرەکە دەکات.

لە هەمان هۆنراوەیدا وێنەیەکی ئاوێتەی شیعریی خوڵقاندووە، لە ڕێگەی وەسف و هونەری (خواستن)ەوە کارە ئەدەبییەکەی ئەنجام داوە، جوانترین گوزارەی شیعری بەدەستەوە داوە:

**با سەر پەنجەی پڕ ئازاری**
**وێڵی ناو دێڕی وشەکانم**
**تاوێ دەرگای**
**بەهەشتی سینە نەرمەکەت بکاتەوە   ل:٦**

دەیەوێ بەسەری پەنجەی پڕ ئازاری، دەرگای بەهەشتی سینە نەرمەکەی بکاتەوە، ئەگەر هەر ئەوەندە بوایە، دەبووە وێنەیەکی ئاسایی، بەلام چووە وشەکانی خۆی کردووە بە جۆگەلە و دێراوی ئاودان، ئەمە لە دەربڕینێکی ئاسایی دوور دەخاتەوە، لەپاڵ وەسفکردنێکی جوان، هونەری خوازەو خواستن دەخوڵقێنێ، وێنە شیعرییە پتەوەکەی پێ دەکێشێ، وێنەکەش لە جۆری جوولاوە، چونکە دەرگاکردنەوە پێویستی بەجووڵەیە و بە هەستی بینین و هەستی دەست لێدان وەردەگیرێ.

لە هۆنراوەیەکی دیکەیدا بەناوی (سیمرخی دوورگەی غەم) دوو وێنەی شیعریی لە (داچۆڕانی ئەستێرە) و (تۆرانی مانگ) لە ئاسمانەکەی دەخوڵقێنی کە هەردووکیان بە هونەری خواستن دروست بوون:

**هەزار ئەستێرە داچۆڕا**
**مانگی چواردە**
**هەزار جار لە ئاسمان تۆرا   ل:١٨**

لەم سێ نیوە دێرە شیعرەدا دوو وێنەی وەستاوی شیعری خوڵقاون و هەردووکیشیان بەهەستی بینین وەردەگیرێن.

لە هۆنراوەیەکیدا بەناوی (نیسانێک)، لە قالبی خوازەدا (دڵەکەی شێتی عەشقی دڵدارەکەی وەکو مانگی گوڵی سووری تێدا ڕوودەوە) و ئەو گوڵە سوورەش وەکو ئاگر (گڕی لە دەریای ئارامی زەرد هەڵگەڕاوی بەرداوە) لەم دوو ڕستە شیعرییەدا دوو وێنەی شیعریی لە ڕێگەی هونەری لێکچوواندن و خواستنەوە خوڵقاوە:

**دڵدارەکەم**
**دڵی شێتم وەکو نیسان**
**گوڵی سووری تیا ڕوواوە**
**گڕی لە دەریای ئارامی**
**زەرد هەڵگەڕاوم بەرداوە   ل:٢٣**

هەردوو وێنەکەش لە جۆری وەستاون و بەهەستی بینین وەردەگیرێن. لە هەمان هۆنراوەیدا لە دەربڕینی (ئاگری لێوەکانی دڵدارەکەی غەمی هەڵوەریوی دوێنێ دەسووتێنێ) و خۆشەویستییەکەی دووبارە دەکاتەوە:

**دڵدارەکەم**
**لە ئاگری لێوەکانتا**
**غەمی هەڵوەریوی دوێنێم**
**ئەسووتێنم   ل:٢٤**

لە ڕێگەی پێکەوەنانی هونەری خواستن وێنەیەکی گەش و گوڵی شیعریمان بۆ دەکێشێ و لە جۆری جوولاوە، چونکە سووتاندن کارێکە بەجووڵە پێکدێ و بە هەستی بینین وەردەگیرێ.

لە هۆنراوەیەکی تریدا بەناوی (منیش دڵداری ئەزانم)، لە ڕێگەی لێکچوواندنێکی ڕەوان کە هەموو (شاعیرەکانی شار بە دڵۆپە فرمێسکێک دەچوێنی) و ئەو فرمێسکەش کە (بەسەر گۆنای هەڵقرچاوی پەردەکاندا دێتە خوارێ) و لەم ڕستە شیعرییەدا هونەری خواستن دروست بووە، هەر بەو هونەرەش وێنەیەکی گەش و گوڵی شیعریی دەخوڵقێنی:

**دڵدارەکەم**
**لە شارێکا کە هەموو شاعیرەکانی**
**فرمێسکێکن**
**بەسەر گۆنای هەڵقرچاوی پەردەکانا**
**دێنە خوارێ   ل:٢٧**

وێنەیەکی ئاوێتەی شیعرییمان لەم دەربڕینە شیعرییە بۆ دەخوڵقێنی کە دەگاتە ڕادەی تابلۆیەکی هونەری و لە جۆری جوولاوە، بەهەستی بینین وەردەگیرێ. لە هۆنراوەی (دەسا دەرگا بکەرەوە)، لە دەربڕینی (دەرچوونی وشەکانی شاعیر لە مەداری خۆیان) و (داگیرسانی ئەو وشانەیشی وەک ئەستێرە) دوو وێنەی شیعریی یەک لەدوای یەکی لە ڕێگەی پێکەوەنانی هونەری خواستن خوڵقاندووە:

**وشەکانم**
**لە مەداری خۆیان دەرچوون**
**وەکو ئەستێرە داگیرسان   ل:٣٠**

ئەم دوو وێنە سادەیەش تەواوکەری یەکترن و لە جۆری وەستاون و بە هەستی بینین وەردەگیرێن.

لە هۆنراوەی (تەلیسمێکی شکاو) چەند وێنەیەکی شیعریی یەک لەدوای یەکمان لە ڕێگەی پێکەوەنانی هونەری خواستن بۆ دەکێشێ:

**ئەمئەزانی**
**کاتێ کە ماچی ئاگری ئاسۆی**
**لیوەکانت ئەکەم**
**کاتێ هانا**
**بۆ مەرگی باوەشت ئەبەم**
**چاوی پڕ قینت دا ئەخەی   ل:٣٥**

لە دەربڕینی (ماچی ئاگری لێوەکانت دڵدارەکەی) هونەری (خواستن) پێکهاتووە، لە دەربڕینی (هانا بۆ مەرگی باوەشی ئەو یارە و نوقاندنی چاوی پڕ لە قینی دڵدارەکەی) هونەرێکی تری خواستن پێکدێنێ و بەم دوو دەربڕینە روونبێژییە دوو وێنەی شیعریی یەک لەدوای یەکمان بۆ دەخوڵقێنێ و هەردوو وێنەکەش لە جۆری جووڵاون و بەهەستی بینین وەردەگیرێن.

دوا بەدوای ئەم دوو وێنەیەش، دوو وێنەی دیکەشمان لە (خۆهەڵدانی دڵی لەودیو شووورەی شارە بێ دەرگاکەی) و لە (باڵەفڕەی دڵەکەی لەبەر پێی ئەو شۆخە) خولقاندووە:

**نەمنەزانی**
**کاتێ دڵم لەودیو شوورەی**
**شارە بێ دەروازەکانا**
**خۆی هەڵئەداو**
**لە بەرپێتا ئەکەوێتە باڵەفڕێ**
**دەستی بەزەیی بۆ ئەبەی ل:٣٥**

شاعیری نوێکارمان لە رێگەی پێکەوەنانی هونەری خواستن وێنەکانی خولقاندووە، هەردووکیشیان لە جۆری جووڵاون بە هەستی بینین و بیستن وەردەگیرێن، چونکە خۆ هەڵدان بەچاو دەبینرێ و باڵەفڕەش جۆرە دەنگێکی هەیە و هەستی بیستن باشتر وەری دەگرێ.

لە هۆنراوەیەکی دیکەدا بەناوی (چاوەکانی تۆ نەورۆزن)، لە دەربڕینی (تواندنەوەی بەفری زستان لەسەر مەچەک و چاوی هەژاران) و (بەجێهێشتنی گڕی سووری رێگاکان بەهۆی رەشەبای رێگەی نەهاتی)یەوە دروست بوون:

**دڵدارەکەم**
**بەفری زستان**
**لەسەر لێو و مەچەک و چاوی هەژاران**
**توایەوە**
**رەشەبای رێگای نەهاتی**
**گڕی سووری رێگاکانی بەجێهێشت**
**بەگەرووی تاریکە شەوی دوێنێمانا**
**کشایەوە ل:٣٦**

وێنەی یەکەمیان بە هەستی بینین وەردەگیرێ، هی دووەمیشیان بەهەستێکی دەروونی. هەردووکیشیان لە جۆری جووڵاون.

لە هۆنراوەیەکی دیکەیدا بەناوی (ماسییەکان تێنوویانە)، لە دەربڕینی (شین بوونی ئەستێرەکانی ئاسمان لە لێواری برینەکانی شاعیر) لە (تواندنەوەی شاعیری دڵدارمان بەهەتاوی باوەشی بەهار) دوو وێنەی شیعریان هونەرمەندانە بۆ دەکێشێ:

**گەر ئەستێرەکانی ئاسمان**
**لە لێواری**
**برینەکانما شین بن**
**هەتاو لە باوەشی گەرمی بەهاری دا**
**تێر تێر بم توێنێتەوە ل:٥٠**

لە رێگەی پێکەوەنانی خواستن لەم دوو دەربڕینە ناسکەدا، ئەم دوو وێنە شیعرییەی بۆ کێشاوین و هەردووکیان لە جۆری جووڵاون، چونکە شینبوون (روانی رووەک) پێویستی بە جووڵە هەیە و تواندنەوەش بەهۆی هەتاوی باوەشی گەرمی بەهار هەمدیس جووڵانەوەی دەوێ و هەردوو وێنەکەش بە هەستی بینین وەردەگیرێن.

لە هۆنراوەی (کۆتاییەک) زنجیرەیەک لە وێنەی شیعریی دروست دەکات، لە سەرەتای زنجیرە وێنەکانیدا (دڵدارەکەی بەشەو دەچووێنێ و خۆیشی بە ئەستێرە) و بەم لێکچوواندنە جوانە وێنەی یەکەمیان دەکێشێ:

**دڵدارەکەم**
**تۆ شەویت و من ئەستێرە و**
**گڕی غەمی بەر بەیانم ل:٦٦**

وێنەکەش لە جۆری وەستاوە، بەهەستی بینین وەردەگیرێ. دوا بەدوای ئەوەش وێنەی دووەمی بەدوادادێنێ. لە رێگەی (لێکچوواندنی دڵدارەکەی بەگوڵلە و لەناو دڵی شاعیردا جێی خۆی کردۆتەوە) خولقاوە:

**دڵدارەکەم**
**تۆ گوللەیت و لەناو دڵما**
**جێگای خۆتت کردۆتەوە ل:٦٦**

ئەم وێنەیەشی لە جۆری وەستاوە. بەهەستی بینین وەردەگیرێ. وێنەی سێیەمیش لە لێکچوواندنی دڵدارەکەی بە مەرگ کە هەرگیز لێی جیانابێتەوە:

**تۆ مەرگیت و بۆ کوێ بڕۆم**
**هەرگیز لێم جیانابیتەوە ل:٦٦**

ئەم وێنەیەشی لە جۆری وەستاوە و بە هەستێکی دەروونی وەردەگیرێ.

لە هۆنراوەی (سوورانەوەی گشت شتەکان) زنجیرە وێنەیەکی شیعریی دیکەی یەک لەدوای یەکی بۆ کێشاوین و لە دەربڕینی (تێکەڵ بوونی جۆگەکان لە شەوی خۆشەویستی دەبنە مایەی رووبار دروست بوون).

بەهۆی ئەم دەربڕینە مەجازییە ئەم وێنە شیعرییەمان بۆ دەکێشێ:

**گەر جۆگەکان**
**لە شەوی خۆشەویستی دا**
**بە ڕووتی تێکەڵ بە لەشی**
**یەکتر نەبن**
**ڕووبار نابێت ل:١١٦**

وێنەکەش لە جۆری جووڵاوە و بەهەستی بینین وەردەگیرێ. دوای ئەمەش وێنەیەکی جووڵاوی دیکەمان بۆ لە دەربڕینی (ئەگەر ڕووبارەکان نەچن بۆ ناو نوێنی شینی دەریاکان، ئەوا دەریاکان چۆڵ و وشک دەبن) لەم دەربڕینە مەجازییەش وێنەکە دروست دەبێ:

**گەر ڕووبارەکانیش غەمی**
**دڵیان بۆ یەکتر نەڵێن و**
**نەڕۆنە ناو نوێنی شینی دەریاوە**
**دەریا چۆڵ و وشک ئەمێنێ ل:١١٦**

ئەو وێنەیەش لە جۆری جووڵاوە و بە هەستی بینین وەردەگیرێ. ئەوجا شاعیر وێنەی سێیەمی بەدەربڕینی وا دروست دەکات کە لە گۆڕەپانی هونەری خوازەی ڕوونبێژیدا نەبێ جێی لەناو دەربڕینی حەقیقیدا نابێتەوە:

**گەر دەریاش وەکو پەپوولە**
**باڵ نەگرێت**
**پۆل پۆل بەرەو ئاسمان نەڕوا**
**هەور دستی ناگاتە مەمکی چیاکان ل:١١٦**

بەڕاستی ئەم دەربڕینانەی شاعیری نوێکارمان، زۆر نوێن و جوانترین هونەری (خوازە و خواستن) یان پێکەوە ناوەو وێنەیەکی جوان و ڕازاوەی شیعریی لە جۆری جووڵاوی بۆ خوڵقاندووین و بەهەستی بینین و هەستێکی دەروونی وەردەگیرێ. وێنەی چوارەمیش لەم دەربڕینە ئاسکانەی نێو شیعرەکەی بۆ خوڵقاندووین:

**گەر هەوریش حەز**
**لە شەقاری لەشی وشکی**
**زەوی نەکا**
**باران نابێت**
**کانی و جۆگا و ڕووبار نابێت**
**دەریا نابێت ل:١١٧**

وێنەکەش لە جۆری جووڵاوە و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

**ئەفسانە وەک ڕەگەزێکی جوانکاریی لەلای شاعیردا**

بەکارهێنانی ئەفسانەی کۆن لە شیعری ڕۆژئاواییدا لە سەدەی نۆزدەیەمەوە دەستی پێکردووە و لە شیعری هاوچەرخی کوردیشدا لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمەوە بە مەبەستی قووڵکردنەوەی چەمکی هۆنراوەی تازە بەکارهاتووە.

شیعرو ئەفسانەش پێوەندییەکی بەهێزیان لەنێواندا هەیە، هەروەک ڕەخنەگری بنیاتگەریی ناوداری فەرەنسایی (ڕۆلان بارت) گوتەنی: [شیعر بریتییە لە دارشتنەوەی ئەفسانە لە قالبێکی نوێدا، یان خوڵقاندنی ئەفسانەی تازە] و لە ڕێگەی ململانێی نێوان ڕەگەزە دژ بەیەکەکانی خێرو شەڕ ئەنجامێکی گەش وەدەست دێت، بەتایبەتی گەر هێزی خێر سەرکەوێ.

شاعیری نوێکاری ئەم باسەمان لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابوردووەوە ئاوڕی لە ئەفسانەی خۆماڵی و بیانی داوەتەوە و تاقیکردنەوەیەکی بە پیتی شیعریی ئەنجام داوە. سەرەتا بە ئەفسانەی خۆماڵیی کوردی دەستی پێکردووە. لەدواییدا دەستی بۆ ئەفسانەی بیانیش درێژکردووە و لە چەمکی بەپیتی ئەو ئەفسانانەش جوانکارییەکی باشی لە هونەری شیعرەکانیدا کردووە.

لە هۆنراوەیەکیدا بەناوی (ئەژدەهاو ئاو) ئەو ئەفسانە کۆنەی نەتەوەکەی بەکارهێناوە کە «ئەژدەهایەک سەرچاوەی ئاوی شارێک دەگرێ و ماوە نادات دڵۆپێک ئاو بۆ خەڵکەکە بێتە خوارەوە تا خەڵکی شار کچێک وەک قوربانی پێشکێشی نەکەن تا بیکاتە خۆراکی ڕۆژانەی. ئەو ئەژدەهایە ڕەمزی زەبر بەدەستێکی خونکار و چەوسێنەرە و میللەتەکەش زۆرلێکراو و چەوساوەیە، تا یەکێک لە قارەمانانی خەباتگێری میللەت ئەو ئەژدەهایە دەکوژێ و خەڵکەکە بەتەواوی ڕزگار دەکات.»

شاعیر وامان بۆ دەردەخات کە نۆرەی ئەو یارە دڵدارەبەتی پێشکێش بەو ئەژدەهایەی بکات. کەچی ئەمە ناکات، چونکە گیانی دڵدارەکەی پێ لە هەموو کەسێکی تر بەنرخترە و ئەمەش لە ئەنجامی عەشقە سەرەڕۆکەیەتی بۆ ئەو یارە نازدارە خۆشەویستەی:

**دڵدارەکەم**
**ئەڵێن نۆرە هاتۆتە سەر من و ئەبێ**
**ئەمشەو تۆ بەدیاری بیەم**
**تەنیا تۆم هەی**
**با شار لە تینوا بخنکێ ل:٤١**

لە چەمکی ئەو ئەفسانە خۆماڵییەی نەتەوەکەی جۆرە جوانکارییەکی خستۆتە بنیاتی هۆنراوەکەی، خۆزیا لە جیاتی ئەوەی بڵێ (با شار لە تینوا بخنکێ) گوتبای

[لەگەڵ ئەژدەها دەجەنگم تا شار و دڵدارەکەم لە تێنوەتی رزگـار دەکـەم] ئەوا دەوری رزگـارکـەری وەردەگـرت و خـەڵکی شـار و دڵدارەکـەیشی لە چنگ زۆرداریی و چەوسـاندنەوەی ئەو زۆرداره چەوسێنەره ئازاد دەکـرد و تاقیکردنەوە ئەفسانەییەکەشی بەهێزتر دەبوو.

لە هۆنراوەی (داسـتـانی فریشـتـەکان)دا، لە مـلمـلانێی نێـوان فـریشـتـە، نموونەی (خێـر و چاکـە). دێو و درنج، نموونەی (شـەڕ و خـراپەکـاری) دەدوێ. ئەوەمـان بۆ دەردەخـات کـە (فـریشـتـەیەکی خوێناوی بەناخی شـەودا دێت و دەچێت و شـاباڵە ئاگـرینەکـانی دەکـاتە هەوێنی شـەفـەق)، لـەم دەربڕینە ئەفـسـانەییـەدا، هونەری (خـواسـتن)ی روونبـێـژیشی خـولقـاندووە، وێنەیەکی ئاوێتەی شیعریی لەپاڵ ئەفسانەکەدا دروست کردووە:

**فریشتەیەکی سەرتاپا لە خوێن**
**بەناخی جەرگی شەوی مەییوا**
**هەر دێت و ئەڕوا**
**نووکی شاباڵە ئاگرینەکانی**
**بۆ لێوی وشەی**
**شەفەقی گەشی ڕەنگ ئەرخەوانی**
**کردۆتە هەوێن ل:٩٧**

لێرەدا کار و هەڵوێستی فریشتەی خێرخواز دەردەبڕێ و ئەوجـا دێتـە سـەر ڕەوشت و کـرداری (دێو و درنج) کـە بەردەوام لە دژی فـریشـتـەن (کە ڕەمزی مـرۆڤی چاک و ئاشتیـخوازن). لە هەمـوو شوێنێـک لە ڕووی دەوەستن و ڕێگە لە کاره باشەکانی فریشتە دەگرن:

**دێو و درنجی سەفتەکراوی**
**ناو گۆڕی پیسی مینا ژەنگاوی**
**دەوریان داوە**
**تا هەڵی لووشن، هەتا شەو ماوە ل:٩٨**

دوای دەرخستنی ئەو ملمـلانێ و دژایەتیـەی نێـوان ئەو دوو ڕەمزە بەهێـزەی ئەفسـانەی کـوردی. شـاعـیـر لەدوا هەنگاوی هۆنراوەکەیدا فریشتەی پەروەردەی کاری چاکە و کـردەوەی شـۆڕشگێـڕی، بتـەکـانی سـەر بەدێو و درنج لەناو دەبات و تۆڵەی کوشتنی کوڕەی (ئاهوورامەزدا)ی خـوداوەندی هەرە گـەورەی ئاییـنی زەردەشت لەو دێو و درنجانە دەکاتەوە:

**بەڵام فریشتەی**
**گۆشکراوی شۆڕشگێڕیەتی**
**بتی کرمۆڵی ژەنگ لەبەرکردووی**
**کۆنە پەرستگای باپیرەی مردووی**
**چاو هەڵئەکۆڵی**
**داخی کوشتنی کوڕیەکەی مەزدەی**
**پێ دەرئەهێنێ**
**شوورەی ناسۆری شەو بسووتێنێ**
**بت و بتخانە داڕووخێنێ**
**چونکە بەتەنها هەر خوایەک هەیە**
**بڕوایەک هەیە ل:٩٩**

بەم جـۆرە شاعـیـر لەناو ئاو و هەوای ئەفـسـانەی کـۆنی نەتەوەکەی خۆیدا دەسووڕێتەوە و ملمـلانێی نێـوان هێـزی خێر و هێزی شەڕ بەجوانی دەردەبڕێ کە سەرکەوتنیش لە ئەنجامدا هەر بۆ هێزی چاکە و خێرخوازییە کە ئەمرۆکە هێزی میللەتی تێکۆشەر دەگرێتەوە.

دوای ئاوڕدانەوەی لە ئەفـسـانەی خـۆمـاڵی وردە وردە بەرەو دنیای ئەفسانەی کۆنی گەلانی تر دەڕوات، لەوانە دەچێتە مەیدانی ئەفسـانەی (سیزیف و تاشە بەردەکەی) کـە ئەفـسـانەیەکی کـۆنی گـریکە، بەڵام وەکـو خـۆی وەری ناگرێ، چونکە لە ئەفسانەکەی (سیزیف) هەمـوو هەوڵی ئادەمـیـزاد لە پێناوی (نەمریی)یە، کەچی لەلای شـاعـیـر هەمـوو هیـوا و ئاوەتەکەی بۆ گـەیشتن بە دڵدارەکـەیەتی و بزانین چۆن ئەو ئەفـسـانەیەی هەڵوەشـانـدۆتەوە و بەجۆرێکی دیکە داڕشتۆتەوە و جوانکارییەکی پێەوی لە هۆنراوەکەیدا خولقاندووە:

**دڵدارەکەم**
**من (سیزیف)ێکم گشت ڕۆژێک**
**بە پێپلکانەی شکاوی**
**تیشکی گەرد گرتووی هەتاوا**
**بەرەو لای تۆ سەر ئەکەوم**
**لەگەڵ ئاوابوونی خۆرا**
**پێپلکانە ئەڕووخێت**
**منیش لە جێگای دوێنێ شەوی خۆما**
**بەتەنیا بێ تۆ ئەخەوم ل:٥٧**

شـاعـیـر چووە لە کـەرەسـتـەی ئەو ئەفـسـانە کـۆنەی (سیـزیف)ی گریکی، ئەفسانەیەکی تازەی داڕشتۆتەوە و بەمـەش تاقـیکردنەوەیەکی نوێی لە شیـعـری هاوچەرخی کـوردیدا خـولقـاندووە. بەپێـچـەوانەی (سـزیـف و بەسـەرخـستنی تاشە بەردەکەی (ئەرکی ژیانی) بۆ سـەر لووتکە (چیای نەمریی)، چووە دڵدارەکەی خۆی کردووە بە خـۆری (ئامـانج)ی و ڕۆژانە بە پێـپلکانەی تیـشکی گـەردگـرتووی هەتاو دەیەوێ سـەرکـەوێ تا بگاتە ئەو خـۆرەی کـە دڵدارەکـەیەتی، کـەچی کـە شـەودادێ ئەو پێـپلکانە شکاوە دەڕووخێت و ئەمـیش وەک سـیـزیف ناگاتە ئامـانج و بە تەنیـایی لە جێی جـارانی ئەوشەوە،

بەبێ ئەو دڵدارە خۆشەویستەی دەخەوێ و بەم جۆرە شاعیر دارشتنەوەیەکی پۆزەتیڤانەی ئەفسانە بیانییەکەی ئەنجام داوە، لە رێگەی هونەری خوازەی رەوانبێژیشەوە جوانکارییەکی باشی خوڵقاندووە.

**ئەنجام**

لەم لێکۆڵینەوەدا تا پێمان کرا تیشکی شیکردنەوەمان خستە سەر هونەری لێکچوواندن و خوازە و خواستن لە شیعری (سەلاح شوان)دا ئەوانەشی لە قاڵبی وێنەی شیعریی و بەکارهێنانی ئەفسانە و رەمزەکانی لە چوارچێوەیەکی نوێدا خوڵقاندوون، ئەوەی سەرنجی رەخنەگر و شیعر دۆستانی ئەم دیوانەی شاعیر رادەکێشی، ئەوەیە زۆربەی هەرە زۆری وێنە شیعرییەکانی بەهەستی بینین وەردەگیرێن مانای ئەوەیە شاعیر ئەوەندە خۆی لە بابەتی ئەوها نەداوە، دەنگ وئاواز و مۆسیقاو گۆرانی تێدابێ تا بەهەستی بیستن وەربگیرێن، یان بۆنی گوڵ و گوڵاو بخاتە نێو رستەی شیعرەکانی تا بەهەستی بۆنکردن وەربگیرێن، یان باسی شیرینی و تاڵی و تفتی و تیژی و ترشی بکات تا بەهەستی تامکردن (چێژە هەست) وەربگیرێن.

دەبێ ئەو راستییەش روون بکەینەوە کە چ وێنەی شیعریی و چ دارشتنەوەی ئەفسانە، یان خوڵقاندنی تا لە رەگەزی ناوی کەسایەتی و کات و سەردەم بەدوور بن نەمرتر دەبن، چونکە بەگۆرانی کات و سەردەم و نەمانی رووەتی ئەو کەسایەتییە وێنەکە و تاقیکردنەوە ئەفسانەییەکە دەمرن، وەک سەرنجیش دەدەین وێنە شیعرییەکانی شاعیری لێهاتوومان و تاقیکردنەوە ئەفسانەییەکانی لە کات و سەردەم و ناوی کەسایەتی بەدەرن هەر ئەم تایبەتمەندیەشە بابەتەکانی گەش و گۆڵ کردووە و جۆرە رووەت و نەمرییەکی پێداون و لە نرخی جوانکارییەکانی دانەلەنگاندووە.

**سەرچاوە و پەراوێز:**

١- سیسل. دي. لویس- الصورة الشعریة- ترجمة: الدکتور احمد نصیف الجنابي و آخرین- بغداد (١٩٨٢)، ص٢٣.

٢- هەمان سەرچاوە، ل٢١.

* سەلاح شوان- دیوانی [دڵدارەکەم پایزە گەواڵەیەک نییە]- بەغدا (١٩٧٨)- چاپ و بڵاوکردنەوەی- دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی.

# (لێکچوواندن)
# لە ئەدەبی کوردیدا

ئیدریس عەبدوڵلا

## پێشەکی
(لێکچوواندن) (یەکێکە لە کۆنترین شێوەکانی ڕوونبێژی و هۆکارەکانی خەیاڵ و نزیکترینیانە لە تێگەیشتن، بۆیە هەندێکی ڕەوانبێژان بەیەکێکی ئەو هونەرانەیان داناوە، کە قۆناغەکانی یەکەمی وێناندنی ئەدەبی و، پێوەندی دروستکردنی نێوان شتەکانی وەئەستۆگرتبێ) [١].
ئەم هونەرە وەک هەر هونەرێکی تری بێجگەی خۆی، بە قۆناغانێکی زۆر تێپەڕیوە، تیایاندا گەشەی کردووە، فراوان و دەوڵەمەند کراوە، تا وای لێهاتووە بۆ ئەمڕۆ بووە بە یەکێک لە هونەرە زۆر فراوان و هەرە گرنگەکانی ڕوونبێژی.

## پێناسە
گەر بەدوای پێناسەی (لێکچوواندن)دا بگەڕێین لە سەرچاوە ڕەوانبێژییەکان، دەبینین زیاتر لە پێناسەیەکی بۆ کراوە، لەوانە:
- (خەتیبی قەزوینی) وا پێناسەی دەکات، کە: (خستنە ڕووی بەشداریکردنی شتێکە بۆ شتێکی تر لە واتا) [٢].
- (ئەبو هیلالی عەسکەری) دەڵێت: (وەصفدانە بەوەی کەوا یەکێکی وەصفکراوەکان، جێی ئەوی تر دەگرێتەوە بە ئەوزارێکی لێکچوواندن لە شیعرو لەسەرجەم گوتراوی تریشدا، تەنانەت بەبێ ئەوزاریش هاتووە) [٣].
- (تەنوفی) دەڵێت: )(هەوڵدانە بەلێکچوویی، ئەوەش بەشداریکردنی دووشتە لە پەسنێک یان زیاتریان، بەڵام نەک لە هەموو پەسنەکانیان) [٤].
- (بریتییە لە بڕیاردانی ئەوەی، کە یەکێکی دوو شتەکان لە هۆش یان لە هەستدا، شوێنی ئەوی تر دەگرێتەوە) [٥].
- (بریتییە لە پێوەندی نێوان دووشت یان زیاتر، لە یەکێ لە سیفەتەکانیان، یان لە زیاتر لە سیفەتێکیان) [٦].

بە بەرچاوگرتنی هەموو ئەو پێناسانە، دەگەینە ئەو ڕایەی کە (لێکچوواندن): یەکێکە لە هونەرە وشەییەکانی شیعر یان پەخشان، بریتییە لە بەیەکچوواندنی شتێک بەشتێکی تر، لە ڕووێ لە ڕووەکانی لە یەکچوویان، ئەوەش هەندێ جار بە یارمەتی ئەوزارێک و، هەندێک جاری تریش بەبێ یارمەتی ئەوزار دروست دەکرێت.

## بنەڕەتەکانی (لێکچوواندن)
بنەڕەتەکانی (لێکچوواندن) چوارن و، دابەش دەبنە سەر دووبەشی سەرەکی و ناسەرەکی.. کە دەتوانین بەم شێوەیەیان دەستنیشان بکەین:
أ- بنەڕەتە سەرەکییەکانی لێکچوواندن، بریتینە لە:
١- لێکچوو.
٢- لەوچوو.
ب- بنەڕەتە ناسەرەکییەکانی لێکچوواندن، بریتییە لە:
١- ئەوزار.

٢- ڕووی لێکچوواندن.

**پێناسەی بنەڕەتەکان و بەشەکانیان**

- (بنەڕەتی سەرەکی لێکچوواندن): ئەو بنەڕەتەیە، کە وەک گوتمان لە (لێی چوو) و (لەوچوو)دا خۆی دەنوێنێت و، بۆیەش بەسەرەکی دەزانرێت، چونکە بە نەمانی هەریەکە لە (لێی چوو) یان (لەوچوو)ەکە، (لێکچوواندن)ەکە لە دەست دەچێت و، ئیتر ناوی هونەرێکی تری بەسەردا دەبرێت.

- (بنەڕەتی ناسەرەکی لێکچوواندن): ئەو بنەڕەتانەی لێکچوواندنی وێنەی (ئەوزار) و (ڕووی لێکچوواندن) دەگرێتەوە، کە ئەگەر بێت و، لە نموونە (لێکچوواندن)ەکاندا هاتبن، یان هەر نەهاتبن، یان بەتەنیا یەکێکیان هاتبێ، هیچ لە (لێکچوواندن)ەکە کەم ناکاتەوە، بەڵکو ئەگەر نەیەن بەهێزتریشی دەکەن.

- (لێی چوو): شتێکە سیفەتێکی تایبەتی هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەهۆیەک لە هۆیەکان وەک پێویست، بەلای بەرامبەرەکەمان ئاشکرا نییە، دێین بەشتێکی دیکەی دەچوێنین، کە بەلای هەموانەوە، یان هیچ نەبێ بەلای بەرامبەرەوە سیفەتەکەی زۆر ئاشکرایە.

- (لەوچوو): ئەو شتە سیفەت ئاشکرایەیە، کە (لێی چوو)ی پێدەچووێنین.

- (ئەوزار): ئەو ئامرازە ڕێزمانییەیە، کە بۆ بەیەکچوواندنی دوو بنەڕەتە سەرەکییەکانی وەکو (لێی چوو) و (لەوچوو) هەندێ جار پەنای بۆ دەبەین.. ئەمەش جۆری زۆرە لە پاشتردا بە نموونەوە دەیانخەینە ڕوو.

- (ڕووی لێکچوون): ئەو سیفەتەی دوو شتە لێکچووەکانە، کە تیایدا چ (لێی چوو) و، چ (لەوچوو) بەیەک دەچن.

**نموونەی لێکچوواندن**

(لێکچوواندن) بەشێوەیەکی گشتی، وەک گوتمان هەر چوار بنەڕەتەکانی (لێی چوو) (لەوچوو) (ئەوزار) (ڕووی لێکچوون)ی تیایەو، بەهەر چواریان نموونەیەکی لێکچوواندن دروست دەکەن، بۆ وێنە:

- نیشتمان، وەک منداڵ وەنەوزی بۆ نوستن
چێ ئەکا... (محەمەد ڕەنجاو) [٧]

لەم پارچەیەدا:

أ- (نیشتمان): (لێی چوو)ە.
ب- (منداڵ): (لەوچوو)ە.
ج- (وەک): (ئەوزار)ە.
د- چێکردنی (وەنەوز بۆ نوستن): (ڕووی لێکچوون)ە.

جاری واش هەیە لە (لێکچوواندن)دا (ئەوزار) نابێت، بۆ وێنە:

- شیعرم سێبەری شاخانی
بنار و دەشت دادەپۆشێ... (طالب سەرانی) [٨]

لەم دێڕەدا:

أ- (شیعرم): (لێی چوو)ە.
ب- (سێبەری شاخان): (لەوچوو)ە.
ج- داپۆشینی (بنار و دەشت): (ڕووی لێکچوون)ە.
(ئەوزار) نەهاتووە.

جاری دیکەش هەیە، لە (لێکچوواندن)دا، (ڕووی لێکچوون)ەکە ون دەبێت، بۆ وێنە:

- ڕاستییەکان وەک هەڵەکان
هەڵەکانیش وەک ڕاستییەکان.... (محەمەد ڕەنجاو) [٩]

لەم پارچەیەدا، لە دێڕی یەکەم:

أ- (ڕاستییەکان): (لێی چوو)ە.
ب- (وەک): (ئەوزار)ە.
ج- (هەڵەکان): (لەوچوو)ە.

لە دێڕی دووەمیشدا:

أ- (هەڵەکان): (لێی چوو)ە.
ب- (وەک): (ئەوزار)ە.
ج- (ڕاستییەکان): (لەوچوو)ە.

بەم جۆرە دەبینین لە هەردوو دێڕەکان، (ڕووی لێکچوون) نەهاتووە.

جاری تریش دەشێت لە (لێکچوواندن)دا، هەر تەنها (لێی چوو) و (لەوچوو) هەبێت، بەبێ هاتنی (ئەوزار) و (ڕووی لێکچوون)، ئەمەشیان (لە هەموو جۆرەکانی تر بەهێزترە) [١٠]، بۆ وێنە:

- چلوورەی گوێسەوانە، پڵپڵەی زیوی کچە کوردە سەهۆڵ ناوێنەیە، لێکدانەوەی ئەم دووشتە وردە... (پیرەمێرد)[١١] لەم دێڕەدا، دەبینین یەکسەر شاعیر شتێک بەشتێکی تر دەچووێنێ و بڕیار دەدات، کە ئەوەی یەکەم ڕێک ئەوەی دووەمە، ئەمەش لێکچوواندنێکی لە ڕووی کاریگەرییەوە زۆربەهێزە.. (چلوورەی گوێسەوانە): (لێی چوو)ە.. (پڵپڵەی زیوی کچە کورد): (لەو چوو)وە. (ئەوزار) و (ڕووی لێکچوون) نەهاتوون.

**جۆرەکانی لێکچوواندن**

بۆ دەستنیشانکردنی جۆرەکانی لێکچوواندن، دەبێت لە چەند ڕوویێکەوە تەماشای نموونە (لێکچوواندن)ەکان بکەین، ئەوانیش:

یەکەم: لە ڕووی بوونی بنەڕەتەکان:

لەم ڕووەوەش جۆری (لێکچوواندن)مان هەیە، کە بریتینە لە:

أ- لێکچوواندنی ئاسایی

ب- لێکچوواندنی ناتەواو (ئەمەش دەبێتە دوو شێوەی ڕێزمانی و واتایی.
ج- لێکچوواندنی بەهێز
أ- لێکچوواندنی ئاسایی: ئەو لێکچوواندنەیە کە هەر چوار بنەڕەتەکانی لێکچوواندنی تێدایە، بۆ وێنە:
- (... ئەو فانۆسانەی کە بە دەرگای پۆلیسخانەکە و، بەنێوچەوانی سەراو، بەرۆخ جادەکەی ناوەندی گوندا هەڵواسرابوون، وەک چاوی برسییەکان سیس دەئایسان)... (مەم) [١٢]
لەم پارچە پەخشانەدا، هەرچوار بنەڕەتەکان بەرجەستەن، ئەوەتا:
- (فانۆس)... (لێی چوو)ە.
- (چاوی برسییەکان)... (لەوچوو)ە.
- (وەک)... (ئەوزار)ە.
- (سیس)ی ئایسان... (ڕووی لێکچوون)ە.
ب- لێکچوواندنی ناتەواو: ئەمە ئەو لێکچوواندنەیە، کە یەکێک لە دوو بنەڕەتە ناسەرەکییەکانی وێنەی (ئەوزار) و (ڕووی لێکچوون)ی تێدا نەهاتبێ.. جا ئەگەر (ئەوزار) نەهاتبوو، ئەوا بە لێکچوواندنەکە دەڵێین: (ناتەواوی ڕێزمانی) و، ئەگەریش (ڕووی لێکچوون)ە کە نەهاتبوو، ئەوا بە (لێکچوواندن)ەکە دەڵێین: (ناتەواوی واتایی).. بۆ وێنە:
- ڕستەکان دیکتاتۆر بوون
یەکەم پیتیان داگیر کردم... (محەمەد ڕەنجاو) [١٣]
لەم دێڕەدا، سێ بنەڕەتی لێکچوواندن هاتوونە، ئەوانیش:
- (ڕستەکان)... (لێی چوو)ە.
- دیکتاتۆر)... (لەوچوو)ە.
- داگیرکردنی (یەکەم پیت)ە کە.... (ڕووی لێکچوون)ە.
(ئەوزار) نەهاتووە، بۆیە بەم جۆرە لێکچوواندنە دەڵێین: (لێکچوواندنی ناتەواوی ڕێزمانی)، چونکە لە ڕووی ڕێزمانییەوە، ڕستەکە لە بنجدا بریتییە لە (ڕستەکان وەکو دیکتاتۆر بوون)، بەڵام بۆ مەبەستی ئەدەبی و، بۆ ئەوەی لێکچوواندنەکەی کاریگەرتر بێت، شاعیر هاتووە ئامرازە لێکدەرەکەی (وەکو)ی هەڵگرتووە.
ئەگەریش (ڕووی لێکچوون) لە لێچوواندنەکەدا نەهاتبوو، بەلێکچوواندنەکە دەڵێین لێکچوواندنی (ناتەواوی واتایی) بۆ وێنە:
- نەکەی ڕووم لێ وەربگێڕی
یانەخۆ بمخەیتە لاوە
چونکە عومری خۆشەویستی
وەک مۆمێکی داگیرساوە.... (ئازاد دڵزار) [١٤]
لەم پارچە هۆنراوەیە، لە دێڕەکانی سێیەم و چوارەم، نموونەیەکی لێکچوواندن، بەرجەستە دەبێت، پێکدێت لە:
- عومری خۆشەویستی)... (لێی چوو)ە.
- (وەک).... (ئەوزار)ە.
- (مۆمێکی داگیرساو)... (لەوچوو)ە.
(ڕووی لێکچوون) نەهاتووە، بەمەش لێکچوواندنەکە لەڕووی واتاوە ناتەواو دەبێت، ئەگەرچی بە نەهاتنیشی لە هزردا واتاکە هەر بەرجەستە ببێت، بۆیە ناوی دەنێین: لێکچوواندنی (ناتەواوی واتایی).
ج- لێکچوواندنی بەهێز: ئەو لێکچوواندنەیە، کە تەنها لەسەر دوو بنەڕەتە سەرەکییەکانی (لێی چوو) و (لەوچوو) دامەزرێ.. بۆ وێنە:
- ئەیشی وت گیانە:
هۆنراوەکانم کۆترە کێویلەن.. (ئەنوەر قادر محەمەد) [١٥]
(هۆنراوەکانم).... (لێی چوو)ە.
(کۆترە کێویلەن).... (لەوچوو)ە.
(ئەوزار)و (ڕووی لێکچوون) نەهاتوون، بەمەش لێکچوواندنێکی زۆر کاریگەر دروست بووە، بۆیە ناوی دەنێین (لێکچوواندنی بەهێز).
دووەم: لە ڕووی جۆری وشەی (لێی چوو) و (لەوچوو)ەکان:
لەم ڕووەوە چوار جۆر (لێکچوواندنمان) هەیە، کە لە خوارەوە بە نموونەوە ئاماژەیان بۆ دەکەین:
أ- لێکچوواندنی هەستی: مەبەست لە لێکچوواندنی هەستی ئەوەیە، کە هەردوو وشەی (لێی چوو) و (لەوچوو)ەکان بەر یەکێ لە پێنج هەستەکانی مرۆڤ بکەون، لە وێنەی هەستەکانی: (بینین- بیستن- بۆنکردن- تامکردن- بەدەستگرتن).. بۆ وێنە:
- دان و بەخشینیان لەلا باوە
خوونی مەیدانیان لەلا ئاوە... (حاجی قادری کۆیی) [١٦]
لە نیوە دێڕی دووەمدا:
- (خوونی مەیدان)... (لێی چوو)ە.
- (ئاو)..... (لەوچوو)ە:
هەردووکیان، دەبینرێن، تامیان هەیەو، بەردەستیش دەکەون، کەواشبێت لێکچوواندنەکە (لێکچوواندنی هەستی)یە.
ب- لێکچوواندنی ئەقڵی: ئەو لێکچوواندنەیە، کە وشە (لێی چوو) و (لەوچوو)ەکانی، بەر هیچ یەکێک لە پێنج هەستەکان نەکەون، بەتەنیا ئەقڵ پەیان پێببات.. بۆ وێنە:
- ڕەحم و ویژدان و مرووەت ونە وەک شکڵی پەری
تەمەع و غەدر و جەفا، زۆرە وەکو لافاوە... (فانی) [١٧]
لە نیوە دێڕی یەکەم:

- (ڕەحم و ویژدان و مرووەت)... (لێی چوو)ە.
- (شكڵی پەری).... (لەوچوو)ە.

هەمووشیان وشەی ئەقڵێن، چونكە بەر هیچ یەكێ لە پێنج هەستەكان ناكەون، ئەوە نەبێت ئەقڵ پەیان پێدەبات، بۆیە لێرەدا (لێكچوواندنی ئەقڵی) بەرجەستە دەبێت.

٣- لێكچوواندنی هەستی ئەقڵی: ئەو لێكچوواندنەیە، كە (لێی چوو)ەكەی (هەستی) بێ و، (لەوچوو)ەكەی ئەقڵی..

بۆ وێنە:

- ئەم ئاسمانە شینە، كەوا بەرگی ماتەمە
تەحلیلی واكراوە، كە قوبەی غەمە، تەمە... (پیرەمێرد) [١٨]

لە نیوە دێڕی یەكەمی ئەم دێڕە هۆنراوەیەدا:

- (ئاسمانی شین).... (لێی چوو)ە، وشەیەكی لێكدراوی هەستییە، چونكە بەر هەستی بینین دەكەوێت.

لە نیوە دێڕی دووەمیش (قوبەی غەم).... (لەوچوو)ە، وشەیەكی لێكدراوی ئەقڵییە، چونكە بەر هیچ یەكێكی پێنج هەستەكان ناكەوێت.

بۆیە بەم شێوە لێكچوواندنە دەڵێین (لێكچوواندنی هەستی ئەقڵی).

٤- لێكچوواندنی ئەقڵی هەستی: ئەو لێكچوواندنەیە كە (لێی چوو)ی ئەقڵی و (لەوچوو)ی هەستی بێت.. بۆ وێنە:

ئاگری عیشقت لە دڵما هەڵكرا هەروەك سیراج
حاڵی خۆم ئاگورمەوە، ئەمڕۆ بەشاهی و تەخت و تاج... (خادیم) [١٩]

لە نیوە دێڕی یەكەمدا:

- (ئاگری عیشقت)... (لێی چوو)ە، وشەیەكی ئەقڵییە، چونكە بەریەكێ لە هەستەكان ناكەوێت.
- (سیراج)... (لەوچوو)ە، وشەیەكی هەستییە، چونكە بەر هەستەكانی دەست و چاو دەكەوێت.. كەواشبێت لێكچوواندنەكە، (لێكچوواندنی ئەقڵی هەستی)یە.

سێیەم: لە رووی ژمارەی وشە (لێی چوو) و (لەوچوو)وەكان:

لەم ڕووەوە دەتوانین دووجۆر لێكچوواندن جیا بكەینەوە، ئەوانیش (لێكچوواندنی یەكسان) و (لێكچوواندنی نایەكسان)ن.

أ- لێكچوواندنی یەكسان: ئەو لێكچوواندنەیە كە ژمارەی وشە (لێی چوو) و (لەوچوو)ەكانی بە یەكسانی و، بەهێندەی یەك هاتبن. بۆ وێنە:

+ لێكچوواندنی یەكسانی یەك بەیەكی: ئەو لێكچوواندنەیە، كە (لێی چوو)ەكەی لەیەك وشە پێكهاتبێ و، (لەوچوو)وەكەشی لەیەك وشە پێكهاتبێ، بۆ وێنە:

- عەشقت خوێنە
بە دڵما هات و چۆ دەكا.... (فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی) [٢٠]
(عەشقت)... (لێی چوو)ە... (خوێن)... (لەوچوو)ە.

+ لێكچوواندنی یەكسانی دوو بەدوویی: ئەو لێكچوواندنەیە ژمارەی وشە (لێی چوو)ەكانی دوو وشەو، ژمارەی وشە (لەوچوو)ەكانی دوو وشە بن، بۆ نموونە:

- مەرگ و ژین میثلی سێبەر و تاوە
ئەوی باقی بمێنێ تەنیا ناوە... (حاجی قادری كۆیی) [٢١]

لە نیوە دێڕی یەكەمدا:

- (مەرگ) و (ژین)... دوو (لێی چوو)ن. لە بەرامبەریان بەریزە:
- (سێبەر) و (تاو) هاتووە، كە دوو (لەوچوو)ن، بەمەش ئەو لێكچوواندنی بۆمان بەرجەستە بووە (لێكچوواندنی دوو بەدوویی)یە.

بەهەمان شێوە دەشێت لێكچوواندنی سێ بەسێیی و.. تادیش، هەبێت.

ب- لێكچوواندنی نایەكسان: ئەو لێكچوواندنەیە كە تیایدا ژمارەی وشە (لێی چوو) وەكان، زیاترە لە ژمارەی وشە (لەوچوو)وەكان، یان بەپێچەوانەوە.. بۆ نموونە:

- ئێوارانێ
وەك دوو مەلی
ئاوارەی بێ لانەو جێگا
ئەبووینە دوو
ڕێبواری ماندووی سەر ڕێگا... (فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی) [٢٢]

لەم پارچەیەدا، (ین)ی فرمانی (ئەبووین)، ڕاناوی لكاوی كەسی یەكەمی كۆیە، بۆ (من و تۆ) دەگەڕێتەوە و، لە بنجدا شاعیر گەرەكیەتی بڵێ:

- ئێوارانێ
من و تۆ
وەك دوو مەلی... تاد

بەڵام لەبەر سووكی دەربڕین، كورتبڕی هۆنراوەكەی، ئەم دوو ڕاناوە سەربەخۆیەی (من و تۆ)ی هەڵگرتووەو، تەنیا بە ڕاناوی لكاوی (ین) وازی هێناوە.. بۆیە ئێستا:

- (ین).. (لێی چوو)ە.
- (دوو مەلی ئاوارەی بێ لانە و جێگا).. (لەوچوو)ی یەكەمە.
- (دوو ڕێبواری ماندووی سەر ڕێگا)... (لەوچوو)ی دووەمە.

لەم نموونەیەشدا لە بەرامبەر یەک (لێی چوو) دوو (لەوچوو) هاتووە.. بەڵام جاری واش هەیە ژمارەی وشە (لێی چوو)ەکان زیاترن، لە ژمارەی وشە (لەوچوو)ەکان، بۆ وێنە:

- پڵنگ و کەمتیار و ورچ و گورگ و شێر خەریکن وەک
قولنگ و قاز و لەق لەق یەک بەلانە، یەک بەهێلانە... (چروستانی) [٢٣]

لەم دێڕەدا:

- (پڵنگ) و (کەمتیار) و (ورچ) و (گورگ) و (شێر)... (لێی چوون)، کە پێنج وشەن.
- (قولنگ) و (قاز) و (لەق لەق)... (لەوچوو)ن، سێ وشەن.. کەواشبێ، لێکچوواندنێکی نایەکسانی پێنج بەسێی لەو دێڕەدا بەرجەستە دەبێت.

چوارەم: لە ڕووی بوونی ڕێزمانی وشە (لێی چوو) و (لەوچوو)ەکان:

لەم ڕووەشدا ئەو جۆرانەی لێکچوواندنمان هەیە:

أ- لێکچوواندنی (ڕاناو) بە (ناو): ئەو لێکچوواندنەیە، کە (لێی چوو) (ڕاناو)و، (لەوچوو) (ناو) بێت.

- ئێوارانێ
وەک سێبەر شوێنم دەکەوتی... (فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی) [٢٤]

(ی) کۆتایی فرمانی (دەکەوتی)، ڕاناوی لکاوی کەسی دووەمی تاکە، شوێنی (تۆ)ی گرتۆتەوە (لێی چوو)ە، (سێبەر) ناوە (لەوچوو)ە.

ب- لێکچوواندنی (ڕاناو) بە (ڕاناو): ئەو لێکچوواندنەیە کە (لێی چوو) و (لەوچوو)ی (ڕاناو) بن..

- تۆش وەکو من
ڕێبواری ڕێی
عەشقێکی گەورە و پیرۆز بووی... (فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی) [٢٥]

(تۆ)... (لێی چوو)ە.. (من).. (لەوچوو)ە، هەردووکیان دوو ڕاناوی سەربەخۆن (تۆ) بۆ کەسی دووەمی تاک و، (من) بۆ کەسی یەکەمی تاک.

ج- لێکچوواندنی (ناو) بە (ڕاناو): ئەو لێکچوواندنەیە، کە (لێی چوو)ی (ناو)و، (لەوچوو)ی (ڕاناو) بێت، بۆ وێنە:

- هۆنراوە تۆی
خورپەیەکیت، بەناخی شاعیرێتیمدا
دێیت و دەڕۆی
بۆ کوێ دەڕۆی؟... (فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی) [٢٦]

لەم پارچەیەدا: (هۆنراوە) ناوە (لێی چوو)ە.. (تۆ) ڕاناوی سەربەخۆی کەسی دووەمی تاکە، (لەوچوو)ە.

د- لێکچوواندنی (ناو) بە (ناو): ئەو لێکچوواندنەیە، کە (لێی چوو) و (لەوچوو)ی (ناو) بن:

- وەک شەڵتە پەین، گەهـ پڕو گەهـ خالییە بەطنت
صەوم و ئەمەلت باعیسی نەفس وشکەمت بوو.. (نالی) [٢٧]

لەم دێڕەدا: (بەطن) ناوە (لێی چوو)ە، (شەڵتە پەین) ناوێکی ترە، لێکدراوە (لەوچوو)ە.

## شێوازەکانی لێکچوواندن

(لێکچوواندن) دوو شێوازی سەرەکی هەیە ئەوانیش ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆنە، وەک لە خوارەوە بە نموونەوە ئاماژەیان بۆ دەکەین:

أ- لێکچوواندنی ڕاستەوخۆ: ئەو لێکچوواندنەیە، کە نووسەر لە دەربڕینەکەیدا ڕاستەوخۆ دروستی دەکات، ئەوەش بەچەند شێوەیەک:

+ (لێی چوو) پێش (لەوچوو) دەکەوێت، کە ئەمەش زۆربەی جارەکان لە لێکچوواندندا، ئەو بنەڕەتانە هەروا ڕیز دەبن، بۆ وێنە:

- ئێوە نەمامی باغێکن
بە دەستی ئێمە نێژرابن... (کاکەی فەلاح) [٢٨]

لەم دێڕەدا: (ئێوە)... (لێێ چوو)ە، (نەمام)... (لەوچوو)ە.

+ جاری واش هەیە، لەبەر پێویستی شیعری، شاعیر (لەوچوو) دەخاتە پێش (لێی چوو) بۆ وێنە:

- جارجار بۆیە مات و پەستم
وەک پەڕەی گوڵ وایە هەستم... (کاکەی فەلاح) [٢٩]

لەم دێڕەدا (هەستم).. (لێی چوو)ە، شاعیر خستوویەتییە دوا وشەی کۆتایی دێڕەکەی، بەڵام (پەڕەی گوڵ) کە (لەوچوو)ە شاعیر خستوویەتیە پێشەوەتر.

ب- لێکچوواندنی ناڕاستەوخۆ: ئەو لێکچوواندنەیە، کە تیایدا نووسەر یان شاعیر لە قۆناغی یەکەمی دەربڕینەکەی ئاماژە بۆ (لێی چوو) دەکات، دواتر بەهۆیەک لە هۆیەکانەوە وەک پرسیارکردنی بەرامبەر لە (لێی چوو)ەکە، یان ویستی نووسەرەکە لە درێژە پێدان و، یان بەهەر هۆیەکی تر، لە قۆناغی دووەمدا، یان ڕاستتر بڵێین، لە ڕستەی دووەمدا، ئاماژە بۆ (لەوچوو)ەکەش دەکات، بۆ وێنە:

- ئەمیرێ ماوە پادشایە، گوتی: کێیە؟ گوتم: شێرە
گوتی: لێرە؟ گوتم: لێرە، هەتا تاران و هیندستان.... (حاجی قادری کۆیی) [٣٠]

لێرەدا شاعیر، سەرەتا باس لە (ئەمیر)ێک دەکات کەوا لە ژیاندا ماوە، بەڵام دوای ئەوەی بەرامبەرەکەی

پرسیاری ئەوەی لێدەکات، کە ئەو ئەمیرە کێیە؟
ئینجا شاعیر درێژە بەقسەکەی دەدات و بە (شێر)ی دەچوێنێت.. بەمەش (ئەمیر) دەبێتە (لێی چوو)... (شێر) دەبێتە (لەوچوو)ی.

**ئامرازەکانی لێکچوواندن**

ئامرازەکانی لێکچوواندن، ئەو کۆمەڵە وشەیەن، کە یارمەتی دروستبوونی نموونەکانی (لێکچوواندن) دەدەن.. هەیانە بەتەنیا وشەیەکە، وەکو: (وەک، وەکو، هەروەک، هەروەکو، میشلی... تاد).. هەیانە پیتە، وەک: (انه).. هەیانە (گری)یەکە لەوێنەی: (بە چەشنی.. بەشێوەی... تاد).. هەشیانە رستەیەکە لەشێوەی: (لێبووە.. بووە.. ئەڵێی... تاد) بۆ نموونە:

١- وەک: ئەرکی رۆژانەی وانەکەم
وەک ئاو و دۆ رەوان دەکەم... (کاکەی فەلاح) [٣١]

٢- وەکو: وەکو هەنگ حەز بەشاخ ئەکەم
تاسەی بۆنی گوڵباخ ئەکەم... (کاکەی فەلاح) [٣٢]

٣- هەروەک: ئەگەر بێت و بنووسم، شەرحی هیجرانم لەسەر کاغەز ئەسووتێنێ هەناسەی حەسرەتم، هەروەک شەرەر کاغەز... (خادیم) [٣٣]

٤- هەروەکو: سەدای (یاحەیی)ی دەروێشان لە ترسی زوڵفی پرچینی
لە عیسا عەرصەیی گەردوون، بە تەنگ هات هەروەکو دەرزی... (حاجی قادری کۆیی) [٣٤]

٥- ئاسایی: هۆگری تۆم
تۆش رووبار ئاسایی بەرەو بەندەری تەمومژ
هەنگاو ئەنێی... (ئەنوەر قادر محەمەد) [٣٥]

٦- میشلی: لە دڵدا ئاتەشی عیشقت بڵێسەی میشلی تەندوورە
شەطی ئەشکم نەبێ مانیع، دەسووتێم دەبمە کۆی نوورە... (نالی) [٣٦]

٧- میشالی: موناسەبەی ئەو و لەیلا، میشالی دێو و پەری
موشابەهەی ئەو و عەزرا، غەزال و جاموسی... (حاجی قادری کۆیی) [٣٧]

٨- ئاسا: کیژۆڵەکەم گوڵ ئاسایە
زیتەڵ و گورج و وریایە... (باوکی ئازیز) [٣٨]

٩- رەنگ: پاشای بابان جیهانگیری
رەنگ رۆستەمی زالی پیری [٣٩]

١٠- چون: گیج سەر کاروان جەسەردی بن کەیل
بۆ مەدان چون بۆی، بێ وەفایی لەیل... (مەولەوی) [٤٠]

١١- انە: بۆ ئەو پەیرەوە ملکەچم
تاکو شێرانە دەرئەچم.... (کاکەی فەلاح) [٤١]

١٢- چەشنی: گوتەی چەشنی شەکر وایە
خوا بیپارێزێ تەنیایە... (باوکی ئازیز) [٤٢]

١٣- بە چەشنی: دڵم بە چەشنی ئاوێنە
سپی و رووناک و خاوێنە... (کاکەی فەلاح) [٤٣]

١٤- بووە: (جریوە جریوەکەشیان لە گوێیدا بووە زیرە زیر...)(عەزیزی مەلای رەش) [٤٤]

١٥- لێبووە: (وای لێهات جێگاکەی خۆی لێبووە جەهەننەم و، دڵی بەرەوستی نەدا، کە چیدیکە کاتی لێ بەسەر بەرێت...) (عەزیزی مەلای رەش) [٤٥]

١٦- ئەکەم: هۆنراوە و چەپکی خەمم
ئەکەمە گوڵ بۆ کچێ... (ئەنوەر قادر محەمەد) [٤٦]

١٧- ئەبێتە: کە شەو دادێ ئاسمانی شین پێدەکەنێ
لە باوەشییا مانگ ئەبێتە گۆرانیبێژ... (ئەنوەر قادر محەمەد) [٤٧]

١٨- دەبینە: ئێمەش دەمرین، دەبینە خاکی سەر رێ
ئەو رۆژ شەوە تەنوری صوبحی دەگەرێ... (حاجی قادری کۆیی) [٤٨]

١٩- ئەڵێی: ناخی دەروونم بێگەردە
ئەڵێی نێرگسی ناو هەردە... (کاکەی فەلاح) [٤٩]

٢٠- بوو بوو: ئەمشەو خەونم پێتەوە دی
لە خەوما بووبووی بە پەری... (فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی) [٥٠]

٢١- عەینەن: (...ئەو بەرگەی لەبەر بووکێیان کرد، لەبەرچاوی خۆی عەینەن کفن بوو، کە سواریان کرد، وەیزانی بەرەو قەبرستانێی دەبەن.)[٥١]

٢٢- کت ومت: (... ژنە کت ومت دێو بوو، لۆیە منداڵەکە زۆر ترسا، دەستی کردە گریانێ و، پێی بەغارێ وەنا...) [٥٢]

٢٣- دەتگوت: (... بەڵام چ ماینە کوێت، دەتگوت حەیاتە...) [٥٣]

٢٤- وەکی: دوێنێ شەو ئاسکە پەمەییەکان سەردانیان کردم
چونکە ماوەیەک بەر لە هەناسەکانی رەشەبا، منیان بەسەر تەنافەکانی مەنفاوە بینیبوو وەکی تۆێکڵە پرتەقاڵێک... (ئیسماعیل حەمە ئەمین) [٥٤]

٢٥- بەمەثەل:
خاکی بەری پێت گەر بدەنە دەستی سولەیمان
ئەیکاتە دوو دیدە بە مەثەل سورمەیی جەوهەر [٥٥]

٢٦- ئەچێ: ئەحواڵی ئەم زەمانە لە کایەی مناڵ ئەچێ
دنیایەکی چ پووچەڵە کە لە زەرفی بەتاڵ ئەچێ [٥٦].

**ئەنجام**

لەم لێکۆڵینەوەیەماندا، گرنگترین ئەوانەی بۆمان دەرکەوت، دەکرێت، لەم خاڵانەی خوارەوەی کورت بکەینەوە:

١- هونەری لێکچوواندن یەکێکە لە کۆنترین

هونەرەکانی ڕوونبێژی، کە قۆناغەکانی یەکەمی وێناندنی ئەدەبی و، پێوەندی دروستکردنی نێوان شتەکانی بەرجەستە کردووە.

٢- لە ڕووی بنەڕەتەکانی لێکچوواندنەوە، لێکچوواندن، سێ جۆری هەیە، ئەوانیش: (ئاسایی) و (ناتەواو) و (بەهێز)ن.

٣- (ئەوزار)ەکانی دروستکردنی (لێکچوواندن) لە کوردیدا یەکجار زۆرن و، زیاترن لە بیست و پێنج (ئەوزار).

٤- ئەدەبی کوردی بەشێوەیەکی گشتی، چ لە شیعر و چ لەو بابەتە ئەدەبییانەی کە بە پەخشان دادەڕێژرێن، بەشێوەیەکی فراوان، (لێکچوواندن) بەکار دەهێنێ و بەهۆیەوەی بەرهەمەکانی بەپێزتر کردووە.

**سەرچاوەو پەراوێزەکان:**


١- فنون بلاغیة، د. ئەحمەد مەطلوب، چاپی یەکەم، کوەیت، ساڵی ١٩٧٥، ل/٢٧.
٢- تلخیص المفتاح، ل٤٧٣.
٣- علم البیان، ل٦٤.
٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل/ ٦٢.
٥- فنون بلاغیة ل/ ٣١.
٦- فنون بلاغیة ل/٣٣.
٧- دارمانی خەونەکان، محەمەد ڕەنجاو، چاپی یەکەم، سلێمانی/ ١٩٩٨، ل/٧٥.
٨- بلاوکراوەی (بینایی)، ژمارە (٥)، ئازاری ٢٠٠٠، قەزای (سۆران)، شێخ طالب سەرانی.
٩- دارمانی خەونەکان، ل/٢١.
١٠- ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا د. عەزیز گەردی، بەرگی یەکەم، بەغداد ١٩٧٢، ل/ ٦٠.
١١- دیوانی پیرەمێرد، محەمەد ڕەسووڵ هاوار، چاپی یەکەم، بەغداد، ١٩٦٨،ل/١٣٦.
١٢- پایزە خەون، محەمەد مەولوود مەم، بەغداد ١٩٨٧، چاپی یەکەم ل/٤٣
١٣- دارمانی خەونەکان ل/٥٣
١٤- دیوانی ئازاد دلزار، ل/٣٥.
١٥- زریان ئەنوەر قادر محەمەد چاپی یەکەم ل/٥٦
١٦- دیوانی حاجی قادری کۆیی ئا: سەردار میران و کەریم شارەزا.
١٧- دیوانی فانی، فانی پشدەری، چاپی یەکەم، ل/ ٢١١.
١٨- دیوانی پیرەمێرد، ل/١٠٣
١٩- دیوانی خادیم، ل/ ١٢١
٢٠- ڕۆژان دەڕواو تۆ هەر خۆشەویستی منی، فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی، چاپی یەکەم، ل/ ٣٠
٢١- دیوانی حاجی قادری کۆیی.
٢٢- ڕۆژان دەڕواو تۆ هەر خۆشەویستی منی، ل/ ٤٨
٢٣- دیوانی چروستانی، ئا: عەبدولڕەحیم و ساڵح عەبدوڵلا چروستانی، چاپی یەکەم سلێمانی، ١٩٨٥، ل/٨٦
٢٤- ڕۆژان دەڕواو تۆ هەر خۆشەویستی منی، ل/٤٧
٢٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل/٤٧
٢٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل/ ١٦
٢٧- دیوانی نالی، ئا/ عەبدولکەریمی مودەریس و فاتیح عەبدولکەریم، بەغداد/ ١٩٨٠
٢٨- چرۆ، کاکەی فەلاح، ل/١٢
٢٩- چرۆ، ل/٣٢
٣٠- دیوانی حاجی قادری کۆیی.
٣١- چرۆ، ل/ ٦
٣٢- چرۆ، ل/٩
٣٣- دیوانی خادیم، ل/٢٨
٣٤- دیوانی حاجی قادری کۆیی، ل/١٥٩
٣٥- زریان، ل/٤٦
٣٦- دیوانی نالی، ل/٤٠٦
٣٧- دیوانی حاجی قادری کۆیی، ل١٦١
٣٨- کەشکۆڵ، دەستنووس باوکی ئازیز
٣٩- زمان و ئەدەبی کوردی، قۆناغی چوارەمی ئامادەیی گشتی، ل/١٢١.
٤٠- ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی یەکەم، ل/٣٣
٤١- چرۆ، ل/٧
٤٢- کەشکۆڵ دەستنووس.
٤٣- چرۆ، ل/٨
٤٤- بۆرەی قەپلان، عەزیزی مەلای ڕەش، چاپی یەکەم، ل/٨.
٤٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل/٨
٤٦- زریان، ل/٤٣
٤٧- زریان، ل/٢٧
٤٨- دیوانی حاجی قادری کۆیی، ل/١٥١
٤٩- چرۆ، ل/٨
٥٠- ڕۆژان دەڕواو تۆ هەر خۆشەویستی منی، ل/٥٩
٥١- هونەری لێکچوواندن، ئیدریس عەبدوڵلا، دەستنووس.
٥٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٥٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٥٤- گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (٤٦)، نیسانی (٢٠٠٠)، ئیسماعیل حەمە ئەمین.
٥٥- ئەحمەد بەگی صاحێبقران، دیوانی حەمدی، (چ:١) سلێمانی، ١٩٨٤، ل/٧٠.
٥٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل/٤١٠.

# دەلاقەیەک بەسەر پێناسەی مۆدێرنیزم (١)

تۆنی پیکنی
و/ لە فارسییەوە: ئیسماعیل ئیسماعیل زادە
(کوردستانی ئێران)

لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە بەم لاوە مۆدێرنیزم (نوێخوازی) وەکو زاراوەیەکی گشتی لە مێژووی کولتووریدا، نیشاندەری کۆیەکی زۆر ڕەنگاو ڕەنگ و بەرفراوانە لە پچڕان و ئەو کەلەبەرە جوانیناسانەیەی تووشی سوونەتی ڕیالیزم (واقعخوازی)ی ئەوروپا هاتووە. لە دەقە نوێخوازەکان (شیعر، چیرۆک، هێلکاری، بیناسازی، ئاهەنگسازی و...تاد)دا فۆرمی جوانناسی ئیتر بە شێوەی ڕوون و ئاشکرا، دنیای کۆمەلایەتی دەرەکی نیشان نادا، بەلکو وەکو بابەتێکی هەلگری سەرنج بە کەلکەلە، یان هۆگریەک دادەنرێ، بە تایبەتی لە شوێنێکدا کە تەنانەت ڕەنگە «ڕاستیەک» پێک بێنێ کە سەردەمایەک وەکو ئاوێنە نیشانی دەدا. شوێنی سەرهەلدان و دەسپێکی بزووتنەوەی نوێخوازی کە تارادەیەک لەسەری کۆکن، یەکیان سالی (١٨٤٨)ە، دوای سەرکوتی دڕندانە و بێڕەحمانەی شۆڕشەکانی ئەوکات نووسین و ئەدەبیاتی کلاسیک، یان واقعخواز لە بەرهەمەکانی «شارل بۆدلێر» (٢) و «گوستاف فلووبێر» (٣)دا هەلقولی کە پڕبوون لە کێشە و قەیران. دووەم سالەکانی (١٨٨٠)ە لەنێوان ئەم سالانەدا ژمارەیەکی زۆر لە ئەزموونخوازی جوانناسانە سەری هەلێنا: لە ناتۆرالیزم (سروشتخوازی)(٤)ەوە بگرە تا دەگاتە سەمبولیزم(٥)، کوبیسم(٦)، ئیکسپێرسیونیزم(٧)، فوتۆریزم (داهاتووخوازی)(٨)، «Constructivism» (٩)، قوتابخانەی ڤۆرتیسیزمی(١٠) ئینگلیزی بزووتنەوەی ئۆبستره و زەینی کە لە چەمکەکانی قوتابخانەی کوبیسم و فوتۆریزم پێکهاتووە و لە دەوروبەری سالەکانی (١٩١٢ هەتا ١٩١٥)دا خولقا، سوریالیزم(١١)، دادائیزم(١٢) و باقی قوتابخانە و بزووتنەوە ئەدەبی و هونەریەکان. بەڕای زۆری نووسەران و بیرمەندان، لووتکە و گەشەی نوێخوازی [مۆدێرنیزم] سالەکانی (١٩١٠ هەتا ١٩٣٠)یە و دوای [مۆدێرنیزم] دەنگی هونەرمەندە نوێخوازەکان لە ئالمانی هیتلەری و ڕووسیای ستالینیدا قوخەبڕ کرا و خودی ئەوانیش بە مەرگ مەحکووم کران و لە باقی شوێنەکانی ئوروپاش کردەوەیەک لە بەرامبەر جوانناسیی واقعخواز- لە هونەردا سەرنجدان بە بەپرسایەتی و بەلێنی کۆمەلایەتی بەجێی ئەزموونە تاکییەکان- وەکو وەلامێک بۆ جەمسەر بوونی سیاسی لە ڕادەبەدەری ئوروپا، ڕاوەستا.

ئەوەی کە ئایا دەتوانرێ لەنێو زۆربەی داهێنان و تازەگەریە سەرنجڕاکێشەکانی جوانناسی کە لە ماوەی ئەم سالانەدا خولقان، تایبەتمەندییەکی گرینگی گشتی و تاک جیابکەینەوە، گومان هەیە: بەشێک لە بزووتنەوە و قوتابخانە نوێخوازەکان دەستیان کردووە بە ستایشی داهاتوویەکی پشت ئەستوور بە پیشەکاری، تەکنەلۆژیا،

هەڵسووڕان، گەشەسەندن لە کۆمەڵگای شارەکان، بەشێکی تر لە بزووتنەوەی مۆدێرنیستی و نوێخواز دەڕوانیتە سەردەمای زێڕینی ڕابردووی دەستەیی (Gemeinschaft)ی سەرەتایی کە بەشێوەی شهوودی و ئیشراقی هاوسەنگ و هاوئاهەنگی سروشت بوون. تاقمێکیش هەوڵیاندا هەتا بیچم و قەوارەی جوانناسیەکی تایبەت بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن، هەڵبەت لەو شوێنەوە کە ژیانی هاوچەرخیان بۆ خود وەکو قاڵب و چوارچێوەیەک دەستنیشان کردبوو. بەم پێیەش شێوە جوانناسییەکانی مەبەستی ئەوان دەبوایە زۆر کامڵ، بەرفراوان هەمەگرین، لە بەرامبەر ئەم دەستەیەشدا نوێخوازێک بوون کە هەوڵیان دەدا هەتا لەم بزووتنەوە بەرین و هێرشبەرە بەشێک لەو توخمانە دەرکێشن کە کەمکردنەوە خوازێکی کامڵن، دەرکەوت و ئیلهام گەلێکی زوو تێپەڕن، مایکۆی دوو ڕستەیی خەیاڵخوازە، شانۆنامەی بیست چرکەیی ساموێیل بێکت و ئەو هێلکاریانەی کە تارادەیەک کاڵ و بەتاڵ و بێ وێنەن، لەلایەکی ترەوە گشت ئەم نوێخوازانە لە ڕوانگەی سیاسییەوە هەڵگری هەڵوێست گرتن، خواست، ڕێ هەڵبژاردن و مەبەست و بەرنامەی جیاواز و شێوا و دژواز بوون:

لە قوتابخانەی نوێخوازیی فۆتۆریزمی ڤلادیمیر مایاکۆفسکی-ەوە کە داهاتی خۆشی بۆ بەشەڤیزم نیشان دا هەتا نوێخوازیی فیلیپۆمارینێتی کە لایەنگریی لە موسولینی کرد، لە ئیکسپێرسیۆنیزمی گاتفریدبین-ەوە کە پشتیوانی هیتلەر بوون، هەتا خۆنیشاندانی توندوتیژ و ڕادیکاڵانەی ئێرنێست تۆلێر کە بەرەو بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی چەپ دەڕۆیشت. ڕەنگە تەنیا شتێکی کە لەلایەن هونەرمەندانی ئەم دەورەیەوە قبووڵ کرا و تێیدا هاوبەشی و لێ نزیکبوون، سەرنجی لە ڕادەبەدەر بە فۆرمی جوانناسانەیە (کە ئەویش لە ڕوانگە و هەڵوێستی ئایدیالۆژیە جیاوازەکان و جاری واشە دژ بەیەک هێزی وەبەردەنرێ). تایبەتمەندیەکانی پێناسەی تایبەتی مۆدێرنیزم بریتییە لە داڕشتنی بزووتنەوەیەک لەدڵی کێشە و قەیراندا. قەیرانێکی کولتووری و کۆمەڵایەتی کە تایبەتمەندیە کلیل-یەکانی ئەوانەن: دەرکەوتنی کولتووری جەماوەری و توێژی کرێکار و خەباتی فیمینستی، تەکنۆلۆژیا نوێیەکانی دەسکەوتی دووەم شۆڕشی پیشەکاری و ئەزموونی هەمەگری شارە گەورە ئیمپریالیستیەکان.

لە ماوەی ئەم ساڵانە، لەنێوان بزووتنەوە جیاوازەکانی مارکسیزمدا مشت و مڕێکی گەرم و بەهێز سەبارەت بە گرینگی و شوێن و جێگەی مۆدێرنیزم هاتە ئاراوە کە لە قاڵبی بزووتنەوەی ناسراو بە «کێشەی ئیکسپێرسیونیزم»ی ساڵانی دەیەی (١٩٣٠)دا گەیشتە قۆناغی گەشەی خۆی. مارکسیستە مەزنەکان وەکو «گیۆرگ لۆکاچ» بەهۆی وەلانانی ئەو مەعریفەناسیەی کە ڕەنگدانەوەی هەیە و (فۆرمالیزمی) خودبینانە و ئاڵۆزەوە، سوونەتی بێ کرێی تایبەت و ئەزموونی قورسی دەروونی لەبەرامبەر وێنەی کامڵی تاک کە لە کۆمەڵگا ڕیالیزمەکەیدا دەینەخشاند و هەروەها بەهۆی وەپێش خستنی نوستووره لە بەرامبەر مێژوودا، مۆدێرنیزمی شەرمەزار و ڕەت کردەوە. باقی مارکیستەکان لەوانە «والتەر بێنیامین»، «بێرتوڵت برێخت» و «تیودۆر ئادۆرنۆ»، هەر کام بەپێی هۆگەلێک و بە ڕادەی جیاواز پێشوازیان لە بزووتنەوەی نوێ کرد، ڕەنگە بتوانرێ بەرهەمەکانی ئەوان بە زیاتر لە چەشنی «مارکسیزمی نوێخواز» بزانرێن هەتا لە چەشنی «مارکیسزمی سەبارەت بە نوێخوازی». لە ساڵەکانی دواتردا ئەم خاڵە کەوتە بەرباس و لێکۆڵینەوە کە لە کولتووری مۆدێرنیستیدا خودی داکۆکیکردن لەسەر فۆرم دەورێکی زاڵی سەبارەت بە کامڵبوونی ماتریالیزمی «ڕۆژئاوایی»، یان دیالیکتیکی لە بەرامبەر ماتریالیزمی «ڕۆژهەلاتی»، یان میکانیکی، نیشان دا- ڕەنگە بتوانرێ کتێبی «مێژوو و هۆشیاریی چینایەتیی لۆکاچ» بە پاژی بابەتی یەکەم دابنرێ [Lunn، ١٩٨٥].

لە ماوەی بیست، یان هەر ئەوەندە ساڵە تێگەیینی ئێمە لە مۆدێرنیزم دیسان بە دەرکەوتنی پاش مۆدێرنیزم- لەپێشدا لە مەیدانی بیناسازی، بەڵام دواتر لە باقی لقە کولتووریەکاندا- گۆڕدراوە. پاش مۆدێرنیزم پێش هەموو شتێک لە بەرامبەر مۆدێرنیزمدا خۆی پێناسە کرد. ئەگەرچی [مۆدێرنیزم] لە تەواوی هەرێمی ئەزموونی سەردەمای پێشوودا هەڵبژاردنێکی کەم ڕەنگە، بەڵام بەسەر پێناسەکانی ئەم دواییانەی ئێمە لە جوانناسی پێشڕەوی سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا زاڵ بووە. لە حاڵی حازردا ئەو شتەی کە بە شێوەی مۆدێرنیزمی لێهاتووە شتێک نییە بێجگە لە: بیناسازیی کارکردخوازیی سەختگرانە و قورسی «لوکوربوزنە» (١٣) و شێوازی نێونەتەوەیی(١٤)، یان بیناسازیی «ڤالتێرگروپیوس» (١٥) و بیناسازیی «باوهاوس» (١٦) بەبێ هیچ چەشنە خشڵ و جوانکاری و هەر چەشنە ئیمتیاز بۆ تاکبوونی مرۆڤایەتی، لە ڕوانگەی

پێکهاتەییەوە بەشێوەی یەکدەست لە هێڵکەلی ڕاست دارێژراوە- کە لە تەکنیک و پێکهاتەکان (پۆلا و چیمەنتۆ باشیەکی تایبەتیان هەیە)، حاڵەتی هونەری دیارە.

بەم شێوەیە جوانناسینی مۆدێرنیست دەتوانێ لەسەر چەشنی دابەشکردنی دوو چەشنی بلیمەت بێن «هونەری زۆر باش» و (کولتووری جەماوەری) دابنێ، ڕواڵەت و سەردەرانە بریقەدار و سپییەکان و سەربانە ڕێک و پێکەکانی «لوکوربوزیە» لە بەرامبەر بینانزمەکان و پۆلێ خانووی شارنشینی دەوروبەر دادەنرێن. ئەم پێناسەیە لە مۆدێرنیزم (یان ئەو شتەی کە بەشێک لەگەیانەنووسان پێی دەڵێن «مۆدێرنیزمی زۆرباش») بە ڕادەی پێویستی ئەو بارەو بار دەکرێ کە بەشێک لە ئەزموونەکانی هاوچەرخ وەخۆ دەگرێ- بۆ وێنە شیعرەکانی «تی، ئێس، گلیەت» کە لە ڕادەبەدەر «دژوارە و «ڕەمزاویی، ئەو ئەزموونانەی کە لە ڕاستیدا لە زۆر شوێنی ترەوە کەمتر خاڵی هاوبەشیان لەگەڵ بیناسازی نێونەتەوەیی هەیە.

لە بەرامبەر ئەمەشدا ئێمە شاهیدی چەواشە و کۆچێکی خێراین لە مۆدێرنیزم. سەرهەڵدانی پاش مۆدێرنیزم لە کۆتاییەکانی (١٩٦٠) پێش هەموو شتێک خۆی وەکو چەشنێ «پۆپۆلیزم» پێشکەش کرد. چەشنێ گەڕانەوە بەرەو سوونەتە نەناسراوەکان، سوونەتە ناوچەییەکان، تەنانەت ئەو سوننەتە بازرگانیانەی کە پۆلێک وەخۆ دەگرن. هەڵبەت دوای ماوەیەکی زۆر سەرگەردانی و چەواشەبوون لەبلیمەتخوازییەکی پێشڕەو کە بە هیچ چەشنێ ئاشت بوونەوەی نییە.

ڕاگەیاندراوەکانی پاش مۆدێرن سەردێری نامۆ و بە دوور لەزەینیان هەیە، وەکو فێربوون لە «لاس و گاس» و «باوهاوس»ەوە هەتا «ئاوڕهاوس» [ماڵی ئێمە] (From Bauhaus to our House) کە لەواندا زیاتر سەرنجی دەدایە هاوئاهەنگی پیت و وتە و هاوکێش بوونی سەرواکان، هاندەر یان هەوێنی سەرەکی تری توخمەی «مێژووخوازی» بوو. گەڕانەوەیەکی بەکاوەخۆ بەرەو شێوازە چەند هەندیییەکانی ڕابوردوو وەک سەرچاوەی ئیلهامدەر بۆ سەردەمای هەنووکە، هەڵبەت بەجێی شەرمەزارکردنی ئەوان بەنێوی تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوو و عاقڵانە بوونی کارکردخواز.

هاوتای ئەم چەشنە پێشکەوتووییە بیناسازیانە لە بواری چیرۆکە خەیاڵییەکاندا هەمان شتە کە «لیندا هاچن» پێی دەڵێ «ئەوپەڕی چیرۆکی مێژوونووسانە» و نووسەرانێک وەکو «گابرێ گارسیا مارکیز»، گۆنتەرگراس»، «جان فۆلز»، ئەی، ئیل دکترۆف» و «سەلمان ڕوشدی» لە سیما ناسراوەکانی ئەم بزووتنەوەیەن.

چیرۆک و ڕۆمانی لەم چەشنە دەگەڕێنەوە سەربیچمی گشتی و پێش بنەمای چیرۆک، «Plot»، مێژوو یان پێشینەی گشتی چیرۆک و بابەت و سەرچاوە. ئەو بابەتانەی کە لە ڕواڵەتدا سەردەمایەک بەهۆی کەڵکەڵەی زۆری چیرۆکە خەیاڵیە [Fictional] مۆدێرنیستیەکان بۆ سەربەخۆیی دەق و هەستکردنبوون ڕەتکراونەتەوە، هەڵبەت بەبێ وەلانانی ئەم کەڵکەڵە و سەرقاڵیی زەینیە «ئەو پەڕچیرۆکی، یان ئەو پەڕ خەیاڵی» [Metafichional]، دەرەنجامی ئەوە بریتییە لە چەشنێک، یان ژانرێکی- Poradoxical، یان دژواز کە تێیدا مێژوو بە تەواوی قبووڵ و پشتگری کراوە، لە هەمان حاڵیشدا کێشە دروست دەکا.

بەگشتی «پاش مۆدێرنیزم» بە چەشنێکی سەرنجڕاکێش و هاندەر، ئاسۆی نوێی لە بەرامبەر (Cultural)، شێوازە لە بیرکراوەکان، یان سەرکوتکراوی ڕابردوو نیشان داوە و هەروەها تیشکی خستۆتە سەر ئەو دەنگانە، یانی بزووتنەوەی ژنان، لاوان، قولەڕەشەکان و بزووتنەوە و سەرهەڵدانی شۆڕشەکانی جیهانی سێیەمی کە لەسەردەمای هەنووکە داخراونەتە نێو پەراوێزەوە. لە فەلسەفەدا ئەم هەڵسەنگاندنە پۆزەتیڤەی دەنگەکان، ئەزموون و گێڕانەوەکانی تر کە بکەونە بەرامبەر «ئەوپەرگێڕانەوە مەزنەکان»، بیچمی شک و گومانیان بەخۆوە گرتووە، ئەو پەرگێڕانەوە گەلێک کە بەشوێن پێی سەرهەڵدان و کامڵبوونی زانست لە ڕابردوو دادەنرێن.

گێڕانەوە مەزنەکانی ڕۆشنگەری هاوڕێ لەگەڵ عەقڵی گشتی و جیهانییەکەی کە بەسەر خورافەپەرستی و خەیاڵدا زاڵ بوو و هەروەها مارکسیسەکان هاوڕێ لەگەڵ ڕوانگەکەی بۆ پرۆلتاریا بەنێوی توێژی کرێکارانی جیهانی وەکو چوارچێوەیەکی سپی هەندەسی گروپیوس، یان لوکوربوزیە بەنێوی دەرکەوتی عەقڵانیبوونی تۆتالیتەرەکە لە بەرامبەر کەمترین ناکۆکی، نارەزایەتی، دژایەتی، یان پلوڕالیزمدا خۆڕاناگرێ. بە پێچەوانە فەلسەفەی پاش مۆدێرن زیاتر لە هەمووان لە بەرهەمەکانی «ژان فرانسوا لیوتار»دا لەسەر ڕێژەییبوونی ناسین و ڕێژەییبوونی زانست و کەوتنە ژێر کاریگەریی دەق داکۆکی دەکا و دەیەوێ بەجێی «عەقڵ»، «حەقیقەت» یان «گشتیبوون» لە «کایە زمانیە ناوچەییەکان»ی ڤیتگشتاین بدوێ.

له روانگەی پاش مۆدێرنیزمدا مارکسیزم هەمیشە لە بارمتەی بەرنامە [پرۆژە]ی سەرکوتگەری مۆدێرنیتە دایە کە بێرەحمانە مێژووە راستەقینەکان بە مێژووی داسەپاوی بزووتنەوەی چینایەتی، یان شێوەکاری بەرهەم هێنان بەرتەسک دەکاتەوە. مارکسیستەکان بە تاوانبارکردنی پاش مۆدێرنیزم بە رێبازی «لاساییکردنەوە و رووتووسکردنەوەی بەرهەمەکانی مامۆستایانی تکنیک و شێزوفرینی و بزرکردن و مەحالکردنی مێژوو لە رووبەڕووبوونەوەی بزووتنەوە گەلێکی هێدی، یان سەرنج سڕینەوەیەکی قوول لە بکەری ناسێنەر بەشێوەیەک کە هێزی هەرچەشنە کردەوەیەکی سیاسی [یان هەر چەشنێکی تر] یان لێ ستاندۆتەوە و دژ بەپاش مۆدێرنیزم راوەستاون. هەر بەو جۆرەی کە ئەم تاوان و دژی تاوانانە نیشانی دەدەن، دژایەتیەکانی نێوان مارکسیزم و پاش مۆدێرنیزم زۆر تایبەتمەندی هاوبەشیان لەگەڵ کێشەکانی پێشووی نێوان مۆدێرنیزم و سیاسەتە مارکسیستەکاندا هەیە و هەنووکە بەهەمان پێویستی بەدوایانەوەن کە شوێن پێی کێشەکانی مۆدێرنیزم و مارکسیزم لە سالآنی دەیەی (١٩٢٠ و ١٩٣٠) هەڵدەگیرا. ئەگەر بەرچاوترین بزووتنەوەی پێشکەوتوویی ئەوکات [دەیەکان] کێشەی وروژێنەری مشت و مڕی دڵتەزێن نەبوو، بەڵکو دەرکەوتنی چەشنێ «مارکسیزمی نوێخواز»ی لەبار لە ولاتی هیچ کەس (١٧) [کەس نەزان] لەنێوان بنکە دژەکان بوو. بەم شێوەیە ئێستاش ئێمە هەست بە خۆگرتنی سەنتێز و مارکسیزمێکی پاش نوێخوازین کە دەتوانێن نیشانەکانی لە بەناوەندبوونی کت و پڕی جوگرافیا لە موتالا کولتووریەکانی مارکسیزمدا ببینێن بۆ جێ کردنەوە، یان رێک و پێککردنی باسەکانی پانتا و شوێن لەنێو گریمانەی مارکسیستیدا، پاش مۆدێرن بە گشتی لەسەر بەرتەسکی، یان (Locality) یان بنەما و نێوەرۆک داکۆکی دەکا ئەویش بەبێ بەختکردنی کەڵکەڵە سیاسیەکانی مارکسیزم.

**پەراوێزەکان:**

1- Tony Pinkney, An Introduction to the Definition of Modernism, in Tom Bottomore(ed), <<A Dictionary of Marxist Thought>>3rd revised edn, (Onford: Blackwell 1996) pp.

٢- شارل بۆدلێر (١٨٢١-١٨٦٧) شاعیر و رەخنەگری ئەدەبی و هونەری فەڕانسەیی، ئەو پێی وابوو کە هیچ چەشنە جوانیەکی کامڵ و گشتی، یان هەمەگر کە هەموو کەس قبوولّی بکا، بوونی نییە، بەڵکو جوانی لەلای جەماوەر و کولتوورەکانی تر جیاوازە. لەلایەکی ترەوە تاکبوونی هونەرمەند بۆ خولقانی جوانی دەوری سەرەکی هەیە و ئەگەر ئەم تاکبوونە سەرکوت بکرێ، یان پێشی پێ بگیرێ ئەوکات هونەرتووشی ناحەزی دێت: «جوانی دائیمە سەمەرە و نامۆیە» پەندێکی ناسراوی پێشینیانە «بۆدلێر» ئەم خواستەی پێ دروست نەبوو کە هونەر دەبێ لە خزمەت مەبەستی کۆمەلآیەتی، یان ئەخلاقیدا بێ. ئەو یەکێک لە رێبەرانی قوتابخانەی «هونەر بۆ هونەر» بوو. «بودلێر» پێی وابوو کە توانایی پێگەیین و گەشەی هەر هونەرمەندێک لە رووی توانایی ئەو هونەرمەندە بۆ کێشانەوە و زەینی کردنی «قارەمانخوازی»ی ژیانی مۆدێرن هەڵسەنگێندرێ.

زۆربەی رەخنەگران ناوی «باوکی مۆدێرنیتە»، یان خولقێنەری مۆدێرنیزمی جوانناسی لە هونەردا لەسەر بودلێر دادەنێن. «دەیڤید هارڤێ» پێی وایە بۆدلێر یەکەم کەسێ بوو کە لە وتاری گرینگی خۆی «شێوەکاری ژیانی مۆدێرن» (١٨٦٣) لە چەند رستەی تایبەتدا مۆدێرنیتەی پێناسە کرد لە راستیدا بەرێژەوە لە سەری دوا: مۆدێرنیتە چەشنی گواستنەوە و تێپەڕینە، بزووتنەوەیەکی بێ گرێ و کورتخایەن و مەرجدارە، نیوەی هونەرە و نیوەکەی دی هەرمانە، بێ سەرەتا و کۆتاو نەگۆڕە.

(وەرگێڕی فارسی)

٣- «گوستاف فلوبێر»، (١٨٢١-١٨٨٠) رۆماننووسی فەڕانسەیی، بەهۆی شێوازی وردبینانە و شێوەی گێڕانەوە، یان گێڕانەوەی ئەناسیا و عەینی لەنێو چیرۆکەکانیدا بەنێو بانگە. ناسراوترین چیرۆکی ئەو «مادام بوڤاری» (١٨٥٧)-ە کە چیرۆکێکی واقعخوازانەی تاڵە لە ژیانی بورژوازی. (و.ف).

٤- «ناتۆرالیزم»: ئەم زاراوەیە باسی شێوەیەک لە کاری هونەری دەکا کە لەودا هونەرمەند هەوڵ دەدا هەتا شت و دیاردەکان نەک بەشێوەیەکی شێوازی، یان چەمکی، بەڵکو هەر بەو شێوەیەی کە لە قەوارەی خۆیدا دەبیندرێن، نیشان بدا. ئەم زاراوەیە یەکەم جار لە ساڵی (١٦٧٢)ز لەلایەن «جیوڤانی بی پێترۆبلوری»، (١٦١٥-١٦٩٦) نووسەر و هونەرمەندی ئیتالیایی لەسەر قوتابخانەی شێوەکاریی لایەنگرانی «مایکل ئانجلومریسی دوکار واجیو» (١٥٧١-١٦١٠) بەرچاوترین شێوەکاری ئیتالیایی سەدەی حەڤدە دانرا.

«کارا واجیست»ەکان باوەڕیان بەکۆپیکردن وردبێن و

وەفادارانەی سروشت هەبوو. جا لە ڕوانگەی ئێمەدا چ ناحەزبن یان جوان. بەم حاڵە ناتۆرالیزم ئارمانیکردنی سروشت ڕەت ناکاتەوە. بۆ وێنە لە ڕوانگەی ئاناتۆی لەشی مرۆڤەوە پەیکەرە یۆنانیەکان دەتوانن ناتۆرالیستی بن، بەڵام لەو سەرەوە کە دەتوانێ پێوانەیەک بێ بۆ چەشنی جوانی لە دنیای ئاسایی و ڕۆژانە دوورە، بەم پێیە ئارمانی ئیدەئالیستیە. و. ف.

٥- «سەمبولیزم»: بزووتنەوەیەکە لە مەیدانی شیعر، ئەدبیات و هونەر کە لە ساڵی (١٨٨٠) لە فەڕانسەوە وەڕێکەوت و لە دەیەی (١٨٩٠)-دا بە شیعرەکانی «مالارمێ» و «ڤێرلێن» بەوپەڕی خۆی گەیشت، مەبەستی ئەم بزووتنەوەیە بە تایبەتی لە مەیدانی شیعردا وروژاندن و وەخەبەر هێنان بوو نەک تەنیا ناساندن. سەردێڕەکەشی شوێنەوار هەڵگرتن، شهوود، هەست و عاتیفەکان بوو. لە ڕاستیدا دەوانرێ سەمبولیزم بە چەشنێ کردەوە لە بەرامبەر مەبەستە سروشتخوازەکانی قوتابخانەی ئیمپرسیونیزم و هەروەها هاوتای ڕیالیزم بزانرێ کە «گوستاف کوربە» (١٨١٩-١٨٧٧) شێوەکاری فەڕانسەیی و بناغە دانەری قوتابخانەی شێوەکاری واقعخوازی فەرانسە دایڕشتبوو، ئەو پێی وابوو کە شێوەکاری تەنیا دەبێ باسی ئەو شتانە بکا کە بە دەستەوەن و ڕاستەقینەن». لە بەرامبەردا سەمبولیستەکان هەوڵ دەدەن هەتا وێنەیەکی زەینی بەشتە شاراوە و ڕەمزیەکان ببەخشرێن کە دەدرکێن.

بە باوەڕی شاعیران لەنێوان ڕیتمی ئەو وشانەی کە لەکاردەکرێن لەگەڵ مانای (وشەکان) هاو ئاهەنگی و نزیکایەتی هەیە. بەم پێیە شێوەکارە سەمبولیستەکان-یش وایان بیردەکردەوە کە ڕەنگ و هێڵ بە تەنیایی دەتوانن نیشاندەری ڕوانگە و بۆچوونەکان بن. ڕەخنەگرە سەمبولیستەکان سەرنجیان دەدا بە کێشانەوەی ئەو هێلانەی لیک دەچن و دۆزینەوەی هاوتەریبی لەنێوان لقە جۆراوجۆرەکانی هونەردا، بۆ وێنە شێوەکاریەکانی «ئۆدیلون ڕێدۆن» (١٨٤٠-١٩١٦) یان لەگەڵ شیعرەکانی «بۆدلێر» و ئیدگار ئالان پۆ» و هەروەها مۆسیقای «کلۆد دیبۆسەر» بەراورد دەکرد. بەم پێیە سەمبولیستەکان لە بەرامبەر پێناسە، یان لێکۆڵینەوەی ڕاستەوخۆ و هەڵسەنگاندنی روون و ئاشکرا، دەربڕین و شرۆڤەکردن وەپێش دەخەن. بەپێی شێوەی کار و دەستوری شێوازخوازانە، هونەرمەندانی سەمبولیست دژایەتی گەورەیان لەگەڵ یەکتری هەبوو: بۆ وێنە «گوستاف مورۆ نا» (١٨٢٦-١٨٩٨) کە لە هونەرمەندان و شێوەکارە ناسراوەکانی قوتابخانەی سەمبولیزم بوو، لەژێر کاریگەریی ڕۆمانتیزمی ڕەمز ئاسا (exotic)ی مامۆستای خۆی «تیۆدۆر کاسی ڕی یو» (١٨١٩-١٨٥٦)دا شێوەکاری دەکرد. لە حاڵێکدا «پیپەر پڤوی دوشاوانە» (١٨٢٤-١٨٩٨)ی فەڕانسەیی کە لەسەر دیوار شێوەکاری دەکرد، بە شێوەی کەمڕەنگ، بزر، کپ و بێدەنگ و لە هەمان حاڵدا مات و خەمۆک کارەکانی نیشان دەدا. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەم بزووتنەوەیە دەربڕینی هەستی ئایینی بوو. لە هەمانکات لە بەرهەمی سەمبولیستەکاندا سەرنج و کەڵکەڵە لە بەرامبەر بابەتگەلێک وەکو مەرگ، نەخۆشی و تاوان-یش دەبیندرێ. ئەم قوتابخانەیە بە گشتی لەگەڵ نێوی فەرانسە گرێ دراوە، بەڵام بوو بە بزووتنەوەیەکی بەرینی نێونەتەوەیی و هونەرمەندانێک وەکو «سێرئیدوارد کولی بێرن» «جۆنز»ی شێوەکار و هێڵکاری ئینگلیسی و «ئیدوارد مانج»ی شێوەکار و خەڕاتی کاری نۆرویژی بە بەشێک لەم بزووتنەوەیە دادەنرێن. (و.ف).

٦- کوبیسم لەو بزووتنەوە هونەریانە (لە شێوەکاری و تارادەیەک لە پەیکەرتاشیدا)یە کە لەلایەن پیکاسۆ (١٨٨١-١٩٧٣) و ژۆرژ براک (١٨٨٢-١٩٦٣)-ەوە داهێنرا. یەکەم وێنە و شێوەکاریە کوبیسم-یەکان لە ساڵی (١٩٠٧)ەوە پێشکەش کران. لە کوبیسمی شیکاریدا شکڵ-ەکان بە پاژی سادەی هەندەسی دابەش دەکرێن و ڕوانگە و دیدی جیاواز سەبارە بە شتێک بەسەریەکەوە نیشان دەدەن. لە کوبیسمی پێکهاتەییدا کە لە ساڵی (١٩١٢)ەوە دەستی پێکرد زۆر جاران پاژی جیاوازی شتەکان وەکو ڕۆژنامە، شەمچە، جگەرە و.. تاد بۆ شێوەکاری تێکەڵاوی یەکتر دەکرێن.

٧- ئیکسپرسیونیزم: زاراوەیەکە لە ڕەخنە و مێژووی هونەردا کە نیشاندەری کەڵک وەرگرتنە لە دەستکاری و گەورە نیشاندان و سانسۆری شوێنەوارە عاتیفی و ئیحساسیەکان: ئیکسپرسیونیزم بەشێوەی جۆراو جۆر و جیاواز لەکار دەکرێت و دەتوانین لە بابەت شێوە جیاوازەکانی هونەردا کاری پێبکەین، بەڵام بە گشتی لەگەڵ هونەری دیداری و بیستن ئاوێتە بوو. ئیکسپرسیونیزم لە مانای گشتی و بەرفراوانی خۆیدا بۆ هەموو هونەرێک لەکار دەکرێت، بەڵام هەستەزەینییەکان دەخاتە ئەوپەڕی بینینە عەینییەکان و ئەو وێنانە نیشان نادا کە لەدنیای دەرەکیدا لەگەڵ بینینەکانی ئێمە یەکتر دەگرنەوە، بەڵکو زیاتر حاڵەتە زەینیەکانی هونەرمەند

دەدرکێنێ. لە لایەکی ترەوە وشەی ئێکسپرسیونیزم بە بزووتنەوەیەکی بەرفراوانی هونەری مۆدێرنی ئەورووپا دەگوترێ کە شوێنی سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە سەر ڤنسان ڤان گۆک. ئەو هەوڵی دەدا هەتا بە کەڵک وەرگرتن لە ڕەنگ و هێڵ، بە شێوەیەکی هەستیارانە و عاتیفی ژان و ئازاری سامناکی مرۆڤ نیشان بدا. بە واتایەکی تر وشەی ناوبراو بە بزووتنەوەیەک دەگوترێ کە لە ساڵی (١٩٠٦ هەتا ١٩٣٠) لە مەیدانی هونەری ئەڵماندا هێزی زاڵ بوو. لووتکەی ئێکسپرسیونیزمی ئەڵمان لەبەرهەمی هونەرمەندانی گرووپی «پڕۆل» [Die Brucke/The] و گرووپی «شینە سوار» [Die Blaue Reiter]دا دەبینرێ. ئەم بزووتنەوەیە لەگەڵ بەرهەمەکانی «ڤاسیلی کاندیسکی»دا لە سەڵت [ئینتزاع- تجرید]-ەوە هەڵقوڵی.

٨- فۆتۆریسم: بزووتنەوەی هونەری پێشڕەوی ئیتالیا کە لە ساڵی (١٩٠٩)دا لەلایەن «ڤیلیپۆ توماز و مارینێتی» شاعیری ناسراوی ئیتالیایی دامەزرا. فۆتۆریسم لە بنەڕەتدا بزووتنەوەیەکی ئەدەبی بوو، بەڵام کەسایەتیە دیارەکانی (ئەم بزووتنەوەیە) شێوەکار بوون وەکو «جیا کوموس باللا» (١٨٧١-١٩٥٨)، «ئومبێرتۆ بۆچیونی» (١٨٨٢-١٩١٦)، «لوئیجی رسۆیللۆ» (١٨٨٥-١٩٤٧) و جینو سیوێرینی» (١٩٦٠-١٨٨٣). بێجگە لەوە لە مەیدانی بیناسازی، پەیکەرتاشی، مۆسیقا، سینەما و وێنەگریدا خۆی نیشاندا. مەبەستی ئەم بزووتنەوەیە کە لە ڕاگەیاندنە جۆراوجۆرەکاندا ئاشکرا کرابوو، دابڕان بوو لە ڕابردوو و کولتووری ئاکادیمیکی و ڕێزدانان بۆ گەشەکردن، دەسەڵات و تەکنۆلۆژیای مۆدێرن. نیشاندان و پێشکەشکردنی ئەم بزووتنەوەیە بە یەکێک لە کەڵکەڵە سەرەکییەکانی شێوەکارە فۆتۆریستەکان دادەنرا و بەرهەمەکانیان زۆرجاران «لە سەڵت»ەوە نزیک دەبۆوە.

هەڵبەت فۆتۆریسم وەکو بزووتنەوەیەکی ڕێکخراو لە ساڵی (١٩١٦)دا بە مردنی «بوچیونی»- گەورەترین کەسایەتی فۆتۆریسم- لێک هەڵوەشاوە، بەڵام شوێنەواری بەرچاوی لەسەر بزووتنەوەی فۆتۆریستی ڕووسیا [کەسایەتیەکانی بریتین لە: ناتالیا گنچاروفا» (١٨٨١-١٩٦٣)، میخایل لارینوف» (١٨٨١-١٩٦٤) و «کازیمیر مالیڤیچ» (١٨٧٨-١٩٣٥)] و هەروەها لەسەر قوتابخانەی «ڤۆرتیسیزم»ی ئینگلیس و «کریستۆفێر ریچارد وانیە نیڤیسۆن» گەورەترین شێوەکاری فۆتۆریستی ئینگلستان) دانا. لە فەرانسەش» مارسێل دوشان» و «رابیرت دلانی» لەبەربڵاوترکردنەوەی قوتابخانەی فۆتۆریسم بەشداربوون. «دادایستەکان» یش بەتایبەت لەکەڵک وەرگرتن لە شێوە پڕ کێشەکانی خۆیاندا تارادەیەکی زۆر لەژێر کاریگەریی فۆتۆریسمدا بوون.

٩- «Constuctirism» یان بزووتنەوەی هونەری «سەڵت» لە ڕووسیا کە لە ساڵی (١٩١٣) لەلایەن «ولادیمیر تاتلین» (١٨٨٥-١٩٥٣) داڕێژرا. ئەو لەگەڵ برایانی «ئانتوان پڤسنێر» (١٨٨٦-١٩٦٢) و «نائوم گابو» (نائوم نیمیا پڤسنێر، لە ساڵی (١٩١٥)دا نازناوی گابو-ی بۆ خۆی هەڵبژارد.). [(Naum Gabo (Neemiap. -١٨٩٠-١٩٧٧] دوو کەس لە شێوەکار و پەیکەرتاشە ناسراوەکانی ڕووسیا لە ساڵی (١٩٢٠)-دا مانیفێستی واقعخوازی خۆیان چاپ کرد کە یەکێک لە بەرنامە و حوکمەکانی ئەوان خوڵقاندن و داڕشتنی هونەر» بوو. ئانتوان پڤسنێر برا گەورەی ئاگوم گابو (پڤسنێر) بوو کە لە ساڵی (١٩٣٠)ەوە خۆی نیشتەجێی فەرانسە کرد. ئەو و براکەی بە یارمەتی و دەوری چالاکی «تاتلین» لە بناغەدانەران و پێشڕەوانی سەرەکی قوتابخانەی «Constuctir» لە هونەری شێوەکاری و پەیکەرتاشی دادەنرێن. نێوی قوتابخانەی «Constuctirism» لە سەردێڕی سەرەکی یەکێک لە بەرنامەکانی مانیفێستی ڕیالیستی ئەوان، یانی لە چەمکی «دروستکردنی هونەر» وەرگیراوە. برایانی پڤسنێر ئەم بۆچوونەیان قبووڵ نەبوو کە هونەر دەبێ لە خزمەت مەبەستێک دابێ کە بۆ کۆمەڵگا پڕ بایەخ و کاریگەرە و هونەری سەر لەبەر زەینی-یشان ڕەت دەکردەوە کە نیشانەدەری تەکنۆلۆژیای مۆدێرن بوو. ئەو لە کەرەسەی پیشەکاری وەکو پلاستیک و شووشە کەڵکی وەردەگرت (تاتلین)ی شێوەکار، داڕێژەر و پێکهێنەری بینا ئینتزاعیەکان کە زۆر جاران وەکو باوکی (Constuctirism) ناسراوە، لە (١٨) ساڵیدا خەریکی شێوەکاری بوو و هەتا ساڵی (١٩١٤) ئاوێتەی ژیانی دەریایی بوو. زۆربەی شێوەکاریە سەرەتاییەکانی ئەو زیاتر تایبەت بوون بە بابەتە دەریاییەکان کە لە گرینگترینەکانیان دەتوانین ئاماژە بکەین بە گەمیەوان (وێنەی خودی شێوەکار) لە موزەخانەی لینینگراد (١٩١١-١٩١٢). لەساڵی (١٩١٠)دا ئەو لە چەندین پێشانگەی بەرهەمە پێشڕەوەکان لە ڕووسیادا بەشداری کرد و لەگەڵ گنجارسروفا و لارینوف کە [تاتلێن] یان بە منداڵ دەزانی، هاوکاری نزیکیان بوو. تاتلین لە ساڵی

(١٩١٤)دا چووە بەرلین و پاریس و چاوی بە پیکاسۆ کەوت کە لەدوای ساڵی (١٩١٤)دا ئیلهامبەخشی خولقانی چەندین بەرهەمی ئەو بوو. تاتلین و ئەلکساندر رادچنکۆ (١٨٩٢-١٩٥٦) شێوەکار، پەیکەرتاش و وێنەگری رووسی لەو هونەرمەندانە بوون کە بەرنامەکانی Constuctirism- یان دەربارەی میحمار و دارێژەری [پیشەکاری] بەکارهێنا. لە ساڵی (١٩٢٢)دا گابو و پڤسنێر دوای ئەوەی قوتابخانەی (Constuctirism) لەلایەن حکومەتی شوراکانەوە مەحکووم کرا، رووسیایان بەجێ هێشت و لەگەڵ باقی شاربەدەرەکان بۆ گەشە و فراوانکردنەوەی ئارمانەکانی قوتابخانەی (Constuctirism) بۆ سەرانسەری ئەورووپا هەوڵیان دا. بۆچوون و دەنگ و بەرهەمی ئەوان شوێنەواری قووڵی لەسەر باوهاس لە ئەڵمانیا، دوستیژێل لە هۆڵەندە و دەستەی داهێنەری ئینتیباعی لە فەرانسە دانا.

١٠- «ڤۆرتیسیزم» لەو بزووتنەوە هونەریە پێشرەوانەی ئینگلستان بوو کە زۆری تەمەن نەکرد و رێک پێش شەڕی یەکەمی جیهانی سەری هەڵدا. کەسایەتی سەرەکی ئەم بزووتنەوە هونەریە «وندهام لوویس» (١٨٨٢-١٩٥٧) شێوەکار، چیرۆکنووس و رەخنەگری ئینگلیسییە کە ماوەی حەوت ساڵ لە پاریس ژیا، لە ساڵی (١٩٠٩)-دا گەڕاوە بۆ ئینگلستان و زۆر هەڵسوور و چالاکانە خەریکی کارە هونەریەکانی خۆی بوو. لە ساڵانی پێش شەڕدا دەورێکی گرینگی بۆ خۆگرتنی بزووتنەوەی هونەری «سەڵت» [ئینتزاعی] و پێشرەوی بریتانیا گێڕا. ئەو ماوەیەکی کورت لەگەڵ «داجێرفرای» (رەخنەگر و شێوەکاری ئینگلیسی) لە کارگەی ئۆگادا هاوکاری کرد. لە ساڵی (١٩١٤)-دا «ناوەندی هونەری شۆڕشگێڕانە»ی دامەزراند کە هەر لەوێدا بزووتنەوەی ڤۆرتیسیزم سەری هەڵدا.

ناوبراو لە کەسایەتیە مەزنەکانی ڤۆرتیسیزم و سەرنووسەری بڵاوکراوەی ئەم بزووتنەوەیە بەنێوی «Blast» بوو. ئەو دواتر رایگەیاند کە «ڤۆرتیسیزم» لە راستیدا شتگەلێک بوو کە من بۆ خۆم لە دەورەیەکی تایبەتدا گوتبووم، یان بەرێوەم بردبوو»، بەڵام باقی ئەندامانی بزووتنەوەکەش لەگەڵ شێوازی نیوە ئینتزاعی و ماشێن ئاسای راجێرفرای هاورێ بوون. لەوانە دەتوانین ئاماژە بە شێوەکارانێکی هەڵکەوتوو بکەین وەکو ڤۆدزورس»، «نێڤنسۆن»، رابێرتس» و پەیکەرتاشانێک وەکو «ئێپێستین» و «گودیە»- بێرێژسکا»، ڤۆرتیسیزم شوێنەواری لە رادەبەدەری لە کوبیسم و فۆتۆریسم هەڵگرتبوو. نێوی ڤۆرتیسیزم لەلایەن ئەزراپاوند-ی شاعیرەوە دانرا، ئەمەش رەنگە ئاماژە بە بۆچوونێک بێ کە (ئۆمبێرتۆبۆچیوڤێنی- ١٨٢٢-١٩١٦) شێوەکار، گریمانەنووس و تاکە پەیکەرتاشی بزووتنەوەی فۆتۆریسم گوتبووی کە خولقانی هەرچەشنە بەرهەمی هونەری دەبێ لە حاڵەتی گەردەلوولی عاتیفی-یەوە، سەرهەڵێنێ. تەنیا پێشانگایەک لە بەرهەمە هونەریەکانی ئەم بزووتنەوەیە لە ساڵی (١٩١٥)دا دانرا و خودی بزووتنەوەکەش نەیتوانی لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا بەردەوامی خۆی راگرێ. ئەو کارانەی لە ساڵی (١٩٢٠)دا لە ژێر نێوی «دەستەی X» بۆ ژیاندنەوەی ئەم بزووتنەوەیە ئەنجام دران هیچ دەرئجامێکیان نەبوو و نەزۆک مانەوە. بەم حاڵە ڤۆرتیسیزم گرینگییەکی زۆری بۆ لەخۆگرتنی یەکەم هەوڵە رێکخراوەکان بۆ دانانی زەین لە مەیدانی هونەریی بریتانیا نیشان دا. هەروەها دواتر شوێنەوارێکی بەهێزی بۆ سەقامگیر و کامڵبوونی مۆدێرنیزمی بریتانیا بوو.

١١- «سوریالیزم» بزووتنەوەیەک لە هونەر و ئەدەبیات کە لەفەرانسەدا پێرۆکە بوو و لە ماوەی ساڵانی دەیەی (١٩٢٠) و دەیەی (١٩٣٠)دا گەشەی سەند و نیشاندەری چەشنێ هۆگریە بە رەگەز و بابەتی سەیر و نامۆ، خەیاڵی، دژ و ناعەقڵانی. سوریالیزم لەسەرەتادا وەکو بزووتنەوەیەکی خەباتکارانە، بەشێوەیەکی شۆڕشگێرانە بۆ ئەندێشەکردن و ئەنجامدان و لە راستیدا بە چەشنێ شێوەی ژیان دادەنرا، نەک ئەوەی بە کۆیەک لە روانگە شێواز خوازانەکان بزانرێ. بەم پێیە لەم رووەوە لە دادائیسم دەچوو کە بەسەرچاوەی بنەرەتی [سوریالیزم] دەناسرا. ئەگەرچی هەردووک بزووتنەوەکە دژی عەقڵخوازی بوون، بەڵام سوریالیزم بە پێچەوانەی «دادا» کە پووچخواز و نەهلیستی بوو، بە بزووتنەوەیەکی باش و پۆزەتیڤ دادەنرا. (ئاندرێ بریتۆن- ١٨٩٦-١٩٦٦) شاعیر، نووسەر و رەخنەگری فەرانسەیی کە گەورەترین گریمانەنووسی ئەم بزووتنەوەیە بوو، یەکەم مانیفێستی سوریالیزمی لە ساڵی (١٩٢٤)دا چاپ و بڵاوکردەوە و دوای ئەوە خەریکی بڵاوکردنەوەی گۆڤارێک بوو بەنێوی «شۆڕشی سوریالیستی». دووەمین مانیفێستی سوریالیزمی ئەو لەدوایین ژمارەی ئەم بڵاوکراوەیە لە بەفرانباری (١٩٢٩)دا چاپ کرا، بەڵام کتێب و وتارگەلێ جۆراوجۆری تری سەبارەت بە سوریالیزم نووسی. «بریتۆن» مەبەستی لە بزووتنەوەی سوریالیزم «جێبەجێکردنی پێکهێنانی مەرج و بارودۆخە دژوازەکانی

خەیاڵ و ڕاستەقینەی پێشوو و هەروەها گۆڕینی ئەوان بە ڕاستەقینەیەکی تەواو، یان ڕاستەقینەیەکی بەرفراوان و بەهێز» بوو. ئەو و باقی ئەندامانی بزووتنەوەکە سەرنجیان دەدا بە بۆچوونەکانی فرۆید سەبارەت بە نەسکرد و نیوەنەستکرد و پێوەندییەکانی ئەم دووانە لەگەڵ خولیا و خەون، بەڵام شێوەی ئەوان بۆ دۆزینەوەی هاندەرەکان و هەستی خەوتوو و هەروەها بۆچوون و خەیاڵەکان بە تەواوی لەگەڵ شێوەی فرۆید جیاواز بوو. هەڵبەت هەرچەندە داکۆکی و ویستە دووپاتەکانی «بریتۆن» بەرچاو بوو، بەڵام لەنێو ئەندامانی بزووتنەوەکەدا وەها یەکێتییەکی بیروبۆچوون نابیندرێ. بەجێتی ئەوانە کەم و کوڕی، ناکامی، جیاوازی بیروبۆچوون، مشت و مڕ دەرکران لە گرووپ و هێرشی ئەندامان بۆ سەر یەکتر، تایبەتمەندی ناسراوی بزووتنەوەکە بوو. لە سوریالیزمدا بەگشتی دەکرێ ئاماژە بە سێ جۆرە خۆنیشاندانی جیاواز بکەین.

أ- لە لایەکەوە بەشێک لە هونەرمەندان شێوەگەلی جیاوازیان بۆ وەلانانی کۆنترۆڵ و چاودێریی ئاگادارانە خولقاند. بۆ وێنە «ماکس ئیرنێست» (١٨٩١-١٩٧٦) هونەرمەندی ئەڵمانی لە ساڵی (١٩٥٨)دا چوو بۆ فەرانسە و بوو بەیەکێک لە کەسایەتیە ناسراوەکانی سوریالیزم، (ئاندرێ ماسۆن- ١٨٩٦-١٩٨٧) شێوەکار، پەیکەرتاش و نووسەری فەرانسەیی و (خوان میرۆ- ١٨٩٣-١٩٨٣) شێوەکار و هێڵکار و گرافیستی ئیسپانیایی لە ساڵی (١٩١٩)وە زۆربەی ژیانی لەپاریس تێپەڕکردن و لە ئەندامانی سەرەکی (بزووتنەوەی سوریالیزم بوو، بەڵام لەژێر کاریگەریی فۆبیسم، کوبیسم (ئەو لە دۆستە نزیکەکانی پیکاسۆ بوو) و داداییسم-یشدابوو.

ب- لە لایەکی ترەوە تاقمێک لە هونەرمەندان لە شێوەکاریەکانی خۆیاندا بە دەوودڵی و سەرنجی لە ڕادەبەدەر و وەبەرچاوگرتنی تەواوی پاژەکان هەوڵیان دەدا چەشنێ هەستی وەهمی لە ڕاستەقینە بەو وێنانە ببەخشن کە هیچ چەشنە مانایەکی مەنتیقیان نەبوو. هونەرمەندانێک وەکو (سالڤا دۆر دالی- ١٩٠٤-١٩٨٩) شێوەکار، پەیکەرتاش و گرافیستی ئیسپانیایی کە دوای ئەزموون و تێپەڕکردنی سەردەما و قۆناغەکانی کوبیسم، فۆتۆریزم و شێوەکاریە میتافیزیەکان، لە ساڵی (١٩٢٩)دا تێکەڵاوی سوریالیزم بوو. زۆر زوو بوو بە ناسراوترین کەسایەتی و نوێنەری [سوریالیزم] و هەروەها «ڕێنێ مەگریت» (١٨٩٨-١٩٦٧) شێوەکاری بەلژیکی لە سیما ناسراوەکانی سوریالیزم بوو.

ج- لە کۆتاییدا بۆ تێکەڵاوکردنێکی سوریالیستی لە مەیدانی میعماری، پەیکەرتاشی، هێڵکاری و شێوەکاریدا لە ئاوێتەکردن و لەلای یەکدانانی ئەو بابەتانە کەڵک وەردەگیرا کە هیچ پێوەندیەکیان بەیەکەوە نییە، هەتا هەست و مانایەک بخوڵقێنن، زۆر ناواقعی، یان خەیاڵی نەبن، بەڵکو ڕاستەقینە ببتە دەرەوەی دنیای ئاسایی. سوریالیستەکان بۆ پاساوی ئەم کارە کەڵکیان لە دەقێک وەردەگرت کە لەناکاو پاژە جیاواز و دژ بەیەکەکان تێکەڵی یەکتر بکا، ئەویش ڕستەیەک بوو لە شاعیری بەناوبانگی فەرانسە «ئیزیدورکاسە» (بەنازناوی کۆنت دولوترێ ئامون) (١٨٤٦- ١٨٧٠) کە لەلایەن سوریالیستەکانەوە بە یەکێک لە پێشڕەوان و ئیلهامدەرانی خۆیان دادەنرا، دەیگوت: «جوان وەکو لەکت و پڕ تووشی چەرخی دروومان و چەتری سەرمێزی نەشتەرگەری بوون...»

سوریالیستەکان زۆر زوو لە سەرانسەری جیهان پەرەیان سەند و بەشێوەی یەکێک لە جیدیترین و پڕ کێشەترین بزووتنەوەی جوانیناسانەکانی نێوان دوو شەڕی جیهانی لێهات. یەکێک لە پێشانگە گرینگەکانی بەرهەمە سوریالیستەکان کە بەدەستی «بریتۆن» دانرا بوو لە ساڵی (١٩٣٦)دا بەڕێوەچوو. ئەم بزووتنەوەیە گەیشتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، چونکە لەکاتی دەسپێکی شەڕی دووەمی جیهانیدا و هەروەها لەکاتی داگیرکرانی فەرانسە بەدەستی ئەڵمانیا زۆربەی هونەرمەندە ئەڵمانی و فەرانسەوییەکان بەرەو ئەمریکا کۆچیان کردبوو. ئەگەرچی لەنێوان شەڕدا سوریالیزم وەکو بزووتنەوەیەکی ڕێکخراوەیی تێکشکاو و لەم سەردەمایەدا زیاترین هێزی خۆی لەکارکردبوو، بەڵام ڕۆحی سوریالیزم هەروا درێژەی بە ژیانی خۆیدا. سوریالیزم بە داکۆکیکردن لەسەر شتە سەیرو سەمەرەکان و داکۆکی لەسەر دەربڕینی شاعیرانە و هەستە ناسکەکان شێوە خۆ نیشاندانێکی بە فۆرمالیزم، یان فۆرمخوازی زاڵ بەسەر کوبیسم و چەشنە جیاوازەکانی هونەری زەینی، پێشکەش کرد، شێوە سوریالیزمەکان شوێنەواری لەسەر هونەرمەندانی زۆربەی وڵاتان داناوە، بۆ وێنە ژێدەر و سەرچاوەی سەرەکی ئیکسپرسیونیزمی ئینژاعی بوو.

١٢- «دادا»: لەو بزووتنەوە هونەریانەی ئەورووپا و ئەمریکایە و دیارترین تایبەتمەندیەکەی شۆڕشێکی توندوتیژانەیە بەدژی بایەخە سوننەیەکان. ئەم بزووتنەوەیە

لە ساڵی (١٩١٥)دا لەلایەن دەستەیەک لە هونەرمەندان و نووسەران وەکو (هانس ئارپ- ١٨٨٧-١٩٦٦) شێوەکار و شاعیری فەڕانسەیی و «تریستان شارا» شاعیری خەڵکی ڕۆمانی دارێژرا. لە ڕاستیدا دەبێ ئەم بزووتنەوەیە بە بەرهەمی وەهم سرینەوەیەک دابنرێ کە لەشەری یەکەمی جیهانەوە سەرچاوەی گرتووە، شەڕێک کە زۆربەی نووسەران و هونەرمەندان بەتەنز، تەوس و ڕەشبینی و ئانارشی لەگەڵ ڕووبەڕووبوونەوە. لە «دادا»دا لەسەر توخمی نامەنتیقی، پووچ و بێ ناوەڕۆک داکۆکی دەکرا و هەروەها بۆ خولقانی بەرهەمە هونەریەکان گرینگایەتی شانس و هەڵکەوتیان لە ڕادەبەدەر زل دەکردەوە. بەپێی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە جۆراوجۆرەکان کە لەبابەت چۆنیەی داهێنانی «دادا» (وشەیەکی فەڕانسەیی بۆ ئەسپی چێوی) و ئەنجام دراوە. وادیارە ئەم سەردێڕە بە هەڵکەوت و بەهۆی دەمە چەقۆیەکی گیرفانی کە لەسەر لاپەڕەیەکی دیکشینری دنراوە، هەڵبژێردرا و لە ڕاستیدا سەمبولێکە لە مەتەرێزی دژی عەقڵانیی ئەم بزووتنەوەیە. هونەرمەندانی «دادا» شێوازێکی تایبەتیان نەخولقاند، بەڵام لە کەڵک وەرگرتن لە گاڵتەجاری و ئاکارە هاندەرەکان خۆیان نەبوارد بۆ ئەوەی قاعیدە و ڕێسا گشتییەکان تێکبدەن، یان لێی لادەن. هەر بەو شێوەیەی کە لە ئەدەبیاتدا شیعری بێ مانا خۆی نیشان دابوو مونتاژ، تێکەڵاوکردنی ڕەنگە جۆراوجۆرەکان و کەڵک وەرگرتن لە توخمەحازر و ئامادەکانیش لە فۆرمە دیارەکانی دەربڕین و مانا دادەنرا، «دادا» زۆر زوو پەرەی سەند (بەتایبەت لە نیویۆرک، مارسێل دوشام) و مەن ڕێی دوو کەس لە کەسایەتییە ناسراوەکانی ئەم بزووتنەوەیە بوون). لە ساڵی (١٩٢٢)دا پێشانگایەکی نێونەتەوەیی لە پاریس دانرا کە تایبەت کرابوو بە بەرهەمە دادایستییەکان، کەچی لەم ساڵە بەدواوە وەکو بزووتنەوەیەکی ڕێکخراو نەیتوانی بەردەوام بێ، بەڵام شوێنەوارەکانی زۆر قووڵ بوون بە تایبەتی لەسەر سوریالیزم (ئەو بەشەی کە بەرەو پووچی و شتە سەیر و سەمەرە و نامۆکان دەچوو)، ئیکسپرسیونیزم-ی ئینتزاعی و هونەرە چەمکییەکان.

١٣- لێکۆربوزیە، شارل- ئیدوارد ژانێریت (١٨٨٧-١٩٦٥) میعماری، شێوەکار و نووسەری سویسی کە ساڵی (١٩٣٠)دا بوو بە هاووڵاتییەکی فەرانسەیی. «لێکۆربوزیە» بە گشتی وەکو یەکێک لە گەورەترین و کاریگەرترین میعمارانی سەدەی بیستەم ناسرا. لە مێژووی شێوەکاریی مۆدێرنیشدا وەکو یەکێک لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی «پیوریسم» [Purism] خاوەنی شوێن و پلەی تایبەت و مەزنە.

«پیوریسم» بزووتنەوەیەک لە شێوەکاریی فەرانسە بوو کە لەگەڵ جوانناسیی نوێی (هونەرە ماشینەکان) گرێدرا بوو و لەنێوان ساڵانی (١٩١٨-١٩٢٥)دا پێگەیی و گەشەی سەند. لە دامەزرێنەران و لایەنگرانی [پیوریسم] دەتوانرێ بە «ئامێدێ ئۆزێنفان» و «لیکوربوزیە» ئاماژە بکرێ. ئەوان بەو باوەڕەوە کە قوتابخانەی کوبیسم لەسەر ڕێی ڕاستەقینەی خۆی بەلاڕێدا چووە و بێ خەوشی متمانەی خۆی لە کیس دا و بەرەو چەشنێ هونەری جوانکاری و دیکوراسیونی ڕۆشت و بەم پێیە تووشی نزمی و ڕزان هاتووە، بەم دەرەنجامە گەیشتن کە دەبێ بەشێوەی جیدی بۆ بنیاتنانەوە و ساغکردنەوەی بناغەی «هونەری بێ گرێ» هەنگاو هەڵگیرێ و بەربەرەکانی بکرێ. ئەوان پێیان وابوو کە دەبێ بە پێداگرییەوە هەست و عاتیفەکان لە «لایەنگریکردن لە شیعری عاشقانەی هەندەسی»- باشترین و گونجاوترین وەڵامە بۆ ئەو وێنانەی خۆش ئاهەنگن و بەباشی لە پەنای یەک دانراون- دووربخرێنەوە. لیکوربوزیە هەتا ساڵی (١٩٢٩) هەر خەریکی شێوەکاری و کێشانەوەی بێ ڕۆح [Still Life]ەکان دەبوو، بەڵام لەم ساڵە بەدواوە سوژە مرۆڤیەکانیش کەوتنە نێو کۆمپوزیسیونی ئەوەوە، هەڵبەت ئەو لە ساڵی (١٩٢٠)دا هەر بەو شێوەیەی کە شێوەکاریەکانی خۆی بەنێوی «ژانرە» ئیمزا کرد نێوی لیکوربوزیە (قشقەرە)ی بۆ خۆی دانا. نێوی لیکوربوزیە لە نێوی یەکێک لە باپیرانی ئەوەوە وەرگیراوە و هەروەها- جناس-ێکە لە ئاماژە کردن بە نزیکایەتی سیمای ئەو بە قشقەرە. بێجگە لە بەرهەمە شێوەکاری و میعماریەکان، لە بواری هێڵکاری، وێنە سازیی کتێب، لیتوگرافی، وێنەکانی پێوەندیدار بەو پەردانەی لە دیواری دەدرێن و بەرهەمی بەرچاوی هەیە. هەروەها زۆر بەرهەمی نووسراوی لە بواری کتێب، دەفتەری نووسینی ڕۆژانە و وتاری لێ بەجێماوە.

١٤- شێوازی نێونەتەوەیی [International]- سەردێڕێکە کە «هانری ڕاسێل هیچکاک» و «فیلیپ جانستون» لە کاتالۆگی پێشانگەی میعماریی ساڵی (١٩٣٢) لە مۆزەی هونەرە مۆدێرنەکاندا بەدەستەیەک لە بیناکانیان گوت کە لەماوەی ساڵەکانی دوای شەڕی یەکەمی جیهانی تا ساڵی (١٩٣١) دارێژراون و میعماری کرابوون (بەتایبەتی ئەو بینایانەی کە لەلایەن «ڤالتێر گروپیوس»، «لیکوربوزیە»، «لودڤیگ میز

ویندێر روهە» و «جی» جی، پی، ئود-ەوە دارێژرابوون)، بەگشتی بیچمی ئەم بینایانە بەشێوەیەکە کە داکۆکی زۆر هەیە لەسەر کارکرد و بەکارهێنانیان، بەڵام لەم بیچمانەدا کارکردخوازیی دەروەستی توخمەی جوانی ناسیە لە میعماریدا. ئەو بنەڕەت و قاعیدە هونەریانەی بەشێوەیەکی بەرچاو بیناکان پێکدێنن، لە بەرامبەر کێش لەسەر بارستا، لە بەرامبەر هاوتەریبی لەسەر سیستەم و قاعیدەمەندی، لە بەرامبەر کەڵک وەرگرتن لە جوانکاریەکان لەسەر ڕێکخستن و ڕێک و پێککردنی پاژەکان زیاترین پێداگری دەکەن کە دواتر «هیچکاک» داکۆکیکردنی لەسەر دەربڕین و ناساندنی وردی پێکهاتەی پێوە زیاد کرد. بێجگە لە ئەمە لە ساڵی (١٩٣٢)دا «هیچکاک» و «جانسۆن» کتێبێکیان لە ژێر سەردێڕی شێوازی نێونەتەوەیی چاپ کرد و هەر بەو شێوەیەی گوترا لە حاڵی حازردا ئەم سەردێڕە بە بزووتنەوەیەکی گرینگی میعماریی مۆدێرن دەگوترێ کە هەڵگری میعماریی وەرگیراوە لە بزووتنەوەی هونەرە زەینیەکانی ناسراو بە «دواستیژل» (De Stigl)ە [نێوی گۆڤارێکە بە زمانی ئەڵمانی کە لە (١٩١٧) دامەزرا و مەبەست لەویش ئاگادارکردنەوەی مرۆڤی مۆدێرنە لە دەنگ و بیروبۆچوونی نوێ سەبارەت بە هونەری شێوەکاری، ئاگادارکردنەوەیە لەشکڵی بێ خەوشی زەین].

هەروەها بزووتنەوەی ناوبراو شێوەواری لە قوتابخانەی «باوهاوس» وەرگرتووە و تایبەتمەندیی بەرچاوی ئەوەیە کە لە هەندەسەی چوارگۆشەی شوێن و لاپەڕەی تەخت لەکاردەکرێ. ئەم شێوازە نیشاندەری تەکنۆلۆژیای هاوچەرخ و بەرنامە کۆمەڵایەتیەکانە. لەناسراوترین ناسێنەران و نوێنەرانی ئەم شێوازە و لە حەیاتترین سەردەمایانی هەم ساڵی دووەمی سەدەی هەنووکەدا دەتوانرێ بە «میەوندر روهە»، «ڤالتێرگروپیوس»، «لیکوربوزیە» و باقی کەسایەتیە ناوچەییەکانی تر وەکو «جی. تی. ریتڤێلد» لە هۆڵەندە، یان «سکیدمور»، «ئۆڤینگز» و «مریێل» لە ئەمریکا ئاماژە بکرێ. ئەم شێوازە هەتا ساڵەکانی دەیەی (١٩٧٠)ش درێژەی بوو،

١٥- «ڤالتێرگروپیوس» [W.Gropius] (١٨٨٣-١٩٦٩) میعمار، دارێژەر و مامۆستای هونەرەکانی بیناسازی، لە ساڵی (١٩١٨) قوتابخانەی میعماری و هونەری بەکارهاتن-ی «باوهاوس»ی دامەزراند و بەرپرسی ئەوێ بوو (لەپێشدا لە ڤایمار و لە ساڵی (١٩٢٥)دا لە دسائو هەتا ساڵی ١٩٢٨) لە ساڵی (١٩٢٨) لە بەرلین دەستی کردەوە بە چالاکیە میعماری و نەخشەسازیەکانی خۆی. لە ساڵی (١٩٣٤) کاتێ ناسیونال سوسیالیزم (نازیەکان) بە دەسەڵات گەیشتن [گروپیوس] ئەڵمانی بەرەو ئینگلستان بەجێ هێشت. لەوێ لەگەڵ «ماکسول فرای» میعمار و نەخشەسازی ئینگلیزی هاوکاری کرد. لە ساڵی (١٩٣٧)دا چووە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لە زانستگای «هارڤارد» هەتا ساڵی (١٩٥١) خەریکی وانەگوتنەوەی میعماری مۆدێرن بوو. ئەو تا کۆتایی ژیان هەڵسووڕ و چالاک بوو. لە کارنامەی چالاکیە نەخشەسازی و میعماریەکانی «گروپیوس»دا تووشی زۆربینای گەورە و بەرزدێین کە هەرکامیان لە چەشنی خۆیاندا بێ هاوتان و لە تایبەتمەندیە گرینگەکانی میعماری-ن. هەروەها بە نیشانەیەک لە تایبەتمەندی و ناوبانگی جیهانی ئەو دادەنرێن. ئەگەرچی هەڵسووڕانی سەرەکی «گروپیوس» لە بواری میعماریدا بوو، بەڵام کاریگەریی ئەو لەسەر بزووتنەوە مۆدێرنیستیەکان لە تەواوی لقەکانی هونەری شێوەکاریدا بەرچاوتر بوو. لە هیچ کوێ نەبیندراوە کە بەرادەی قوتابخانەی میعماری و نەخشەسازیی باوهاوس کە «گروپیوس» دایمەزراندبوو، هونەرمەندانی ئاوا زۆر و دیار پێکەوە کۆبووبێتنەوە.

١٦-«باوهاوس»: لە قوتابخانە هونەری، نەخشەسازی و میعماریەکانە کە بەپێی بۆچوونی «وێرکبوند» دارێژراو لە ساڵی (١٩١٩) وەکو تەواوکەری «قوتابخانەی هونەری بەکارهێنانی ڤایمار» دامەزرا. خودی «وێرکبوند» لە ساڵی (١٩٠٧)دا لەلایەن هێرمەن مۆدێسیوس. بە میعمار و دواتر چاوەدێر و بەرپرسی «بەشی بازرگانی قوتابخانە هونەری و پیشەییەکانی- پروس-»دانرا. ئەو لەژێر کاریگەری «ویلیام موریس» و «بزووتنەوەی هونەر و پیشەکان» دابوو. مەبەستی سەرەکی «وێرکبوند» تەیارکردنی هونەرمەندان بوو بە ئامرازی بەرهەم هێنانی ماشێنی بە مەبەستی زۆر کردنی بەرهەمە هونەریەکان و زەمانەتکردنی شوێن و جێگەی ئەڵمانیا لە بازاڕە پیشەییەکان لە مەیدانی هەناردن. مەبەستی ڕاگەیاندراوی «وێرکبوند» نە تەنیا بەرهەم هێنانی کەلوپەلی بنەڕەتی و خۆراگر و کەڵک وەرگرتن لە مادە و کەرەستەی بێ وێنە بوو، بەڵکو بەکەڵک وەرگرتن لەم ئامرازە گەیشتن بوو بە هەمەگرییەکی سەر لەبەر ئەندام ناسا، حەساس و کە شیاوی بەکارهاتنە و لە هەمانکاتیشدا هونەریە. گرینگترین پێشانگەی

بەرهەمەکانی «ویرکبۆند» لە سالّی (١٩١٤) لە شاری کۆڵن بەرێوەچوو کە تێیدا «ڤالتێر گروپیوس» و «ئادۆلف مێیەر» کارخانەیەکیان دامەزراند و لە سالّی (١٩١٩)دا «ڤالتێر گروپیوس» سەرپەرشتی و ئیدارەی کارەکانی باوهاوس-ی وەئەستۆگرت کە دەیویست بەدوای ئارمانەکانی «موتسیوس»دا بڕوا، بەم شێوەیە باوهاوس بەرێنوێنی و رێبەرایەتی گروپیوس هەتا سالّی (١٩٢٥) لە ڤایمار درێژەی بەکارەکانیدا. لە سالّی (١٩٢٥)دا باوهاوس بۆدیسائۆنێردرا و هەتا سالّی (١٩٣٢) درێژەی بەژیانی خۆیدا، بەڵام کاتێ نازی-ەکان لە سالّی (١٩٣٣)دا بەدەسەڵات گەیشتن، لێک هەڵوەشاوە. گروپیوس لە (١٩١٩- ١٩٢٨) بەرپرسی ئەوێ بوو. ئەو دەیویست هەتا بەرنامە و مەبەستەکانی لەرێی باوهاوس-ەوە بە ئەنجام بگەیەنێ کە لەمانیفێستی نیسانی (١٩١٩)ی خۆیدا ڕاگەیاند، یانی یەکگرتووکردنی هونەر داهێنەر و پێکهێنەرەکان لەژێرنسێی هونەری میعماری و چاوخشاندنەوەی هونەرمەندان بەسەر پیشە و هونەری خود».

زۆربەی کەسایەتیە سەرەکییەکانی هونەر و میعماری مۆدێرن- وەکو «کلێ»، «کاندینسکی»، «ما هولی ناگی»، «شلیمێر»، «برێڤێر»، «هانس مێنێر»، «لودڤیک میز»، «ڤەندێر رۆهە»- لە باوهاوس پەروەردەکران ئەگەرچی زۆرجاران لەسەر بابەت گەلێک وەکو خولە رێژەییەکانی هونەر، تەکنۆلۆژیا و سیاسەت جیاوازی بۆچوونیان لەگەڵ یەکتر بوو، کەڵکەڵە و بۆچوونە داهێنەرەکانی ئەوان سەبارەت بە فۆرم- مادە و کەرەسەی بیناسازی و پێویسی کاری کۆ بوو بە بەشێک لە نیشانە دیارەکانی «شێوازی نێونەتەوەی» لەمیعماری بە ئاشکرایی لە شکڵ-ە سانا هەندەسییەکانی ئەو بەرنامە پیشەییەکان بوو کە باوهاوس ئیهامی پێ بەخشیبوون، بەڵام ئەم بۆچوونامە تواناکانی خۆیان لە قەوارەی سوونەتی ئاکادیمیکیتر لە کیسدا. ڕەنگە بەم هۆیە کە دکۆکی لە ڕادەبەدەریان لەسەر لەکارکردنی شکل-ە هەندەسییەکان دەکرد و کەمتر سەرنجیان دەدایە نەفسی کەڵک وەرگرتن، جۆری کەڵک وەرگرتن و شێوە و گرفتەکان. فێرکاریەکانی باوهاوس هەتا سالّی (١٩٧٠) لەبیچمی جۆراو جۆردا و بە چەند ئاڵوگۆڕییەک لە زۆربەی قوتابخانە و پەیمانگاکانی میعماری و نەخشەسازی درێژەی هەبوو.

١٧- بۆ وێنە زۆریەک لە گریمانە نووسە مۆدێرنەکان بە ئیلهام وەرگرتن لە شیعرێکی «بۆدلێر» پێیان وایە تەنیا بەوەچنگ هێنان و داگیرکردنی ڕۆحی زەمان و وێکهێنان، یان ڕاگرتنی تایبەتمەندییەکانی گەریان و ڕاکردنی زەمانەکە دەتوانرێ بە هەرمانی و تا هەتایی بگەین. ئەم چەشنە ڕوانگەیە بۆ میعماران و هونەرمەندە مۆدێرنەکان کە دارشتن و دروستکردنی شوێنەکان [بینا و دام و دەزگاکان] تاوانبارن، مزگێنی دەربوو. «میزڤەن دێر رۆهە» لە میعمارە ناسراوەکانی سالاّنی (١٩٢٠) دەنووسێ کە تەنیا لەچوارچێوەی شوێندا لە ئیرادەی زەمان دەگەین، بەڵام بەپێی بۆچوونی تاقمێکی تر لەنوێخوازان «بەشوێنکردنی زەمان» لەرێی وێنەکان، ئامازە و خەیاڵ و ئامازەی بەرچاو و هاندەر، زەبری چاوەڕوان نەکراو یان تەنیا لەرێی هونەری مونتاژ / کولاژ [هونەری تێکەڵکردنی تیکەجۆراوجۆرەکان/ هونەری ئاوێتەکردنی ڕەنگە جیاوازەکان] کارەکە بەوپەڕی دژواری و سازکردنی کێشە گەیشتوە «بۆدلێر» لەم بابەتەوە لە شیعری خۆیدا دەڵێ:

**«تێگەیین، لەسەردەمای بووندانینە**  
**بەڵکو سەردەمای بوون تەنیا کاتێکە لەگوڵزاردای**  
**کاتێ لە باخ دای و گوێ بیستی زەمزەمەی بارانی**  
**ئەی دەست بەسەری سامی مێژوو و هیوای داهات**  
**لەیادت بێ**  
**کە داگیرکرانی زەمان لەگەڵ زەمانە»**

**سەرچاوە:**

مدریتە و مدرنیسم، مجموعەی مقالات، ترجمە و تدوین: حسیغلی نوذری، چاپ، ١٣٨٠- انتشارات نقش جهان.

# فەرهەنگی ئەستێرە گەشە و چەند سەرنجێک

عەزیزی مەلای ڕەش

سەرایییەکی پێویست: ڕۆشنبیرانی کوردی ئەم پارچە کوردستانە، پێشتر لەبەر ئەوە ژێر چەپۆکی عەرەبی داگیرکەر بوون زمانی عەرەبییان لە زمانە زگماکەکەی خۆیان باشتر دەزانی. من هەرکە مانای وشەیەکی کوردیم ئەوسا نەدەزانی لە فەرهەنگی مەهاباد، کە فەرهەنگێکی کوردی و عەرەبییە بەهۆی عەرەبییەکەوە دەمزانی. فەرهەنگ ئەو زەمان وا شیاوبوو. کەچی ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆ کوردییەکەی لە عەرەبییەکە باشتر دەزانن بۆیە پێویست ناکات فەرهەنگی کوردی و عەرەبی، یان عەرەبی و کوردی لەمەودوا دابندرێت. بگرە وەک فەرهەنگی «خاڵ» و «هەمبانەبۆرینە» کوردی کوردی بێت. کە زمانەکەمانی پێ دەوڵەمەند دەبێت. کەچی جێگەی داخە لەم یەک دوو ساڵەی دواییەدا سێ چوار لاو تەمەنیان ناگاتە «٣٠» سی ساڵ، هەریەکەیان نامیلکەیەکی دەرکردووە و ناوی ناوە «فەرهەنگ». جگە لە ئەوەی لە (٢٠٪) تا (٤٠٪) ی وشەکان بە هەڵە ڕاڤەکراون هەر نەیانزانیوە ڕووی «فەرهەنگ نووسین» لەکام لایە. بۆیە داوا لە ڕۆشنبیرانی ئێستا و لەمەودوا دەکەم، کەم و زۆر پشت بەو نامیلکە بەناو فەرهەنگانە، نەبەستن تەنیا فەرهەنگە کشتوکاڵییەکەی مامۆستای هێژا «حەمە ساڵح فەرهادی» هاوێرە و شتێکی زۆر نایابە و بە سەتان وشەی ڕەسەنی کوردی لە فەوتان ڕزگار کردووە. داوا لە مامۆستای تایەن دەکەم بەشێوەیەکی قەشەنگتر چاپی بکاتەوە.

(١) ل١٢: نووسەر لەم لاپەڕەیە دەڵێت: «ئاراو= شطف، تشطيف، الماء المزوج برغوة الصابون»

فەرهەنگی مەهاباد دەڵێت: «ئاراو= غسالة الصابون».

هەمبانە بۆرینە دەڵێت: «ئاراو= کەفاوی جل شوشتن دەکار کراو هێشتا بەکەلک مابێت».

کەواتە ئاراو تەنیا کەفاو نییە، کە نووسەر وای بۆچووە. بگرە کەفاوێکە جلکی پێ شوورابێت و هێشتا بە کەلک شوشتنی جلی تر مابێت.

(٢) ل١٧: ئاقار= «مكان، محل، موضع، مستوى».

لە «د.ھ»: ئاقار= زەوی و زاری دەرەوەی ئاوایییە.

(٣) ل٢٢: ئاوخۆر= «إناء لشرب الماء».

لە «د.ھ» دوو مانای هەیە.

یەکەم: ئاوخۆر، یان ئاو خۆرەوە بەو کەسە دەڵێن: لە ئاواییدا زەوی و زاری فەلاحەتی لەبەردەستدا نەبێت. واتە لە دێیەکە تەنیا ئاو دەخواتەوە و بەکاسبییەکی لابەلای تر دەژیت. نەک تەرزی فەلاح بە بەرهەمی خاکەکەی بژیت.

دووەم: ئەوکەسەیە ئاو دەخواتەوە: هەروەک ناوگێڕ لە کۆڕی مەجلیسان دەڵێت: «ڕەحمەت لە ئاو خۆری». نەک بە مانای «جام»ی ئاو خواردنەوە. کە مامۆستا وای بۆچووە.

(٤) ل٢٣: ئاورنگ، ئاورینگ= «ندى، طل».

هەمبانە دەڵێت: «ئاورینگ پریشکە ئاگری وردیلە لە کوتانی ئاسنی سوورەوە کراو دەپەڕی، بریقە و تروسکە، شەرارەرین»

خاڵ دەڵێت: «ئاورینگ بریسکانەوە».

لە «د.هـ» جگە لە ماناکانی سەرەوە گریـیـەکی بەژانە، لەبن پیل، یان لەبن ڕان، لەحەژمەتی ژانی برینەو بەیدا دەبێت.

(٥) ل٢٣: ئاوڕێژ= «مصب، مجرى ماء، الشخص الذي يصب الماء على الميت أثنا غسله».

لە «د.هـ»: «ئاوڕێژ= بەرزترین شوێنی ناوچەیە و ئاوی باران بە هەردوو دیو هەڵدەڕێژێت». بۆ وێنە ڕێگای نێوان شاری دیبەگە و مەخموور بەرزە و باراناوی لای ڕۆژئاوا هەڵدەڕێژتە «زێ»ی بادینان، لای ڕۆژهەلات هەڵدەڕێژتە زێی پردێ.

(٦) ل٢٥: ئاوەڵکراس: «لباس التحتاني، لباس النساء».

ئاوەڵکراس هەموو شمەکێکی ژێرەوەی ئافرەتان نییە. ئەگەرنا دەبێ بە فانیلە و بن کراسیش بگوترێت: «ئاوەڵکراس».

ئاوەڵکراس لە ڕاستیدا «دەرپێ»ی ژنانە. کەچی لەبەر باری ئەدەبەوە بە ئاوەڵکراس ناودەبردرێت، نەک دەرپێی ژنان.

(٧) ل٢٦: ئاوی ڕەش= «عمى، الماء الأسود في العين».

خاڵ دەڵێت: «ڕەشاوێکە، کە چووە پەردەی چاو کوێری ئەکا و ڕووناک نابێتەوە».

ئاوی ڕەش نەخۆشییەکی کوشندەی چاوە و ئەگەر عەمەلیات نەکرێت، لەلایەن پزیشکی تایبەتەوە چاو کوێر دەکات» نەک بە مانا کوێر.

(٨) ل٢٨: ئەتک= «فساد، فسق». نووسەر لە هەمان لاپەڕە دەڵێت: «ئەتک کردن= إتيان العمل المنكر، القيام بعملية الفسق».

هەمبانە دەڵێت: «ئەتک: سووکایەتی، شوورەیی».

ئەتک کردن: «سووکایەتی بەسەرهێنان، ئابڕووبردن».

خاڵ: «ئەتک کردن: ئابڕووبردنی یەکێک».

ئەتک کردن کردەوەکەیە. ئەتک ناوە و لە دەشتی هەولێر ئابڕووبردن و سووکایەتییە. بە عەرەبی «هتك، فضيحة، تعرض». نەک ئەوەی مامۆستا دەڵێت. ئەتکیش جۆری هەیە:

أ- پردانە ئافرەت.

ب- گوێ برینی مرۆڤ.

ج- کلک برینی وڵاخ.

د- ئاوەڵکراس دڕاندن، یان دۆخین پساندن.

هـ- پرچ برین و شتی تر.

(٩) ل٢٩: ئەژنۆ= «ركبة، كوع».

«ركبة» ڕاستە چۆکە، بەڵام «كوع» بەمانا «جومگە، گۆزینگ»ە. نەک ئەژنۆ.

(١٠) ل٣٠: ئەستێرک= «بركة، خزانه الماء».

خاڵ جوانی ڕاڤە کردووە: «ئەستێر، ئەستێل= گۆمێکی گەورەیە لەبەردەم-ی ئاوێکی کەما دروست ئەکرێ. بۆ ئەوەی کە پڕ بوو شینایی پێ ئاوبدرێ».

«ئەستێرک بە «ڕ»ێی قەڵە و بە مانا شووقەڵەت و هەرزاڵەیە. واتە ئەو شوێنەیە کە نوینی لەسەر دادەندرێت.

(١١) ل٣١: ئەغیار= «عدو».

ئەغیار «کۆ= جەمع»ی «غەیر»ە واتە بێگانە، نەک دوژمن.

(١٢) ل٣١: ئەلحەد= «حجارة القبر».

ئەلحەد= «گۆڕیچە» جێگەی مردوو لە بنی گۆڕدا. واتە ئەو شوێنە تەسکەیە کە مردووی تێدەنێژرێت. نەک بەردی گۆڕەکە. هەروەکو مامۆستا وای بۆچووە.

(١٣) ل٣٣: ئەندێشە= «ألم، وجع، قهر، جزع».

خاڵ دەڵێت: «ئەندێشە= مەترسی: ئەندێشی لە ئازاد

ئەستێرەگەشە

فەرهەنگێکی کوردی - عەرەبییە

فاضل نظام الدين

مەکە». واتە لێی مەترسێ.

هەمبانە دەڵێت: «ئەندێشە بیرکردنەوە و ترس و خەوف».

ئەندێشە جگە لەو مانایانەی سەرەوە بە مانای خەیاڵیش دێت.

(١٤) ل٣٨: باخەڵ= «إبط».

نێوان باخەڵ و بن هەنگل: «ابط» ئاسمان و رێسمانە.

باخەڵ لە «د.هـ»= «نێوان سنگ و کراسە، یان نێوان دوو بەرگ لە ڕاست پەراسوودا، یاخۆ نێوان بەرگ و پەراسووە. لەگەڵ «بەرک= گیرفان» جیاوازە. ئەمەیان تایبەت بە دروومان دروست دەکرێت.

(١٥) ل٤١: بازگە= «ساحة اللعب».

«ساحة اللعب= الملعب». بە کوردی «یاریگا». نەک بازگە.

خاڵ دەڵێت: «بازگە= ئەو شوێنەیە کە بازی لێ بدرێ».

هەمبانە دەڵێت: «بازگە= جێگەی بازدان، رێگەی هاتوچۆی حەیوانە کێوی»

لە «د.هـ» بۆ ڕێگەی مرۆڤیش دەگوترێت.

(١٦) ل٤٢: بافرە= «الصمغ الأبيض».

وشەی «صمغ» بە عەرەبی «شیراز»ە.

لە «د.هـ» «الصمغ= نەسترێلک، چریش»ە.

وشەی «بافرە بەم مانایە دێت لە «د.هـ» گەشی ڕوو لە زەردەخەنە کەمترە: «ئازاد لەخۆشییان بافرەی هاتێ». سەردەمێک بە دەفتەری جگەرە دەگوترا: «دەفتەر بافرە».

(١٧) ل٤٥: بانەمەڕ= «وسط الربيع».

ڕاستە «بانەمەڕ کاتەکەی لە ناوەڕاستی بەهاردایە، بەڵام بەم مانایە نییە» بگرە بەم دوو مانایە دێت:

یەکەم: بانەمەڕ= دووەم مانگی ساڵی کوردییە. «نەورۆز، گوڵان= بانەمەڕ» واتە گوڵان و بانەمەڕ یەک مانگە.

دووەم: هەروەکو هەمبانە دەڵێت: هاوینە هەوار.

(١٨) ل٤٦: باوە خوون= «زيارة إعتياد للعروس إلى أهلها بعد سبعة أيام من زواجها».

باوە خوون= چوونەوەی بووکە بۆ ماڵە باوکی دوای گواستنەوە یەکەمجار. جا کەمی پێ بچێت، یان زۆر.

(١٩) ل٥٠: برێشکە= «كرزات، چزر»

خاڵ دەڵێت: «برێشکە دانەوێڵەی برژاو». بە عەرەبی «حبوب محمصة».

هەمبانە دەڵێت: «برێشکە= دانەوێڵەی لەسەر ساج بۆدراو». ئەمەیان تۆ گندۆرەش دەگرێتەوە.

(٢٠) ل٥١: بڕ «قطع، جزء، كسرة، قسم، مقدار».

ل «د.هـ» بڕ بەم سێ مانایە هاتووە:

یەکەم: بڕ= «بوار= شوێنی پەڕینەوە لە تەنکاوی ڕووباردا.

ئازاد لە بڕەکە پەڕیەوە» یان «کەندەکە بەم زووانە بڕنادا».

دووەم: بڕ= بەش: «مێگەلەکە بوو بە دووبڕ» واتە بووە دووبەش.

سێیەم: بڕ= «تۆزێک= بڕە مەڕێکم دیت»، یان «بچۆ بڕە دار بهێنە».

(٢١) ل٥٤: بستە «قطب، نبات وثمر الفستق، قرمعة الأصابع، دق الأصبعتين».

نازانم ئەو هەموو وشە عەرەبییە، مانا لەیەک دوور و جیاوازەی لەکوێ هێناوە.

لە «د.هـ» بستە= «داوێکی باریکە و لە بڕکە بێستان و دارمێوی تازە ڕوواو پەیدادەبێت و خۆی بەشتان هەڵدەواسێت».

(٢٢) ل٥٤: بسکە «طلاق الوجه، بشاشة، سرور».

لە «د.هـ» بەم مانایەش دێت: «بسکە= جۆرە خشڵێکی ئافرەتانە و بە هیزارو دەسرۆک قایم دەکرا».

(٢٣) ل٥٨: بنەبان= «سقف».

مامۆستا لە هەمان لاپەڕە دەڵێت: «بن میچ= سقف».

ئەمەیان ڕاستە و لە «د.هـ» پێیدەگوترێت «ساپیتە».

کەچی «بنەبان= ئاخیری ژوور. تۆ بۆ بنەبان هەڵکشێ».

(٢٤) ل٥٩: بۆدڕ «ن»= «نتن، زفر، رائحة كريهة. الرائحة النتنة». خاڵ دەڵێت: بۆدڕ= بۆنێکی ناخۆشە بەهۆی چڵکەوە پەیدا نەبێ».

کەچی لە «د.هـ»: بۆدڕ، یان بۆدڕن. یاخۆ بۆندڕ= بۆنی «تەگە»یە لە وەرزی پەڕیندا. نەک بۆنی چڵک.

(٢٥) ل٦٧: بەرایی= «تحمل».

مهاباد دەڵێت: «بەرایی= اولى»

لە «د.هـ» بەم دوو مانایە دێت:

یەکەم: «دڵم بەرایی نادا ئەزیەتی کێشکەیەک بدەم». واتە دڵم ڕێ نادات.

دووەم: بە مانا پێشەکی: «بەرایی مێگەلەکە گەیشتە سەر ئاو».

خاڵ دەڵێت: «بەرایی= پێشڕەوی شتێک، بەرایی ئاوەکە، یان لەشکرەکە گەیشت».

(٢٦) ل٦٨: بەرچاوگە= شراشر».

شراشر= «شەراشیف».

لە «د.هـ»: (بەرچاوگـــــە= دارودو، یان پووش و قەسەڵێکە کە هەوەڵ جار ئاگری پێدەکرێتەوە».

خاڵ دەڵێت «بەرچاوگە= پارچە خشـڵێک، یان چەند زەنگیـانە و مـوورووەیەکی هۆنراوەیە ژنان بۆ جـوانی ئەیکەن بە پێش سەریانا».

(٢٧) ل٦٩: «بەرخەلەوان= راعی قطیع، بەرخەڵ»

خاڵ دەڵێت: «شوانی کار و بەرخ».

بەرخەوان= «شـوانی بەرخان. عـەرەبییـەکە «راعـــي الخرفان».

بەرخەڵ مێگەلی بەرخ= قطیع الخرفان».

(٢٨) ل٦٩: بەردەشـۆر= «بەردە شـۆركـردن= «غـسل التمن».

خـاڵ دەڵێت: «بەردەشـۆركـردن= شـتنەوەی برنج و نیسک و ماش بە رەنگێک تا بەردەکەی لێ بگیرێ»

بەردەشۆر تایبەت نییە بە برنج هەروەکو مامۆستا وای بۆ چووە.

بەڵکو هەر دانەوێڵەیەک وەک گەنم و نیسک و برنج و نۆک.. بەردی هەبێت و بشوورێتەوە ئەو ناوەی بەسـەردا دەسەپێت.

(٢٩) ل٧٠: بەرزەکی بانان= «نجاة، خلاص، إفلاة».

هەمـبـانە دەڵێت: «بەرزەکی بانان قـوتکەی بەسـەر لێواری بانەوە، بریتییە لەلاوی تۆلازو دڵتەڕ».

خـاڵ دەڵێت: بەرزەکی بانان= وتەیەکـە تەشـبـیـهی یەکێکی پێ ئەکرێ کە لەجورتمێک بە ئاسانی رزگـاری بووبێ».

بەبۆچوونی مـن: «بەرزە= ولاخ» و «بانـان= گـــرد و بسـتی زەوییـــە»، واتە وەک ولاخی بەرزەی بەسـەر بەرزاییـەوە رابکات». من لەم مـانایە تەواو دڵنیـانیم، بۆیە پێویست ناکات پشتی پێ ببەسترێت.

(٣٠) ل٧٢: بەرموسەلان= ورگ، مافوق الفخذ».

هەمـبـانە جـوانی بۆ چووە: «بەرمـوسـەڵدان= ژێرمیزەڵدان، تۆزێ بەرەو ژوور لە گون».

(٣١) ل٧٥: بەروولە= «صغیر، ناعم، وتد، مسمار، خشبي».

هەمـبانە دەڵێت: «بەروولە= خیـاری تازە گوراوی بە قـەد قـامک، داروکـەیەکە دەنا و باشبـار و دەسـەندودا».

ئەمە لە «د.هـ» «دەستە مستە»ی ناوە.

بە روولە= «جـــۆرە نۆژەنکردنـەوەیەکی گـــاسنی هەوجارە».

(٣٢) ل٧٧: بەکرە= «بکرة، بكرة خیط الماكنة».

خـاڵ دەڵێت: «بەكـرە تەختـەیەکی كـونداری گـردە، دەزووی درووماني بەسەر هەڵئەکرێ».

لە «د.هـ»- بەکرە= «گرگرە» مەبەست بەکرەی «دۆلابە» جگە لە ماناکەی سەرەوە.

(٣٣) ل٧٨: بەڵم= «ساق الشلب».

خاڵ دەڵێت: «لاسکی چەڵتووک».

هەمبانە دەڵێت: «بەڵم کای برنج و هەرزن».

لە «د.هـ» بەڵم= سـەرەسـەری کـای گـەنم و جـۆش دەگرتەوە.

(٣٤) ل٨١: بـــەیـــار= بـــور، أرض بـــور، أرض غیرمزروعة أو متروكة بلازرع، أرض لا زراعة فیها».

لە بریتی ئەو چەند ڕستـەیە باشتـر بوو بیگوتبـووایە: «بور أرض غیر مزروعة» و بەس.

خـــاڵ دەڵێت: بەیار= «زەوییـــەکـــە چەند ســـاڵێک نەکێڵدرابێ».

لە «د.هـ» بەیار بەو زەوییە دەگوترێت کە ساڵێک پترە نەکێـڵـدرابێت، یان هەر نەکـێـڵـدرابێت. کـەچی بوور ئەو زەوییەیە تەنیا ساڵێک نەکێڵدرابێت.

(٣٥) ل٩٠: بیراز= «أحـجـار لتـبطین القـبـور، نقر، تحدیل».

خاڵ دەڵێت: «بیـرازکـردن= زبرکردنەوەی دیوی ناوەوەی بەرداش و دەستاڕ، دوای سوانی، کەلوکون گرتنی دیواری وشکە کـەڵەک، دیواری ئەمـلا و ئەولای کـارێز و گـۆڕ بە وشکە کەڵەک».

لە «د.هـ»: بیراز بە دوو مانا هاتووە:

یەکـەم: گـرنی گـرنی بەردی ئاشـە: «ئاشـەکـەم بیـراز کردەوە» واتە بەردەکەیم تیژ کردەوە.

دووەم: مەودای تەسک و بەرینی بیر و شتی وەک بیر. «بیرازی بیرەکەمان تەسکە».

(٣٦) ل٩٢: پاپووچ= «خف».

خـاڵ دەڵێت: «پاپووچ= جـۆرە پێـڵاوێکە وەک پانی بەرز، ژنان لەپێی دەکەن».

«خف»ی عـەرەبی= «سۆل» کـە ئەمرۆ پێـیدەگـوترێت «نەعل».

لەگەڵ پاپووچ شێوەی جوودایە.

(٣٧) ل١٠٢: پرپۆڵە «طعام الأفراخ».

مەهاباد دەڵێت: «پرپۆڵە= حبوب العجین، قطائف».

هەمبانە دەڵێت: «پرپۆڵە= چێشتی گزمووڵە و هەویرو کــوزەڵە، دانی جـووجکەی مـریشـکی تازە لە هێلکە دەرهاتوو».

لە «د.هـ»= «پـرپـۆڵـە= ئـاردە و بـە ئـاو تـۆزێـک تـەڕ دەکرێت و تێکوەردەدرێت، تا دەبێتە گرمت، گرمت، جا

بۆ جووجەڵان بێت، یان شتی تر».

(٣٨)ل١١٣: پەتک= «حبل، خیط».

خاڵ دەڵێت: «پەتک پارچە پەتێکی بادراوی ئەستوورە».

مەهاباد دەڵێت: «پەتک= حبل صغیر».

لە «د.هـ» پەتک لە گوریس کورتترە، مەرجیش نییە لە ئەستووری بە ئەندازەی ئەوبێت. لەگەڵ «خیط» زۆر جیاوازە.

(٣٩) ل١١٦: پەرگ= «رواسب، ثقل، رغوة المعادن».

پەرگ= بەنێکی تایبەتە بۆ چنینی کڵاش، پەرگەکڵاش».

خاڵ جوانی بۆچووە: «پەرگ هەودایەکی بادراوە و لە دەزوو، یان

بەن سەری کڵاشی پێ ئەچینرێ».

(٤٠) ل١١٦: پەرە= «زیادة، کثرة، نمو، تکاثر».

لە «د.هـ» پەرە بەدوو مانا دێت:

یەکەم: پەرە= مانەوەی بۆشایی لەنێوان خەتە جووتدا. واتە کێڵگەکە پەرەی زۆرە.

دووەم: پەرە= زۆر: «ئاگرەکە زوو پەرەی ساند». نەک «پەڵە»ی باران بارین.

(٤١) ل١٢٨: پێدزەکێ، پێدزە: «تقصیر و بطيء الخطوات، عمد للتأخر».

خاڵ دەڵێت: «پێدزەکێ= هەنگاو بچووککردنەوە و خۆدواخستنی لە هاوڕێی لە ڕۆینا».

«منداڵ بووم، لەگەڵ چەند هاوڕێیان داومان لەنێو تەبارە گەنم، یان پەرێز، بۆ قەتێ دادەناوە. قەتێکە ئەگەر لەسەر هێلانەکە بفڕیبووایە داوەکە دەیگرت. قەتێش هەبوو لەسەر هێلانەکە بەپێ دەڕۆیشت ئەوجا دەفڕی و بەداوەکەوە نەدەبوو. ئەوسا دەمانگوت: پێدزەی کردووە».

(٤٢) ل١٣٠: پێشکە= «ڕەشکە و پێشکە= بعوضة، برغوث».

لام سەیرە مامۆستا «پێشکە لەگەڵ ڕەشکە و پێشکەی کردووەتە یەک.

پێشکە= «مێشوولە= بعوضە»یە، کەچی ڕەشکە و پێشکە تەم و ڕەشایی بەرچاوانە، لەبەر بێ حوکمی دیدان، یان لەبەر بهێزی خاوەنەکە پەیدا دەبێت.

دووەم= «برغوث= گێچ»ەو لەگەڵ پێشکە زۆر جودایە.

(٤٣)ل١٤٨: تایەن= (بریئ، غیر مذنب، سلیم البنیة، سازج، فقیر، مسکین، سيء الخط، تعیس».

دیسان سەرم لە ڕیزکردنی ئەوەندە وشەیە سوڕماوە و بە بۆچوونی من چشتاقیان لەگەڵ مانای «تایەن» ڕێک ناکەوێت. بگرە تایەن بە کەسێکی ناوبراو دەگوترێت: «کابرای تایەن وا هات».

(٤٤) ل١٥٦: تۆپین= «موت الحیوانات»

تۆپین بە مردنی ئەو ئاژەڵانە دەگوترێت کە گۆشتیان ناخورێت.

وەک سەگ و کەر و بارگین و...»، کەچی بە مردنی ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان دەخورێت دەگوترێت مردار بۆوە، نەک تۆپین.

(٤٥) ل١٦١: توولە= «صغار بعض الحیوانات، جرو الکلب، کلیب».

خاڵ دەڵێت: «توولە= جۆرە سەگێکی بچووکە». بەڵێ توولە سەگێکی زۆر لەتاژی و سەگی ئاسایی بچووکترە و کاتی خۆی لەبەر گچکەیی دەیانناردە نێو کونە ڕێوییەوە و دەری دەهێنا. لەلایەکی دیکەوە «توولە» بە کشانی لقی مێو و برکە بێستانیش دێت: «توولی برکەکان زۆر گەورەیە».

(٤٦) ل١٦٤: تەپان= عقب الباب».

تەپان خاڵ دەڵێت: «گرێژنەی دەرگا، خوانکەی ئاش، گەلا کوتک». کەچی هەمبانە دەڵێت: «تەپان= ژێردەرانە، بازنەی دەرگا، داری جێگەی تەوەرەتاش، تێلای گەڵاکوتان، چەپەرەی پشتیوانەی دەرگا، بەردی قورسی سەردینگ».

لە «د.هـ». تەپان بە سێ مانا دێت:

یەکەم: لە لباد و قایش دروست دەکرێت و لە کورتان تەنکترە، بۆ ئەوەی لەکاتی شەغرەکێشانەوە، یان باری گران وڵاخەکە پشتی لەبەر قورسایی ئەزیەت نەخوات دەخرایە سەر کورتانەکە.

دووەم: قووڵایی= دەوڵکەکە هێشتا لە تەپانی بنی بیرەکە دایە».

سێیەم: لێدان= «ئازاد نەوزادی چاک تەپاند».

(٤٧) ل١٦٦: تەراخۆمە= «تراخومة، مرض التراخومة».

تەراخۆما نەخۆشییەکی چاوە و لە «د.هـ» پێیدەگوترێت: «وەردێنە».

(٤٨): ل١٧٣: تەگە، تگە= «ماغر، طلب العنزة للماء، تیس».

خاڵ دەڵێت «تەگە، تگە سابرێن، ئارەزووکردنی بزن بۆ سابرێن.

«بزنەکە هاتووتە تەگە». لە «د.هـ» دەگوترێت:بزنەکە بە

تەگە هاتووە.

«ماعز» ڕەشانی مێیە، «تیس» ڕەشانی نێرە، لە یەک جیاوازن. تەگە بە «خەجل»ی ڕەشان دەگوترێت. کە بە عەرەبی «تیس»ی ناوە. ماناکانی تر هەڵەنە.

(٤٩)ل١٧٧: تەنگە= (حزام السرج، حیاصة او حزام السرج».

خاڵ دەڵێت «تەنگە قایشێکی پانە و «زین»، یان «کورتان»ی پێ قایم ئەکرێ لە بن سکی وڵاخەوە.

هەمبانە دەڵێت: «تەنگە= کەمەر بەندی یەکسم».

بەبۆچوونی من هەرسێکیان، لەگەڵ ڕێزم بۆیان سەرچیغ چوونە.

«تەنگە= «قەبرغە، تەرۆک، ناوقەد». واتە ئەملاو ئەولای ورگی بنیادەم و گیانلەبەر. کەچی بە «قایش»ەی کە زینی پێ شەتەک دەدرێت، یان بەو «سەرکەلە»ی کە تۆزێک لە دۆخێن ئەستوور ترە، کورتانی پێ قایم دەکرێت دەگوترێت: «بنزگ».

ڕاستە دەگوترێت: «تەنگەی ئەسپەکە باش توند بکە»، بەڵام مەبەست: «زینەکەی بەهۆی قایشەکەوە لە تەنگەی ئەسپەکە شەتەک بدە». ئەمەش بۆچوونەکەی من دەسەپێنێت: «قسەیەکی وام بە ئازاد گوت تەنگەی پێگرت»، یان «بەردێکم لە تەنگە وڵاخە دا». کەواتە «تەنگە= حزام السرج» هەڵەیە. ڕاستییەکەی قایشەکەیە. کە بنزگی ناوە.

(٥٠) ل١٨٣: تێر= «کیس، جراب، عدل»

(٥١) ل١٨٣: تێرکە= «کیس کبیر».

لەگۆڤاری ڕامانی ئازیزدا ژمارە «٨٦-٨٧» بە دوور و درێژی باسی «تێر و تێرکە و جەواڵ و خرار و هەگبە و خورجە و توور و مەلاکدان و توورەگە و کیس»م کردووە. پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەمەوە. بەس ئەوەندەی دەڵێم: نێوان «تێر و کیس» ئاسمان و ڕێسمانە. کەوا مامۆستا کردوونی بەیەک.

(٥٢)ل١٨٨: تیرۆژوو= «وصلة قماش مثلثة الشکل».

لە «د.ه»: «تیرێژ»ە. پارچە قوماشێکی سێگۆشەیی درێژی تایبەت هەڵبڕاوی کراسی ئافرەتانە و لە ڕاست هەنگڵەوە بەرەو خوار.

(٥٣) ل١٨٩: تیر= «نانی تیری».

بە عەرەبی شەرح نەکردووە کە پێیدەگوترێت: «خبزالرقاق». نانی تیری جۆرە نانێکی گەورە و تەنکە و بە ساج دەبرژێت.

دووەم: تیر بە مانا «خەست»ە. ماستێکی تیرم خواردەوە.

سێیەم: تیر= ئەو شتەیە کە بەکەوان دەهاوێژرێت.

چوارەم: تیرەمار. واتە مارێکی بارێک.

لەمانە دەردەکەوت کە: «تیر» لەگەڵ «تیری» جیاوازە و یەک نین.

(٥٤)ل١٩٠: تیلاک= «أصلح، أجرد الرأس».

خاڵ دەڵێت: «تیلاک کەسێکە پێشەوەی سەری مووی نەبێت».

لە «د.ه». تیلاک= «بەرزایی سەرپێچ: «ئازاد تیلاکی خوارە»، یان «تیلاکی قیتە». بە عەرەبی «لفة الرأس»ی ناوە.

(٥٥) ل١٩٢: جاش= «جحش، والد الحمار، کر».

خاڵ دەڵێت: «جاش= بەچکەی کەر. جاشک، جاشولکە».

هەمبانە دەڵێت: «جاش= بەچکەی کەر».

هەرسێکیان سەرچیغ چوونە. لە «د.ه»، جاش= «هێستری ساوایە».

هەربۆیەش ناوی ئەو کەسانەی کە خۆیان فرۆشتبووە دوژمن «جاش»یان پێیدەگوترا. واتە باوکی لە توخمی دایکی نییە و بیژییە. نەک بەمانا جاشکەکەر.

(٥٦)ل١٩٦: جۆزەرە، جۆزەردان= «أوان حصاد الشعیر».

جۆزەردان ناوی مانگی سێیەمی کوردییە. واتە لەم مانگەدا وەرزی دروونە دادێت. نەک وەک مامۆستا دەڵێت: «بە مانا هاتنی کاتی دروونەیە»

(٥٧) ل٢٠٨: چاک= «جید، صالح، خیر، مفید، نافع، موافق، طرف، ئەو ذیل الثوب».

قەت نەم بیستووە «چاک» بە ئەوەندە مانایە هاتووبێت. لە «د.ه»:

یەکەم: چاک گۆڕی پیاو چاک و ئایین پەروەر.

دووەم: چاک دژی خراپ.

(٥٨) ل٢١٦: چاوە= «منبع عین».

سەرچاوە بەم مانایەی مامۆستا دێت. چاوە لە «د.ه» بە دوو مانا دێت:

یەکەم: چاوە= ژوور، هۆدە. خانووەکەی ئازاد دوو چاوە و بەر هەیوانێکە.

دووەم: قرشە هەرکە دەدرێتە بەردەمی جەنجەڕ بۆ وردکردن، لێواری دەرەوە پێیدەگوترێت «ڕۆخە»، لێواری ژوورەوە «چاوە».

(٥٩)ل٢٢٠: چۆپی= «رقصة، دبکة».

چۆپی= جۆرێکە لە شایی، بە هەموو شایی و

هەڵپەڕکێیەک ناگوترێت.

(٦٠) ل٢٤٧: حزت= «ممتلئ الجسم، مكتنز، ماعز بعمر سنة واحدة، ابن سنة».

ئەوە یەک لە ژیانمدا ببیستم: «ماعز بعمر سنة واحدة= واتە بزنی یەک ساڵە». ئەمە «گیسک»ی پێدەگوترێت. لەم تەمەنەش ئەگەر ڕەت بوو بە نێرەکە دەگوترێت «کوور»، مێیەکەش «چوشتیر».

پاش ئەم تەمەنە ئەوجا مێیەکە بە بزنە «بەربوارد» ناودەبردرێت. نێرەکەش «خرت».

(٦١) ل٢٤٧: خرتوڵە= ممتلئ الجسم وقصير القامة».

خرتوڵە، لە خوڵ وەردانە: «تاژییەکە مامزەکەی لە خرتوڵێ وەردا». واتە لە عەردی دا. لام وایە وشەکە «خرپوڵە»یە بە ئەم مانایەی مامۆستا دەگەیەنێت.

(٦٢) ل٢٤٨: خرچە= «حرير، حريف».

لە «د.هـ» خرچە جۆرە تەرۆزییەکی ناویی زۆر گەورە و بێتامە.

(٦٣) ل٢٥١: خشتبڕ= «عامل الطابوق أواللبن».

خشتبڕ لە «د.هـ» بەو قالبە دارەی دەگوترێت کە خشتی پێدروست دەکرێت.

(٦٤) ل٢٦٤: خوبزە= «خادمة، خدامة، شغالة».

هەمبانە دەڵێت: «خوبزە= نۆکەر، خزمەتچی»

لە «د.هـ» خوبزە= پیاوی خزمەتچی ئاغا لە دەرەوە و ژوورەوەی ماڵی ئاغاکەی. بە ئافرەتی خزمەتچی دەگوترا: «کارەکەر». نەک خوبزە.

(٦٥) ل٢٧١: خەرتە= «الأرض المحروثة مرتين».

لە «د.هـ» خەرتە، یان خرتە: جوتیار کە دەچێتە سەر زەوییەکەی تۆ بکات، زەوییەکە ڕەقە و ئەوەندە خوڵەی لێ پەیدانابێت تۆیەکەی بزر بکات، ناچار دەبێت، زەوییەکە پێشتر کێڵدرا بێت، یان.. ناگاسنێکی پێش تۆکردن لێدەدات. بەم گاسنەی دەڵێن «خرتە».

(٦٦) ل٢٧٤: خەفیە «خفير= حارس ليل».

لە «د.هـ» خەفیە بەمانا جاسووسە.

(٦٧) ل٢٨٦: دارە دارە= «تاتی= تشجيع للطفل للوقوف والمشي».

«تاتی» ئەم مانایەی مامۆستا هەڵدەگرێت. کەچی «دارە دارە» بەو منداڵە دەگوترێت کە تازە پێ دەگرێت. ئەمە بۆ نەخۆشیش دەگونجێت: «تازە دارە دارەی ڕاستبوونەوەیەتی».

(٦٨) ل٢٩٣: درشت= «خشن، غليظ، ثخين، سميك».

درشت= گەورەتر لە ڕەگەزی خۆی: «سەرە سەرە درشتی گەنمەکەی دەگرم بۆ ساوار».

بۆ سەرند و بێژنگیش دەگوترێت: «بێژنگ و سەرەندی درشت».

واتە کونەکانیان گەورەبن.

(٦٩) ل٣١٣: دەرخۆنە= «إناء من الطين».

لە «د.هـ»: دەرخۆنە سەرپۆش= «قەپاغ»ی دەفرە. واتە «غطاء المواعين» جا داربێت، یان شتی تر.

(٧٠) ل٣٤١: دەرزیلە= «اسم عشب».

دەرزیلە جگە لەو مانایەی مامۆستا= دەبووس. دەرزییەکە سەرێکی مێرووی ڕەنگاو ڕەنگی پێوەبوو و ئافرەت بۆ جوانی بەنەخش لە هێزار و دەسرۆکی دەدا، کاتی خۆی.

(٧١) ل٣٢٥: دەغەڵ= «كسلان، خبيث، ماكر».

لە «د.هـ»- دەغەڵ بە دوو مانا دێت:

یەکەم: دەغەڵ لە هەناوەوە. واتە لە دەروونەوە نەخۆشە.

بەزۆریش بۆ نەخۆشی کرم دەگوترێت. جا مرۆڤ بێت، یان گیانلەبەر.

دووەم: بە کەسێک دەگوترێت «دەغەڵ» لە دڵەوە لەگەڵ خەڵک ساخ نەبێت واتە «زگرەش» بێت.

(٧٢) ل٤١١: سامۆتە= «بەن سامۆتە».

عەرەبییەکەی نەگوتووە هەمبانە دەڵێت «بەنسامۆتە= بەنی پاشکۆ. دوو بەنی هۆنراوە بەپشت زینەوەیە، کە پاشکۆی پێدا دەبەستن».

خاڵ دەڵێت: «سامۆتە= بەنسامۆتە بەنێکی هۆنراوەیە، بەلای ڕاست و چەپی زینا پاشکۆی پێدا ئەبەستریٰ».

مەهاباد دەڵێت: «حبل يشد به الحقيبة في مؤخرة السرج» منیش دەڵێم بەنێکی هۆنراوەی ڕەنگاورەنگی بە گوڵینگە بۆ جوانی بەملاو بەولای پاشەڵی وڵاخدا شۆڕ دەبێتەوە. ئەگەر تەنیا بۆ بەستانی پاشکۆ بێت، بۆ ئەوەندە درێژ دەبێت بەملاو بەولادا شۆڕببێتەوە، کە هێندەجار سەرەکەی بە سمی وڵاخ دەکەوت.

(٧٣) ل٤١٣: سپیلک: «الحصان الأبيض، التراب الأبيض».

سپیلک بەم مانایانەم بەرگوێ کەوتووە:

یەکەم: بەنی سپیی تەون.

دووەم: ناوی چیایەکی کوردستانە.

سێیەم: هێندە جاریش بەم مانایە دێت: «ئازاد پیاوێکی سپیلکەیە».

(٧٤) ل٤٢١: سندان «انتفاخ، ورم، زائدة، وباء،

خربة، آفة تصيب بعض الأثمار».
لە «د.ھ»- «سندان= ڕیخۆڵە کوێرە» بەڵام لەبەر ئەوە وشەی «سندان» جوان نەبوو بڵێن: «فلان سندانی لێ هاتووە» کورت دەکراوە و دەگوترا: «فلان لێی هاتووە». واتە تووشی ڕیخۆڵە کوێرە بووە.
(٧٥) ل٤٢٣: سۆفی= الروحاني، درویش».
سۆفی و دەرویش لەیەک ئایەرن. ئەویان تۆبەکاری شێخانی: «نەقشی»یە و ڕیش دەهێڵێتەوە زیکری خوا بە نهێنی دەکات، کەچی ئەمیان تۆبەکاری شێخانی «قادری»یە و پرچ دەهێڵێتەوە زیکری بەدەنگ و دەف و تەپڵەیە.
(٧٦) ل٤٣٢: سەپان= (حصاد) حاصد، عامل الحاصد وبأجرة أو باتفاق».
لە «د.ھ» سەپان ئەو کەسەیە لە هەوەڵ ڕۆژی دروونەوە هەتا «کا» و «دان»ی جۆخین دادەکات ئیش دەکات. کەچی «حاصد» شەرت نییە سەپان بێت. ئەمەیان ناوی دەبردرێت بە «پاڵە». واتە دروونەکەر. جا سەپان بێت، یان کرێپاڵە».
سەیر لێرەدایە «حصاد، حاصد»ی کردوونە بەسەپان. کەچی زۆر لەیەک دوورن. ئەویان «دروونە»یە و ئەویشیان «دروونەکەر». مەرجیش نییە هەروەکو گوتم: **هەموو دروونەکەرێک سەپان بێت.**
**(٧٧) ل٤٣٨: سەرپاڵە= «الحاصود السريع، أوالمتقدم من جماعة في الحصاد، العامل، المتفوق أو المتقدم».**
سەرپاڵە واتە سەرۆکی «دروونەکەران». ئەمەش مەرج نییە لە هاوڕێکانی ئازاتر بێت و دروونە باشتر بکات. بگرە وادەبێ بە هۆی تەمەن و دنیا دیتەیی و بیرفرەوانترەوە بووە.
(٧٨) ل٤٤٠: سەر تەنوور= «مخبز، محل عمل الخبز في البيوت».
تەنوور، یان تەندوور بە عەرەبی «تنور»ە. سەر تەنوور لە «د.ھ» بە دوو مانا دێت:
یەکەم: «ژیان چووەتە سەر تەندوور» مانا چووە ئیشی تەندوور بکات.
دووەم: سەر تەندوور= پارچە بەرمیلێکی خڕەو دەخرێتە سەر تەندوور. واتە قەپاخی تەندوور.
مامۆستا دەبووایە «سەر»ی وەگەڵ نەخستبووایە.
(٧٩) ل٤٤٠: سەرتیل= «حبل يشد بيت الشعر».
لە «د.ھ» سەرتیل، یان سەرتیلە= بەرزایی خانووی جەزیری.

(٨٠) ل٤٤٢: سەردڕ= «عمل اليد، الصناعة اليدوية».
سەردڕ بەوکەسە دەگوترێت: کە شمەکی بەری زوو بدڕێت. لەگەڵ ئەوەی مامۆستا فەرموویەتی زۆر دوورە.
(٨١) ل٤٤٤: سەرسپی: «كبيرالسن، عجوز، أو عجوزة، حكيم، عاقل»
سەرسپی من وام بیستووە تایبەتە بە ئافرەتان، بۆ پیاو دەگوترێت: «ڕیش، ڕدێن سپی». وشەی حەکیم و عاقل-یش زێدەنە. مەرج نییە هەموو سەرسپییەک حەکیم و عاقڵ بێت.
(٨٢) ل٤٤٦: سەرشۆرک، سەرشۆرکە= (حمام الصيفي، مكان الاستحمام في الصيف».
سەرشۆرک= گەرماوە جا چ لە هاوین بێت، یان زستان. کەچی بە داخەوە ئەمڕۆ لەسەر زاران لادراوە و «گەرماوی» تەرجومەی عەرەبی شوێنی گرتووەتەوە. چەندین وشەی ڕەسەنی کوردی فەوتاوە و وشەی عەرەبی جێگەی گرتووەتەوە. وەک «ئاروو» لەسەر زاران نەماوەو بووەتە «خیار». «مژمژە» لە سلێمانی بووەتە «مەساسە»...
(٨٣) ل٤٤٦: سەرشیر= «قشده، قشطة، زبدة».
بە بۆچوونی من «سەری شیر» ماناکەی مامۆستا دەگەیەنێت.
«من نانێکم بەسەری شیرخوارد» واتە بە «سەرتوو= سەرتوێژەکەی، کەچی «سەرشیر» پارچە پەڕۆیەکی ئەستووری تایبەتە و دوای هەوێنکردنی شیر بەسەر دەفری شیرەکە، تا دەمەیی دادەدرێت.
(٨٤) ل٤٤٨: سەری کڵاو= «غطاء، رأس الفانوس او المصباح النفطي».
من وام بیستووە: «سەرکڵاو» کڵاوێکی لبادی گەورە و بە لێوارە و سەری قیتە و کاتی خۆی «دروونەکەر» یان «شوان» بەهاوین لەبەر گەرمی لەسەری دەنا.
(٨٥)ل٤٤٩: سەرکەلە= «لجام، شكيمة، غمامة».
سەرکەلە تەنراوێکی ڕەنگاو ڕەنگی بەن بوو لە شێوەی کەژی، بەڵام باریک و تەنکترە دەکرایە ڕێشمەی وڵاخ و گوێدرێژ و شتی تر.
(٨٦) ل٤٦٥: سێرە= «سن، عمر، دور، فترە، أوان أو فترة الحياة».
سێرە لە «د.ھ» بە مانا نیشانەگرتنی تفەنگە: «ئازاد سێرەی لە مامزەکە گرت و پەنجەی بزافت و لە ڕێسەی ملی دا».
(٨٧) ل٤٦٥: سێ گاسنە= «حراثة الأرض بعد

البزار، أرض محروثة بعد البزار».
سێ گاسنە مانای «٣» سێ جار کێڵدراو. شەرت نییە تۆکردن سێ کەڕەت بکێڵدرێت. جار وایە تۆ بەکۆنە پەرێزەوە، وەردەگرێت.
ئەوکات تۆیەکە یەک گاسنەیە، یان خرتەیە، یاخۆ شۆیە تۆی پێوەدەکرێت. تۆیەکە ئەوسا دوو گاسنەیە. تەنیا ئەگەر زەوییەکە وەرد بێت. بە گاسنی تۆیەکە دەکاتە سێ گاسن. ئەو دەمیش دەگوترێت: «دەغڵی وەردێیە» ناگوترێت «دەغڵی سێ گاسنە».
(٨٨)ل٤٦٦: سیلە= (قطعة، مسطحة من الحجر).
سیلە لە «د.هـ»: «گۆشەی دیوارە: ئازاد لە سیلەی خانووەکە سووڕاوە».
(٨٩) ل٤٧٩: شکارتە= «شكارة ما يزرعه الفلاح لنفسه في قطعة أرض صغيرة».
شکارتە= پارچە دەغڵێکی بچووکە فەلاح لە بریتی کرێ بۆ ڕەنجبەری خۆی دەکات، یان بەخێر بۆ مەلا و سەید و شێخ، یاخۆ بە پیاوەتی بۆ دۆستێکی خۆی. باوکم لە سی «٣٠» ساڵ پتر مەلا بووە و فەلاحانی ئاوایی ساڵانە شکارتەیان بۆ دەکرد. نەک فەلاح بۆخۆی بچێنێت.
(٩٠) ل٤٨٥: شوانکارە= «مجموعة من الرعيان».
لە «د.هـ» شوانکارە ئەو کەسەبوو کە مەڕی خەڵکی بەنیوەیی بەخێو دەکرد.
(٩١) ل٤٨٨: شەختە= «لوح أو قطعة من الجليد».
شەختە لە «د.هـ»= «سەهۆڵ». بە عەرەبی «جليد، صقيع».
«دنیا بوویتە شەختە». واتە بەستوویتی.
(٩٢) ل٤٩٣: شەک= «خروف، حمل، شاة، بعمر سنتان».
سەیرە لەلایەک دەڵێت: شەک «خروف= بەرخ»ە، کە تەمەنی ناگاتە ساڵێک، کەچی دوایی دەڵێت: «شەک= شاة»، تەمەن دوو ساڵانە.
شەک لە ناوچەی سلێمانی نێر و مێی سپیانە، نەک ڕەشان= «شەکەنێر، شەکەمێ». کەچی لە «د.هـ» تەنیا بەسپیانی نێری دوو ساڵی دەگوترێت.
(٩٣) ل٥٠٥: شینکە= (أرض صخرية)
لە «د.هـ» شینکە= بە «گیا» دەگوترێت: «ئەسپەکە تێر شینکەیە غوردە». واتە تێر گیای شینە.
(٩٤) ل٥١٠: غەور= «قيح، صديد، مدة».
خاڵ دەڵێت: «غەور کێم و زووخی ناوبرین: ئەم دەرمانە غەوری برین ئەکێشێ. واتە چڵکی ناوی پاک ئەکاتەوە». کەچی لە «د.هـ» غەور= «ڕووچوون بۆ ژێر زەوی= خودا غەورت بکا».
(٩٥) ل٥١٥: فسین= خروج الفسوة اوالغازات من البطن».
فسین کردەوەکەیە، هەروەکو مامۆستا ڕاڤەی کردووە.
دەبووایە «فس»ی کە چاوگەکەیە باس بکردبووایە. نەک فسین.
فسین بە مانا پەڕینی نێری باڵندەش دێت. «کەڵەشێرەکە بەسەر مریشکەکە فسی».
(٩٦) ل٥٢٠: فەلاقە= «الضرب او الجلد على راحة القدم»
ئەوەی مامۆستا دەڵێت «فەلاقە» نییە، لە «فەلاقەدانە». هەردوو پێی مرۆڤ دەخرایە نێوان دوو «پەت»ەوە، سەری پەتەکان بە دوو داری تەرزی «لۆلەپ»ی مەشکە دەبەسترێت. دارەکان بە پێچەوانەی یەکتر بادەدرێن تاکو قاچەکانی، بە نووساوی شەتەک دەدرێن. ئەوجا دوو کەس هەریەکەیان دارێکی بەرز دەکاتەوە و نێو شانی کابرای لە فەلاقە دراو لە زەوییە و ژێر پێیەکانی لە حەواو جا بە قامچیان، یان دار لێیدەدرێت، تاکو بن پێیەکانی شین و مۆر هەڵدەگەڕێت.
فەلاقە بە هەر دوو دار و پەتەکان دەگوترێت. مانای دووەمی «دارێکی تەژیە دەخرێتە کونی ئەملاو ئەولای دەرگای «تەویلە»ی وڵاخ و گوێدرێژ تا نەتوانن بێنە دەرەوە.
(٩٧) ل٥٢٨: قانگ= «دخان».
خاڵ دەڵێت: «قانگ پووتی توور» واتە بە توورێک دەگوترێت کە لەناوەوە تووشی نەخۆشی بوو بێت و بەکەڵک خواردن نەیەت.
قانگدان= دووکەڵ کردنەوەیە لە ژوورێکدا: «بەو دووکەڵە قانگ دراین». جار وابووە ڕێوی چووەتە نێو کونێکەوە بە دووکەڵ تا بێتە دەرەوە قانگیان داوە. کەواتە قانگ «دووکەڵ» نییە، بەڵکو دووکەڵ کردنەوەیە، لە ژوورێکی تەسکدا.
(٩٨) ل٥٢٨: قاو= «شائع، خبر شائع».
لە «د.هـ»- قاو= گەمەیەکە پێیدەگوترا «قاوقاوانێ» و تایبەت بوو بە کوڕانی منداڵ و لاو. یەکێک دادەنیشت و یەکێکی دی لەگەڵ فڕانی کڵاوی سەری دانیشتووەکە دەیگوت: «قاو» و تێیدەتەقاند و خاوەن کڵاو و هاوڕێکانی دەکەوتنە دوای. ئەگەر پێش ئەوەی بگاتە جێگەی مەبەست بیگیرابووایە کابرای پێشوو لە یارییەکە دۆڕاندی، ئەگەرنا بە پێچەوانەوە بوو.

(٩٩) ل٥٥٠: کارەموو= «نسیج من صوف الماعز».

کارەموو لەکوێ و «نەسیج» لەکوێ. مانای وشەکە لەخۆیەوە دیارە: «کارەموو= واتە مووی کار».

(١٠٠) ل٥٥٧: کرمانج= «جماعة من الاکراد».

خاڵ دەڵێت: کرمانج= «هۆزێکی گەورەیە لە کورد»

مەهاباد دەڵێت: کرمانج= «سکان منطقة کردستان الشمالیة».

کرمانج لە ڕاستیدا بەسەرتاپای گەلی کورد دەگوترێت. هەمبانە جوانی بۆ چووە: «کرمانج ناوە بۆ گەلی کورد».

کەچی بە داخەوە: غەوارەکانی کوردستان، بەتایبەتی بەرزنجییەکان لەگەڵ هێندێک کەسانی زرخۆیی جیاوازییەکی تەواویان خستووەتە نێو میللەتی کوردەوە. بۆ وێنە سەیری ئەمانە بکەن.

أ- کرمانج و شارستان.

ب- ئاغا و کرمانج. واتە کوردەکانی ناو شار و ئاغاش کە خاوەن موڵکە لە گەلی کوردییان جیاکردووەتەوە. ئەمەش گەورەترین هەڵەیە دەرحەق هەستی نەتەوایەتی. بە بۆچوونی من ئەم تەرحە جیاوازییەش لە هاتنی بەرزنجییەکانەوە بۆ کوردستان سەری هەڵداوە. لە ڕاستیدا ئەوان کرمانج نین عەرەبن. حەقی خۆیانە کرمانج و شێخ، یان کرمانج و سەیدیان بلاوکردووەتەوە. کە تا ساڵی (١٩٧٧)دا گشتیان لە نفووس خۆیان بە کورد نووسیبوو، کەچی بۆ ئەوەی لەلایەن سەدامی دکتاتۆری گۆڕ بە گۆڕچووی دۆستیان خۆشەویستر بن و مووچەیان زێدە بکات، مەگەر بەدەگمەنیان دەنا زۆربەیان لەم ساڵەدا خۆیان بە عەرەب نووسی. تاکو ناو نووسێکی کورد، بەبێ پرسی پیاوە وەلییە گەورەکەیان ڕچەڵەکی بە کورد نووسیبوو زۆر نەمابوو بە جەلاویزە بەعسییەکانی دۆستی بە کوشتنی بدات.

(١٠١) ل٥٦٤: کۆتک= «قطعة خشب أو حطب»

کۆتک جامێکی گەورەی داربوو. لە پەرێزدا ئاو و دۆی تێدا دەخورایەوە. لەبەر ئەوە داربوو ئاو و دۆی تێدا درەنگتر لەجامی سفر و مەعدەن گەرم دەبوو. بۆیە ئەو زەمان باوی هەبوو.

(١٠٢) ل٥٧٨: کوێخا= «سەرکاڵ القریة».

«سەرکاڵ» نییە «سەرکار»ە.

مامۆستا خۆی لە لاپەڕە «٤٤٧» دەڵێت: «سەرکار= ملاحظ، مراقبة، هیمنة»، کەچی لێرەدا کردوویە بە کوێخای گوند.

لە «د.هـ» سەرکار «ئەوکەسەیە بەکاروباری ئاغای دێ هەڵدەستێت لە هەموو ڕوویێکەوە».

کوێخاش: «لە هێندە گوندان ئاغای تەواوە. تەنیا ناوەکەیان جودایە. لە هێندە گوندانیش برا گەورەی ئاواییە.

(١٠٣) ل٥٨٠: کەتن= «ورطة، ذنب، اثم، أذیة، عرر، سوء».

کەتن لە «د.هـ» بە دوو مانا دێت.

یەکەم: کەتن= «گرانەتا. ئازاد کەتنیێتی. واتە گرانەتایەتی».

دووەم: کەتن «سووکایەتی: کەتنێکم بە ئازاد کرد با بە دەواری شڕی نەکردبێت».

(١٠٤) ل٥٩٣: کەوە ڕۆژ= «نهار مظلم فی الشتاء»

لە «د.هـ»: ئەگەر ئاسمان هەورێکی بۆر یان زەردی هەبێت بە ڕۆژەکە دەگوترێت «کەوەڕۆژ»، ئەگەر هەورەکە سپی بوو بە «سپیە ڕۆژ» ناودەبردرێت.

(١٠٥) ل٥٩٧: گاشە= «حصو، حصاة، حجر صغیر أو ناعم»

خاڵ دەڵێت: «گاشە= خڕەبەرد».

هەمبانە دەڵێت: «گاشە= بەردی زل».

مەهاباد دەڵێت: «گاشە بەرد= صخرة».

کەچی لە ڕاستیدا «گاشەبەرد» بەردێکە ناو لەپێ دەستێک هەر ئەوەتە بەخۆیەوە بگرێت.

(١٠٦) ل٦٠٤: گزیر= «رئیس، زعیم، شخصیات متنفذة في الحکم، الهیئة الحاکمة».

مەهاباد دەڵێت: «گزیر= شرطي، سمسمار القریة»

خاڵ دەڵێت: «گزیر کەسێکە، کە کاروباری دێیەک ببینێ»

هەمبانە دەڵێت: «گزیر بەردەستی کوێخا لە دێدا».

ئەمەیان جوانی بۆچووە: «گزیر= بەردەستی ئاغا و کوێخایە لە دێدا».

(١٠٧) ل٦١٢: گورد= «شجاع، باسل، لا یقهر».

هەمبانە دەڵێت: «گورد= دارێکە دەخرێتە ڕایەڵی بەن».

خاڵ دەڵێت: «گورد دارێکە لە کەمەری تەونا ئەنرێ».

بە بۆچوونی من هەمبانە و خاڵ بە هەڵە چوونە. ئەمەی خوارەوەش دەیسەپێنێت:

«تەون دوو ڕایەڵی هەیە. ڕایەڵی پشتەوە «شێرە»ی ناوە. ڕایەڵی پێشەوە گوردە.

دارێک کە بە بەنێکی ئەستوورتر لە ڕایەڵەکان پێچراوە و لەنێوان ڕایەڵی گورد و شێرە هەڵدەکێشرێت. جا لەبەر

ئەوە ڕایەڵی «گورد»ەکە بە بەنە ئەستوورەکە دەبەسترێتەوە بەو دارە دەبێژرێت: «دارگورد» بە بەنە ئەستوورەکەش «بەنەگورد». کەواتە «گورد» دار نییە و بەڵکو ڕایەڵی پێشەوەی تەونە».

(١٠٨) ل٦٣٨: لاک= «جيفة، جثة، رمة».

لە «د.هـ» لاک بە دوومانا دێت:

یەکەم: «ئازاد لە ترسانا لاکەی لەخۆ بڕی». واتە جوولەی نەدەکرد.

دووەم: ئازاد وا بە لاکەلاک هات». واتە هەر ئەوەتە دەتوانێت بڕوات.

(١٠٩) ل٦٣٩: لاکێش= «مدخن أحيانا، قليل التدخين، من لا يحمل السجاير ويدخن».

پێویست بەو درێژدادرییەی نەدەکرد و دەبووایە بەم تەرحەی ڕاڤە بکردبووایە: «لاکێش کەسێکە جگەرە دەکێشێت لەسەر حسێبی خەڵک».

لە «د.هـ» لاکێش بەم مانایەش دێت: «ڕایەخێکی درێژ. جا لباد بێت، یان مافوور». ئەمەیان «سەرەناز»یشی پێدەگوترێت.

(١١٠) ل٦٤١: لچ «الشفة، الشفة السفلى».

«لچ» لە «لێو» گشتی ترە. هەردووکیان بۆ مرۆڤ دەگوترێت: ئازاد لچ، یان لێوی ئەستوور بووە»، کەچی بۆ گیاندار تەنیا ئەویان بەکاردێت «لچی مەڕەکە برینداربووە». مەبەست لچی سەرەو خوارەوە بە تایبەت بە خوارەوە نییە، هەروەکو مامۆستا وای بۆچووە.

(١١١) ل٦٦٤: ماچە= «أنثى الحيوان أو الطير، حيوان مؤنث».

لە «د.هـ» ماچە تەنیا بە هێستری «مێ» دەگوترێت. بۆ گوێدرێژ «ماکەر»، وڵاخی بەرزە «ماین»، ڕەشەوڵاخ «چێڵ»، سپیان «مەڕ»، ڕەشان «بزن»، باڵندە «مێیە»یە.

(١١٢) ل٦٧١: مردار= «رمة، جيفة، ميت، عفن».

مردار هەروەکو پێشتر گوتم: «بە مردنی ئاژەڵێک دەگوترێت کە گۆشتی بخورێت». ماوەیەکی پێ بچێت ئەوجا بۆگەن دەبێت، نەک یەکسەر.

(١١٣) ل٦٧٣: مزە= «أتعاب، أجرة، رسم، قيمة».

مزە لە «د.هـ» تایبەتە بە ئاشی ئاردی. خاوەن ئاش کرێی لێکردنی باراشی خەڵک لە دەغڵەکەی «گەنم بێت، یان مزاش و جۆ» دەگێڕاوە. کە «مزە»ی پێدەگوترا. ئەوانەی مامۆستام نەبیستووە بەمانا مزە بێن.

(١١٤) ل٦٧٨: مۆرە= «زهرة، نرد».

مەهاباد دەڵێت: «مۆرە= «فص النرد، كعبتين». واتە «مۆرە» بە «زاری تاوڵە»ی دەگوترێت. نەک تاوڵە. کە مامۆستا وای بۆچووە. ئەمەی خاڵیش سەقای دەدات: «شتێکی بچووکی«٦» شەش ڕووە و هەر ڕووی چەند خاڵێکی پێوەیە».

هەمبانە دەڵێت: «مۆرە= چینە دیواری قوڕ، لەتی بە مشار بڕاو لە کۆلکەدار، زاری تەختە نەرد».

لە «د.هـ»: هەر کە دیواری حەوشە تەواو بوو سەرەکەی بە «قوڕە پەست» سواق دەدرێت تاباران کارنەکاتە سەر دیوارەکە» پێیدەڵێن: «مۆرە».

دووەم: مۆرە «بەو کایە دەگوترێت، کە لە ترسی مۆرانە دەخرایە نێوان دەغڵ و دیواری چاڵەوە».

(١١٥)ل٦٨٣: مەفرەق= «برنز، مرشب، مزيج القصدير والنحاس والخارصين».

لە «د.هـ» مەفرەق «تووج»ە و لەلایەکی دیکەوە: «دوو ڕێگا بە پێچەوانە یەکتر ببڕن».

(١١٦) ل٧٠٥: نسار= «المنطقة المعتدلة المناخ».

لە «د.هـ» نسار= «شوێنی سێبەر و هەتاو نەگر».

(١١٧) ل٧٤٢: هەتەر= «مصر، لجوج، لحوح»

لە «د.هـ» هەتەر= بڕو مەودای حوکمی چاو «تاکو چاو هەتەر دەکات دەشتە».

(١١٨) ل٦٤٣: هەراش= «تام، ناضج، خشن»

لە «د.هـ» هەراش بەو چەند مانایە دێت:

یەکەم: هەراش= «کەبەر و قەسەڵ و پووش و گەڵای بەسەر دارە ڕای خانوو دادەدرێن».

دووەم: «مەڕەکە هەراش ئاوسە». واتە زگی گەورەیە و زۆری نەماوە بزێت.

سێیەم: «منداڵەکە هەراشە». واتە لە ساوایی دەرچووە.

(١١٩) ل٧٦٥: یاپراخ= «دۆڵمە= طعام من التمن ملفوف بالورق وغير ذلك».

لە «د.هـ»- یاپراخ= لەگەڵ دۆڵمە جیاوازە. ئەم برنج و گۆشتە، ئەویش برۆێش و پیازی سوورکراوەی تێدەکرێت.

(١٢٠) ل٧٧٠: ییخ= «صوت لسوق الحيوانات».

ییخ تەنیا بۆ لێخوڕینی ڕەشانە. بۆ لێخوڕیی سپییان «هڕە» و بۆ گوێدرێژ «هەچە» و بۆ مانگا «وەحە» و بۆ پشیلە «ختە» و بۆ سەگ «چەغە» و بۆ مریشک «کشە»...

نۆباتیش بەم تەرحەم بیستووە «حوشترەکە ییخ بوو». واتە دانیشت، یان نوست.



# د. شێرزاد نەجار:
# زانکۆکانی ئێمە چەند دەزگایەکن لە واقیعی کۆمەڵایەتی دابڕاون

لە زۆربەی گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا باس و لێکۆڵینەوەی هەیە، لە زۆربەی سەندیکا و ڕێکخراو و دەستەبەندەی جیاجیای ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەوانی و سیاسی و ئەدەبیدا ئامادە دەبێ، بەشدارییەکی دیاری لە شیکردنەوەی ڕووداوە سیاسییەکانی نێو کوردستان و دەرو دراوسێ و نێو دەوڵەتیدا و لەنێو کەناڵەکانی تەلەفزیۆن و سەتەلایتەکان بەرچاو دەکەوێ، جگە لەزمانی کوردی، بە ئینگلیزی و عەرەبی و تورکمانی و ئەڵمانی دەپەیڤێ و شارەزاییشی لەزمانی فەرەنسی و لاتینیشدا هەیە، هەموو ئەمانە بوونەتە مایەی ئەوەی یەکێ لە زانکۆکانی ئەڵمانیا داوای لێ بکا تا لەمەڕ (بنیادنانی نەتەوە لە کوردستانی عیراق) لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانە ئامادە و پێشکەش بکا. لەبەر سەرقاڵبوونی، (٣) مانگە خەریکی ئەم دیدارەین، تا بەم دواییە- سوپاس بۆ خوا- تەواو بوو.. دەی دەبا بزانین دکتۆر شێرزادی برا، چۆن سەیری ژیان و مێژوو و فیکر و سیاسەت دەکا.

**رامـــــان:** ئایا فـره ڕۆشنبـیری و فـرەیی سیـاسی لە سیمایەکانی کۆمەڵگەی مەدەنین؟

**د. شێرزاد نەجار:** لەم ساڵانەی دواییدا هەر بە تەواوی چەق لەسەر مەسەلەیەکی گرنگ دەبەسترێ ئەویش: ئایا ئەو تۆڕە بەرهەراو قـووڵەی نێوان دەستەبەندە و گرووپی جـیـاجـیـا و بەرژەوەندییـەکـانیـان و بەشـداربوونی سیاسـیـشـیان، لە سـیـمـا جەوهەرییـەکانی کۆمـەڵگەی مـەدەنین؟ کە ئەمـەش خـۆی لەخۆیدا کۆمـەڵگەیەکە هەر هەموو هاووڵاتییان لە ئەنجامی بەندیواری کۆمەڵایەتی و سیاسـی تێک دەچرژێن و دوور لە چاودێری و کـۆنترۆڵی دەوڵەت کـار دەکـەن. هەروا یەک لە ئەدگـارەکـانی کۆمەڵگەیەکی کارای مەدەنی ئەوەیە کە: بەشداری کردن لە دەزگـا و ڕێکخـراو و سەندیکاکـاندا دەبێتـە مـایەی پەرەسەندنی کارامەیی و دەسرەنگینی (تاک) لە کـاری ڕۆژانەی سـیـاسـیـدا و هەروا لە پێوەندی هەرەوەزیدا کـە تێیدا هاووڵاتیـان فـێری خـۆ ڕێکخستن و فـێری جـۆری ڕادەربڕینی بەرژەوەندییـەکـانی خـۆیان دەبن، لە پێناوی مـەبەسـتـە هاوبەشکۆکـاندا. کـەواتە: فـرە ڕۆشنبـیـری و فرەیی سیاسی و هەروا هزرمەندی، کارێکی هەر یەکجار پێـویـسـتی کـۆمـەڵگەی مـەدەنیـیـە کـە خـۆی لە (٣) خـەسـڵـەتدا دەنوێنێ: (بەرهەمـهـێنان- دابەشکردن- بەرخوری) لە ڕێگەی ئەمەشەوە ئەو کـۆمەڵگەیە دەبێتە جـۆرە (سـیـسـتـەمـێک) واتە: هەر هەمـوو ئەو ڕەگـەزانە پەنجـەنمای توخم و ڕەگـەزەکانی دیکە دەکـەن، بێگومـان کۆمەڵگەی مەدەنیش وەک سیستەمێک، ناتوانێ بەبێ بوونی ئەو تـوخم و ڕەگەزە سـەرەکی و لاوەکـیانە هەنگاو هەڵێنێ، هەر هەمـوو ئەو ڕەگەزانەش، بەیەکەوە ئەو فـرە ڕۆشنبیری و فرەیی سیاسییە دەرسکێنن.

**رامان:** ئەی چۆن دەستنیشانی مەسئولیەتی ڕووناکبیر دەکەی لەپێناوی بنیادنانی کۆمەڵگەی مەدەنییدا؟ ئەی مافی ئافرەت و منداڵ لەو کۆمەڵگەیەدا؟

**د. شێرزاد نەجار:** مەسئولیەتی ڕۆشنبیر بەند نییە بە بنیادنانی کۆمەڵگەی مەدەنییەوە، نا بەڵکو ئەو کارە بەر لە هاتنی ئەو کۆمەڵگەیەوە دێ ئەمیش: بە (خولقاندنی هوشـیـاریی لای کـۆمـەڵانی خـەڵک) و تێگەیشـتنێکی تەواوی پرۆسەی بنیادنانی کۆمەڵ. دیارە ئەو پرۆسەیەش سـیـمـا و سـیـفـەتێکی گـرنـگ و تایبـەتی دەبەخشـێتـە ڕۆشنبیر کە ئەمیش: (ڕۆشنبیرێکی دینامیکییە) بەپێی ئەو بۆچوونەی کـە بیـرمـەندی ئیـتـاڵی (گـرامـشی) بۆی چووە، وەک دیاریشـە بە هیـچ کـڵـۆجێ ڕۆشنبـیـر ناتوانێ ئەو مـەسـئـولیـەتە بخـاتە سـەر شـان گـەر چەندین چەند پێوەندی گـیـانی بەگـیـانیـانەی لەگـەڵ کـۆمەڵانی خـەڵک نەبێ، چونکە هەر ئەو پێوەندییانە دەرفەتی تەواو بۆ ئەو



**شێرزاد نەجار لەگەڵ باوک و فەرهادی برای**
**١٩٥١/٢/١٢**

ڕۆشنبـیـره دەرەخـسـێنێ تا دەوری خـۆی لە هەژاندن و بزواندنی جـەمـاوەردا ببـینێ، بۆ ئەوەی بەرگـری لە مافەکانی خۆی بکات، ئا لەم دەروازەیەوە ڕۆشنبیر بۆی دەلوێ ئەو مەسئولیەتە بخاتە سەر شانی، لە بنیادنانی کۆمەڵگەی مەدەنیشدا کە لە بنجیدا پێویستی بە دەوری سەرەکی ئەنتلجنسیا هەیە. ئێمە کاتێ باسی کۆمەڵگەی مـەدەنی دەکـەین، ئەوە بێگومـان مـەبەسـتـمـان لە دەسـتـخـسـتنی مـافە بنەڕەتییەکانی هاووڵاتیانە، دیارە مـافەکانی ئافـرەت و منداڵانیش لە ستوونە گرنگەکانی ئەو مـافـانەن کـە بەپێی چەندین ڕێککەوتنامـەی نێودەوڵەی و تایبەتی ڕێکخراوە و لە ڕەچەڵەکییەوە بەندە بە جاڕدانی جیهانیی مافی مرۆڤی ساڵی (١٩٤٨)ـەوە.

**رامـان:** باشە ئەی ڕۆڵ و پێوەندیی هوشیاری فیکری و سیاسیی و ئابووری و زانستی بە کۆمەڵگەی مەدەنییەوە چییە؟ ئەی دەوری میدیا لەو بنیادنانەدا؟

**د. شێـرزاد نەجـار:** بیـرۆکەی کـۆمـەڵگەی مـەدەنی و هەوڵی بنیـادنانی، لە قـۆناغـێکی پێشـکەوتووی قۆناغەکانی پەرەسەندنی هوشیاریی فیکری و سیاسی و ئابووری مـرۆڤ-وەک هاووڵاتی- کـە لەنێـو کـۆمـەڵدا دەژی، هاتەکـایەوە. بێگومـان ئەو هۆشـیـارییـەش لە ئەنجامی چەند هۆکارێکەوە سەرهەڵدەدا، گـرنگـترینیـان

ڕووبەڕووبوونەوەی هاوولاتییە لەگەڵ پرۆسەیەکی زۆر گرنگ کە ئەویش: پرۆسەی پێگەیاندنی سیاسکۆمەڵایەتییە و لە ئامرازە هەرە بایەخدارەکانیشی (دەزگای ڕاگەیاندن)ـە کە لە هەمان کاتدا لەو هۆکارانەیە کە دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەت و بۆ خزمەکردنی مەبەست و ئامانجەکانی خۆی دەیخاتە گەڕ، بەڵام دەبێ لێرەدا جیاوازیی نێوان دەوڵەتی تۆتالیتاری و دەوڵەتی دیموکراتیدا بکەین، چونکە دەوری ئەو دەزگایانە لەژێر سایەی ئەو دوو ڕژێمەدا تەواو لێکترجیاوازن، ئێمە لێرەدا باسی دەوری ئەو دەزگایانە لەژێر سایەی ڕژێمێکی دیموکراتیدا دەستنیشان دەکەین، کە مەبەستی بنیادنانی هاوولاتییەکی هۆشمەند و چالاک و بەکاربێ لە پرۆسەی سیاسیدا، بۆیە لێرەدا مەبەست دەزگایەکی سەرازادی ڕاگەیاندنە، لە هەمان کاتیش هەست بە لێپرسینەوەیەکی گەورەش دەکا کە ئەویش: جۆرە پەیگیرییەکی گرنگ فەرز دەکاتە سەر کارمەندانی نێو ئەو دەزگایانە و بەندیشە بە: سەراوەڵەکردنی ڕاستی و بەرگری لێکردنیەتی، مەبەستم ڕاستیی پیرۆزمەندی کێشەیەکە. ئا لێرەوە پرسیارێک قوت دەبێتەوە: ئەویش کێشەی بەرگریکردنە لە بەرژەوەندییە باڵا و پڕ لە زیندەگییەکانی گەل کە دەبێ لەسەرووی ئەو کێشانەدا بێ کە دەزگاکانی میدیا هەوڵی چارەسەرکردنیان بۆ دەدا.

## دوورکەوتنەوەی سیاسەتمەدارانی کوردلە مشوورنەخواردنی ئەرکی ڕۆشنبیری و فیکری و ئاوێتەنەبوونیان لەگەڵ بزافی فیکریدا، دیاردەیەکی زۆر خەتەرناکە

**ڕامان:** ئەی چۆن سەیرێکی واقیعبینانەی دەسەڵات و هاوولاتی دەکەن، کە لەنێو کۆمەڵگەی مەدەنی و سەروەری یاسادایە؟

**د. شێرزاد نەجار:** خاسییەت و سروشتی کۆمەڵگەی مەدەنی گەلێ مەرجی جیاجیا هەڵدەخا، تا ببێ بە کۆمەڵگەیەکی کاراو بەزات و چالاک، لە سەرووی ئەو مەرجانەش، دەبێ دەسەڵاتی سیاسیی لە خواست و ویستی هاوولاتیانەوە هاتبێ و پشتی پێ بەستبێ، بۆیە کۆمەڵگەی مەدەنیی چەشنێکی نوێی پێوەندی و بەندیواربوونی نێوان هاوولاتی و ڕژێمی سیاسی هەڵدەخات، ئەو (چەشنە)ش دەبێتە مایەی ڕسکانی ئاوێتەبوونێکی پوخت و خارا لەنێوان دەسەڵاتی سیاسی و هاوولاتیان و بەندیشە بە دەوری هەرە جەوهەریی یاسا لەنێو دەوڵەتدا، بە جۆرێ کە دەستەبەری سەروەریی یاسا و حوکمی یاسا دەبێ، لە هەڵسووڕاندنی کاروباری دەوڵەت و دەشبێتە مایەی ئەوەی: هاوولاتی هەستێکی بەجۆش و کارا بەوە بکات کە هەموو ئەو بڕیار و ڕێنماییانەی دەردەچن سەر بە پرنسیپەکانی داد و یەکسانییەوەیە، ئا ئەم هەستە کار لە ئاسی ئەو شەرعیەتە دەکا کە ئەو ڕژێمە سیاسییە هەیەتی. ئەو شەرعیەتەی کە پەیوەست بوونی هاوولاتیان بەڕژێمی سیاسییەوە دەنوێنێ، چونکە ئەو ڕژێمە ئەو داخوازییانەیان بۆ دابین دەکا کە دەیخاتە بەردەستی. ئەم خاسیەتانەش زۆر بە ڕاشکاوی و ڕوونی نابینرێن، مەگەر تەنیا لە کۆمەڵگەیەکی تایبەتدا نەبێ، مەبەستم کۆمەڵگەی مەدەنییە، ئەو کۆمەڵگەیەش دانامەزرێ مەگەر تەنیا لە قۆناغێکی پەرەسەندووی کۆمەڵدا نەبێ، کە خۆی لە ڕژێمێکی دیموکراسیدا دەدۆزێتەوە.

**ڕامان:** بۆ کۆمەڵ لە ژێر سایەی ڕژێمی دیکتاتۆریدا دەوری کەم دەبێ وپووچەڵ؟

**د. شێرزاد نەجار:** دیکتاتۆریەت هەروا لە خۆی و بەبێ بوونی چەندین چەند هۆکاری فیکری و کۆمەڵایەتی پەیدانابێ، کە پەیداش بوو ئەوە بەرەنگاری گەشەکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی دەبێتەوە و گیانی کۆنترۆڵ و بەرزەفتکردن بە زەقی سەرهەڵدەدا و چ دەرەتانێک بۆ ڕاسانی کۆمەڵ و پەرەسەندن ناهێڵێتەوە. هەر لە سیمایەکانی ئەم گیانە دیکتاتۆریەشەوە ئەدگارەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی وردە وردە پووچ دەبێتەوە و هەڵدەوەرێ و دەگاتە ئاستێک کە مەرجە مەوزوعییەکانی نامێنێ و بەمەش کۆمەڵگەی مەدەنی دروست نابێ. پێوەندی نێوان دیکتاتۆرییەت و کۆمەڵگەی مەدەنی پێوەندیی بەرەنگاربوونەوەیە، واتە: بوونی دیکتاتۆریەت نەبوونی کۆمەڵگەی مەدەنییە، بوونی کۆمەڵگەی مەدەنیش دژ بە بوونی دیکتاتۆریەتە. هەر بۆیەشە پێداویستییەکی بەردەوام هەیە بۆ پاراستنی کۆمەڵگەی مەدەنی لە ناهەمواری و نالەباری و خراپەکاری تاوانەکانی دیکتاتۆریەت، ئەویش لە ڕێی هاندان و جۆشدان و پشتگیری کردنی پرنسیپەکانی دیموکراسی و ئازادی و یەکسانییەوە دێتە کایەوە.

**ڕامان:** ئەی خەرافات و دەسبڕین و بیری پرپووچ و چەواشەکردن و دابونەریتی گەندەڵ، چەند ڕێگە لەسەرهەڵدانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا دەبینێ؟

**د. شێرزاد نەجار:** بەڕاستی سەرهەڵدانی بیرۆکەی



**شێرزاد نەجار لە پۆلی چوارەمی سەرەتایی، قوتابخانەی موزەفەریە - هەولێر ١٩٥٦**

کۆمەڵگەی مەدەنی لەگەڵ ڕۆچوون و پاشەکشە و فەوتانی (بیری تاریک و ترسناک)دا هەماهەنگ بوو، چەندین چەند چاخیشی خایاند و بووە مایەی گەشەنەکردن و پێشکەوتنی مرۆڤایەتی، گومانیش لەوەدانییە کە ئەو (بیرەش) پشتی بەخەرافات و جادووبازی و دەسخەڕۆکردن و دابونەریتی گەندەڵەوە بەستبوو و لە نەزانین و نەخوێندەواری و لە ڕواڵەتبازیی فیکر و لێکدانەوەی ڕووکەشەوە هەڵقوڵا بوو، کۆنە کۆمەڵگاکەش بەربەستێک بوو لەبەردەم هزری پەرەسەندنی مرۆڤ و بنەماکانی پێشکەوتن، هەر بۆیەشە بۆ چەندین سەدەی کەوناراش بوو بە بەردی مەحەکی بیروڕاو بۆچوون و پرنسیپە والآکان و خۆی لەخۆشیدا بوو بەمایەی سەرهەڵدانی گەلێ دیاردەی ناجۆر و نالەباری وەک: دژایەتی کردنی زاناکان و سووتاندنی کتێب و زیندانی کردنیان. ئەم پرۆسەیەش لە دادگایی کردنی (سوکرات)ـەوە کەوتەوە کە ڕووبەڕووی مەرگیان کردەوە و ژەهریان دەرخوارد دا (٣٩٩. پێ. ز)، بەڵام ئەم کارە ناساز و پڕ لە جەهالەت و ئەم دابونەریتە ڕزیوە بۆی نەلوا تا سەر ببێتە بەربەست لەبەردەم گەشەسەندنی شارستانیەتی گریک و دەوری پێشڕەوانەی فەیلەسووفە مەزنەکانی وەک: (ئەفلاتوون- ٤٢٧-٣٤٧-پێ. ز) و (ئەرستۆ -٣٨٤-٣٢٢-پێ.ز)، لەپاڵ ئەمەش هەمیشە هێزەکانی تاریکی بەربەست بووە لەبەردەم پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا، بۆیەشە کەشوتەشقی تاریکستان بۆ چەندین دەموچاخ باڵی بەسەردا کێشابوو، نەخاسمە لە ئەوروپادا، بەڵام لەگەڵ پەیدابوونی ناکۆکییەکانی نێو کۆمەڵگەی مەدەنیدا، گەلێ بیروڕای مرۆڤانەی مەزن سەری هەڵدا و بانگاشەی داد و یەکسانی و ڕزگاری بەخشینی دا، تا بەمجۆرە خەرافات و دەمامکبازی و چەواشەکردن و بیری تاریک و دابونەریتی داڕماو و نارێک، تا سەر ناتوانێ خۆی لەبەردەم سەرهەڵدانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا ڕابگرێ، چونکە حەتمیەتی مێژوویی بۆ بەرەو پێشەوە چوونە نەک بۆ بەرەو دواوە گەڕانەوە..!

**ڕامان:** ئەمڕۆ ئێمە لەبەردەم شەپۆلی ئەم پێشکەوتنە پڕ لە هاڕژنەی جیهانی تەکنۆلۆژیا و گلۆبالیزم داین، ئایا دەکرێ کۆمەڵگەی مەدەنی لە کوردستان سەرهەڵبدا؟ ئەی بنەمای کۆنە بەها ڕوحییەکانی کوردەواری چۆن دەبینی؟

**د. شێرزاد نەجار:** هێشتا کوردەواری لە کۆنە قۆناغە بەراییەکاندایە و پێوەندییە کلاسیکییەکانیش دەورێکی سەرەکی لە تێکچڕژانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا دەبینن، ئەمەش بەڵگەیە کە هێشتا گەلێ قۆناغی جیاجیای پەرەسەندن لەبەردەمدایە و دەبێ کۆمەڵگەی کوردستان ئەو قۆناغانە ببڕێ تا بگاتە قۆناغێکی وا کە دەرفەت بۆ سەرهەڵدانی سیمای کۆمەڵگەیەکی مەدەنی پەیدا ببێ، بۆیە زۆر قورسە بێین و بڵێین: کۆمەڵگەی مەدەنی لە کوردستاندا هەیە، چونکە گەلێ مەرجی ڕۆشنفیکری و ئابووری و کۆمەڵایەتی نەهاتۆتە کایەو نییە، تا ئەوکاتەش ئەو مەرجانە نەبن، ئەوە کۆمەڵگەی مەدەنی هەر (دیلی) دەستی کۆنە پێوەر و پێوەندییە ڕزیوەکانە، هەر ئەو پێوەر و پێوەندییانەش دەورێکی کاریگەری لە کۆنە بەها ڕوحییەکان کردووە و ناشکرێ هەروا بە ئاسانی بڵێین (توانا)ی لەناوبردنی هەیە، چونکە ئەو کۆنە بەهایانە زۆر بەهێز لەنێو جەستەی کۆمەڵدا ڕەگاژۆ بووە، دیارە بنواشەی ئەو بەهایانەش دەگەڕێتەوە بۆ (باوەڕی قووڵ) و قنیات هێنانێکی ئاشکرای گەلی کورد بەو بەهایانە، سەرەڕای نەبوونی (خواست)ێکی ڕاشکاوانە و دیار بۆ گۆڕین یا نوێکردنەوەی ئەو بەهایانەی کە گەرای لەنێو کردار و ڕەفتار و هزر و بیر چاندووە، بە جۆرێ ئەوانەی دەخوازن جۆرە گۆڕانێک بەسەر ئەو بەهایانەدا بەرپا بکەن، ئەوە ڕووبەڕووی گەلێ ئاستەنگ و ژان و هەژان دەبنەوە. بەڕاستی ئەمەیان جەنگێکی ڕاستەقانی ڕیفۆرم خوازەکان و بگرە شۆڕشگێڕەکانیشە، گەر بێتوو بیانەوێ هەنگاوە بەراییەکانی ئەو (گۆڕان)ـە بهاوێژن..!

**ڕامان:** دیالۆگی نێوان شارستانییەتەکانی- نەماو و باو- و بەرەنگاربوونەکانیان چۆن دەبینن؟ ئەی پێت وایە مێژوو لە کۆتایی بوون دایە؟

**د. شێرزاد نەجار:** کاروانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی کاروانێکی دژوار و جەنجاڵ و پڕ لە ئاستەنگە و پێداویستی بە بەرخودان و خەبات و خوێن و بەرگەگرتن هەبووە، لە هەنگاو هەڵێنانی ئەو کاروانەشدا مرۆڤ توانی (شارستانیەت) بنیاد بنێ، هەروا لە ئەنجامی جیاوازیی کۆمەڵگاکان و ژینگەی مرۆڤ، چەندین شارستانیەتی جوێ جوێ هاتنە پێش، بۆیە دەبوایە لەگەڵ یەک هەڵکەن و بکەونە نێو دیالۆگەوە، بەڵام چونکە سروشتی مرۆڤ سروشتێکی خۆ بین و متمەن و بەدکار

(هەروەک یەک لە تیۆریستانی گرێبەندی کۆمەلایەتی (تۆماس هۆبز- ١٥٨٨- ١٦٧٩) لە کتێبە ئاودارەکەیدا (لیڤاتان- Leviathan- ساڵی (١٦٥١) دەرچووە دەستنیشانی کردووە، لە جیاتی خەرێکی دیالۆگ و لە یەکــحــالّی بوون بێ، ملمـــلانێی توندی نێـــوان شارستانییەتەکان سەری هەڵداوە، ئەمیش لە ئەنجامی بەرزەفت کردن و خۆسەپاندنەوە، جا ئەو خۆ سەپاندن و بەرزەفت کردنە فیکری بێ ئابووری یا لەشکرکێشی و لە ئەنجامیشدا بەرزەفت کردن و چەوساندنەوەی سیاسی لێکەوتووەتەوە. ململانێی نێوان ئەو شارستانیەتانە نەیتوانیوە ڕاستەڕێ و هاوتەریب بەرەو پێشەوە بڕوا، بەڵکو دووچاری پاشەکشەیی و هەرەسهێنان هاتووە (بەپێی تیـــۆری ئارنۆڵد توینبی) کــە لەو باوەڕدایە هەرهەموو شارستانیەتێک دووچاری هەرەس و فەوتان و ڕۆچوونە. ئەوەتانێ شارستانییەتی یۆنانی و ڕۆمانی و فارسی و چی و چیتر گەیشتە لوتکە، لە پاشان هەرەسی هێنا، ئەمیش لە ئەنجامی- وەک هەر شارستانیەتێکی تر- نەیتوانی لە بەخششی شارستانیدا بەردەوام بێ، بۆیە ناچاربوو بە (ملکەچی) شـــوێنی خـــۆی بۆ شارستانیەتێکی نوێباو چۆڵ بکا، هەر ئەمەش بزاڤی مێژووە و سەرکەوتن بەرەو لووتکە، لەپاشان دارمانی شارستانییەتەکان.

## ڕووناکبیری کورد لە زۆر کێشەی جیاجیا دواون، بەڵام زۆربەیان کورتبین و ناتەواو بوون، چونکە سەیری کێشەی کۆمەڵگەکەی خۆی بە لێکدانەوەی ئەوانی دیکە کردووە

ئەم بزاڤە هێشتا هەر بەردەوامە، بەڵام لێرەدا تووشی (کێشــەی لێکدانەوە و ڕاڤە کردن) دەبین، چونکە لە فیکری سیاسفەلسەفیدا دوو جۆرە بۆچوون و لێکدانەوە هەیە: لای (فــۆکــۆیامــا) هەروەک لای (هیگڵ)یش بانگەوازی ئەوە دەدا کە بزاڤی مێژوو گەیشتە کۆتایی خۆی، ئەمیش لە سایەی سەرکەوتنی لیبرالیزم و لە ئەنجامیشدا سەرکەوتنی شارستانیەتی خۆرئاوا، کەچی (هنتگتن) ڕووبەڕووی ئەم بۆچوونە دەبێتــەوە و ڕاڤە و بۆچوونێکی دی بۆ ئەم کــێشـــەیە هەڵدەخا ئەویش:

لەبەربوونی ململانێ و کێشمەکێش و وەتەنگهێنانی شارستانییەتەکانەوە، ئەو شارستانییەتانەی کە هەمیشە (٧-٨)یکن و بۆ ڕووبەڕووبوونەوەش کاندیدکراون، لە ســەرووی ئەو ملمـــلانێیـــەش، ملمـــلانێی نێـــوان شارستانیەتی خۆراوای کریستیانی و شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامیە. بێگومان ململانێ و دیالکتیک لە ڕوخسارەکانی ژیانە و ناکرێ و نابێ وێنای ژیانێ بکرێ بێ ئەو ململانێیە، چونکە ژیان و لە ئەنجامیشدا مێژوو زنجیرەیەک ڕەپێچکدان و ململانێیە، واتە: مێژوو کۆتایی بۆ نییە..!

**ڕامان:** باشە ئەی ڕووناکبیری کورد چۆن دەتوانێ خۆی لە گرێی پێوەست بوونی ملکەچانەی فیکری و فەلسەفی دەرباز بکا؟

**د. شێرزاد نەجار:** ئەگەر بوونی (ڕووناکبیر) لەنێو کۆمەڵی کوردی لەبەرچاو ڕاگرین، ئەوە بەپێی بۆچوونی بیرمەندی چەپڕەوی ئیتالی (گرامشی) کە جار بۆ بیرۆکەی ئەو (ڕووناکبیرە دینامیکی)یە دەدا کە لەگەڵ کۆمەلانی خەڵک ئاوێتە دەبێ و دەچرژێ، ئەوە بەڕاستی ئەو بوونە (دیل)ی گەلێ پیل و شەپۆل و ڕێباز و تەوژمی جیاجیای فیکرییە، جا بۆ ئەوەی ئەو ڕووناکبیرە بەرەو ئەتمۆسفیرێکی بەرهەرای فیکریی پێنگاف بهاوێژێ، دەبێ بەپلەی یەکەم خۆی لەو پابەندبوونە ملکەچە دەرباز بکا، کە بەڕاستی (نەخۆشی)یەکە و تووشی مرۆڤ دەبێ و ناتوانێ شیکردنەوەی وردی ئەو کێشانەی ڕووبەڕووی دەبنەوە بکات، نەخوازەڵلا کێشە جۆراوجۆرەکانی کۆمەلانی خەڵک، ئەو پێوەست بوونە (کوێربوونی فیکرە) و پەردەیەکی تاریک بەســەر تێـروانینی ڕاشکاوانەی کێشەکانی کۆمەڵ دادەخا. (ڕووناکبیری کورد) لەگەلێ کێشەی جیاجیا دواوە و خۆی نواندووە، بەڵام ئەو دوان و خـۆنواندنە زۆربەی زۆریان کـورتبین و ناتەواوبوون، چونکە سەیری کێشەی کۆمەڵەکەی خۆی بە (لێکدانەوەی ئەوانی دیکە) کـردووە و هەوڵیشی داوە چەند هاوڕێژەیەکی وا بگرێتـەبەر کـە لە بنجدا لە توانستیدا نییە کێشە زۆر و زەبەندەکانی کۆمەڵگە دوا کەوتووەکان شیبکاتەوە، بۆ ڕزگاربوونیش لەم واقیعە فیکرییەش دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە کە: سەرشارەکانی فیکری مرۆڤایەتییەکە و ئامانجیشی دۆزینەوەی چەندین ڕێگاو چارەســـەرە بۆ بەختەوەرکردنی ژیانی خودو ژیانی کۆمەلایەتی مرۆڤ، بۆیە دەبێ ڕووناکبیری کورد (ڕووناکبیرێکی مرۆڤانە و مرۆڤدۆست) بێ و هەوڵیش بدا بیروڕاو بۆچوونی خارا و پوخت بۆ (ڕزگاربوونی مرۆڤ) لە کوردەواریدا لە دژی چەوساندنەوە و پێوەست بوون هەڵخا..!

**رامان:** کۆمەڵگەی لیبرالیزم و جاڕدانی بۆ نوێبوونەوە و عەلمانیەت. ئایا لەگەڵ پەرەسەندنی مەدەنیانەی کۆمەڵی کوردیدا دەگونجێ؟ چۆن و لەبەرچی؟

**د. شێرزاد نەجار:** نەخێر ناکرێ قسە لەوە بکرێ کە گوایە کوردەواری گەیشتۆتە قۆناغێک و لە تەک کۆمەڵگەی لیبرالیزمدا دەپۆڕێ. لیبرالیزم بەندە بە جاڕدانی ڕزگارکردنی مرۆڤ و دەستەبەرکردنی مافەکانی، ئەمەش لە سیمای گشتگیری خۆیدا دوورە لە چوارچێوەی گشتیی کۆمەڵی کوردیدا. کەواتە: لیبرالیزم بیرۆکەیەکی خۆرئاواییە و تارادەیەک نامۆیە لەگەڵ سیمای کوردەواری کە بەندە بە پرنسیپەکانی (پەترپارکیزم)- باوکسالاری- و پابەندبوونی توند و تۆڵیماڵباتی و عەشیرەتگەری و ئاینییەوە، ئەم سیمایانەش بەندە بە ململانێیەکی درێژخایەن و پێویستە کوردەواری و پێشەنگ و نیازخوازانی (گۆڕان) مل لەبەر ملی بنێن و بەرگەی ژانوژوور و ئەشکەنجە و ئازارەکان بگرن، **لیبرالیزم لە ئەنجامی خەباتی کۆمەڵگاکانی خۆرئاواوە کەوتۆتەوە و لە پێناوی ڕزگاربوونیش کۆششی کردووە،** ئەو خەباتەی کە ڕەهەندێکی مێژوویی هەیە و خۆی لە قەرەی (٧) سەدە **دەدات و گەلێ فەیلەسووف و بیرمەندی مەزنیش لەو خەباتەدا بەشدارییان کردووە.** هەر بۆ نموونە وبەس: (هۆبز- لۆک- ڕۆسۆ- هیگڵ- کانت- فیختێ- مارکس) و هێشتا ئەو خەبات و ململانێیە بەردەوامە، هەر تەنیا بەسە ئەو ئەرکوکارەی هزرمەندانی (قوتابخانەی فرانکفۆرت)ی وەک (ئەدۆرنۆ- مارکۆزە- هابرماز) لەبەر چاوڕاگرین کە لەپێناوی سازدانی گۆڕانکاریی بەردەوامدا لە پرۆسەی ڕزگارکردنی مرۆڤ چ لە بوونی کۆمەڵایەتی و چ لە بوونی عەقلانیەتدا کاریان کردووە.

فەیلەسووفەکانی چاخی ڕێنیسانسی ئەورووپایی مەشخەڵی ڕزگارکردنی ئاوەز و بوونی کۆمەڵایەتی مرۆڤیان هەڵکردبوو، ئەو مەشخەڵانەش پڕ ئەرک و مەزن بوون.

**رامان:** ئایا دەشتنشین یا دێهاتنشینی کورد توانیویەتی ڕووبەڕووی دیاردە تێکچڕژاوەکانی مەدەنیەت بێتەوە و خۆی لە بەردەم هێدمەی شارستانی ڕابگرێ؟

**د. شێرزاد نەجار:** لە قۆناغەکانی گوێزانەوە لە ژیانێکی کپ و خامۆشی کلاسیکییەوە بۆ ژیانێکی نوێی پڕ لە زیندەگی، ئەوە مەسەلەی کۆچکردنی دێهاتییەکان بەرەو شار سەرهەڵدەدا، ئەمیش لە ئەنجامی پشتگوێخستنی دێهات و دووربوونی لە هەر شتێ کە پێوەندی بە بزاوتی نوێبوونەوەوە هەبێ، ئەم دیاردەیە لە ئەمریکای لاتین و ئەفریقیا و ئاسیا (ڕۆژهەڵاتی ناڤینیشی لەگەڵ دابێ) بە دەرکەوتووە، پرۆفیسۆر (ئەلمۆند) لە کتێبەکەیدا (سیاسەت لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکان)دا هەروا پرۆفیسۆر (هنتگتن) لە کتێبەکەیدا (سیستەمی سیاسی لە کۆمەڵگە گۆڕاوەکان)دا پەنجەنمای ئەوەیان کردووە کە: ئەم دیاردەیە لە ئەنجامی چەقبەستنی پیشەسازییەکانە لەنێو شارەکاندا.



د. شێرزاد لەگەڵ پۆلێک لە قوتابیانی ئەکادیمیای دیپلۆماسی لە ئەیەنا ١٩٧٥/١/٢٢

کۆمەڵگەی عیراقی نموونەیەکی دیاری ئەو دیاردەیەیە. هەروەک پرۆفیسۆر (عەلی ئەلوەردی) لە کتێبەکانیدا ئاماژەی بۆ دەکا، کۆمەڵگەی کوردییش سەرباری کەمی ژمارەی شارەکانی کوردستان (لەچاو کۆمەڵگەکانی دیکە) بەر ئەم دیاردەیە کەوتووە، ئەم بارو ڕەوشە دیاردەی جیاوازی نێو شار و دێهاتی ڕەگاژۆتر کردووە. سیاسەتی حکوومەتی بەغدا لە کوردستاندا بەتایبەتی دوای بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی (١٩٦١) وای لە دێهاتنشینان کرد بە لافاو پەنابەرنە بەر شارەکان، بەمەش بە تەواوی بنیادی دیمۆگرافی شار وەرچەرخا. ئا بەمجۆرە هێدمەی شارستانی لەلای ئەو دێهاتیانە ئەوەندە دیارنەبوو، چونکە بە قووڵی ڕەگی دابونەریتی خۆیان لەنێو شاردا داکوتا و بەمەش شار بەپێی سەرجەم دێ و ئەم خێڵەساتە، لە جیاتی بنەماڵە و پیشە و سامان هاتە ئاراوە، شاری کوردی بە هیچ کلۆجێ لە شاری ئەورووپایی ناکات، چونکە خۆی لەبەردەم کۆچکردنی دێهاتییەکان ڕانەگرت و ئەنجامیش بەوە شکاوەیە کە زۆر لە ڕوخسار و سیمای ڕەسەنی خۆی بدۆڕێنێ، زەقترین نموونەش بۆ ئەمە ناو شاری هەولێرە، چونکە ئەوانەی لە دەرەوەی شارەوە هاتوون ئەوەندە بە تەنگەوەی ئەو سیما و ڕوخسارە ڕەسەنەوە نین و لەلایان پەشمە..!

**رامان:** عەقلانیەت و دیالۆگی سەرازاد و والا و

**هەڵبژاردنی خاوێنی پەرلەمانی، چەند لە دامەزراندنی بنەماکانی مەدەنیەتدا دەوریان هەیە؟**

**د. شێرزاد نەجار:** لە عەقلانییەت و دیالۆگێ ئازادەوە، بەراییەکانی دیموکراسی لە ئەسینای کۆن و بەر لە (٢٥٠٠) ساڵ و لە ئەکادیمیای ئەفلاتوون-دا خۆی نواند، بەڵام بەرایی هەرە بەراییەکانی ئەو دیموکراسییە لە میزۆپۆتامیادا، هەروەک پرۆفیسۆر (ژاکۆبسن) پەنجەی بۆ راکێشاوە، سەری هەڵداوە..

هەر لە رێی دیموکراسیشەوە بیرۆکەی هەڵبژاردن کەوتەوە، بەڵام لە هەڵبژاردندا عەقلانییەت دەوری سەرەکی نابینێ، بەڵکو هاورێژەیی و مانۆری سیاسی ئەو دەورە دەگێرێ و پەیتا پەیتاش لە سیاسەتی ئایدیایی دوور دەکەوێتەوە، لای زانای ناوداری کۆمەڵایەتی (ماکس ڤیبەر)دا، حوکمی عەقلانی سەر بە حوکمی یاسا و دەزگاکانی ئەو حوکمەیە کە دەبێ دەوڵەت بەرەو پیری بروات.

کەواتە: **هەڵبژاردن تەنیا دەساوێژێکە بۆ گەیشتن بە حوکمی عەقلانی، بەڵام زۆرجار لەپێناوی پشتگیری حکومەتە دیکتاتۆرییە داپڵۆسێنەرەکان بەکارهاتووە، دیارترین نموونەش ئەڵمانیای نازی بوو کە ئەو هەموو نەهامەتی و کارساتە گورچکبڕانە هاتە سەر ئەڵمانیا و سەرجەمی مرۆڤایەتی.**

**رامان:** ئایا کولتووری کلاسیکی لەبەردەم کولتووری نوێدا پاشەکشەی کردووە؟

**د. شێرزاد نەجار:** ئەم پرسیارە زۆر زۆر گرنگە، چونکە بە راستی بەندە بە دیاردەیەکەوە کە رۆژانە لەگەڵیدا دەژین، ئەویش سیمای (کولتوورێکی شکستە و بۆردراو) لە ئاسۆگەدا دیارە، بۆیە حەق وایە بپرسین ئایا کولتووری کلاسیکی لەگەڵ کولتووری نوێدا لە پاشەکشەدایە و هەرەسی هێناوە؟ بەڕاستی ناکرێ ئەم پاشەکشەیە هەر بۆ کولتووری کلاسیکی بگێرینەوە، بەڵکو کولتور خەریکە رەگوماک و قووڵایی خۆی لەبەردەم (کولتوورێکی بەرخۆریی)دا لە دەست دەدا و دەدۆڕێنێ، ئەمیش لە ئەنجامی ئەو شۆڕشە تەکنیکییەوە کە سەرتاسەری جیهانی داگرتووە، هەروەک بیرمەندی کەنەدی (ئالفن تۆفللەر) بە (شەپۆلی سێیەمی شارستانی) دوای شەپۆلی یەکەمی کشتسازی و شەپۆلی دووەمی پیشەسازی ناوزەدی دەکات، بەڵام بەردەوام و هەمیشە کولتووری کلاسیکی (حەز دەکەم بڵێم: رەسەن) کانیاوی بەتافەتافی کولتووری مرۆڤ و مرۆڤایەتییە. بەڵگەی درەوشاوەش کولتوری گریکە، کە چۆن تا رۆژی ئەمرۆش بیروڕاکانی سوکرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ بەزەقی و ڕاشکاوی لەنێو هۆڵی زانکۆکانی سەرلەبەری جیهاندا دەنگ دەداتەوە..!

**رامان:** ئەی چۆن سەیری کولتوورێکی ملکەچ و گوێ لەمست و چەواشەکردنی هۆش و تێکشکاندنی ئاوەز دەکەیت؟

**د. شێرزاد نەجار: هەر شتێ بەرەو ملکەچی و گوێ لە مستی و چەواشەکردنی هۆش و تێکشکاندنی ئاوەزی مرۆڤ ناراستەبکرێ، بە هیچ چەشنێ سەر بە فیکر و رۆشنبیری و کولتوری مرۆڤایەتی نییە.** کەواتە: ئەوە (کولتووری تاریکی)یە کە ئەگەر خیوەتی رەش و چڵکنی خۆی بەسەر کۆمەڵگە داخست، ئەوە بێگومان بەرەو هەڵدێری هەزار بە هەزاری دەبا. گاڤێ کە تاریکی باڵی بەسەر ئەڵمانیای نازیدا کێشا، یەکانسەر بەرەو هەڵدێر و هەرەسهێنانی پەلکێش کرد، لەو ڕەوشە ناهەمووارەش هەڵنەستایەوە تا بەجارێ چکوچڕی سەرچاوەی فیکری تاریکی و تاریکستانی تێدا نەکرا، **لای من تەنها بە فیکری مرۆڤدۆستی و ژیانپەروەری کۆمەڵگە گەشە دەسێنێ و بەرەو کۆمەڵگەیەکی پڕ لە داد و یەکسانی هەنگاو هەڵدێنێ.** ئالێرەدا دەوری سیاسەت دەدرەوشێتەوە، کە لەبنجدا کۆشش بۆ دامەزراندنی کۆمەڵێکی رێک و کۆک و چاک پەروەردەکردنی مرۆڤی باش و دڵسوودە دەکا، هەروەک فەیلەسوفی ناوداری گریکی (ئەرستۆ) بۆی دەچێ..!

## کۆمەڵگەی مەدەنی دانامەزرێ، مەگەر تەنیا لە قۆناغێکی پەرەسەندووی کۆمەڵدا نەبێ کە خۆی لە سیستەمێکی دیموکراسیدا دەدۆزێتەوە

**رامان:** بەڕای تۆ ئێستا کاتی هەرەسهێنانی فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیا هاتووە؟

**د. شێرزاد نەجار:** (بیل- Bell) لەکتێبەکەیدا (کۆتایی ئایدیۆلۆژیا) کە ساڵی (١٩٦٠) دەرچووە، بەر لەگشت کەس وەک پێوانەیەکی یەکجارەکی لە مێژووی مرۆڤ و کۆمەڵگە نوقڵانەی کۆتایی هاتنی ئایدیۆلۆژیای لێداوە، بەر لەویش (ئارنۆڵد شپینگلەر) لە (هەرەسهێنانی شارستانیەتی رۆژئاوا) دواوە.

ئەم بیروڕایانەش لە ئەنجامی هوشیاری مرۆڤەوە سەریان هەڵداوە لە پێناوی تێگەیشتنێکی قووڵی هەم

خودی خۆی و هەم کۆمەڵگەکەی، بەڵام کاتێ کە (فەلسەفە هەردەس دێنێ) وەک یەکە حیکمەتی مرۆڤ لە ژیانیدا، ئەمە وا دەگەیەنێ کە: یەکە ڕامانی سەرەکی مرۆڤ دەربارەی سروشت و کۆمەڵگە هەردەسی هێناوە، ئەمیش لە ئەنجامدا بۆرهێنانی مرۆڤە لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارگەلەی سەرەتا هەر مرۆڤ خۆی ورووژاندوویەتی کاتێ کە لەخۆی گەیشتووەو فامی کردۆتەوە، هەر ئەمەش وادەگەیەنێ کە (هەردەسهێنانی فەلسەفە) نیشانەی هەردەسهێنانی هۆشە، بە ڕاستیش ئەمە تەڵەزگەیەکی سامناکە لە بەردەم مرۆڤی پڕ لە ڕامان، کە هەرگیز ناکرێ واز لە (فەلسەفاندن)ی سەرلەبەری دەوروبەرەکەی بێنێ.

کەواتە: **من لەو باوەڕەدانیم کە زەمەنی رووخانی فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیا هاتبێ، چونکە ئەمە مایەی کۆتایی مرۆڤی هۆشمەندە و سەرەتای چاخی مرۆڤی (رۆبۆت)ە کە نە هەستی هەیە و نەهۆش..!**

**ڕامان:** ئەی بۆ دوورکەوتنەوەی سیاسیەتمەدارانی کورد لە بواری فیکری و ڕۆشنگەری چیت پێیە؟

**د. شێرزاد نەجار:** کاتێ مرۆڤ سیاسەت وەک پیشە و پیشەکاری وەردەگرێ، بەبۆچوونی (ماکس ڤیبەر) ناتوانێ لە بۆچوونی فیکری و ڕۆشنگەری نێو کۆمەڵگە دووربکەوێتەوە، نەخێر بە پێچەوانەوە کارکردن لەکایەی سیاسەتدا، مانای هەڵسووڕاندنی کۆمەڵگە و حوکمدارییە، لە هەمان کاتدا بایەخدانە بە کایەکانی کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیری و ئابووری. ئەوەی حوکمڕەوایە پێویستە چەندان جۆرە ئەرک بخاتە سەر دەفەی شان، لەوانەش ئەرکی فیکری و ڕۆشنبیری، بۆیە گەر لەو ئەرکانە دوورکەوتەوە، مانای وایە فیکر و ڕۆشنبیری دەخاتە لاوە، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەرەنجامی زۆر خراپی دەبێ لەسەر پەرەسەندنی کۆمەڵگادا. کایەی فیکر و ڕۆشنبیری بنیادی سەرووی کۆمەڵگەیە و هێزەکەشی هاوتەریبە لەگەڵ هێزی سیاسەتدا، سیاسەتیش پێوەندییەکی زۆر پتەو و قووڵی لەگەڵ فیکردا هەیە، نا بەڵکو لە هەموو ڕەوش و بارێکدا، ڕەنگدانەوە و ئاوەژووبوونی ڕەگی قووڵی ڕۆشنبیری و فیکرە لەنێو کۆمەڵگەدا، هەر بۆیەشە دینامیکییەتی سیاسی دینامیکییەتی فیکرە، ترازاندنی ئەم دینامیکییەتە سیاسییە لە دینامیکییەتی فیکری، توخمی تەنگژەیەکی فیکری و ڕۆشنبیری لە ناخیدا هەڵگرتووە، گەر بێتوو تا ماوەیەک بەردەوام بێت، ئەوە دەبێتە مایەی چاوەڕوان کردنی (هەرەسهێنانی کۆمەڵگە)، بلۆکی دەوڵەتە سۆشیالیستەکیش دیارترین نموونەی ئەو ڕەوشەن. هەربۆیەشە **دوورکەوتنەوەی سیاسەتمەدارانی کورد لەمشوور نەخواردنی ئەرکی ڕۆشنبیری و فیکری و ئاوێتەنەبوونیان لەگەڵ بزاڤی فیکریدا، دیاردەیەکی زۆر خەتەرناکە و مایەی سەرنج و تێرامانێکی قووڵە و پێداویستیی بە چارەسازی هەیە و دەبێ ئەو بزاڤە لەگەڵ بزاڤی سیاسیی تێکەڵ بکرێ،** گەر نەکرێ ئەوە دەبێتە مایەی دروستبوونی درزێکی گەورەی نێوان ئەو دوو کایەیە، لە ئەنجامیشدا ئەو سیاسەتمەدارانە، لەبەردەم پەرەنەسەندنی فیکر و ڕۆشنبیریدا بەرپرس دەبن و ناشتوانن کۆمەڵگە بەرەو پێشەوە ببزێون.

**ڕامان:** ئایا زانکۆکانی کوردستان کاریان لە شەقامی کوردی کردووە، یا بە پێچەوانەوە؟

**د. شێرزاد نەجار:** یەک لە کارەساتەکانی کۆمەڵگە دواکەوتووەکان، لەوانەش کۆمەڵگەی کوردستانیمان، زانکۆکانی چەند دەزگایەکی دابڕاون لە واقیعی کۆمەڵایەتی، بۆیە زۆر دوورە ببن بە دەزگایەکی کارا و کاریگەر لە سەر گەشەسەندنی کۆمەڵگە. زۆر لە کردارو ڕەفتاری نێو زانکۆکان بەڵگەی ئەوەن کە ئەو زانکۆیانە لەنێو کەشوهەوا و هەڵسوکەوتی کۆمەڵگەیەکی دواکەوتە و تەقلیدیدا دەژین و زۆریش لە ئەرک و کارەکانی دوورکەوتوونەتەوە و نەیانتوانیوە گۆڕانکاری لە بونیادی فیکری و کۆمەڵایەتی نێو کۆمەڵگەدا بەرپا بکەن.

لەنێو ئەو کەشوهەوایەشدا، ئەو زانکۆیانە لەنێو قاوغی خۆیاندا (کروشکە دەبەستن). مادامەکیش ڕێگا بە (فیکری ڕەخنەگرانە) نادەن تا ببێتە مەکۆی ئاراستەکردنی زانست و لێتۆژینەوە و پراکتیکی جیاجیا لەنێو زانکۆکان خۆیاندا، چونکە تەنیا لە ڕێی فیکری ڕەخنەگرانەی قووڵەوە، هەروەک زانای سیاسی ئەمریکایی (ئەڵمۆند) دەبێژێ: مرۆڤ بۆی نالوێ چاوەڕوانی هیچ جۆرە پێشکەوتن و گۆڕانێک لەنێو کۆمەڵگەدا بکا.

ئەم ئەرکەش هەر یەکجار مەزن و زۆریش قورسە و جگە لەو (دەستەبژێرە فیکری)یەی نێو زانکۆ نەبێ بەرگەی ناگرێ، چونکە ئەو دەسەبژێرە بەپێچەوانەی دەستەبەندە خاو و خلیچک و کۆن و تەقلیدییەکان، ڕووبەڕووی گەلێ ڕەوشی ناهەموار و (دەم بەستن) هاتوون، تا بەشێوەیەکی ڕەخنەگرانە قسە نەکەن و ڕادەرنەبڕن. بە ڕاستی ئەو دەستەبژێرانە زۆر بە ڕاشکاوی و ڕیسواکەرانە چەوساوە و زوڵم لێکراون و دوژمنکارییان لەگەڵ دەکرێ، هیچ دەستەبژێرێکی چاخە تاریکەکانی ئەوروپا ئەم دیاردەیەی بەخۆوە نەدیوە.

هەر هەموویان لە (یەک خاڵدا) یەک دەگرنەوە، کەچی لە دەیان خاڵدا جیاوازن، ئەو خاڵەش بەندە بە بەرەنگاربوون و ڕاوەدوونانی ئەو (دەستەبژێرەی) نێو

زانکۆ، بەڵام خۆشبەختانە ئەو کردەوە ناهەموارانە لەبەردەم ئەو دەستەبژێرەدا بۆریانخوارد و نووچیاندا، کەواتە: دەبێ ئەو کردەوانە لەنێو زانکۆکانی کوردستاندا بنەبڕ بکرێن، تا زانکۆکان دەوری دیار و لەباریێ خۆیان لە گۆڕینی عەقڵیەت و لە سیستەمی کۆمەڵایەتیدا ببینن. بێ ئەم دەورەش، ئەوە زانکۆکان دەورێکی کۆنەخوازانە و تەقلیدی دەگێڕن، نەک دەورێکی پێشڕەوانە و دەستەبژێرانە، لە ئەنجامیشدا و لەبەر نەبوونی گۆڕانکاری و چاکسازی تووشی (ئیفلجی) دەبن...!

**رامان:** باشە، ئەی پێت وایە دەرچووانی زانکۆ- بەشی سیاسەت- دەورێکی کارا لە ڕابەرایەتی کۆمەڵگەی سیاسی لە دوارۆژیشدا سیاسەتی کوردیدا دەبینن؟ چۆن؟

**د. شێرزاد نەجار:** بەشێوەیەکی گشتی، دەرچووانی بەشەکانی زانستی سیاسی و هەروا پسپۆڕانی ئەو زانستە دەورێکی گرنگ و لەبەرچاو لە سیاسەت و پێوەندییەکانی نێودەوڵەتی و دیپلۆماسیدا دەنوێن. لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا چەندین چەند قوتابخانەی باڵا و تایبەتی بۆ ئامادەکردنی کادیرانی ئەو کایەیە هەن. لەوانەش: ئەکادیمیای دیپلۆماسی لە ڤیەننا (کە من لە ساڵی ١٩٧٥ لەوێ دەرچووم) هەروا (قوتابخانەی باڵای سیاسەت لە پاریس). بەشی زانستی سیاسەت لە ساڵی (١٩٩٣) لە زانکۆی سەلاحەدین کرایەوە و شەرەفی سەرۆکایەتی ئەو بەشەش بەر من کەوت و ئەرکێکی زۆریشم خستە بەر خۆم بۆ ئامادەکردنی کادیری پسپۆڕ. لە سەرەتاوە توانیمان ئەو کادیرە ئامادە بکەین، بەڵام مخابن رووبەڕووی بەرنگاربوونێکی فیکری بووینەوە کە لە ئەنجامدا بوو بە مایەی پەرەنەسەندن و پێشنەکەوتنی ئەو بەشە و لە جێی خۆیدا کەوتە (راوحکردن) و زۆریش کاری خەراپی کردە سەر ورەی لاوان و وەچەی نوێ و زۆریش بێ ئومێدی کردن. بۆیە جارێکی تر ئەرکی (ژیاندنەوەی) ئەو بەشە و زانستی سیاسەتمان خستە سەر شان بە فرە هەوڵ و کۆششێکەوە توانیمان (کۆمەڵەی زانستەکانی سیاسی) دامەزرێنین و ئەو بەشەی زانستی سیاسەتمان کردە (کۆلێژی زانستەکانی سیاسی). ئەم دوو هەنگاوە گرنگەش بووە مایەی رووخاندنی دیواری (گەمارۆدانی) بەشی سیاسی و کلیل و کلۆمدانی دەمی ناحەزانی ئەو بەشە، ئێستا ئێمە لەبەردەم دووریانێک داین یا ئەوەتە لێگەڕێن تا ئەم کۆلێژ و ئەم جۆرە خوێندن و لێتۆژینەوەیە پەرەبستێنێ و پێشکەوێ و هەموو چەشنە پشتگیرییەکی بۆ تەرخان بکرێ و لە ئەنجامیشدا دەستەیەک کادیری زاناو پسپۆڕ دروست بێ و مەسئوولیەت بگرنە ئەستۆ، یا ئەوەتە ئەو خوێندنە پشتگوێ بخرێ و لادرێ، چونکە ناتوانێ دەوری خۆی بەکارامەیی بگێڕێ...!

**رامان:** ئایا تۆ لەگەڵ ئەوەی کە فەلسەفە لە بەرنامەکانی خوێندندا بخوێندرێ؟ لەبەرچی؟

**د. شێرزاد نەجار:** بەڵێ.. من بەم شێوەیە یا ئەو شێوەیە لەگەڵ ئەوەدام کە فەلسەفە بخرێتە ناو بەرنامەکانەوە و بخوێندرێ، زۆریش گرنگە قوتابیان فەلسەفە بخوێنن، چونکە دەبێتە مایەی والابوونی زەین و مێشکیان لەسەر چەندین جۆرە کولتوور و پیل و شەپۆلی فیکری..!

**رامان:** چاکە.. ئەی د. شێرزاد و شیعر؟

**د. شێرزاد نەجار:** شیعر بەهرەیەکی تایبەتییە و تەنیا بەشی بەهرەدار و داهێنەرانە، جگە لە خەوندیدە و خەیاڵ هەتەربووان نەبێ تاموچێژی لێوەرناگرن، من بەشبەحاڵی خۆم پێوەندییەکی کۆنم لەگەڵ شیعر و شاعیراندا هەیە زۆریش چێژ لە خوێندنەوەی شیعر دەکەم، نەخاسمە شیعری کلاسیکی عەرەبی و لەوانەش (موتەنەبی) و (جەواهیری)، سەرباری شیعری نوێش، بە تایبەتی (سەیاب).

**رامان:** شێرزاد و نوکتە؟

**د. شێرزاد نەجار:** زۆرم حەز لە بیستنی نوکتەیە، بەڵام بەداخەوە ناتوانم ئەزبەری بکەم و زوو لەبیرم دەچێتەوە و ناشتوانم نوکتە بڵێم، ئەمەش وای کردووە، گەلێ جار و لای هەندێ کەس من بە پیاوێکی وشک بناسرێم.

**رامان:** شێرزاد و مەسئولیەت؟

**د. شێرزاد نەجار:** هەرگیز رۆژێ لەرۆژان بیرم لەوە نەدەکردەوە، مەسئولیەتێکی گەورە و هەستیاری کارگێریم بخرێتە سەرشان، بۆیە هەمیشە درزێک لەنێوان هەستی ناسکم لەبارەی فیکر و رۆشنبیری و فەلسەفە و شیعر و ئەدەبیات و بەرامبەر بەرۆتین و وشکەجاری کاری کارمەندیدا هەیە، من بەردەوام هەوڵ دەدەم لە چوارچێوەی یاسا و سەرپێچی نەکردن و یاسا پێپەست نەکردندا کارەکانم ئەنجام بدەم، ئەمەش وایکردووە جۆرە (دوژمنانێک)م بۆ بخولقێ، ئەوانەی دەیانەوێ بەرێگای پێچە لپێچ و ناڕەوا چەند دەسکەوتێک وەدەست بخەن. لەلای من ئەرکی کار خزمەتکردنی هاووڵاتیانە و ئەمەش ئامانجی منە لە ئەرکی کارگێریدا، بەڵام ئەگەر ڕاستتان دەوێ بیرای بیر حەز ناکەم لەم کارەمدا بەردەوام بم، هەرچەندەش دەزانم زۆر کەس هەن بەتەمای ئەم کارو پایەی منن، نا بەڵکو زۆر حەز دەکەم و ئاواتە، بەردەوام لەبەرهەمهێنانی فیکر و رۆشنبیری و وانە وتنەوەی زانکۆییدا بژیم و جێ پەنجەم هەبێ، چونکە هیچ شوێنێ بەقەد کورسی مامۆستایەتی رەسەنی نێو زانکۆ شیرین و جوان نییە.

هەر لەو جیهانە جوانەشدا (نەک جیهانی کاروکارمەندی) بەهرە و داهێنان دەدرەوشێتەوە..!

**ژياننامە و بەخشش:**

* لە ساڵی (١٩٤٥) لەناو قەڵای هەولێر لەدایک بووە.
* لە خانەوادەیەکی ڕەسەنی ئاینییە و شاعێری ناوداری هەولێرییان (میهری) کوڕە مامی باوکیەتی.
* قۆناغەکانی خوێندنی هەر لەم شارە و لە ساڵی (١٩٦٣)دا تەواو کردووە.
* ساڵی (١٩٦٨) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە (زانستی سیاسی) وەرگرتووە.
* ساڵی (١٩٧٣) چووەتە نەمسا لە ئەکادیمیای (دبلۆماسی) ڤیەننا دەستی بە خوێندن کردووە و لەپاڵیشیدا و لەپێناوی بژێوی ژیان لە تاقیگەکانی وێنەی فۆتۆگرافی و هەروا لە شانۆی هاوینەی سەر بە (Burg Theater)ی بەناوبانگ کاری کردووە.
* ساڵی (١٩٧٥) باوەڕنامەی ماجستێری لە (دبلۆماسیەت و پێوەندییەکانی نێودەوڵەتی) دەست ختسووە.
* ساڵی (١٩٨٦) باوەڕنامەی دکتۆرای لە [ (لێتۆژینەوەی شیکارانە لەبارەی ئەو گۆڕانکاریانەی ڕژێمی عێراق لەنێوان ساڵانی (١٩٥٨-١٩٦٨) ] وەدەست هێناوە.
* ساڵی (١٩٩٣) لە دامەزراندنی کۆلێژی ئێوارانی (ماف)دا بەشداری کردووە و لە دەستەی ئەمیندارانی ئەنجومەنی کۆلێژ ئەندام و سەرۆکی بەشی یاساش بووە.
* لەنێوان ساڵانی (١٩٩٣-١٩٩٤)دا بەشێکی تایبەتی بۆ زانستی سیاسی لە کۆلێژی ماف-دا کردۆتەوە.
* لەنێوان ساڵانی (١٩٩٤-١٩٩٧) یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بووە.
* ساڵی (١٩٩٩) هەوڵێکی زۆری داوە تا کۆلێژی مافی بە زانکۆی سەلاحەددین-ەوە گرێداوە و لە ئەنجومەنی هەمان کۆلێژدا بووە بە ئەندام.
* ئێستا ڕاوێژکاری فێربوونی باڵا و لێکۆڵینەوەی زانستی بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە و لەپاڵیشیدا بەڕێوەبەری گشتی- بەوەکالەت- فێربوونی باڵای دیوانی ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی کوردستانە. لە بەرهەمەکانی:
* کتێبی (دراسات فی علم السیاسة)- چاپکراوە.
* کتێبی (دەربارەی ڕۆشنبیری سیاسی- چاپکراوە.
* تێزی دکتۆراکەی بە زمانی ئەڵمانی چاپکراوە.
* کتێبی (دراسة في تغيرات النظام السياسي في العراق الجمهوري- ١٩٥٨-١٩٦٨- چاپکراوە.

**هەڤپەیڤینی:**
**ئازاد عەبدولواحید - مەحموود زامدار**

**عومەری عەلی ئەمین:**

# شانۆی کوردی بە دەقی نووسەرانی کورد پێدەگات



ئەو شانۆکارو هونەرمەندانەی هەموو تەمەن و تواناو ئەزموونی ژیانی هونەری خۆیان بۆ شانۆی کوردی تەرخان کردووە، ئەگەرچی بە ژمارە کەم و دەگمەنن، بەڵام جۆرایەتی و ئەفراندنێک لە کۆی بەرهەمەکانیاندا بەدی دەکرێت، یەکێک لەو هونەرمەندە پێشەنگانەی کە بەبێ دابڕان و نزیکەی نیــو ســەدەیە ئامــانجی سەرەکییان خزمەتگەیاندن بووە بەهونەری شانۆی کوردی بەڕێز «عومەری عەلی ئەمین»ە، لە هەگبەی ئەم هونەرمــەندەدا جگە لە دەیان نووسین و لێکۆڵینەوەی هونەری و پێشانگا، ڕۆحێکی ئایدیال و سۆفیگەرو ڕەوشتێکی بەرزو ڕاستگۆییەکی بێ ئەندازەی بۆ ئەم ئامانجە پیرۆزە هەیە کە بەشێکی زۆری تەمەنی خۆی بۆ کردووەتە دیاری، لە ناوجەرگەی ڕووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتی و هونەرییەکانی کۆمەڵگەی کوردیدا ژیاوە و وەک دەرهێنەرو ئەکتەر لە چەندین شانۆنامەدا ڕۆڵی کاریگەری بینیوە، بە مەبەستی بەسەر کردنەوە و دواندنی ئەم هونەرمەندە بە پێویستمان زانی ئەم چەند پرسیارەی لێ بکەین.

* ئایا بۆ هونەرمەند شەخسییەت پێویستە؟

– ڕەوشتە باوەکانی نێو کۆمەڵگە شەخسییەتی مرۆڤ دیاری دەکات ئەگەرچی ئەم ڕاستییە لەکۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەگەیەکی تر دەگۆڕدرێت..

بۆ نموونە: لەم سەردەمەدا لە فەرەنسا مەشرووب خواردنەوە و مەشرووب فرۆشی و مێبازی و شەو نەهاتنەوە بۆ ماڵەوە هاموشۆی خراپخانە بە کەم و کوڕی دانانرێت بۆ شەخسییەتی مرۆڤ، بەڵام لە هێندێ کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتیدا بگرە ئەو مرۆڤانە خوێنیشیان حەڵاڵە. لە کۆمەڵگەی کوردەواریشدا کەسێک بەکارو کردەوە دز یان درۆزن یان خوا نەناس نەبێت و سوودبەخشی کۆمەڵگەی بێت و لە دابونەریتە باوەکانی دەرنەچێت؛ مرۆڤێکی چاکەو شەخسییەتی هەیە و جێگەی باوەڕە، بەتایبەتی لە مامۆستاو هونەرمەندو ڕۆشنبیرو سیاسەتمەدار کە کۆمەڵ باوەڕیان پێ دەکات و بە پیرۆز سەیریان دەکات و دوایان دەکەوێت، لەبەر ئەوە بۆ هونەرمەندێک هەر هونەرەکەی بە تەنیا بەس نییە کە هەیبێت تا باوەڕی پێ بکرێت، بەڵکو ڕەوشت و هەڵوێستی جوانیشی پێویستە تا شەخسییەت بۆ خۆی دروست بکات.

پێشەکی بینەر دەزانێت کە ئەکتەر لەسەر شانۆ دەوری شەخسییەتی نێو دەقەکە دەبینێ کە دروست کراوە، نەک شەخسییەتی خۆی؛ لەبەر ئەوە باوەڕەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم ڕاستییە کە ڕەوشتی بنەڕەتیی ئەو «کە ئەکتەرە» شەخسی خۆی جێگەی باوەڕە یان نا.

گەڕان و دەست پان کردنەوە و پاڕانەوە و خۆ هەڵواسین بەم و بەودا بۆ پێشکەش کردنی بەرهەمێکی شانۆیی شەخسییەتی ئەو هونەرمەند لە کۆمەڵدا بەتوانەوە دەتوێنێتەوە، نە بەرهەمەکەی سەنگی دەمێنێ و نە لەلای ئەو کەسانە شەخسییەتی دەمێنێت. خۆ بەستنەوەی هونەرمەندێکیش بە کۆڕو کۆمەڵێکەوە شەخسییەتەکەی

لاواز دەکات، چونکە وەک بلبلێکی ناو قەفەزی لێ دێت کە خوێندنەکەی هەر بۆ خاوەنەکەی بێت. بینەر باوەڕی بە هونەرمەندێکی خاوەن شەخسییەت و خاوەن هەڵوێستە کە دوای بکەوێت با هونەرەکەی لەخۆی کەمتربێت، باوەڕی بە کەسێک نییە کە بێگانە پەرست بێت و کۆمەڵەکەی خۆی دۆڕاندبێ با بەسەر هونەرەکەی خۆیدا زاڵیش بێت.

(ڕۆناڵد ریگن) میللەت پەروەری و شەخسییەتە هونەرییەکەی ناونیشانی پێ پەیدا کردبوو وای لەگەلی ئەمەریکا کرد بە سەرۆکی کۆماری هەڵیبژێرن، خۆ هونەرمەندی لەو بە تواناتریش هەبوو. (ئەنتۆنی کوینیش) کە خەریک بوو جارێکیان خۆی بپاڵێوێت پشت بە شەخسییەتە هونەرییەکەی خۆی بوو. کە کاتی خۆی (ستانسلاڤسکی) و تیپەکەی چوون بۆ بترسبورغ بۆ پێشکەش کردنی شانۆییەک (کۆرنی) سەرداری شارەکە وتارێکی بۆ خوێندنەوە پڕی بوو لە ڕێنمایی و ئامۆژگاری هونەری و ستایش و شانازی بۆ ستانسلاڤسکی و هاوڕێکانی تیپەکەی. ئاوها لێپرسراوی ولاتان هێندە نرخی شەخسییەتە هونەرییەکانیان ڕادەگرن. ولاتان بۆ بەرژەوەندی خۆیان شەخسییەتە زانستییەکان لە ولاتێکی ترەوە بە فڕاندن دەفڕێنن بۆ ولاتەکەی خۆیان تا سوود بە نیشتمانەکەیان بگەیەنن و شانازی بکەن، نەک شەخسییەتە هونەرییەکان تا ناوەکانیشیان بخرێتە نێو تاریکی و نوتەکیی ڕاگەیاندنەوە.

* کە دەڵێین «شانۆی کوردی» مەبەست چییە لەمانای ئەم وشەیە؟

– کە دەڵێین شانۆی کوردی مەبەست شانۆیەکە لەگەڵ هیوا و ئاواتی گەلی کورددا ئاهەنگ بگێڕێ و گۆرانی بڵێت، لەگەڵ ژانەکانیشدا بناڵێنێ و بگری، لەگەڵ کێشەو گرفتەکانیشیدا ڕێنمایی بکات و لەگەڵ چارەسەرکردنی کۆسپەکانی سەرکەوتنەکانیدا چاوساغی بکات. هەر نەتەوەیەک لەم جیهانەدا جیاواز لەوی تر کێشەی تایبەتی خۆی هەیە، کێشەی گەلی ڕووس جیاوازە لەهی هۆڵەندە، هی گەلی سوێد جیاوازە لەهی ئەفغان، هی کوردیش جیاوازە لە عەرەب لەگەڵ ئەوەشدا کە خاڵی هاوبەشمان بیر ناچێت کە لە نەتەوەکانی جیهاندا لە کاروباری مرۆڤایەتییەکان و فیکری ڕزگاریخوازیدا هەیە کە تێکەڵ بە کێشەکانیان دەکرێت. بەداخەوە تا ئێستا هونەرمەندانی کورد نەمانتوانیوە شتێک پێبگەیەنین پێی بوترێت شانۆی کوردی، یان شتێک دروست بکەین کە پێشکەش کرا لە جیهاندا بیناسنەوە کە ئەمە شانۆی کوردە، سەرەڕای ئەوەش کە (ئاداموف و بیکێت و یۆنسکۆو شەکسپیر) پێشکەش دەکرێت بە شانۆی کوردی لە قەڵەم دەدرێت!! دەوترێت شانۆ وەک وەرزش وایە جیهانگیری لەخۆ گرتووە، بەڵام تا وەرزشیش تایبەتمەندێتییەکی لەخۆ گرتووە، بۆ نموونە دەوترێت یاریی سوێدی یان کاراتێی یابانی یان فوتبۆڵی ئینگلیزی.

دەقی شانۆی کوردی کێ دەینووسێت؟ کێ لەگرفتەکانی گەلی کورد شارەزایە؟ بێ گومان نووسەرێکی کورد، لەبەر ئەوە هەرچەندە گێزو گولنکە و جل و بەرگو کاسەو کەوێڵی کوردەواری لەکات و جێگەی خۆیاندا جۆرە دەورێکیان هەیە؛ بەڵام ئەوانە شانۆی کوردی پێناگەیەنن، شانۆی کوردی بە دەقی نووسەری کوردی پێدەگات، کە نووسەریش زۆری لێ ناکرێت بۆ نووسین، چونکە شانۆش وەک چالاکییەکانی تر عەشق و شەیدایی و بەهرەیە بۆ یەکێک بتوانێت بینووسێت.

بمانەوێ و نەمانەوێ هەر بە دەقی نووسینی کوردی، شانۆی کوردی پێدەگات و لەم بارەیەوە ئەوەندەم نووسیوە و ئەوەندەم وتووە هێشتا دەنگم نەنووساوە.

لەکۆتاییدا دەڵێم: داواکردن بۆ پێگەیشتنی شانۆی کوردی بە شۆڤێنییەت دانانرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە داوایەکی ڕەوای نەتەوەیی و ئینسانییە، چونکە بە خاڵە هاوبەشەکانەوە کە وتمان ئینسانین و ڕزگاریخوازن، موتوربە دەکرێت و ئەمیش دەبێتە جیهانگیری، چونکە جیهانگیریش بە خۆماڵیدا تێپەڕ دەکات.

* لە هێندێ حاڵەتدا ناحەزانی پێشکەوتنخوازی، پەنا دەبەنە بەر شانۆی بازرگانی. تۆ ئەم کارە چۆن لێک دەدەیتەوە؟ هێندێ لایەنی ئەم شانۆییەمان بۆ ڕوون بکەرەوە؟

– ئەگەر لە ڕووی پەنجەرەی بلیتەوە باسی بکەین، شانۆ درامی بێت یان بازرگانی بێت، پەنجەرەکە هەر کراوەیە، بەڵام مەبەست لە بلیت فرۆشتنەکە جیاوازە، چونکە لە بنەڕەتدا کە شانۆ دروست بووە مەبەستی بلیت فرۆشی نەبووە بگرە نەشیزانیوە کە ئەوە هەیە، بەڵکو شانۆ خۆی فیکرە، فیکرەیەکی مرۆڤایەتی، مرۆڤ بەرەو ژیانێکی هەمیشە باشترو بەختیاری ڕێنمایی دەبات، بەڵام شانۆی بازرگانی بە چەندان قۆناغ دوای شانۆی درامی داهات.

کەواتە مادام لە سەرەتادا شانۆی درامی و شانۆی بازرگانی یەک نەبوون، تا سەریش هەریەک نابن لە

دووریانێکدا هەر خۆیان دەبیننەوە کە:

شانۆی درامی درامییە و فیکرە و جموجوڵ و بەسەرهات و رووداو و دایەلۆگی شەخسییەتە درامییەکان، هەمووی لە پێناوی گەشەکردن و بەهێزکردنی دراماکەدایە و نامەو پەیامەکەی خۆیشی بەرێکی دەداتە دەست بینەر، بەڵام شانۆی بازرگانی مەبەستەکەی بازرگانی کردنە، گوێ ناداتە فیکری بەرزو جمووجوڵ و هەڵوێستەکان و دایەلۆگەکانی شەخسەکانی ناو نمایشەکە لەپێناو خزمەت کردن بۆ کات بەسەربردن و پێکەنین و حەوانەوەی بینەرە، بینەریش کە شانۆییەکە تەواو دەبێت و دێتە دەرەوە، هیچ پەیام و نامەیەکی پێ نەگەیشتووە.

لە شانۆی بازرگانیدا بینەر بە شەخسی ئەکتەر خۆی پێ دەکەنێت بە پێچەوانەی شانۆی درامی کە بینەر بە کەسە درامییەکە پێ دەکەنێ و لەگەڵی دەژی. شانۆییەک لاوازبێت، مەرج نییە کە بازرگانی بێت، بەڵکو پێی دەوترێت لاواز، بەڵام شانۆییەک بەهێزیش بێت مادام سیمایەکی بازرگانیی گرتبێتە خۆ هەر پێی دەوترێت بازرگانی. بەڵێ بینەر مافی رەوای خۆیەتی بحەوێتەوە کات بەرێتە سەرو پێ بکەنێت، بەڵام لەسەر حسابی شانۆیەکی راستەقینەو درامی نەبێت، کە هەرچەندە شانۆی درامیش جۆرە حەوانەوەیەکی بینەری تێدا هەیە لە جۆری بازرگانی نا، لەبەر ئەوە شانۆی بازرگانی شانۆیەکی ترسناکە بۆ فیکرو وریاکردنەوە و هوشیاری، بگرە لە هێندێ حاڵەتیشدا سڕکردنی مێشک و هەڵوێستی بینەریشە.

* چۆن دەڕواننە ئەو بزووتنەوەیە کە لەم سەردەمەدا هەوڵی گۆڕانکاری دەدات لە شانۆی کورددا؟

- هەر لە رۆژگارەکەی (تیسپیس)ەوە (٢٥٠٠) ساڵە شانۆ لە جیهاندا بە رێگەی نوێکاری و ئەزموونگەری، بلێین گۆڕانکارییەوەیە، ئەگەر وەها نەبوایە ئەم هەزارەها ساڵەی نەدەسمی و هەر بە مەلۆتکەیی گیانی لەدەست دەداو بەم جۆرە نەدەگەیشتە ئێستای ئێمە.

بزووتنەوەی شانۆی کوردیش هەر لە کلاسیک و واقیعییەوە هەنگاوی ناوە بۆ پێشرەوگەری و مەلحەمی و لەوێوە بۆ ئەزموونگەری و ئاهەنگسازی و.... تاد هاتووەو تاقی کردۆتەوە، ئەگەرچی نەگەیشتۆتە رادەی پێگەیشتنی شانۆیەکی کوردی. ئێستا شانۆکارە هوشیارە گەنجەکانیشمان وانیشان دەدەن کە رێگەی نوێکاری و گۆڕانکارییان گرتۆتە بەرو داوا دەکەن کە بۆچی شەکسپیرو ئەپسن و ئەدولف ئابیا مافی نووسینیان هەبێت، ئەوان نەیانبێت؟ کە بۆچی بریخت و ئارتۆ و بیکێت مافی پەت و گوریس و پەیژەو سێرک بازیان هەبێت و ئەو تەکنیکانە لە مان قەدەغە بکرێت.

لە راستییدا وەک شیری بەری دایک مافی رەوای خۆیانە نەک وەک ئەوان، نایابتریش بنووسن و چ کەرەسەو تەکنیکێکی شانۆش هەیە لەوان زۆرتر بەکاری بهێنن، مافی خۆیانە کام چرا شەوقی لەوان بەهێزترە دایبگیرسێنن و ئێمەیش لەبەر رووناکییەکەیدا هەنگاو بنێین و شانازیی پێوە بکەین، بەڵام هەرگیزاو هەرگیز مافی چراکوژاندنەوەیان نییە و پێ نادرێت.

نووسین و بەکارهێنانی تەکنیکەکان لە شانۆی کورددا بەناوی نوێخوازی و گۆڕانکارییەوە لە خزمەتی تەکنیکەکان تەنیا خۆیاندا، نەک لە پێناوی خزمەتی دراماماندا، هەروەها بەناوی نوێخوازییەو پەنا بردن بۆ زاراوە سازی و وشەی ناباو وەک: ئیپستمۆلۆجی، لۆژیک، عەقلانی، یۆتۆپیا، مەعریفی، فۆرم، پرەنسیب، دۆگما.. تاد.، هەر لەپێناوی ناوهێنانی وشە و زاراوەکان خۆیاندا؛ ئەم کارانە نابنە بەرنامەیەک بۆ گۆڕانکاری لە شانۆی کورددا و کەسیش بەغیلی بە خاوەنی ئەم رێڕەوانە نابات کە هاواریان لێ هەڵسێ کە گوایا بەرهەڵستی دەکرێت.

بمانەوێ و نەمانەوێ شانۆ خاسیەتێکی تایبەتی خۆی هەیە و ئەرکە لەسەرمان ئەو خاسیەتەی بپارێزین، ئەویش ئەوەیە: شانۆ خاوەنی نامەیەکە و دەبێت ئەو نامەیە بگەیەنێتە بینەر هەر شانۆیەک ئەگەر ئەم کارەی بۆ نەکرا بیگەیەنێت، خاسیەتەکەی نەماوە و شانۆیەکی دۆڕاوە. بە کورتی ئەمە بوو رای من لە بارەی گۆڕانکارییەوە.

* رەخنە چییە و رەخنەگر دەبێ چ مەرجێکی تێدا بێت و چۆن رەخنە بگرێت؟ ئەمڕۆ هەڵسەنگاندن و رەخنەی شانۆیی لە هەرێمی کوردستاندا لە چ رادەیەکدا دەبینن؟

- رەخنە زانستییەکە لە زانستییەکان پێویست ناکات زۆری لەسەر بدوێم. بە کورتی رەخنەی شانۆیی بەشێکە لە بەشەکانی هونەری شانۆیی لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان لەبەغداو ئەکادیمییە هونەرییەکانی جیهان دەخوێنرێت. رەخنەگری شانۆ جگە لە ئەوەی مەرجە شارەزایی تەواوی لە زانستی شانۆ هەبێت لە هەمان کاتیشدا مەرجە لە زانستی ئیستاتیکی هەر هەمان شارەزایی هەبێت تا بە هێمنی و لەسەرخۆ خواروخێچییەکان راست بکاتەوە و ئاماژە بۆ خاڵە سەرکەوتووەکان بکات و هەڵیان بسەنگێنێت، بەڵام بەلای منەوە جگە لە ئەودوو مەرجە، مەرجی سێیەمیش

هەر لە ڕەخنەگردا هەبێت، کارێکی چاکە: بێ لایەنی و زاڵ بوون بەسەر بڕیاری دەروونیدا. ستانسلاڤسکی لەم بارەیەوە باوەڕی وایە کە ڕەخنەگر لە دەرگای هۆڵی نمایشەکەوە قاڵبەکانی دابنێت و جێ لەسەر شانۆکە بدۆزێتەوە و چی دەبینێ و دەبیستێ ئەوە بچنێتەوە. ئەمڕۆ ڕەخنەی شانۆیی و هەڵسەنگاندن بەشێوەیەکی ڕاستەقینە لە هەرێمەکەماندا ئەگەر بڵێم ڕادەکەی یەکجار کەمە وا لە نەبوون نزیک دەبێتەوە، چونکە ئەو پێوانانەی کە باسمان کردن فرێ دراونەتە نەدیوییەکەوە، هەرکەسە بە تەرازووی تایبەتی خۆی بەرهەمی شانۆیی هەڵدەسەنگێنێ و هەرکەسە بە سەنگی تایبەتی خۆی ڕەخنەکان دەکێشێت.

* ڕۆژنامەنووسیی کورد چیی بەخشیوە بەهونەری شانۆی کوردو دەتوانێت چیی پێ ببەخشێت؟

– هونەری شانۆ چالاکییەکی کاروکردووەیە کەمتر نەزەرییە، وەک ڕۆژنامە و گۆڤارنووسی نییە پشت بە نووسین و وتن ببەستێت. ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکانیش هەر ئەوەندەیان پێ کراوە لا لە هونەری شانۆ بکەنەوە ئەوەندە پەرژاون، کە جارو بارەیەک لە بارەی ئەم هونەرەوە نووسینێک بلاو بکەنەوە، یان لە گۆشەی هونەرو ئەدەبدا سەرێکی لێ بدەن، یان هێندێکیان لەساڵێکدا ژمارەیەکی تایبەتی بۆ دەربکەن، یان بە بۆنەیەکەوە شانۆییەک هەڵبسەنگێنن، یان لە ڕۆژی شانۆی جیهانیدا لەم بارەیەوە بنووسن، یان بە بۆنەیەکەوە چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵ هونەرمەندێکدا کردبێت. شان بەشان ئەمانەش ئەگەر لە گۆڤارێک یان ڕۆژنامەیەکدا لیژنەیەکی تایبەتی بۆ لێپرسینەوە و پسپۆری هونەری نەبووبێت کە سەرەو کاری هەواڵی شانۆ بکات، یان بەنارەوا ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە شانۆییەکیان هەڵنەسەنگاندبێ، یان چاوپێکەوتنێکی ناشایستە کرابێت، یان ڕێک کەوتبێ نووسینێکی نا هونەرمەند درابێت بەسەر نووسینێکی هونەرمەنددا بۆ بلاوکردنەوە، یان ناوبردنی ڕۆژی شانۆی جیهانی فەرامۆش کرابێ، یان هونەرمەندێکی ڕەسەن خرابێتە بەر تاریکایی ڕاگەیاندن، یان سستی کرابێت لە بلاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی هونەریی، ئەگەر ئەمانەش کەوتبێتە نێو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانەوە؛ ئەوە پەندو دەرسێکی هەر لێ وەردەگیرێت بۆ سوودی هونەرەکە.

لەبەر ئەو ڕاستییانەی سەرەوە و لەبەر ئەوەی لە سالانی حەفتاکانەوە بزووتنەوەی شانۆی کورد بە جۆرێک تەوژمی هێناو بەربلاوبوو، بۆیە دەرچوونی گۆڤارێکی تایبەت بەهونەری شانۆ خۆی کارێکی پێویست بوو و ئێستاش زیاتر پێویستترە و لەکاتی خۆیشیدا زۆرم داوا کردووە، بەڵێ گۆڤارێکی هونەری بۆ شانۆ پێویستە تا خۆی تەرخان بکات بۆ کاروباری هونەرەکە و بەربلاوی ئەم بزاڤە بگرێتە خۆو تا بتوانێت بە تێروپڕی لە باس و خواستە هونەرییەکان بدوێت و هونەرمەندان لەو گۆڤارەدا چربنەوە، دەنگ و باسی هونەریی پەخش بکات و بەرهەمەکانی نێوخۆی ولات هەڵبسەنگێنێت و دیدەنیی هونەرمەندانی شایستە بلاوبکاتەوە و قۆناغی هونەرو هونەرمەندانی جیهان بگەیەنێت و ڕۆشنبیرییەکی هونەری بەکۆمەڵ ببەخشێت.

بەڵێ ئێستا گۆڤاری «شانۆوسینەما» لە هەولێر چاوڕوونیی لێ کردووین و لە سلێمانیش پێشتر بە گۆڤاری «شانۆ» شادبووین، کە هیوامان گەورەیە ئەم گۆڤارانە باوەش بۆ ئەو ئەرکانە بکەنەوە، با ئەوەشمان بیر نەچێتەوە گۆڤاری (السینما و المسرح) کە دامەزراوی «السینما والمسرح» لە بەغداد ساڵی «١٩٧٧» دەری دەکرد، ئەمەش بەزمانی عەرەبی؛ تا ماوەیەکیش مانگانە شەش پەڕە بوو، ئەوەندە بەدەربەستەوە بوون.

* مشت و مڕێکی درێژخایەن لەنێوان نووسەرو دەرهێنەردا هەیە، ئایا ئێوە چۆن دەڕواننە ئەم بارودۆخە لە شانۆی کوردیدا؟

– لێدوان لەم بارەیەوە زۆرەو چڕەو کۆنەو بەردەوامیشە. من لەم بارەیەوە نووسینم زۆرە، بەلام لە کوردەواریدا ئەوەی کە دەمەوێت بیخەمە سەر نووسینەکانی پێشووترم ئەمەیە:

(١) نووسەر نووسەرەو دەرهێنەر دەرهێنەرە، هەریەکە خاسیەتێکی تایبەتی خۆیان هەیە. ئەگەر وەها نەبوونایە یەک ناویان لێ دەنرا، مەزنیی نووسەر لە نووسینەکەیدایە و مەزنیی دەرهێنەریش لەدەرهێنانەکەیدایە.

(٢) نووسەرێک ماوەیەکی درێژ شەونخوونی دەکێشێت تا درامایەک دەنووسێت، بۆ ئامانجێک و مەبەستێکیش دەینووسێت، دەرهێنەرێکیش بە دەرهێنانەکەی ئەگەر دەستکاریی نوسینەکەی ئەوی کردو نزمی کردەوە، ئەوە ستەمی لێ دەکات، ئەگەر بەرزیشی کردەوە ئەوە خزمەتی دەکات. ئەوەش بزانین هەموو درامایەک بۆ نمایش کردن یان بۆ دەستکاری ناشێت.

(٣) من پێم وایە نووسەرو دەرهێنەر لەسەر خاڵی دەستکاری ڕێک بکەون ڕاستترەو بە ڕەزامەندیی هەردوولا بێت. ستانسلاڤسکی دەڵێت: «شانۆ لە

نووسەرەوە دەست پێ دەکات» برێختیش رای وایە کە نووسین بۆ خزمەتی نووسەرو دەرهێنەر نانووسرێت. ستانسلاڤسکی کە [چۆلەکە شینەکە]ی میترلنگی دەرهێنا، بۆ هێندێ دەستکاری لە رووسیاوە چوو بۆ ئەو لای پاریسەوە بۆ لای میترلنگ بۆ پرس پێ کردنی، ئەوسا نمایشی کرد. نیکولز کە ویستی «لەچاوەڕوانییەکەی گۆدۆدا»ی بیکیت نمایش بکات، چوو بۆ فەرەنسا سەردانی بیکیتی کردو موناقەشەی لەگەڵ کرد، ئەوسا پێشکەشی کرد کە بیکیت بەدەنگی خۆی گۆرانییەکەی بۆ وت. کەچی لای خۆشمان زۆر رووی داوە نووسەر کاتێک بەخۆی زانیوە، دەقەکەی حەفتەیەکە لە شانۆیەکدا سەربڕاوە لەگەڵ ئەوەشدا کە ماڵەکەیان لەگەڵ دەرهێنەرەکەدا لەیەک گەڕەکدا بووە.

(٤) هێندێک دەرهێنەر وشەی (أضافة) یان بیستووە، جا بەم بۆنەیەوە پاچێک و بێلێکیان هەڵگرتووە دوای خوێندنەوەی دراما دارێژراوەکە بە شانۆیی، داوا لە نووسەر دەکەن ئایا رێگەیان هەیە ئامادەی بکەن!!؟ یان دەستکاری بکەن؟

من خۆم لەگەڵ ئەوەشدا کە لەدرامانووسیندا ئەوە دەزانم کە کەمتر دەشێت ئاماژە بۆ جموجووڵ بکرێت، بەڵام لەبەر ئەو جۆرە دەرهێنەرانە هەر ئاماژە بۆ جموجوولە پێویستەکان دەنووسم. چەند دەقێکیشم چەندان ساڵە ماونەتەوە هەر لەبەر ئەوەی رێگەی دەستکارییەکی نابەجێم نەداون.

(٥) زۆر نووسەری کورد هەیە دەقەکانیان لەماڵەوە نووستووە لەبەر ئەوەی کە دەرهێنەرەکان بەلاوازیان داناون، یان نووسەر رێگەی دەستکاریی نابەجێی نەداون، یان... تاد. گریمان لەبەر ئەوە نەبووە کە کاڵ و کرچن یان هی (حەمە کەریم هەورامی و حەمە فەریق حەسەن و سمکۆ سەعیدو عومەر عەلی ئەمین)ەو هی (برێخت و شەکسپیر) نییە، یان جیهانی نین و خۆشیان بیرچۆتەوە کە خۆیان جیهانی نین و داوای چیرۆک نووسینی جیهانی لە نووسەری کورد دەکەن! گریمان وەهابوو، ئەمە لەلایەک لەلایەکی ترەوە، بەڵام ئەی شانۆی کوردی چۆن پێ دەگات و دروست دەبێت؟ ئەی دەقی کوردیش هەر نووسەری کورد نایینووسێت؟ لێرەدا مەترسییەکە خۆی حەشاردراوەو خۆی حەشار دەدات.

(٦) من بەلامەوە نووسەر هەڵگری مەشخەڵی فیکرەو تا دێت دەرهێنەریشم بەلاوە گرنگ و مەزن دەبێت، چونکە پێویستە لە هەموو زانستێکدا شارەزایی هەبێت.

* ئایا شانۆ دەتوانێت خزمەتی کۆمەڵ بکات؟

- بەڵێ ئەگەر شانۆ نەیتوانیایە خزمەتی کۆمەڵ بکات، ئاوا بەم رادەیەی ئێستا باو نەدەبوو. پێویست ناکات بڵێین شانۆ لە رووی کۆمەڵایەتی و ئینسانی و هونەری و ئەدەبی و رۆشنبیری و سیاسەت و ... تاد. گەورەی داوێنی دێت لە خزمەتی کۆمەڵداو شتی نوێ دەخاتە روو بۆ ژیانێکی هەمیشە گەشتر.

من شەخسی خۆم ئەم راستییەم چاک بۆ ساغ بۆتەوە. رۆژێک کابرایەک لەسەر شەقامێک گرتمی و باسی کارێکی خێزانیی تایبەتی خۆی بۆ کردم نەشمدەناسی وتی بۆچی ئەمە ناخەیتە نواندنەوە کە خەڵکی پەندی لێ وەربگرن؟ ئیتر من لەو کاتەدا کە ئەو ئەوکارە خێزانییە تایبەتییەی خۆی بۆ باس کردم، ئەوم بە نەخۆشێک سەیر دەکردو شانۆشم بە دکتۆر زانی، بۆیە شانۆ بە خزمەتکاری گەلی بینەران دادەنێم. سەرتان نەیەشێنم؛ رۆژێک لە بازاڕ رێم کەوتە چاخانەیەکی بچکۆلەی بۆرە پیاوێکی چایچی نەدیوو نەناسەوە، کە هەڵسام برۆم و دەستم کرد بە گیرفانمدا، گورج پەلاماری دام و وتی: ئەوە تۆ چی دەکەیت مامۆستا «دارپیر دەبێت جارێک بازی بەسەرەوە دەنیشێتەوە» منیش کە وام زانی خەڵاتی ئۆسکارم وەرگرتووە! دەڵێم ئەم رووداوانە و زۆر لەم بابەتە هەموو گەواهی ئەوە دەدەن کە شانۆ لە خزمەتی کۆمەڵدایە، شانۆییەکەی «جولز ورزی» کە بەناونیشانی «سزا» یە، بوو بەهۆی دەستکاری کردن لە قانوونی سزای ئینگلیزدا.

شانۆ خاسیەتێکی ئەوتۆی هەیە کە حوکمەکانی راستەوخۆیە و کاریگەرە، چونکە راستەوخۆ لەگەڵ بینەردا دادەنیشێت و دەستەویەخە قسەی لەگەڵ دەکات،

جگە لە ئەوەش خاسییەتێکی تری هەیە کە لە چالاکییەکانی تردا دەست ناکەوێت، ئەویش ئەوەیە: شانۆ ئاهەنگسازییە. ئاهەنگسازی بەو مانایە نا کە رێبازێکە و عەبدولکەریم لە مەغریب پێڕەوی کردووە، بەڵکو بەو مانایە دەڵێم: کە بینەرێک دەچێتە هۆڵی شانۆیەکەوە هەست دەکات هەر خۆی بە تەنیا نییە، بەڵکو لەگەڵ خەڵکیدا تێکەڵ دەبێت و ئاهەنگی چاوپێکەوتن و فیکر بە کۆمەڵ دەگێڕێت. جا کاتێک کە ئەو سلبیات و ئیجابیاتانەی لەسەر شانۆکە نیشان دەدرێت، ئەگەر ئەو کەسە بیانگرێتەوە؛ زۆر بەهێز کاریان تێ دەکات. لەبەر ئەم راستییانە، شانۆ زۆر لە خزمەتی کۆمەڵدا بەکاریگەر دەزانم.

* تۆ چۆن و لەبەرچی ئەو هونەرمەندانە پەسند دەکەیت کە هونەریان خۆش دەوێت؟

- بێگومان مرۆڤ زۆرتر بەدەربەست شتێکەوە دێت کە حەزی بوێت، کاتێک کە هونەرمەندیش وەکو هەموو مرۆڤێکی تر خواستەکەی دەگاتە رادەی خۆشەویستی و عەشق: زیاتر بە تەنگ گەشە پێ کردنییەوە دەبێت و زۆرتر کاتی خۆی بۆ سەرف دەکات و چاکتر پارێزگاری دەکات و بەهێزتر دەیلاوێنێت و زۆرتر داهێنانی تێدا دەکات.

خۆشویستنی هونەر کارێک دەکات کە لە دەرهێناندا دراماى نایاب هەڵبژێردرێت و خزمایەتی و ئاشنایەتی و مەبەستی تر لەو بارەیەوە لێک نەدرێتەوە، دەورەکانی نواندن بسپێردرێت بە ئەکتەرە لێهاتووەکان نەک دۆست و هاورێی لاواز، هونەرمەندە رەسەنەکان دوور نەخرێنەوە، بەڵکو وزەو بەهرەکانیان بەکاربهێنرێت، هونەرمەندێکی خۆشەویستی هونەر، هونەرەکەی نافرۆشێت، بەڵکو رێزی بەرزتر دەکاتەوە، خۆشویستنی هونەرو هونەرمەندان لە کۆری هونەردا پتر کۆدەکاتەوەو توانایان یەک دەخات و بەرهەمی سەرکەوتووتر ئەنجام دەدەن و زۆرتر داهێنان دێنە دی.

ئەو رووداوانەی کە لەمێژوودا روویان داوە و شتی سەرسوورهێنەریان بەدوادا هاتووە؛ زۆربەیان لە ئەنجامی خۆشویستنەوە هاتوون، ئەگەر خۆشەویستی لە چیا سەختتر نەبوایە و لەژیان و لەمەرگ بەهێزتر نەبوایە؛ نە فەرهاد کێوی بێستوونی کون دەکردو نە مەم و زین وایان لێ بەسەر دەهات و نە رۆمیۆو جولێت بەو جۆرە دەمردن.

ستانسلاڤسکی وتوویەتی: «من خۆم لە هونەردا خۆش دەوێت نەک لەخۆمدا هونەرم خۆش بوێت». بۆ ئەوەی هەڵەش لە هونەرەکەدا نەکەین، واچاکە ئەم شیعرەی تایەر بەگی شاعیرمان لەبیر بێت کە دەڵێت:

**هەر کەسێ هات و وتی من عاشقم بروا مەکە**
**تا لەسەر گۆنای نیشانەی زەخمی مارانگاز نەبێ.**

**ئا: رامان**

# چەمکی ژینگە لە سۆسیۆلۆژیادا

د. کامل جاسم المراياتي
و/ ستار باقی کەریم

ئەگەرچی کارل مارکس سروشتێکی جیاوازی بەخشییە هزری کـۆمــەڵایەتی و لە قــۆناغی بیــرکــردنەوەی فەلسەفییەوە گواستییەوە بۆ چوارچێوەی تیۆریزەکردنی سۆسـیـۆلۆژی کـاتێ بەرەو ئەوە چوو کـە ئەوە شـێـوازی بەرهەمـهێنانە دەسـتنیـشـانی ڕێچکەی گشـتی پرۆسـە کـۆمـەڵایەتییەکـان دەکـات، بەمـەش بوونی کـۆمـەڵایەتی جیـاکـردەوە لە هوشـیـاری کـۆمـەڵایەتی و ئـامـاژەی دا بۆ پێشینەیی بوونی ماتریالی و کۆمەڵایەتی لەسەر بوونی هزری، ئەوا وەکــو من دەیبـینم جگە لە نیـشــاندانی پێــوەندی مــرۆڤی یەکــەم بە ژینگەی ســروشــتی و ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی مرۆڤی خۆبەدەستـەوەدەر بۆ سـروشت و کـاریگەریەتی ئەم خـۆ بەدەســتـەوەدانە لە گـەشـەسـەندنی بەهاو ئەخـلاق و دەرکـەوتنی ئایین هیچ مەبەستێکی تری نەبووە. کاتێ ئەمیل دورکهایم هەوڵی دا دژایەتی بۆچوونەکـانی مـارکس بکات بە پشت بەستن بەوەی خواوەند تەنیا دەربڕینێکی سیمبۆلییە لە کۆمەڵگا و دەزگـاکـانیش نە زیاتر نە کـەمــترن لە کـۆمـەڵگە لە فـۆرمـێکی گـۆڕاودا، بەو مـانایەش ژینگە لێـپـرسـراوە لەبەرهەمـهێنانی ئەو میراتە شارستانییە، لێپرسراویشـە لە فـۆرمـەلەکردنی هەمـوو بونیـادە کـۆمـەڵایەتییـەکـان. لەبەرئەوە لە گۆشەنیگاوە نەبێ جیاوازی لەگەڵ مارکسدا نەبووە. نازانین تا چەند ئەم دوو پیاوە لە بۆچوونەکانیان ڕاست بوونە؟ تا چەند لەگـەڵ بۆچوونەکـانی (فـرۆید) و گـرێ ئۆدیبـیــەکـەی تەبابوونە یان لەگـەڵ بۆچوونەکـانی (مــاکــدوگل) جــیــاوازبوونە یا لەگــەڵ هزرەکــانی (مـالینۆوفسکی) کە بەلایەوە ئایین جگە لە دەربڕینێکی دەروونی بەشـێوازێکی کولتـووری لەسـەر ئەو کـێشـانەی ژینگەی مرۆڤی پێ پڕدەکاتەوە چی تر نەبووە. ئایا ئەبێ تا ئەم ئاستـە ژینگە کاریگەری بەسەر ڕەفتاری مرۆڤەوە هەبێت؟ ڕەنگە نەتوانین بڕیاری ئەوە بدەین کە بارودۆخی ژینگە تا چ مەودایەک دەتوانێ شێوازێکی دیاریکراو لە ڕەفتار بسەپێنێتە سەر خەڵک یا سیستمێکی ئاڵۆز لە نێـوانیـاندا بچێنێت یان دەسـتنیـشـانی چەشنگەلێکی گـۆڕاو لە کـەسـایەتیـیـەکـانیـان بۆ بکات، لێـرەدا لەوە دڵنیـایـن خـەڵک بە گـوێرەی جیـاوازی هاونیـشـتیـمـانی و ژینگەکان لە یەکتری جیاوازن.

هەر لە سـەردەمـە کـۆنەکـانەوە هزرمـەندان و زانایانی عـەرەب و مـوسـڵـمـان ڕۆڵێکی بەرچاویان لەتوێژینەوەی دیاردە ژینگەییەکاندا هەبووە، تێبینی ئەوەیان کردووە کە ژینگە بە تایبەتی سروشتییەکەیان کە بینراوێکی دیارە، شـایانی تێـبـینی کـردنە، ئەوا بە حـوکـمی تەقـەنیـاتە سـادەکانی لە مـامەڵەکردن لەگـەڵیدا تووشی ئاسـتـەنگ هاتبوون، ڕزگاربوون لە چاوگەکانی مەترسی و ترس لێی، لە بەرامـبـەر ناوەکـیـەتی نەبینراو کـە کـۆمـەڵگاو مـرۆڤ نوێنەرایەتی دەکـات، ئەمـەش تەفـسـیـری پێـشـنەیی دەرکەوتنی زانسـتـە سروشـتـیـەکـان لە بەرامـبـەر زانسـتـە ڕەفـتـارگەراکان دەگەیەنێ. هزری ئایینی لە عـیراقی کۆن بە ئامادەگی بەهێزی سیمبولی سروشتی جیـادەکرێتـەوە، وەکـو خۆر بە سـیفـەتی ئەوەی هەسـارەی ڕۆژە، حەموڕابی



مارکس

له بەڵگەنامەکانی خۆیدا خۆی بە پارێزەری زەوی دادەنێ، دوای سەرهەڵدانی ئیسلام و تێکەڵاوبوونی عەرەب بە گەلانی تری زەوی ئەوا ئاماژەگەلێکی ژینگەی کۆمەڵایەتی جیاواز هاتە ئاراوە، بەڵکو زۆر لە ئایەتەکانی قورئان ئاماژەی بە ڕاستییەک کردووە کە زەوی و پێکهاتەکانی بۆ مرۆڤ تەرخان کراون، بەڵام گەندەڵی لە وشکانی و دەریا بەهۆی خراپەکاری مرۆڤەکان دەرکەوتن، لەو کاتەی «فارابی» بایەخداربوو بەم مەسەلەیە، ئەوا دەستنیشانی سیما و تایبەتمەندییەکانی شارە شکۆمەندەکەی کرد، بەهۆی کاریگەری ئەو ژینگەیەی کە دەوری داوە لە ڕووی دابینکردنی سەرچاوەکانی ژیان.

دەشێ چاکترین نموونەی کۆمەڵایەتی ژینگەیی پێشەکییەکەی ئیبن خەلدوون بێت، ئەمیش بەر (لە مونتسکیۆ) و کەسانی تر جەختی کردە سەر بایەخداری فاکتەری جوگرافی و کاریگەری بەسەر بونیادی ئاوەدانی کۆمەڵایەتی و لەسەر ڕەنگی مرۆڤ و ئەخلاقیدا. دوالیزمی ڕەوەندی و شارستانی یا ڕەوەندی و ئاوەدانی گرنگی ئیبن خەلدوون بە ڕەگەزی ژینگەیی بە ڕوونی دەردەخا، بەوەی زۆری ئاوەدانی و زیادبوونی دانیشتوان پەیوەست دەبن بە بارودۆخی کەش و هەوا، هەروەکو دەرچوون لە سادەیی ڕەوەند و هەژارییەکەی بۆ ئاڵۆزیی ئاوەدانی و دەوڵەمەندبوونی لەلای خۆیەوە پێوەندیدار دەبێ بە کارتێکردنێکی دیار کە مرۆڤ لەسەر ژینگە پیادەی دەکات لە سایەی دامەزراندنی شار و هێنانەکایەوەی جۆرەها خزمەتگوزاری تیایدا.

کاریگەری ژینگە بەسەر ڕەفتار تا ماوەیەکی درێژ بە پەنهانی مابووەوە تا ئەوکاتەی دیکارت گریمانەی ئەوەی کرد ژینگە ڕۆڵێکی ئەکتیڤ لە دەستنیشانکردنی ڕەفتاردا دەبینێت، (روبرت ئۆین) یەکەم کەس بوو بە ڕوونی درکی بەوەکرد ژینگە کەسایەتی دروست دەکات. لە ڕاستیدا میزاجی کەسیی مرۆڤ پەیوەستە بە ژینگە، تەنانەت هەستەوەرەکانی جوانی و ناشرینیش بە سیفەتی ئەوەی لە هەستەوەرە خودییەکانن، ئەوا مرۆڤ لە ژینگەی دەوروبەری و سەرنجە کەسییەکانی لە بارەی ژینگە و سروشتییەکەی و مەودای درککردنی بە هارمۆنییەت و هاوگونجانی ڕەگەزەکانی وەردەگرێ. بێگومان پێداویستی مرۆڤ بۆ هەستکردن بە بەهای جوانی یەکێک لە پاڵنەرە سەرەکییەکانی مرۆڤ پێک دێنێ کەوا (ماسلۆ) لە هەرەمەکەی دەری بڕیوە.

چۆن دەکرێ لە چەمکی ژینگە تێ بگەین لەگەڵ هەموو میراتە فیکرییە سۆسیۆلۆژیەی کە لە خەیاڵماندا ئاپۆرەیان کردووە؟ لە کوێوە دەست پێ بکەین؟ لە کام گۆشەوە باسی بابەتەکە بکەین؟ کێشەی ژینگە هەر لەکاتی کۆنگرەی ژینگەی مرۆیی کە لە (١٩٧٢) لە ستۆکهۆلم بەسترا، بەڵکو بەر لە هاوارەکانی ڕۆژی زەوی بە چەندساڵێکی درێژ بوو بەجێی کاری زۆر لە نووسەران و بیریاران لە زۆر پسپۆریەتی زانستی و مرۆیی جیا لە یەک دوای ئەوەی لەژێر دەستی کۆنگرەکاران و هۆڵەکانیان کەمێک نەبێ دوورنەکەوتەوە. لەوەوە دەست پێ بکەین کە ژینگە لە پێگەی یەکەمیدا بە چەمکێکی (فیزیکی) ماددی دادەنێین، بایەخ و ڕەهەندە فیزیایی و کیمیایی و بایۆلۆژییەکان تەوەری کێشەی ژینگەیین لەجیهانی ئەمڕۆ، پێویستە هەوڵ و کۆششەکانیش بەم ئاراستەیە دەربڕدرێن، چونکە ژینگە تاپلەیەک یا ئاستێک بەشێوەی بنەچە و سیستمێکی یا نەسەقێکی قفڵدراو نامێنێتەوە، ڕەگەزە سەرەکییەکانیشی لە حاڵەتی کارلێککردنی وەزیفی هاوتا و تەواو نامێنێتەوە ئەگەر خۆتێهەڵقورتاندنی مرۆڤ تێکدانی سیستم و ڕێکخستنی بونیاتە فیزیکییەکان نەبێ. لەگەڵ ئەوەی دەزانین سەرجەم کێشە ژینگەییەکانمان لە بنەچەدا لە ڕەفتاری مرۆڤەوە دەست پێ دەکەن، ئەمەش ناتوانرێ تەنیا بە پشت بەستن بە شێوازەکانی تەکنەلۆژی و ڕێ و شوێنە تاقیگەییەکان چارەسەربکرێت.

چونکە پێوەندی مرۆڤ بە ژینگەی سروشتی هەردەم کۆمەڵێک لە ئامانج و بەهای ڕۆشنبیری و نەسەقی تەواو لە بونیادنانی مەعریفی کولتووری هزری بۆ ماوە ناوەندێتییان دەکات. یان گرنگیدانمان ئاراستەی ئەو خۆتێهەڵقورتێنەرە بکەین تا ئەوە ببینین کە مانەوەی بەردەوامی جۆرەکەی لە هەڕەشەدایە، چونکە زێدەڕۆیی کرد لە هەڵقۆزتنەوە و بەم خۆهەڵقورتاندنەیشی قەیرانی

زۆری ژینگەیی نایەوە، هەندێکییان خۆیان لە کێشەکانی ناهاوسەنگی نێوان بەرهەمهێنانی خۆراکی و تێکڕای گەشەی دانیشتوان دەبینییەوە و هەندێکی تریشیان خۆیان کێشەکانی تەندروستی و گۆڕانی کەش و پیسبوونی ئاووهەواو دابەزینی ئاستی بەرهەمهێنانی زەوییە کشتوکاڵییەکان دەبینییەوە، هەروەها لە زۆر تێکچوون و شڵەژانی تر، ئەمەش بەهۆی چالاکییە شارستانییەکان و خراپی لە بەڕێوەبردن و پلاندانان بەبێ کەمترین ئاستی هەستکردن بە لێپرسراویەتییە مێژووییەکەی لە بەرامبەر نەوەکانی داهاتووی. دەکرێ بەدوای ئەم بیرۆکەیەدا بچین کە وای دەبینێ بەرزبوونەوەی ئاستەکانی ژیان لە رووی ئابوورییەوە بە زەروورەتەوە پەیوەست دەبێت بە خراپبوونی بارودۆخی ژینگە، ئەمەش بەرزبوونەوەی گەشەی دانیشتوان و ئاپۆرەبوونیان لە شوێنەکانی لێ دەکەوێتەوە، هەروەها پیسبوونی پیشەسازی و تێکچوونی ژینگە و ئەوەی لەم دیاردانەش دەکەوێتەوە وەکو هاوار و ژاوەژاو و خراپی بەکارهێنان. لەگەڵ باوەڕی تەواومان بەوەی کە شێوەی بەرهەمهێنان بە زەروورەتەوە هەڤبەند دەبێ بە بارودۆخی بەرهەمهێنان، هەرچی بەرهەمهێنانی ماددی و عەقڵی مرۆڤە جگە لە فۆرمێک لە فۆرمەکانی دەربڕینی ژیانی مرۆڤایەتی ئەگینا هیچی تر نییە، لەبەر ئەوە پێوەندی نێوان مرۆڤ و ژینگە پێویستە بەردەوام بە ئاراستەیەکی هاوسەنگی پێوەندی نێوان مرۆڤ و دەرئەنجامی کارەکەی ببردرێ.

ئایا ئێمە راست دەڵێین گەر داوای هەڵهێنجانی مەرجی پەروەردەی نوێی ژینگەییمان کرد کە خاوەنداریتی و جۆرەکانی رەفتار و بەهاو زانیاری و تواناکان گەشەپێبدات، لەم کارەشیدا گونجانێکی چاکتر بۆ مرۆڤ لە ژینگەکەی دابین دەکات، هەوڵ و کۆششمان لە گەڕان بە دوای فۆرمێکی نوێی بونیادی کۆمەڵایەتی کە زۆر پێگەیشتوو و عەقڵانی بێت کە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بخاتەگەڕ بەشێوەیەک تیایا زۆرترین هوشیاری و تێگەیشتن بۆ رێساکانی گەردوون و چالاکییە «سروشتییەکان لەخۆ بگرێت؟ پاساومان بۆ ئەمەش ئەوەیە کە یاساکانی سروشت لە بنەچەدا بۆ هاوسەنگکردن و ئاسانکردنی شێوازەکانی ژیانی هاوچەرخ و دینامیکییەتی بزاوتەکانیەتی هەروەها نە هۆکارەکانی بەرهەمهێنانی پیشەسازی و نە مۆتیڤەکانی ئاکاری ئابووری یا ئاکارییەکانی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی لەجیهانی ئەمڕۆ نەبووە. لەوەدا نازانین تا چەند ئێمە نزیکین لە تێزەکانی فرۆید و قوتابخانە رەفتارگەرییەکانی و شرۆڤەکانی بۆ رەفتاری مرۆڤ بەوەی کە لەلایەن هەردوو غەریزەی سێکس و شەڕانگێزییەوە پاڵی پێوە دەنرێت کە لەناخی مرۆڤدا و لە نائاگاییدانە ئەوانەی کە هەناسەیەکی بە فەر بۆ تێربوونیان نادۆزنەوە جگە لە گۆڕەپانەکانی ژینگە و سروشت نەبێت ئەمەش وەکو لەم گوتە زایە شیعرییەی کە دەڵێت: (زوڵم یەکێکە لە غەریزەکانی دەروونی مرۆڤ، گەرکەسێکمان بینی زوڵم ناکا ئەوا لەبەر هۆیەکە).

پاشان ئایا ئەم کۆششە واتای ئەوە نادات ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین لە دیاردەکانی فەوتاندنی ژینگە ناتوانرێ بەشێوەی رەفتارگەری شرۆڤە بکرێ، تەنیا بەگەڕانەوە نەبێت بۆ ئەو ئاڵۆزییە لە سیستمی سیمبولی کە مرۆڤ دایهێناوە و لە سایەیەوە خەڵکی لە کۆمەڵگە لەگەڵ ژینگەکانیدا دەگونجێن، لە سایەی ئەمەوەش دەستنیشانی پێوەندییەکانیان بە ئەوانی دیکەوە دەکەن. گەر بونیادە کولتوورییەکانمان پڕ بن لەو رەگانەی کە لەنێو خۆیاندا ئامانجی شەڕانگێزیان هەڵگرتووە کە هانی ململانێ لەپێناو مانەوە بدات و هەوڵبدا پارێزگاری لە جۆر بکات ئەوە لە ئەنجامی ئەوەدا ئابووری ناوەخۆ پەرەدەسەنێت کە ئەمەش هانی پراکسیسەکانی خراپەکاری ژینگەیی دەدات، ئەوەی ئێمە دەیڵێین گەواهی زۆری لەسەرە کە سەرجەمیان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن مرۆڤی سەرەتایی لەگەڵ ژینگە بەشێوەیەکی گونجاو بەخۆشی و ئاشتی ژیاوە، گەشەسەندنی ژیارەکانی پێش زایینی تەنیا بریتی بوون لە چەندین ماوەی شڵەژانی فرەوان و تێکچوونی ژینگەیی خێرا. ئاخۆ دەبێ مرۆڤ رەگێک نەبێ لەم هەموو شرۆڤە و تێزانە؟ ئەی بۆچی هەندێک سوورن لەسەر وەدەرنانی بۆ دەرەوەی نەسەقی ژینگەیی؟ رەنگە هەندێکیان بڵێن مرۆڤ زیانی گەیاند بە ژینگەی سروشتی و پێوەرەکانی هاوسەنگی نێوان کەرەستەکانی ژینگە و ژمارەی دانیشتوان لەق بکات، تەنانەت بووە هۆی لە دەستدان یا نەمانی (ئۆزۆن ستراتوسفیری) لە ئەنجامی سەرهەڵدانەوەی (ئەکاسید تروجین)ی لەو فڕۆکانەی خێراتر لە دەنگ لە ئاستێکی بڵندی بەرز ڕێ دەکەت، بەڵام پێویستیە ئەوەمان لەیاد بێت کە عەقڵی مرۆیی توانایەکی لە رادەبەدەری هەیە بۆ دۆزینەوەی رێگە چارە و چارەسەرکردنی کێشەکانی ژینگە. تا ئێستاش رێگە لەبەردەم تەکنیکی نوێی زانستی والایە، تا بوار کراوەیە لەبەردەم عەقڵی مرۆڤ بۆ بەفەڕکردنی بیابانەکان و باراندنی بارانی دەستکرد و پاککردنەوەی مەودای خواردەمەنی لە پاشماوە پیشەسازییەکان یا لە قووڵایی دەریاکان، بەڵکو خستنەگەڕی هەوڵەکان بۆ ئامادەکردنی یاساغکردن یا کەمکردنەوەی بەکارهێنانی گیراوەکانی (مرکبات) کرابوون کلۆراید و ئەو مادانەی کاردەکەنە سەر نەهێشتنی ئۆزۆن لە چوارچێوەی بەرنامەیەکی دیار وەکو ئەوەی لە برۆتۆکۆلی مۆنتریالی و راستکردنەوەی


فرۆید

(١٩٨٧-٢٠٠٠)دا هەیە.

ئەمە کێشەی زانستە ژینگەییەکانە، زۆرجار سۆسیۆلۆژیا ئەوەی دراوەتە پاڵ کە زانستێکی دابڕاوە لە زانستەکانی ژینگە، زۆرجاریش پێناسەکانی بۆ ژینگە بە تەنیا لە ڕەهەندە زانستی و سروشتییەکان قەتیس ماون وەکو ئەوەی بوونەوەری مرۆیی بوونەوەرێکی ئۆرگانیکی نەبێت کە لەژینگەی سروشتی دەژی و جۆرێک نەبێت لە جۆرە سروشتییەکان کە مەملەکەتی گیاندارانی لێ پێک دێت. بۆچی چالاکییەکانی مرۆڤ شرۆڤەیەکی ئیکۆلۆژیای ناکرێت تا لەژێر ڕۆشنایی پرۆسەکانی هاوکاری و کێبڕکێ و بەیەکەوە ژیان و هەڵبژاردن تێی بگەیەین وەک ئەوەی کە بەشێکە لە پرۆسەگەلێکی هەر نەسەقێکی ئیکۆلۆژی، مادام مرۆڤ ڕەگەزێکی سەرەکییە لە ڕەگەزەکانی ئەم نەسەقە. ئەمە دەروازەی سۆسیۆلۆژیا و کێشەکەیەتی لە مامەڵەکردن لەگەڵ ژینگە و درکپێکردنی کێشەکانی، ئەو لە هەمان ڕیشەی ئەو زانستانەیە کە خاڵی هاوبەش دەبینێ مادام هەوڵی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی بۆ مرۆڤایەتی لەسەر ئەم زەوییە دەدات. هەندێکییان بەم بیانووە ڕەخنە دەگرن کە ئەوەی فەرمانداریەتی چالاکییەکانی سروشت و دیاردەکانی دەکات یاساکانی هۆکارییە، ئەوەی فەرمانداریەتی چالاکیەکانی مرۆڤ و ڕەفتاریشیان دەکات یاسای مەبەستدارن کە ناشێت بۆ شرۆڤەکردنی چالاکی سروشت یا هەر نەسەقێک کە مرۆڤ تیایا کارابێت، بەڵام ئایا ناشێ ئەوەی کە فەرمانداریەتی ئەم جۆرە نەسەقانە (سستیمانە) دەکات یاساێکن تا ئێستا ئەقڵی مرۆڤ پێیان نەزانیوە و هەوڵی دۆزینەوەشیانی نەدابێت؟ ئایا مۆنتسکیۆ وا دەبینێ کاتێ بابەتەکانی و شتەکان لەبەرامبەر یەکتر ڕێک دەکەون ئەوا لە ئەنجامدا یاسایەک دروست دەکەن کە فەرمانداریەتییان پێ دەکەن؟

ئایا لە توانامانادا نییە شرۆڤەی تێکچوونی ژینگە بکەین، شرۆڤەکردنێکی بونیادیانە و بگەڕێینەوە بۆ نیگەرانی پەرێشانێکی بنەمایی لەنێوان ئەو ژینگەیەی کە خودای گەورە دروستی کردووە لەگەڵ ئەو ژینگەیەی مرۆڤ خۆی دروستی کردووە، ئەم نیگەرانییەش لەسەر بونیادی ئیکۆلۆژی ڕەنگی داوەتەوە، مادام مرۆڤ خۆی ڕەگەزێکە لە ڕەگەزەکانی سیستمی ژینگەیی؟ پاشان ئایا (مالتۆس) ئاگادارمان ناکاتەوە لە هزرە یەکەمینەکانی هۆکارێکی وەک ئەمە کە ژینگە توانای دووبارە گەڕاندنەوەی هاوسەنگی هەیە هەرچەندە مرۆڤ پلیشاندبێتیەوە؟ (هربرت سپێنسی) ئاماژەی بەوە کرد کاتێ بەرەو ئەوەچوو کە کۆمەڵگا مرۆییەکان دەربڕینێکن لەبارەی کۆمەڵەیەکی ئۆرگانیان) لەنێویانا ئەوەی «بە هاوسەنگی وزە» ناوزەد دەکرێ بە تەواوی وەک ئەو حاڵەتە وایە کە لە نەسەقی ئیکۆلۆژی و سروشتی بوونەوەرە زیندووەکاندا هەیە، ئەم هاوسەنگییەش لەنێوان هەندێ کۆمەڵگاکان خۆیانیان لەنێوان ژینگەکانیان شێوەی خەبات لەپێناو مانەوە وەردەگرێ، لە پاشان ململانێ دەبێتە چالاکییەکی زانراو لەو کۆمەڵگەیانەی لەژێر کاریگەرییەکی زۆری ژینگەی سروشتی دانە، هەر لە گەرمەی ئەم ململانێیەدا ترس لە زیندووەکان وەک یەکەم ڕیشەی بەرزەفتی سیاسی دەردەکەوێ هەروەک ئەو ترسەی لە مردووەکان وەک ڕەگی و ڕیشەی بەرزەفتی ئایینی دەردەکەوێ. کێشەی تێکچوونی هاوسەنگی ئیکۆلۆژیا لە ژینگەی سروشتی کێشەیەکی سەربەخۆ و بەدەرنییە لە کێشەکانی پیسبوونی ژینگەی و وێرانبوونی ژینگە، بەڵکو ئەنجامێکە لە ئەنجامەکانی ئەم کێشانە. کەواتە لەبەرچی لە یاساکانی ژینگە سروشتی بە تەنیا بەدوای هۆکارەکانیدا دەگەڕێین بێ ئەوەی هەوڵی تێگەیشتن لە ژینگەی بەشێوەیەکی ئیکۆلۆژی بدەین و بە نەسەقێک کە مرۆڤ ڕەگەزێکی سەرەکییە تیایدا؟ زۆر لە زانا سۆسیۆلۆژییەکانی وەکو (باریتو و دورکهایم و مارکس) درکیان بەوە کرد کە نهێنی گۆڕان و پێشکەوتن لە هەر دیاردەیەک لەنێو خودی دیاردەکە خۆی دایە، بە واتا گۆڕان لە ئەنجامی کارلێککردنی ڕەگەزەکانی ناو ئەم دیاردەیە دێتەکایەوە.

گەر بەدوای وەرچەرخانی چالاکی و جووڵانەوەکانی مرۆڤ لە چەشنێک بۆ چەشنێکی تر دابچین ئەوا دەتوانین

بگەینە نهێنی تێکچوونی هاوسەنگی ئیکۆلۆژی. گەر هەوڵمان دا کارلێککردنە ژینگەیی و شارستانییەکانی هەر چەشنێک لە چەشنەکانی نیشتەجێی مرۆیی بزانین و لە هەموو چەشنێک لە چەشنەکانی بەرهەمهێنان هەموو قۆناغێک لە قۆناغەکانی پێشڤەچوونی سیستمی کۆمەڵایەتی بزانین. لەو کاتەی ئینسان کۆکەرەوەی خواردن بوو و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی نەبوود جگە لە کۆمەڵێک هۆزی بچووک و کۆمەڵەی سنووردار، سیستمی ئابووریش سیستمێک بوو پشتی بەخۆتێرکردن دەبەست لەوکاتە کاریگەری مرۆڤ بەسەر ژینگەی سروشتی کاریگەرییەکی وانەبوو شایانی ئاماژەپێدان بێت لەوکاتەش هەرگیز کێشەی ژینگە لە ئارادانەبووە، بەڵام لەوکاتەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی بۆ چەشنێکی گۆڕاو وەرچەرخا و شوێنی نیشتەجێبوونی مرۆڤەکان قەرەباڵغ بوو، سیستمی بەرهەمهێنان چەندێتییەکی گەورەی بەرهەمهێنان وەرچەرخا بەهۆی سیاسەتی پیشەسازی و گۆڕینی کەرەستەی خاو بۆ کەرەستەی دروستکراو، بێگومان ئەمەش لەسەر سیستمی ژینگەیی و بەسەر چەشنی خستنەژێر ڕکێفی مرۆڤ بۆ کەرەسەکانی ژینگە ڕەنگی دایەوە. ڕووداو و دیاردەکان، بەڵکو هەموو شتێک لەبوون بە گوێرەی سیستم و ڕێکخستنی مکوم دەڕۆنە ڕێ بەپێی ئەمەش ڕووداو و دیاردەکان بەدوایدا دێن، هەر هەموو زانستەکانیش هەوڵی زانستی سیستمی واقیع و ژیانی ئەدەن و بەدوای چوارچێوەیەکی گونجاو بۆ شرۆڤەکردنی ڕووداوەکان و هۆکارەکانیان دەگەڕێن، بەڵام لە ڕووی میتۆد و ئەو ڕێگەیانەی دەگرێتەبەر لە یەکتر جیاوازن.

کەواتە بۆچی هەوڵی بەهرەهانینی بەخشش و پێدراوەکانی زانستەکان و میتۆدەکانیان نادەین لەبارەی شرۆڤەکردنی کێشەی ژینگەی مرۆڤ و پێشخستنی هزری ژینگەیی نوێ کە هەوڵی گوێڕایەڵی بوونی مرۆڤ بۆ ژینگە و ژینگە بۆ مرۆڤ بدات بەرلەوەی ژینگە خۆی جڵەوی ئاقڵکردن یا بە ئەدەبکردنی مرۆڤ و گەڕاندنەوەی هاوسەنگی بگرێتە دەست. هیچ شتێک لە بوون لەخۆوە ڕوونادات و هیچ هۆیەک بێ هۆکارنابێ، بێ چاوی لەمە بێت کە هەموو شتێکی بەگوێرەی خۆی خەلق کردووە، با کەمێک بگەڕێینەوە سەر پێناسە گشتییەکەی سیستمی ژینگە بۆ ئاشکراکردنی هۆکاری ئەم نەسەقە و ڕۆڵی لەم هۆکارە.

نەسەقی ژینگەیی هەر یەکەیەکی ڕێکخراوەیی یا شوێنییە بوونەوەری زیندوو و مادەی نا زیندووی کارلێککردوو دەگرێتەوە بەشێوەیەک کە کارلێککردنی دەبێتە هۆی ئاڵوگۆڕی مادەکان لەنێوان بەشە زیندوو و نا زیندووەکان. وەکو ئاشکرایە کارلێککردن و ئاڵوگۆڕکاری دوو ڕەگەزی سەرەکی و کاران لەم نەسەقە (سیستمە)، بەڵام چۆن بە ئاڵوگۆڕی دەگەین و چۆن دەکرێ لە میکانیزمەکانی ئەم کارلێککردنە بگەین؟ ئایا دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ خوێندنەوەی بۆچوونەکانی (ماکس ڤیبر و تالکوت پارسونز) سەبارەت بە کردەی کۆمەڵایەتی و پەیوونی سیبرنتیکی بۆ ئاڵوگۆڕی نێوان نەسەقە لاوەکییەکانی نەسەقی کردە وەک هزرێکی سەرەکی بەرمەتیدەر بۆ تێگەیشتن لە تێکچوونی ژینگە وەربگرین. لەگەڵ ئەوەی من بەمە بە تەواوی باوەڕناکەم، بەڵام من وا بەچاک دەزانم چاودێری بکەین.

گەر هۆکاری تێکچوونمان گەڕاندەوە سەر کەم و کورتی میکانیزمی ئاڵوگۆڕکاری لەوکاتە لەسەرمان پێویستە دەستنیشانی شوێنی ئەم کەم و کورتییە بکەین، جا ئایا لە ئاستی بوونی زانیارییەکان یا ئاستی وزەدا دەبێ؟ ئایا تێکچوونی ئاڵوگۆڕکاری دەبێتە هۆی کەم و کورتی یا کەمتەرخەمی لە یەکێک لە چوار نەسەقە لاوەکییەکە یاخود بە دەستنیشانکراوی لە نەسەقێکی دیاریکراودا؟ ئەمە لێپرسراویەتی سۆسیۆلۆژیایە. بە دڵنیاییەوە کارلێککردنی ئیکۆلۆژی کارلێککردنێکی کۆمەڵایەتی ڕووت و پەتی نییە وەکو ئەوەی لەنێوان مرۆڤێک و یەکێکی تردا ڕوودەدات، ئەمەش لەبەر ئەوەی لێرەدا میکانیزمی کارلێککردن هەمان میکانیزمی کارلێککردن نییە لەوێدا؛ لە دیدی زانایانی ئیکۆلۆژیا کارلێککردنی ئیکۆلۆژی کارلێککردنێکی کۆمەڵایەتی ڕووت نییە، چونکە ئەم پرۆسەیە ناکەسێتی و نیمچە کۆمەڵایەتییە Impersonel and sub Social Interaction که ئاڵوگۆڕی ماناکان ناگرێتەوە وەکو ئەوەی لە کردەی کۆمەڵایەتی نێوان تاکێک و یەکێکی تر بەدی دەکەین، ئەمە چەمکێکە ئاماژە بەو کاریگەرێتییانە دەکات کە بوونەوەری زیندوو بەسەر بوونەوەری تری زیندوو پیادەی دەکات کەوا لەژێر جۆرەهای تر ڕیزبەند دەکرێن. دەشێ ئەم کاریگەرێتییەش فسیۆلۆژی بێت وەکو ڕشتنی ژەهر یان ڕەفتاریی بێ وەکو ململانێ و شەڕ، کەچی پێویست نییە کارلێککردنی (ئیکۆلۆژی) ڕێچکەیەکی ئازاردەر وەربگرێت کە زیان بە بوونەوەرەکان یان لایەنە کارلێککردووەکان دەگەیەنێت، بەڵکو دەبێ سروشتی بە دەستهێنانی بەرژەوەندی ئاڵوگۆڕکاری وەربگرێ. لە پاشاندا لایەنی پێوەندیدار بە کارلێککردنی ئیکۆلۆژی لەلایەنی پۆزەتیڤ دەست دەکات بە کێشکردنی پێوەندی کێشکردن و هاوکاری و لایەنی نێگەتیڤیش بە لەناوچوون و تێپەڕین و ڕۆیشتن بە چەندین پرۆسەی کارلێککردنی ئیکۆلۆژی وەکو هاوکاری و پێکەوە ژیان و ناخۆشی و ململانێ و نێچیربەتی و... دەبێ.

لەبەر ئەوە پێویستە جیاوازی نێوان هەردوو شێوە لە

شێوەکانی ناو هەر نەسەقێکی ئیکۆلۆژی بکەین، یا بەدەربڕینێکی تر دوو ئاستی ئیکۆلۆژیای ژینگە هەیە یەکەمیان لەسەر ئاستی هاوکارییە کە کێبڕکێی ناکەسێتی خۆی دەبینێتەوە، دووەمیانیش لەسەر ئاستی رۆشنبیرییە کە جەخت دەکاتە سەر پێوەندیکردن و رێککەوتن. وەکو روونە ئەمە واتای ئەوە دەدات میکانیزمەکانی نەسەقی ئیکۆلۆژی لەسەر دوو ئاست رێک دەخرێن، یەکێکیان زیندەگییە کە پشت بە هاریکاری دەبەستێ و پێوەندییەکانی کێبڕکێی ناکەسایەتی (ئابووری یان بایلوجی) بەڕێوەی دەبات، دووەمیان کولتوورییە لەسەر پێوەندیکردن و رێککەوتن وەستاوە کە یاساکانی بوونی کۆمەڵایەتی بەڕێوەی دەبەن کە هێزەکانی کێبڕکێ و هاریکاری و ململانێ رۆڵی تیادا دەبینن لە پێوەندی نێوان تاکەکان لەنێوان هەندێکی تریاندا یا لەنێوان ژینگەکەیان. کەواتە بۆچی ئەم هەموو ئاینزایانە دەهۆنرێنەوە لەگەڵ ئەوەی کۆنگرەی ستوکهۆڵم ئەم کارەی یەکلایی کردەوە و چەمکی ژینگەیی بەرفراوان کرد بەشێوەیەک کە ئەم چەمکە تەنیا ئاماژەیەک نەبوو بۆ رەگەزەکانی سروشتی وەکو ئاو و هەواو خۆڵ و میتاڵ و رووەک و ئاژەڵان، بەڵکو ئاماژەی بەوە دا ژینگە سەنگی کەرەسە ماددی و کۆمەڵایەتییەکانە لەو ساتەی بۆ تێرکردنی پێداویستییەکانی مرۆڤ و پێشکەوتنیانن.

لەو باوەڕەدام ئیتر ئێمە لەمەودوا لاگیری رەوایەتی ناکەین گەر داوای گۆڕینی چەمکی نەسەقی ئیکۆلۆژیان لە زهنی هەندێکدا کرد بۆ ئەوەی مرۆڤی تێبخەین وەک بەشێک لە سیستمی ژینگەی گەردوونی ئامادەی بکەین، ئەم ئەنجامەش لە خۆ بگرین لەم کارە کە لێی دەکەوێتەوە لە بەرهەمهێنان لە شیکردنەوە و ستراکتور و دەرئەنجام، بەڵکو ئێمە تەواو راست دەبین گەر ئەم میتۆدەمان گرتە بەر، چونکە بوونەوەری مرۆیی لە دیدگای ئەنترۆبۆلۆژیای سروشتییەوە لە ئاژەڵێکی ناتایبەتمەند زیاتر چیتر نییە واتە مرۆڤ بەوە جیادەکرێتەوە کە توانای ژیانی هەیە لە جۆرەهای نادیاریکراو لە هەرێمە سروشت جیاوازەکان لە رووی کەش و رووەک و ئاژەڵ و بەرزو نزمی شوێنەکان. بەواتایەکی تر مرۆڤ ناتوانێ بە تەنیا و دابڕاوی بژی و ژینگە مرۆییەکەی پێشبخات بە تەنیا و دوور لە کاریگەرییەتی و لە دەرەوەی چوارچێوەی سیستمی ژینگەی سروشتی، ئەمەش رەگەزێکی سەرەکییە لە رەگەزەکانی ئەم نەسەقە، چونکە فەلسەفەکاری تێ دەکات و کارلێکدەکات و پێی کاریگەر دەبێ بە فۆرم و شێوە و پلەی بەرانبەرکێ و جۆرەها هاریکاری، بەلام ئەم لە کارلێککردنی لەگەڵ رەگەزەکانی نەسەقی ئیکۆلۆژی و لە ئاڵوگۆڕی سوودەکانی لەگەڵیدا پەیوەست نابێ بە یاساکانی سروشت و عورف و رێساکانی، ئەمەش پراگماتیکییە و لە وەرگرتنا زێدەمەسرەفە، کەم بەخشە، تەنیا بە بوونی (بایلوجی) وەک رەگەزێک لە رەگەزەکانی نەسەقی ژینگەیی نەوەستاوە، بەڵکو بۆ ئەم بوونە رەهەندی سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و بنیاتی دەزگا و پەیکەری بیناسازی و بنیاتی مەعریفی و سیمیۆلی کولتووری زیاد کردووە.

بەمەشیان مەعریفەی دیاریکراوی لەبارەی یاسای سروشت و ئەو سونەتانەی تەحەکوم بە میکانیزمی کارلێککردن و میکانیزمەکانی ئاڵوگۆڕکاری لە ژینگە سروشتییەکان و نەسەقەکانیانی دەکرد شێواند. ئەگەرچی هەندێ لە زانایانی ئیکۆلۆژیای مرۆیی بە ململانێ لەگەڵ هەندێ بیرمەندانیان هەوڵی جیاکردنەوە و دابڕاندنی نەسەقی ئیکۆلۆژیاندا لە نەسەقە کۆمەڵایەتییەکانی تر بەو بەهانانەی کە وەریان گرت لە جیاکردنەوەی نێوان کارلێککردنی ئیکۆلۆژی و کارلێککردنی کۆمەڵایەتیان، ئەمەش بەهیچ جۆرێک ناکرێ مانای ئەوە بدات کە دیدگەی سۆسیۆلۆژیا بۆ پێوەندی مرۆڤ بە ژینگەکەی دووردەکەوێتەوە لە تێگەیشتنی کارلێککردەیی بۆ دەرهاویشتەکانی کاریگەرییەتی ئاڵوگۆڕکاری نێوان مرۆڤ و شوێن لەلایەک و مرۆڤ و شوێن دیسان لەلایەکی تر. جا ئەگەر ئەم سیستمە ئیکۆلۆژییە لەخۆیدا سیستمێکی سەربەست لەسەرجەم نەسەقە ئیکۆلۆژییەکانی تر بێ، یاخود بەشێک بێت لەو نەسەقانەی یارمەتیدەرن لە پێکهێنانی بونیادی کۆمەڵایەتی، ئەمەش بە دڵنیاییەوە واتای هەموو ئەو دەرهاویشتە کۆمەڵایەتی و کولتووری و شارستانی و ئۆرگانیانەیە کەوا ئەو کارلێککردنە لێکیان جیادەکاتەوە ئینجا لەسەر شێوەی کۆمەڵایەتی یا رێکخستنی دەزگاییەکان یان کەسایەتییە (بیناسازی) یا بونیادی مەعریفی یاخود نەخۆشییە رەفتارییەکانی بێت دەدات، لەبەرئەوە پێویستە کارلێککردنی مرۆڤ و شوێن رەهەندی مەعریفی ئەوتۆی لێ لە دایک ببێت کە شارەزایەتی مرۆڤ لەخۆ بگرێ کە لە ئەزموونەکانی لەگەڵ ژینگە وەریگرتووە، ئەم رەهەندە مەعریفییەش کارایەکی کارتێکەرە لە دروستکردنی نەسەقەکانی کۆمەڵایەتی هەندێکی مادی و ئەویتر مەعنەوی. ئەم سیستمانەش رۆڵێکی کاریگەر لە هەڵسووڕانی رێڕەوەکانی پێوەندی ئاوێزەیی و دووبارە رێکخستنەوە و دارشتنەوەی نەسەقی ئیکۆلۆژی لەشێوەیەکی جیاوازدەگیرێ لە ماوەی کات گەرجێگیر بێت و لەماوەی شوێن گەر زەمان گۆڕاو بێت یاخود گەر شوێن و کات بزاوتیان کرد ئێستا دەکرێ وا چاکتر بێ کە خاڵ بخەینە سەر پیتەکان و چاوگی بایەخەکان زیاد بکەین و زاراوە و تێرمەکان بناسین. یا

به لایەنی کەم هەوڵی جیاکردنەوەیان بدەین. ئێمە لە توێژینەوەیەک داین کە هەوڵ دەدات ڕووناکی بخاتە سەر چەمکی ژینگە لە دیدی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، ئێمەش تایبەتمەندین بە یەکلاکردنەوەی ناچوونیەکە فیکرییەکانی نێوان هزرڤانانی سۆسیۆلۆژیای تایبەت بە کاریگەریتی ژینگە لەسەر مرۆڤ لەسەر ژینگە، مرۆڤیش ئەو ڕەگە هاوبەشەیە لەنێوان ئەو چەمک و بۆچوونانە کە دەبێتە هۆکاری زۆر لە دەستێوەردانان وەکو ئەوەی بۆ ژینگە بوو بەهۆی نانەوەی زۆر لەم ئیشکالاتانە، ئەمیش ڕەگەزی دینامیکییە لە هەموو زەمەن و شوێنێک، بەڵام بەرلەمە با هەندێ بۆچوونی خۆمان ڕوون بکەینەوە لە بارەی پێوەندی نێوان مرۆڤ و ژینگە گەر لەشێوەی وێنەکردنی پلانیش دابێت.

## سیستمی ژینگە

هەندێک وایدەبینن چەمکی ژینگە تەنیا دەربڕێنێکی خودان سیمانتیکی فیزیاوییە، بەڵام پێناسی سەراپاگیری فراوانتر دەبێ بۆ ئەوەی لە ژینگە کۆمەڵێک لەو ڕەگەزانەی دەوردەگیرێن یا کاریگەر دەبن بە زیندووەرەکان بگرێتەوە هەروەکو ئەو پێیان کاریگەردەبێ، ڕەگەزە گرنگەکانیش (ئاو و هەوا و زەوی)ن، ئەم سێ ڕەگەزە لەحاڵەتی کارلێککردندا یەکەیەکی ئیکۆلۆژیای جوگرافیای فیزیایی پێک دێنن، بەڵام بە تەنیا ناتوانن جیهانێکی زیندەگانی پێک بێنێ، لەبەر تەواونەبوونی خولی ئەم کارلێکردنە بەهۆی کەمی مەرجی (زیندەگانی) کە ئەم دەورە تەواو دەکات. لەبەرئەوە دەکرێ ئەم ڕەگەزانە بە ڕەگەزی ژینگەیی نەوەکو بایوفیزیکی دابنێین، بەڵام تەنیا بە چوونە پاڵی بوونەوەرە زیندووەکان بۆ ئەو ڕەگەزانە ئەوا دەبێتە جیهانێکی بایوفیزیای یا نەسەقێکی زیندەگیانە کە لەخۆیدا لەسەرجەم یاساکان یا پرنسیپیەکان پێک دێت. بەم شێوە بەبێ بوونی بنەمای سەرەکی تواناى دەبێ. نەسەقێکی ژینگەیی، بنەمای سەرەکیش بۆ هەر نەسەقێکی ژینگەیی دەبێ بە لایەنی زەرووەرەتەوە لە ڕەگەزی زیندەگانی و نا زیندەگانی پێکبێ.

خۆڵ و ئاو و هەواو زۆر کەرەستەی تری وەکو کلۆریدی سۆدیۆم و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن ئەمانە کەرەستەی نازیندەگانێن کاتێ بەشێوەیەکی فیزیاوی دەکەونە دەرەوەی بوونەوەرە زیندووەکان. ئەمەش نوێنەرایەتی بنەمای مادی بۆ نەسەقی ئیکۆلۆژی دەکات، بەڵام تەنیا بە بوونی لەناو بوونەوەری زیندوو ئەوا دەبێتە بەشێک لە جیهانی زیندەگی. هەرچی پێکهێنەرەکانی زیندەگیانەی نەسەقی ژینگەییە ئەوا بوونەوەرە زیندووەکانە جا ئۆرگانیزمی بەرهەمهێنەر بێت وەکو بەکتریا یا ڕووەک کە پێکهاتی ئۆرگانیکی بونیاد دەبێت یاخود بوونەوەرە بەرخۆرەکان دەبن وەکو ئاژەڵانێک کە ماددە ئۆرگانیکییەکان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆی لەلایەن ڕووەک یا بوونەوەرە شیبووەکانی وەکو بەکتریا و فیتریات کە پێکهاتە ئۆرگانیکییەکان شی دەکاتەوە، پێوەندی نێوان ئەم زیندەوەرانە پێوەندییەکی خۆراکی بەیەکداچووە و فۆرمی زنجیرەیەکی خۆراکی وەردەگرێت کە خۆراک لە بەرهەمهێنەرەوە دەگوازێتەوە بۆ بەرخۆر لەچوارچێوەی ئاستی جیاجیا و بەگوێرەی ئەو ژینگەیەی ئەو زیندەوەرانە تیایدا نیشتەجێن.

نەسەقە تەواوەکانی ژینگە سەرجەم پێکهێنەرە سەرەکییەکانی ژینگە دەگرێتەوە لەگەڵ ئەگەری بوونی نەسەقی ئیکۆلۆژی ناتەواو لەکاتی کەمتر لەیەک یا زیاتربوونی لە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی. لە ئەشکەوتەکان تاریکی ئەنگوستەچاو ڕێگەی سەوزبوونی ڕووەکەکان نادات بێگومان ئەم سیستەمە ئیکۆلۆژییە پێویست دەکا پشت بە بەرهەمهێنانی دەرەکی ببەستێ، لەبەرئەوە شەمشەمە کوێرەکان هێلانەکانیان جێ دەهێڵن بۆ گەڕان بەدوای خۆراک. (تانشلی) پێی وایە تێکچڕژانێک لەنێوان هەندێک لە بوونەوەرە زیندووەکان و پێکهێنەرە فیزیکی و کیمیاویەکانی ژینگە هەیە، ئەم پێوەندی تێکچڕژانەش زنجیرەیەک لە پرۆسەی تێکچڕژا و هەڤبەندیان لێ دێتە بەرهەم، کۆمەڵێک لە پێوەندی ناڕاستەیان دەکات، پێوەندی سەبەبی ئاقارەکەیان دیاردەکات و دەبێتە هۆی پێکهێنانی سیستەمێکی وەزیفی کە تیایا بەش و پێکهێنەرە زیندەگانی نازیندەگانییەکان دەبنە عیبارەتێک لە هۆکارەکانی کارلێککردن کە لە حاڵەتی هاوسەنگیبوون بوونی هەیە. لەمیانەی کارلێککردنێکی ئاڵوگۆڕی نێوان ئەو بەشانە ئەوا پاراستنی نەسەقی ژینگەیی لەبوونیدا لێ دەکەوێتەوە، بە گوتەیەکی تر ڕاهاتنی ڕێکخستنی خودی بۆ ئەم نەسەقە پلەیەک لە هاوسەنگی نێوان پێکهێنەرە سەرەکییەکان بە دەست دێنێت، کەواتە نەسەقی ژینگەیی بونیادێکی مکومی ڕێکخراوەوە هەمەکیەکی تەواو پێک دێنێت کە بە بەردەوامی و هاوسەنگ جیادەکرێتەوە، لە ڕاستیدا ئەم سیستمە عیبارەتە لە کۆمەڵێک سیستمی زنجیرەی شێوە بچووک هەریەک لەوانە یەکەیەکی سروشتی پێک دەهێنن کە لە ئەنجامی کارلێککردنی پێکهاتە زیندووەکانی بە پێکهاتە نازیندووەکانی هەریەکێک لەوانە بە نەسەق ناوزەد دەکرێ، ئەم ڕێکخستن و هاوسەنگییە خاسیەتی سیستم یا نەسەق بەم گیانە دەدات ڕەنگە لەسەر شێوەی سیستمی ژینگەیی ببێ ئەم ڕەگەز و پێکهاتانەی بەشێوەی هاوکاری یا

کێبڕکێ تیادا دەژین. ئەمەش واتای ئەوەیە کە پێوەندییە کارلێککەرییەکانی ناو نەسەقی ژینگەیی بە هەردوو شێوەی هاریکاری و کێبڕکێ جا لەنێوان بوونەوەرە زیندووەکان بێت لەلایەک، یان بوونەوەرە زیندووە ڕەگەزە نا زیندووەکان لەلایەکی تر بێت کە زنجیرەیەک لە پرۆسەی تێکچڕژاو هەڤبەند و ئاراستەکراو بە پێوەندی سەبەبی دیاریکراوی لێ دەکەوێتەوە کە تیایدا ڕەگەزی ماددی و نامادی هۆکاری کارلێککردنن لە حاڵەتی هاوسەنگی بۆ پارێزگاری لە بەردەوامی و مانەوەی ئەم هەموو وەزیفییە لە حاڵەتی هاوسەنگی. نموونەی ئەو هەمەکییە پشتبەستووە بە سیستەمی ئیکۆلۆژیا ناودەبرێت. بەم مانایە ئیکۆلۆژیاش چەمکێکی (ئیکۆلۆژییە) نەوەکو چەمکێکی ژینگەیی ڕووت، چونکە ئاماژە دەکات بە توانای بوونەوەرە زیندووەکان لە هاوگونجانیان لەگەڵ ژینگەکە تیایدا. گەر بۆمان کرا ئەم هاوگونجانە یا بە ژینگەکرانە ڕوون بکەینەوە، دەڵێین دەرکەوتنی هەر بوونەوەرێکی زیندوو و نوێ لەنێوەندی ژینگەیەکی دیاریکراو، مسۆگەرکردنی مانەوەی لەم ناوەندە پێویست بە هاوگونجانی بونیاد و فرمان و ڕەفتاری کۆمەڵەیەک لە بوونەوەرە زیندووەکانی تر دەکات کە لە هەمان ناوەند دەژین یان شوێنێک لەگەڵ زەرووڕەت بوونی هاوگونجانی لەگەڵ کۆمەڵێک لە ڕەگەز و کاریگەریەتی سروشتی هەبوو لەم ژینگەیەدا. بە دەربڕینێکی تر لەسەر ئەو بوونەرە نوێیەیە یا دەبێ لەگەڵ ئەو ژینگە هەمەکیەی چواردەوری داوە بگونجێت یا بۆ ژینگەیەکی تر کۆچ بکا یا لەناوی بیات و بە یەکجاری کۆتایی پێ بهێنێت. جا ئەگەر توانای مانەوە و تێکەڵاوبوون و گونجانی هەبوو ئەوا مانای وایە کە تواندارە لە کێبڕکێ و هاوکاری لەگەڵ بوونەرەوەکانی تر لە پێناوی گەیشتن بە پێکهێنەری سەرەکی لەپێناوی مانەوە و بەردەوامییەتی و پێشکەوتنیدا- ڕێکخستنی پێوەندی خۆراکی لەچوارچێوەی هەر سیستەمێکی ئیکۆلۆژی واتای وەرگرتنی وێنەی تۆڕێک دەدا کە ناوی تۆڕی خۆراکی لێ دەنرێ کە لەبەردەم بەرخوردا چانسی زۆری بۆ هەڵبژاردن هەیە کە ئەم تۆڕە هاوسەنگی پێدەدات، لەگەڵ ئەوەش ئەم سیستمە بەردەوامی و هاوسەنگی خۆی دەپارێزێ. لەبەرئەوە هەموو پێوەندییە کارلێککەرییەکان لە ڕێکخراوەی سیستم دانە کە مەحکوم دەبێت بە یاسای هاوسەنگی ناجێگیر، بەمە بۆمان دەردەکەوێ زاراوەی ژینگە ئاماژە بە ژینگەی شارسانی دەدات واتە کۆمەڵێک لەو بوونەوەرە زیندووانەی کە لەژیانکردن بەشداری لەگەڵدا دەکەن، هەروەها ئاماژە بە ژینگەی فیزیکی دەورووبەر دەکا، بەمەش پێوەندییەکانی بوونەوەری زیندوو بە ژینگەکەی بێگومان بە پێویستییەوە پێوەندییەکانی لەگەڵ تاکەکانی تری هاوجۆری خۆیان دەگرێتەوە لەگەڵ جۆرەهای تر کە لە شوێنی نیشتەجێبوون خۆی بەشداری تیا دەکات ئەوەی لە کارلێککردنەوە بەیەکەوە پەیوەست دەبن بۆ لایەنی *تایبەتمەندییە فیزیکییەکانی نیشتمانە.* ئەو کارلێککردنانەی کە لەنێوان تاکەکانی یەکجۆر یا چەندین جۆری جیا سەرهەڵدەدات یان لەنێوان ئەوان و ئەوجێیەی تیایا نیشتەجێن ئەوا سیستمێک بەناوی سیستیمی ئیکۆلۆژی پێک دێنن.

### ئیکۆلۆژیا یان زانستی ژینگە

بەشێوەیەکی گشتی مەبەست لە ئیکۆلۆژیا توێژینەوەی پێوەندییەکانی نێوان بوونەوەری زیندوو و ژینگەکەیانە، لەبەرئەوە دەتوانین ئەم زانستە بە زانستی ئیکۆلۆژیا ناوزەد بکەین. ئیکۆلۆژیا یا زانستی ئیکۆلۆژیا تا ئاستێک زانستێکی نوێیە، بەڵام بەکارهێنانی ئەم زانستە لە ڕووی مێژووییەوە دەگەڕێتەوە بۆ زانای بایلوجی ئەڵمانی (ئەرنست هیگل) ساڵی (١٨٦٩) کاتێ بۆ مەبەستی ئاماژەکردن بۆ پێوەندی بوونەوەر بە ژینگە ئۆرگانیی و نائۆرگانیەکەی بەکاری هێناوە. زۆر کات تێکەڵاویەک لەنێوان زانستی ژینگە و ئیکۆلۆژیا دێتە گۆڕێ، بەڵام وردبینی زانستی داوای جیاکردنەوەی نێوانیانمان لێ دەکات. زانستی ژینگە لە بنەچەدا گرنگی دەدا بە توێژینەوەی ژینگەی سروشتی بە ڕەگەزە ئۆرگانیی و فیزیکییەکانی بێ ڕۆچوونە نێو ئەم پێوەندییە کارلێککەرییانەی کە لە ژیانی هاوبەش دروست دەبن دەدات، هەرچی ئیکۆلۆژیایە ئەوا بایەخدەدا بە لێکۆڵینەوەی پێوەندییە کارلێککەرە بەرهەمهاتووەکانی هاوبەش لە ژیان لەنیشتمانێکی ژینگەیی. لە ڕاستیدا ئیکۆلۆژیا زانستێکی بڵاوە و زۆران لقی مەعریفی لەخۆ دەگرێت کە ناکرێ بەدەستنیشانکراوی کۆنترۆڵ بکرێت بەهۆی بەربڵاوی بایەخەکانی ئەم لقەی مەعریفە و چوونە نێو زۆرترین بازنە مەعریفییە مرۆییەکان مادام گرنگی بە پێوەندی کارلێککەرییەکان دەدات کە لەئەنجامی مومارەسەی بوونەوەری زیندوو بۆ وەزیفەی ژیانی لە ژینگەی هاوبەش دروست دەبێ، کەچی هەندێ لە پسپۆران هەندێ پێشنیاریان بۆ پۆلێنکردنی ئیکۆلۆژیا پێشکەش کرد بۆ ئەوەی حەوت خانەی سەرەکی بگرێتەوە وەک ئەم لەلای کوری (مورتەسەم) ڕوون کراوەتەوە لە هەمان کاتدا بواری بایەخەکانی ئیکۆلۆژیای مرۆیی ڕوون دەکاتەوە. ئیکۆلۆژیا و توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان (ناونیشانی لاوەکی) هەڤبەندی پتەوی نێوان چەمکی ئیکۆلۆژیا بە توێژینەوە بایۆلۆژیەکان ڕوون بووەوە، چونکە ئەو لەبنەچەدا گرنگی بە توێژینەوەی چەندێتی توانای

بوونەوەرە زیندووەکان لە گونجانێکی کارا لەگەڵ ژینگەکەیان دەدات. ئیکۆلۆژیاش بە گوێرەی تێگەیشتنی مۆدێرن تا ئەندازەیەک خوازراوە لە گۆکردنی یونانی (Oikos) کە واتای ئەو خانووە یا شوێنەی کە تیایا دەژین هاتووە.

لە سەرەتای سەدەی بیستەمیشدا ئەم چەمکە گوازرایەوە نێو زانستە کۆمەڵایەتییەکان و لە میانەیا چوارچێوەی توێژینەوە ئیکۆلۆژییەکان فراوان بوو لە بواری پێوەندییە مرۆڤایەتییەکان بۆ ئەوەی بابەت و چەندین کایەی مەعریفی جۆرا و جۆر بگرێتەوە وەکو جوگرافیا و سۆسیۆلۆژیا و دیموگرافیا و سایکۆلۆژیا و ئەنترۆپۆلۆژیا و ئابووری، بەڵام دەرکەوتنی قوتابخانەی ئیکۆلۆژی لە چارەگی دووەمی سەدەی بیستەم ئاراستەیەکی تری فیکری جیاوازی وەرگرت کە گرنگی دەدا بە توێژینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، بەمەش بەشداری کرد لە گەڵاڵەکردنی چەمکی ئیکۆلۆژیا لە کایەی توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا ئەو قوتابخانەیە بایەخی دا بە توێژینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان نەک وەک ئەوەی کۆمەڵێک دیاردە و پرۆسەگەلی کۆمەڵایەتی رووت بن و چارەسەرێکی وەسفی بەتەنیا دەبێ، بەڵکو لێکۆڵینەوەی ئەم دیاردانە لە چوارچێوەی بارودۆخی سروشتی بۆ ژینگەی شار و جەختکردنە سەر پێوەندییە هاریکارییەکانی کە لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگا و داهاتی ژینگەی سروشتیدا هەیە کە لەنێو ئەم کۆمەڵگەیەدا بەدی دەکرێن. هەروەک (رودریک مکزی) کە یەکێکە لە دیارترین دامەزرێنەرانی قوتابخانەی ئیکۆلۆژی ئەوا بەلایەوە ئیکۆلۆژیای مرۆیی گرنگی دەدا بە توێژینەوەی لایەنی شوێنگەیی پەیوەندییە هاریکاریەکانی تایبەت بە بوونەوەری مرۆیی و دەزگا کۆمەڵایەتییەکان ئەو پرنسیپ و رەگەزە شاراوانەی گۆڕانی تەرتیبی شوێنگەیی بۆ دانیشتوان و ئەو دەزگایانە ئاشکرا بکات ئەوەی دەرەنجامی کارلێککردن و بە هەڤبەندی کاریگەریی تێکچرژاوەی بوونەوەرە زیندووەکان لە شارستانیەتدا بەردەوام لە گۆڕاندا دەبێت، لەبەر ئەوە بابەتەکانی رێکخستنی ئیکۆلۆژی و بونیادی ئیکۆلۆژی و ئەوانەی لێوەی دەردەچن لە تەوەر و بایەخە لاوەکییەکان بە گرنگترین و گەورەترینی ئەم سووتانانە دەژمێردرێن کە قوتابخانەی ئیکۆلۆژی لێ دەست پێ دەکات بۆ تێگەیشتنی پرۆسە کۆمەڵایەتییەکان لە نێوەندە شارستانییەتەکان لە هەردوو حاڵەتی جێگیر و گۆڕاندا. گەر هەوڵمان دا بەدوای ریشەی مێژوویی هزری ئیکۆلۆژی لەلای هزرڤانە کۆنەکاندا بچین ئەوا ئەم بایەخانە لە نووسراوەکانی هزرڤانانی وەکو ئەرستۆ و ئەفلاتون و بەتایبەت ئەوەی پێوەندیدارە بە باسکردنی پێوەندی نێوان قەوارەی دانیشتوان و فۆرمی سیستمی سیاسی و جێگیریەتی بەدی دەکەین. بۆچوونەکانی (دورکهایم) لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم لە بارەی (مۆرفۆلۆژیای) کۆمەڵایەتی تەواو بەرامبەر دەبێ لەگەڵ شیکردنەوەی ئیکۆلۆژی بۆ پێوەندی مرۆڤ بە شوێن، ئەمەش لە کاتێکدا کە گرنگی بە توێژینەوەی بنەمای ژینگەیی بۆ رێکخستنی کۆمەڵایەتی و توێژینەوەی دیاردەی دیموگرافی دەدا، نەخاسمە ئەوەی پێوەندیدارە بە قەوارە و چڕی دانیشتوان یا بە دەربڕینێکی تر توێژینەوەی کارلێککردن و ئاڵوگۆڕی کارتێکردنی نێوان دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و بارودۆخی و بزاوتی کۆچی ناوخۆیی و جووڵانەوەی دانیشتووان و دابەشکردنیان و چڕێتییان هەروەکو بزاوتی کۆچکردن خۆی کاردەکاتە سەر ژینگەی سروشتی، بەڵام بەکارهێنانی میتۆدی ئیکۆلۆژی و چەمکەکانی لە بواری پێوەندییە مرۆییەکان روون و دیارنەبوو هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم و لە میانەی توێژینەکەی (چارلس جالین) بەناوی (توێکاری کۆمەڵایەتی بۆ یەکێک لە کۆمەڵگا لۆکاڵییە کشتوکاڵییەکان) کاتێک تیایدا هەوڵی سەلماندنی ئەوەی دا کە هەموو کۆبوونەوەیەکی دانیشتووانی لە ئەنجامی رەخسانی بارودۆخی ئیکۆلۆژی دیاریکراو دەردەکەوێ و جۆرەها چالاکی کۆمەڵایەتی گونجاو و دیار لەگەڵ ئەم بارودۆخە دەگونجێت. کاتێ (رۆبرت بارک) وتارێکی لە (١٩١٥) بلاوکردەوە ئەوە میتۆدی ئیکۆلۆژی جیابوو کاتێ تیایدا دەریخست کە شار دیاردەیەکی سروشتییە بە کاریگەری چەندین فاکتەری سروشتی کە ناتوانرێ کۆنترۆڵ بکرێ دروست دەبێ، هەموو شارێک دابەشی ناوچەی پیشەسازی و بازرگانی دانیشتوان دەبێ هەر یەکێکیان خاسیەت و تایبەتمەندی خۆیان وەکو کۆمەڵایەتی و کولتووری هەیە کە پێیەوە لەوانیتر جیادەبێتەوە. ئەم خاسیەتانەش سروشتێک دەبەخشێتە دانیشتووانەکەی کە سروشتێکی تایبەت دەبێ. هەروەکو خاسیەتی کۆمەڵایەتی و کولتووری چوونیەک بۆ یەک کۆمەڵە وایان لێ دەکات لەیەک ناوچەی دیاریکراوی شاردا کۆببنەوە. (برگس) جەختی کردەوە لە میانەی توێژینەوە هاوشێوەکانی کە دیاردەکانی وەکو تاوان و گەندەڵی و لەبارێک هەڵوەشانەوەی خێزانی و دیاردەکانی رەفتاری لادراو ئەوا لە ناوچە دیارەکان سەرهەڵ دەدەن بە تایبەت لە ناوچە دواکەوتووەکان. لەگەڵ ئەم توێژینەوانەشدا بە راشکاوی چەمکی ئیکۆلۆژی بەکارنەبراوە تەنیا لەو کتێبەی کە هەریەکە لە (بارک و برگس) لەژێر ناوی (سەرەتایەک بۆ سۆسیۆلۆژیا) کە لە (١٩٢١) نووسیویانە نەبێ. چارەگی دووەمی سەدەی بیستەم دەرکەوتنی قوتابخانەی

ئیکۆلۆژی بە ئاراستەیەکی فیکری تری جیا بەخۆیەوە بینی کە گرنگی بە چارەسەرکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەدا. لە ساڵی (١٩٣٠) تەنیا وەسفکردنی دیاردە مرۆییەکان لەسەر ئاستی شوێن بەس نەبوو بۆ ئەوەی ئەم توێژینەوە ببێتە توێژینەوەیەکی ئیکۆلۆژی و ڕووت. هەروەکو جەخت کرایە سەر جیاکردنەوە لەنێوان کارلێککردنی (ئیکۆلۆژی) بەمانای دیاریکراوی و کارلێککردنی کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی گشتی ئەمەش یارمەتی ڕوونکردنەوەی هێڵی فیکری بۆ قوتابخانەی ئیکۆلۆژی لە سۆسیۆلۆژیا دا. بەسەرکردایەتی قوتابخانەی شیکاگۆ پێشکەوتنی فیکری لە دوای یەک لە بواری توێژینەوە ئیکۆلۆژییەکان داهات کە بە ئاراستەی دیراسەکردنی دیاردەکانی لەت لەت بوونی کۆمەڵایەتی و میکانیزمی تەواوکاری لەو شارانەی کە ڕووبەڕووی گەشەی خێرا دەبوونەوە ناسرا لەگەڵ ئەوەی ئەم قوتابخانەیە بێبەش نەبوو لەناوچوونیەکی هزری لەنێوان هزرڤانەکانی. گەر بەشداریکردنەکانی (پارک) لە هزری ئیکۆلۆژی لەسەر لایەنی ژیاندۆستی دابنرێت، ئەوا شرۆڤەکانی (برگس) جەخت دەکاتە سەر لایەنەکانی ماددی و ڕاڤەکردنی چەشنەکانی بەکارهێنانی زەوی، شرۆڤەکانی (مکنزی)یە لەژێر کاریگەری ڕێچکەی ئابووری دابوو نەخاسمە ئەو نووسینەی لە کتێبەکەی لەسەر هاوسێکان و ناچوونیەکی بەهای زەوی لەنێوان ناوچە جیاوازەکانی بەهۆی کاریگەری هۆکاری کێبڕکێ نووسی. ئەمە لە کاتێکدا کە (ئامۆس هارلی) هەوڵی دا فەرامۆشی جیاوازی نێوان کارلێکی ئیکۆلۆژی و کارلێکی ژینگەیی بکات لەو نووسینانەی پێشکەشی کرد کە جەختی کردە سەر گرنگی و بایەخی پێوەندی بەخێوکردن و بەیەکەوە ژیان. ئەم ڕەخنە میتۆدییانەی قوتابخانەی (متشیگان) ئاراستەی قوتابخانەی (شیکاگۆ)ی کرد بووە هۆی ڕاستکردنەوەی زۆر لە میتۆدەکانی توێژینەوەی ئیکۆلۆژی، ئەنجامەکەیشی بریتی بوو لە دەرکەوتنی زۆر لە ئاراستەی تیۆری کە بواری چوونە نێو ناوەرۆکەکەیان بە درێژی نییە. گۆڕەپانی خۆرئاوا دوورنەبوو لەم پێشکەوتنە هزریانە، بەڵام ئەوەی گۆڕەپانی خۆرئاوا جیادەکاتەوە نەخاسمە لە کۆتاییەکانی سەدەی ئێستامان (٢٠)ەم بریتی بوو لەو ململانێ هزرییە ڕادیکاڵی و میانڕەوییانەی نێوان هاوڕێبازانی میتۆدی مارکسی نوێ کە لەناوەڕۆکدا جەخت دەکاتە سەر هەوڵدانی ئەم مارکسییانە وەکو (ئالبیار و ئەلتۆسێر و لیفی شتراوس و مانویل کاستلر) بە پشت بەستن بەهزری (سروشتی گۆڕاو بۆ ململانێ) بۆ شیکردنەوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی، بەڵام لە هەمان کاتدا میانڕەوەکان هەوڵی سووڕانەوەیان لەفکری مارکسی و دابەشکردنی پێکهاتە سەرەکییەکانی لەململانێی کۆمەڵایەتی دەدا لەمیانەی بڵاوبوونەوەی ڕۆڵی شوێن و جەختکردنی ململانێ شارستانیەتەکان و سەربەستی لە فۆرمەکانی تری ململانێ وەکو لە توێژینەوەکانی (جۆن ریکسیس و روبرت مۆر) دەردەکەوێ.

### لقەکانی ئیکۆلۆژیای مرۆیی

دەکرێ کایەکانی مەعریفەی فیکریی لە بواری ئیکۆلۆژیای مرۆیی بۆ ئەمانەی خوارەوە پۆلێن بکەین.

١- ئیکۆلۆژیای مرۆیی سروشتی.

٢- ئیکۆلۆژیای مرۆیی کۆمەڵایەتی.

کایەی یەکەم گرنگی دەدات بە توێژینەوەی پێوەندییەکان لەنێوان سیفەتە بایۆلۆژییەکانی مرۆڤ و ژینگەی سروشتی لەمیانەی چوونی بەرەو توێژینەوەی ئەو پێشکەوتنە ئۆرگانیکییانەی کە ڕەگەزی مرۆیی لە سەدەکانی بەر لە مێژوو پێیدا تێپەڕیون، بە توێژینەوەی بۆ هەرێمایەتی و گەیشتن بە باسکردنێکی تەواو بۆ گونجانی گرووپەکان لە ژینگە لۆکاڵییەکەیان و خاسیەتە ئۆرگانیکییەکانی جەستەی بوونەوەری مرۆیی و پێوەندی هەموو ئەمە بە ژینگەی سروشتی بەخۆیەوە بینی. لێرەدا بابەتەکانی خۆ گونجان و خۆ ڕێککردن و خۆڕاهێنان و بنەمای ژینگە بۆ زەوی و کەنارەکانی فۆرمی سەرەکی تەوەرەکانی ئەم کایەیە پێک دێن. ئەم لقەش چەندان لقی تری لێ دەبێتەوە و لە گرنگترینیان (ئەنسرۆپۆلۆژیای سروشتی و ئیکۆلۆژیای سروشتی)، هەرچی کایەی ئیکۆلۆژیای مرۆیی کۆمەڵایەتییە ئەوا گرنگییەکەی دەدوەستێتە سەر توێژینەوەی پێوەندییە کۆمەڵایەتییە تێکچڕژاوەکانی نێوان ژینگەی سروشتی لەلایەک و دانیشتووان و تەکنەلۆژیا و کۆمەڵگە لەلایەکی تر. ئەم کایە مەعریفییە بۆ دوو لقی سەرەکی دابەش دەبێ لەوانە (ئیکۆلۆژیای ئەنسرۆبۆلۆژی) و (ئیکۆلۆژیای کۆمەڵایەتی) ئەوەی کە ئاماژەمان بۆ کرد ئەوەی لە زانکۆی شیکاگۆ پێگەیەنرا دوا بەدوای یەکدا هاتنی چەندین توێژینەوە کە جولان دانیشتووان و شوێنی تاکەکانی کۆمەڵەکانی کردە ئامانجی خۆی، هەروەها دیاردە و پرۆسە ئیکۆلۆژییەکانی لەشار بە جیاوازی وێنە و لەگەڵ فۆرمەکانیان وەکو گلۆربوونەوە و دوورکەوتنەوە و دابڕان و بەرانبەرکێ و بەدوای یەک داهاتن و هاوکاری و ململانێ بۆ توێژینەوە وەرگرتبوو تا شار بەڕای ئەم زانایە (روبرت پارک) بوو بەکاریگەریەک بۆ لێ توێژینەوەی ڕەفتاری مرۆیی بە گوێرەی بۆچوونی زانای ناوبراو. بە گشتی دەتوانین بوارە گرنگەکانی ئیکۆلۆژیای مرۆیی بەم شێوە کورت بکەینەوە.

أ- توێژینەوەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی کە خۆی لە

دابەشبوونی نیشتەجێبووەکان بۆ هاوڵاتیان (یا دانیشتووان) و دەزگاکان لە ناوچە سنووردارەکان بەشێوەیەکی تر لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی لۆکاڵی یا کۆمەڵەیەک لە کۆمەڵگە لۆکاڵییەکان دەبینێتەوە.

ب- توێژینەوەی هەژموونی ئیکۆلۆژی کە خۆی لە هەر لایەکی دینامیکی و وەزیفی بۆ پێوەندییە شوێنییەکان دەبینێتەوە.

ج- دیاردەی بەدواداچوون بەدوای یەک داهاتن کە گۆڕانە زەمەنییەکانی کۆمەڵگەی لوکاڵی وەسف دەکات.

دەتوانین بەگشتی بایەخەکانی ئیکۆلۆژیای مرۆیی کۆمەڵایەتی لە توێژینەوەی پێوەندییەکانی نێوان مرۆڤ و ژینگەکەی وەستانی لەسەر ئاستی کارلێکردنی لەگەڵ ڕەگەزەکانی ژینگە و ئاڵوگۆڕی کاریگەریەتی لەنێوان مرۆڤ و ژینگەکەی کۆبکەینەوە. ئەم کارلێکردنەش دەرکەوتنی چەشنەکان و شێوازەکانی هزر و کاری مرۆیی بۆ قۆستنەوەی سروشت و پاشان توێژینەوە لە چاوکردنی ئەو شێوازانە و پێشخستنیان دەگرێتە خۆ. دەکرێ توێژینەوەی پێوەندییە ئیکۆلۆژییەکان لە دوو ڕووەوە وەربگرین؛ یەکەمیان توێژینەوەیەکی وەسفی کۆمەڵایەتی و وێناکردنی وەکو خۆی لەکاتێکی دیار، ڕووی دووەمی توێژینەوەیەکی دینامیکی بەدواییەکدا هاتووە پەیوەستە بە ژیانی کۆمەڵایەتی لەگۆڕانی نێوان زەمەنێک و یەکێکی تر و ئەوەی لەم گۆڕانە دەکەوێتەوە لە بونیادی کۆمەڵایەتی و وەزیفییەکانی بەدرێژایی زەمەن. ئیکۆلۆژیا تەنیا گرنگی بە توێژینەوەی بەرسڤی ژینگە یا ئەو پەرچە کردانەی کە دەرەنجامی لێکخشاندنی کارلێکردن لەگەڵ ژینگەیە نادات، بەڵکو سەرەڕای ئەوە گرنگی دەدات بە دابەشبوونی پێکهاتە وەزیفە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ توێژینەوەیەکی پێوەندییە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکانی کە لە نێوان ئەندامانی یەک کۆمەڵە سەرهەڵدەدەن، هەروەها لەنێوان گرووپی جیا، لەگەڵ جەختکردنە سەر سروشت و گرنگیدان بە دابونەریت لە کۆنترۆڵی ڕەفتاری تاکی کۆمەڵایەتی.

## ئیشکالیەتی ڕێکخستن و بونیادی (کۆمەڵایەتی و ئیکۆلۆژی)

دیالکتیکی بەردەوامی نێوان زانایانی ئیکۆلۆژی سەبارەت بە جیاوازی نێوان سیستەمی ئیکۆلۆژی و سەراپای سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان یا دانانی وەکو سیستمێکی لاوەکی لەم سیستمانەی بوونەتە سەنتەر لەنێوان چەمکی کۆمەڵایەتی و ئیکۆلۆژییەکانی تر ئەمەش هەر لەبەربوونی هەندێک ڕوانگەی تیۆری لەسەر بیرۆکەی جیاوازی نێوان کارلێککردنی ئیکۆلۆژی و کارلێککردنی کۆمەڵایەتی لەلایەک و درێژکردنەوەی کاریگەریەتی لەسەر چەمکەکانی تر لە بواری ئیکۆلۆژی گرنگترین بابەتێک کە پێویستە یەکلایی بکرێتەوە بەر لەچوونە نێو تێگەیشتنی چوارچێوە ئیکۆلۆژییەکان بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ مرۆڤ ئەویش جیاکردنەوەی نێوان چەمکەکان ڕێکخستنی و بونیادە لە هەردوولایەنی ئیکۆلۆژی و کۆمەڵایەتی. ئەگەر ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی تێرمێکی ئاماژە بۆ چەشنێکی جێگیری ڕێژەیی لە دابەشکردنی کۆمەڵایەتی و چالاکییە جیاجیاکان لەناو کۆمەڵگە یا لە گرووپ» ئەوا ڕێکخستنی ئیکۆلۆژی تێرمێکە ئاماژە بۆ دابەشکردنی بوونەوەرە زیندووەکان و واقیعی شوێنی دەکات لە چوارچێوەی ناوچە یا شوێنێکی دیار لە ئەنجامی هەوڵ بۆ وەدیهێنانی داخوازییە فسیۆلۆژییەکان. بە دەربڕینێکی تر ئەوا ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی ئاماژە بۆ ئەو شێوازانە دەکات کە ڕێکخستنی یا بەرزەفتکردنی ڕەفتار، دەتوانرێ تێبینی بکرێ کە ئەم ڕێکخستنە دەوەستێتە سەر بارودۆخی کۆمەڵایەتی کە تاکەکان لەژێر سایەیدا دەژین، بەڵام ڕێکخستنی ئیکۆلۆژی دەرئەنجامێکی کۆتایی کارلێککردنی ژمارەیەک لە خاسیەتی شوێن و هێزی ئابووری و کولتوورییە کە لە شوێنێکی دیار چالاک دەبێ و دەدرێتە دەست کیان و کۆبوونەوەکان و ڕەفتارییەکان بەم شێوە کۆمەڵگەیەکی لۆکاڵی جیا دەکاتەوە لە یەکێکی تر. لێرەدا دەردەکەوێ کە ڕەگەزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی جیاوازن لە ڕەگەزەکانی ڕێکخستنی ئیکۆلۆژی، لە کاتێکدا ڕەگەزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی ڕەگەزی کۆمەڵایەتی ڕووتن لە دابینکردنی پێوەندی کۆمەڵایەتی لەنێوان ژمارەیەکی زۆری تاکەکان و دابینکردنی باوەڕی هاوبەشەکیان پێ دەگرێ و ڕەفتاریان یەک دەخا. ڕەگەزەکانی ڕێکخستنی ئیکۆلۆژی ڕەگەزی نیمچە سۆسیۆئیکۆلۆژین واتە لەسەر دوو ستوون هەڵدەکەوێ یەکێکیان کۆمەڵایەتی ڕووت و ئەویتریان نیمچە کۆمەڵایەتییە، گومانی ناوێ ڕێکخستنی ئیکۆلۆژی بەردەوام، دۆخێکی جێگر و چەسپاو نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دۆخێکی تەواو پڕ جێگیر نییە واتە ئەم ملکەچی کاریگەرێتی کات و شوێنە. بەمانایەکی تر ئێمە ناتوانین هەر فۆرمێک لە فۆرمەکانی ڕێکخستنی ئیکۆلۆژی بخوێنینەوە تەنیا لە چوارچێوەی شوێن (ئیکۆلۆژی) و لەنێو ڕەهەندی کاتدا (ئیکۆلۆژی) نەبێ. لەبەر ئەوە ڕێکخستنی ئیکۆلۆژی بارێکی وەستاو و جێگیری نییە، بەڵکو ملکەچە بۆ هەردوو فاکتەری کات و شوێن، ئەوا چەمکی بونیادی ئیکۆلۆژی زیاتر دەربڕینە لە حاڵەتی وەستاو و جێگیر لە ماوەیەکی دیاریکراو. بۆ ئەوەی بابەتێکی تێکچڕژاو لەنێوان هەردوو چەمکی بونیادی کۆمەڵایەتی و بونیادی ئیکۆلۆژی

یەکلابکەینەوە، بێگومان لە پێشەکی دەبێ بڕیاری ئەوە بدەین بونیادی کۆمەڵایەتی ئاماژە بۆ تۆڕی ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییانە دەکات کە لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵگەدا هەیە، لەوکاتەی چەمکی بونیادی ئیکۆلۆژی ئاماژە بۆ ئەو پێوەندی و هەڤبەندییە کۆمەڵایەتییانە دەکات کە لە ئەنجامی کارلێککردنی شوێن دەکەویتەوە. واتە ئەمە ڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییانە دەکات کە لە کارلێکردنی نێوان مرۆڤ و شوێن سەرهەڵدەدەن واتە (پێوەندییە کۆمەڵایەتی و ئیکۆلۆژییەکان) بونیادی ئیکۆلۆژی ئەم وێنەیەیە کە کۆمەڵگە تیایا لەمیانەی هەڤبەندی چەشنەکانی چالاکی و چالاکییە مرۆییەکان و دابەشکردنە چەشنییەکانی ئەم چالاکییانە دەینوێنێ. بە دەربڕینێکی ورد بونیادی ئیکۆلۆژی جگە لە ڕێکخستنی دووبارە بووەوەیە بۆ چالاکی و ئەکتیڤە مرۆییەکان وەکو (ئەکتیڤی دانیشتوان، کار، خۆشی) هیچی تر نییە، بەم ڕێکخستنە دووبارەبووەوەی سیفەتی فۆرمەکانی وەرگرت کە لەلایەن خۆیەوە تا ئەندازەیەکی گەورە ئەمەی پێچەوانە کردەوە لە ڕێکخستنە دووبارەبووەوەکەی بۆ بەکارهێنانی پراوپڕی شوێن. کەواتە بونیادی ئیکۆلۆژی ئاماژە بە ڕێکخستنی یەکەکانی زەوی و دانیشتووان و چالاکییەکانی تر لەکیانێک کە دەتوانرێ بە ڕوونی دیاریکرێ ئەدا لەمیانەی کارلێکردن باوی نێوان دانیشتووان خۆیان و لەنێو ئەم ناوچانەی تیایا ئەژین، زۆر کات چەمکی بونیادی ئیکۆلۆژی هاو واتای چەمکی بونیادی شوێن دەکات، بەڵام جیاوازی نێوانیان کە خۆی لە بونیادی شوێن بەدی دەکات ئاماژە بۆ سیستەمەکانی بەکارهێنانی زەوی دەکا وەکو ئەوەی بەرچاوە، لە هەمان کات چەمکی بونیادی ئیکۆلۆژی بە واتای هەموو ڕێکخستنە شوێنی و ڕەفتارییەکان دەکا بە هەر دوو شێوە دیار و شاراوەکەی.

**سەرچاوەکان:**


١- د. قيس النوري، طبيعة المجتمع البشري، ج١، مطبعة الاداب، النجف الاشرف، (١٩٧٠)، ص٢٣٣.

٢- ب. ف سكيز، تكنلوجيا السلوك الانساني، سلسلة عالم المعرفة، ت. د. عبدالقادر يوسف و محمد رجاالدريني، المجلس الوطني للثقافة والفنون والاداب، الكويت، ١٩٨٠، ص١٩.

٣- مصطفى كمال طلبه، انقاذ كوكبنا، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت (١٩٩٥)، ص٣٣-٤٤.

٤- د. احمد الخشاب، التفكير الاجتماعي، دارالنهضة العربية، بيروت، (١٩٨١)، ص٤٢٦، انظر.

Barnes. H. E introduction to the history of Society. The univarsity chicago press, chicago, 1948, p. 48.

٥- السيد عبدالعاطي السيد، الانسان والبيئة، دارالمعرفة الجامعية، الاسكندرية، (١٩٩٨)، ص١٢٨.

٦-زاهد روسان، السببية والحتمية عند ابن خلدون، المجلة العربية للعلوم الانسانية، عدد ٣٧، مجلد. ١٠، (١٩٩٠)- ص٩٨-٩٩.

٧- د. السيد عبدالعاطي السيد، المصدر السابق، ص٣٣.

٨- نيقولا تماشيف، نظرية علم الاجتماع، طبيعتها و تطورها، ت/ محمود عودة واخرين، دارالمعرفة الجامعة، الاسكندرية، (١٩٩٠)، ص٢٥.

٩- رشيد أحمد و محمد سعيد العباريني، البيئة و مشكلاتها، سلسلة عالم المعرفة، المجلس الوطني للثقافة و الفنون و الاداب الكويت (١٩٧٩)، ص٢٥.

١٠-د. طارق أحمد محمود، علم و تكنلوجيا البيئة، مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٨، ص١٢.

11- A. G. Tansley, Introduction to the Plan ecology, London-1946. P.207.

١٢- السيد عبدالعاطي السيد، ص١٩.

١٣- المصدر نفسه، ص٤.

١٤- رشيد الحمد محمد سعيد العباريني، المصدر السابق، ص٧٢.

15-The New Eneyclopedia Britanica, Vol.6, London, P. 197

١٦- شارلس هەرس و ثويك (علم البيئة و نوعية بيئتنا)، ت نجيب صالح و زملائه، مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٤، ص٢٠٤.

١٧- د. احمد ابوزيد، ازمة البيئة، مجلة عالم الفكر، المجلد السابع، العدد الرابع، ١٩٧٧، ص٢٥.

18- G. Gurvitch and w. Moore, (Twentieth Centary Sociology)ed The Philofophical library, New York.1945, P468.

19- Quiny, James, A., (urban Sociology) American book Co-New York, 1955. PP.157-162.

# چەشنی کەسایەتی و پێوەندی بە نەخۆشییە دەروونییەکان و توانای بڕیاردان

د. ڕێزان عەلی ئیبراهیم
(کۆلێژی پەروەردە زانکۆی سەلاحەدین)

زانایانی دەروونزانی کەسایەتی گرنگیان دا بەلێکۆڵینەوەی (نەریت) وەک بچووکترین یەکەی دروستبوونی کەسایەتی، بۆ دروستکردنی زاراوەکانیان بەتایبەتی ئەوەی تایبەتمەندە بەو پێوەندییەی کە لەنێوان کەسایەتی و هەڵسوکەوت دایە.

دواتر بەیەکەی دروستبوونی گەورەتر کە (سیما)یە وە کە بە هۆیەوە دەتوانرێ کەسێک لەهی تر جیا بکرێتەوە، وە ناسینی (سیما)و دیاریکردنی یارمەتیمان دەدات بۆ پێشبینیکردنی دوارۆژی مرۆڤ وەچۆن بەرەنگاری هەڵوێستی جۆراوجۆر دەبێت لە ژیانیدا بە ئامانجی گەیشتن بەیەکەی دروستبوونی گەورەتر کە ئەویش (چەشن)ی کەسایەتییە.

لەو ڕێگایانەی کە زانایان پشتیان پێوە بەستبوو لە لێکۆڵینەوەکانیاندا لەم بوارەدا هەڵبژاردنی گۆڕاوێک یان فاکتەرێک یان سیفەتێک یان چەشنێک وە پۆلینکردنی تاک بەپێی ئەمەوە بۆ گەیشتن و جێبەجێکردنی یەک لە ئامانجە هەرە گرنگەکانی لێکۆڵینەوە لە کەسایەتی، ئەویش دۆزینەوەی ئەو هۆیانەی کەوا لە کەسان دەکات کە جیاواز بن لەگەڵ یەکتردا لە ڕووی هەڵسوکەوت و ڕەوشتیان کاتێک کە دووچاری هەمان ڕووداو و هەڵوێست دەبن.

زانایان خەڵکان پۆلێن دەکەن بۆ چەند چەشنێکی زۆر لە کەسایەتی لەوانە جەستەیی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و مەزاجی (هیبوقراط) خەڵکانی پۆلێن کرد بۆ چوارچەشن کە خوێناوی و زەرداوی و ڕەشبین و لیمفاوی بوو. دواتر پۆلینکردنی (کرتشمر)هات کە جەختی کردە سەر سیمای جەستەیی و (یونگ) کە جەختی کردە سەر (ئەرکەکانی ئەقڵ) (الوظائف العقلیة)وە لەوانەیە کەسان دوورە پەرێز بن یان کۆمەڵایەتی بن (منبسط). و (توماس و زنیانسکی) کە جەختیان کردە سەر هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان کارلێکی کۆمەڵایەتی کە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە دروستبوونی کەسایەتی مرۆڤ.

ئەو ڕێگایەی کە زانایان (فریدمان و روزنمان) هێنایانە کایەوە لە شەستەکاندا بەهۆیەوە خەڵکیان دابەش کرد بۆ دووچەشنی بنەڕەتی کە ئەویش چەشنی کەسایەتی (A) و چەشنی کەسایەتی (B) بوو بەیەکێ لە گرنگترین ڕێگاکانی لێکۆڵینەوە دادەنرێت لە بواری کەسایەتی. گەیشتن بەوە کە کەسایەتی خەڵکان یان هەڵسوکەوتیان دوو چەشنی جیاوازی لێ بەدەردەکەوێت ئەویش چەشنی (A) و چەشنی (B) بوو، وە گرنگترین سیمای چەشنی کەسایەتی (A) ئەوەیە کە ئەو کەسە طموحێکی بەهێز و پاڵنەری پێشبڕکێیەتی هەیە، وەگرنگییەکی زۆر بەکات دەدات وە زۆر بەئاسانی دەورووژێنرێت. کەسان لەم چەشنەدا بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن کە بن بەکەسانێکی تەواو (کامل) وە پێشبڕکێ لەگەڵ کاتدا دەکەن وە لەیەک

کاتدا بەچەند جۆرە کارێک هەڵدەستن، ئەو کەسانەی لەم چەشنەدان لەوانەیە سەیری T.V بکات و قسە بە تەلەفۆن بکات راپۆرتێک بنووسێت نان بخوات وە هەمووی لەیەک کاتدا. خەڵکان بەپەلە دێخن لە قسەکردندا وەخۆشیان بەپەلەن لە قسەکردندا بۆچوونیان شەڕانگێزییە بەرامبەر خەڵکانی تر، ئامانجیان لەژیاندا پارەوپوولێکی زۆریان دەست کەوێت چالاکترین و برادەریان زۆرتر بێت. حوکم لەسەر سەرکەوتن و دەستکەوت بە چەندجار رووداني و جێبەجێکردنی دەدەن لە جیاتی جۆری ئەو کارانەی کە سەرکەوتنیان تیادا هێناوە.

بەڵام ئەو کەسەی کە لە چەشنی کەسایەتی (B)دایە بەشێوەیەکی کەمتر گرنگی بە کات دەدات، توانای کۆنترۆڵکردنی خودی خۆی زیاترە لە چەشنی پێشوو لەکاتی مامەڵەکردنی لەگەڵ دەوروبەریدا. وە کات دیاری دەکات بۆ حەسانەوەی بەبێ ئەوەی هەست بە گوناهی بکات (دون الشعور بالذنب)، کەسایەتییەکی هاوسەنگی هەیە، وە لەگەڵ ئەوەشدا کە کەسایەتی چەشنی (A) زوو و بەخێرایی دەگەنە پایەی بەرز لەکارەکانیاندا، بەڵام خەڵکان لە چەشنی کەسایەتی (B) بە تواناتر دادەنرێن لە هەڵسوکەوتکردنیان لەم ئاستانەدا.

بەڵام دەمارگیری لە نەخۆشییە دەروونییە بڵاوەکانە لەلایەن زۆربەی زۆری تاکەکانی کۆمەڵ بەرێژەیەکی ئاسایی، کە کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر کارە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانیانەوە، وە دەمارگیری بریتییە لە شڵەژانی فرمانی کەسایەتی کە کاریگەری هەیە لەسەر هاوسەنگی هەڵچوونەکانی کەس و دڵخۆشبوون و چەندی رازیبوونی لە ژیانی بەشێوەیەکی گشتی. ژیان بە هەموو قۆناغەکانییەوە وا لەکەسان دەکات کە پێویستی بەبریاردان بێت، و پرۆسەی بریاردان لە ساڵانی زووی تەمەنی تاک دەست پێ دەکات، وەبریاردان دەگۆرێت لەهی ئاسانەوە کە پێویستی بەبیرکردنەوەیەکی قووڵ و ماندووبوونێکی زۆری نییە بۆ بریاردانی چارەنووسی کە کاریگەرییەکی زۆر لە دوارۆژی تاک دەکات کە هەندێ جار دەگاتە هەڕەشەکردنی خۆی و کەسانی دەوروبەری و ئەوانەی لێی نزیکن. لەوانەیە بریار لەژێر بار و هۆکار و هەندێ کاریگەری تر بدرێت کە گرنگترینیان هۆکارە دەروونییەکان و پێکهاتەی دەروونی ئەوکەسەی کە بریار دەدات واتە کەسایەتی بریاردەر. بۆیە توێژەر هەوڵی داوە لەم لێکۆڵینەوەیەدا کاریگەری سیمای کەسایەتی (A) لە کەسایەتی (B) لە دەرکەوتنی نەخۆشییە دەروونییەکان و پێوەندی بە توانستی بریاردان بزانێت، ئەمە لەلایەکەوەو پێوەندی نەخۆشییە دەروونییەکان بەتوانستی تاک (قوتابی زانکۆ) لەسەر بریاردان دیاری بکات لەلایەکی ترەوە.

**ئامانجەکانی توێژینەوەکە بریتییە لە:**

١- دروستکردنی پێوەرێک بۆ جۆری کەسایەتی (A-B) لەلایەن قوتابی زانکۆدا.

٢- زانینی ئاستی جۆرەکانی کەسایەتی (A-B) وە ئاستی نەخۆشییە درووییەکان و توانستی بریاردان لەلایەن قوتابی زانکۆدا.

٣- زانینی سروشتی پێوەندی نێوان جۆرەکانی کەسایەتی (A-B) لەگەڵ هەر نیشانەیەک لە نیشانەکانی نەخۆشییە دەروونییەکان لەلایەن قوتابی زانکۆدا.

٤- زانینی سروشتی پێوەندی نێوان جۆرەکانی کەسایەتی (A-B) و توانستی بریاردان.

٥- زانینی سروشتی هەر نیشانەیەک لە نیشانەکانی نەخۆشییە دەروونییەکان و توانستی بریاردان لەلایەن قوتابی زانکۆدا.

٦- زانینی جیاوازی لەنێوان جۆرەکانی کەسایەتی (A-B) و نەخۆشییە دەروونییەکان و توانستی بریاردان بەپێی گۆڕاوی (ڕەگەز- پسپۆری)

٧- زانینی چەندی بەشداربوونی سیمای جۆرەکانی کەسایەتی (A-B) لە گۆڕینی نیشانەکانی نەخۆشییە دەروونییەکان و توانستی بریارداندا.

ژمارەی نموونەی توێژینەوەکە (٥٠٠) قوتابی کوڕ و کچ بوون کە بەشێوەیەکی ڕەمەکی (عشوائي) لە بەشەکانی کۆلیژەکانی زانکۆی سەلاحەددین بۆ ساڵی خوێندنی (٢٠٠٣-٢٠٠٤) هەڵبژێردرابوون. وە بەپێی ئەدەبیات و لێکۆڵینەوەو پێوەرەکانی پێشوو پێوانەیەک بۆ جۆری کەسایەتی (A-B) دروست کرا. وەتایبەتمەندییە سایکۆمەترییەکان بۆ پێوارەکانی تایبەت بە توێژینەوەی ئێستا دەرکرا کە بریتییە لە (پێوەری جۆرەکانی کەسایەتی (A-B)، پێوەری کراون- کرسب بۆ نەخۆشییە دەروونییەکان، پێوەری توانستی بریاردان) وە دوای وەرگێرانی هەرسێ پێوەرەکە لە زمانی عەرەبییەوە بۆ زمانی کوردی وە دەرهێنانی (ڕاستی وەرگێران) بۆ پێوەرەکان، ئەنجام دراوە بەهەردوو زمانی عەرەبی و کوردی لەسەر نموونەی توێژینەوەکە لە قوتابیانی ساڵی چوارەم کە بەپێی ڕەگەز و پسپۆرایەتی دابەش کران.

وە بۆ دەرهێنانی ئاکامی توێژینەوەکە ئەمانەی خوارەوە بەکارهات:

(چوارگۆشەی کای) هاوکۆڵکەی پەیوەندی پێرسون، هاوکێشەی سبرمان- براون، لادانی پێوەری، پێوەری تائی بۆ یەک نموونە، وەپێوەری تائی بۆ دوو نموونەی سەربەخۆ، رێژەی فائی، جۆراوجۆری بەرەبەرە) لە ئەنجامدا توێژەر بەم ئەنجامانەی خوارەوە گەیشت:

١- ئامادەکردنی پێوەرێک بۆ دیاریکردنی هەردوو جۆری کەسایەتی وەشێوە کۆتاییەکەی پێوەرەکە لە (٥٤) برگە پێک هاتبوو وەبۆ هەر برگەیەک چوار لە بری دانراوی هەبوو بۆ وەڵامدانەوە.

٢- ئەنجامەکان دەریخست ئارەزووی تاکەکانی توێژینەوەکە و نزیکبوونەوەیان لە جۆری کەسایەتی (A) بە هۆوەرگرتنی ژمارەیەکی بەرز لەسەر پێوەرەکە، چونکە ژمارەی بەرز ئاماژە بەجۆری یەکەم (A) دەکات، بەڵام ژمارەی نزم ئاماژە بەجۆری دووەم دەکات کە (B) بوو.

٣- ئەندامانی توێژینەوەکە (نموونەکە) ئاستێکی ناوەندییان لەسەر پێوانەی نەخۆشییە دەروونییەکان تۆمار کرد، وە ئاستێکی نزمیان لەسەر پێوەری توانستی بریاردان تۆمارکرد. واتە نیشانەکانی نەخۆشی دەروونییان تیادایە، بەڵام بە ئاستێکی ناوەندی وە هەروەها توانستیان بۆ بریاردان نزمە یان کەمە.

٤- بوونی پێوەندی لە نێوان جۆرەکانی کەسایەتی (A-B) وە هەر نیشانەیەک لە نیشانەکانی نەخۆشییە دەروونییەکانی پیشان دا.

٥- بوونی پێوەندی لەنێوان جۆرەکانی کەسایەتی (A-B) و توانستی بریاردانی پیشان دا.

٦- بوونی پێوەندی لەنێوان هەر نیشانەیەک لە نیشانەکانی نەخۆشییە دەروونییەکان و توانستی بریاردان جگە لە (نیشانەی سەپێندراو) کە پێوەندی لەگەڵ توانستی بریاردان دال نەبوو.

٧- نەبوونی جیاوازی ژمێریاری (احصائیة دالة) دال لەنێوان هەردوو رەگەز لە جۆرەکانی کەسایەتی (A-B) پیشان دا.

٨- بوونی جیاوازی ژمێریاری لەنێوان نێر و مێ لە نەخۆشییە دەروونییەکان وەبۆ بەرژەوەندی رەگەزی مێ بەدیارخست، واتە مێ زیاتر دووچاری نەخۆشییە دەروونییەکان دەبێت.

٩- نەبوونی جیاوازی ژمێریاری لەجۆرەکانی (A-B) بەپێی گۆڕاوی پسپۆری لە خوێندن پیشان دا.

١٠- نەبوونی جیاوازی ژمێریاری لە نەخۆشییە دەروونییەکان بەپێی گۆڕاوی پسپۆری دادەستەوە.

١١- نەبوونی جیاوازی ژمێریاری لە توانستی بریاردان بەپێی گۆڕاوی پسپۆری خوێندن بەدیارکەوت.

١٢- بەشداربوونی سیمای جۆرەکانی کەسایەتی (صفات أو خصائص أنماط الشخصیة) لە دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشییە دەروونییەکان وە بەم شێوەیەی خوارەوە پیشاندا:

أ- بێ ئارامی، ئارەزووی توندی پێشبڕکێ، خود کۆنترۆڵ نەکردن، ئارەزووی شەڕانگێزی لە (دڵەڕاوکێ)دا.

ب- بێ ئارامی، ئارەزووی پێشبڕکێی توند، خود کۆنترۆڵ نەکردن، ئارەزووی شەڕانگێزی لە (ترس)دا.

ج- بێ ئارامی، خودکۆنترۆڵ نەکردن، دەستکەوتی بەرز لە (بەزۆری سەپێنراو) (القسریة).

د- بێ ئارامی، ئارەزووی شەڕانگێزی، ئارەزووی پێشبڕکێی توند لە (دەروونییە جەستەییەکاندا).

هـ- بێ ئارامی، پەلە پەل، خود کۆنترۆل نەکردن لە (خەمۆکی).

و- ئارەزووی شەڕانگێزی، پەلەپەل، نائارامی، لە (هیستیریا).

بەشداربوونی سیماکانی کەسایەتی لە توانستی بریارداندا دەرکەوت. وە بەپێی ئەم ئەنجامانەی کە توێژەر دەستی کەوت لەم توێژینەوەیەدا کۆمەڵێک لە ڕاسپاردەو پێشنیازی پێشکەش کرد.

*** ئەم باسە پوختەی تێزی دکتۆرایە کە بە ناوونیشانی (انماط الشخصیة (A-B) وعلاقتها بالمیول العصابیة والقدرة علی اتخاذ القرار) کە ساڵی ٢٠٠٤ پێشکەش کراوە.**

# سەردەمی ڕۆشنگەری و ڕۆمانتیکی

برتراند رسل
و/ ڕەحیم سابیر

(٢ - ٣)

فەلسەفەی ئایدیالیستی ئەڵمانی لەسەر دەستی هیگڵ دوا شێوەی میتۆدی وەرگرت، پاڵپشت بەو تروسکاییانەی کە لە (فشتە) و (شلنج)ی وەردەگرت، فەلسەفەیەکی هێنایە ئاراوە کە تا ئێستاش بایەخ و سوودی خۆی هەیە، سەرەڕای ئەوەی هەموو سیماکانی ڕاستی دەڵێن.

بێجگە لەوە هیگڵیزم کاریگەری گەورەی بۆ سەر نەوەیەکی تەواو لەبیرمەندان هەبوو، نەک تەنها لە ئەڵمانیادا، بەڵکو لە ئینگلتەراشدا، بەڵام فەرەنسا بەشێوەیەکی گشتی فەلسەفەی هیگڵ کاری تێ نەکرد، لەوانەیە هۆی ئەوە بگەڕێتەوە بۆ لێڵی سەرچاوەکە، کە گۆڕانەکە بۆ زمانی فەرەنسی بەشێوەیەکی وا بووە کە زمانی فەرەنسی بە ڕوونی گوزارشتی لێ نەکراوە، بەشێوەیەکی تایبەت تا ئێستاش فەلسەفەی هیگڵ، لە مادیەتی جەدەلیەتی مارکس و ئەنگڵسدا زیندووە، لە هەمان کاتدا دەیکەنە نموونەیەکی باش بۆ دۆزینەوەی هەڵەکانی ئەو فەلسەفەیە، هیگڵ (١٧٧٠- ١٨٣١) لە شتوتجارت لە دایک بووە، لەو کاتەی کە شلنج لە توبنجن دەیخوێند ئەمیش لەوێ دەیخوێند، بۆ ماوەیەک بە وانەوتنەوە خەریک بووە، لە ساڵی (١٨٠١) چووە پاڵ شلنج لە یبنا، لەوێ دوای پێنج ساڵ کتێبی (دیاردەکانی ڕۆح)ی تەواو کرد لەنێو بارودۆخی جەنگی (یبنا)دا، پێش ئەوەی سوپای فەرەنسی بچێتە ناو شارەوە ئەم شاری بەجێ هێشت، چەند ساڵێک کاری سەرنووسەری دەکرد، دوایی بووە بەڕێوەبەری قوتابخانەیەکی ناوەندی لە نورمبرج، کتێبی (زانستی لۆژیک)ی دانا، لە ساڵی (١٨١٦) بووە مامۆستا لە هیدلبرج، (فەرهەنگی زانستە فەلسەفییەکان)ی دانا، ساڵی (١٨١٨) لە بەرلین بانگێشت کرا بۆ کاری فەلسەفە و کورسی فەلسەفەی پێ بەخشرا لەم پلەیە مایەوە و کاری دەکرد، بروسیا لای هیگڵ جێی سەرسوڕمان بوو، فەلسەفەکەی بووە وانە ڕەسمییەکانی دەوڵەت. نووسینەکانی هیگڵ گرانترین نووسینن لە هەموو بەرهەمە فەلسەفییەکان گرانترە، ئەمە تەنیا بۆ سروشتی بابەتەکانی ناگەڕێتەوە کە چارەسەری دەکردن، بەڵکو بۆ ئەو شێوازە گران و کرچەی دەگەڕێتەوە کە پێی دەنووسی، ڕاستە کە هەندێک مەجازات لە نووسینەکانیدا دەردەکەون کە خۆشی بە ئاوەزی خوێنەر دەدەن، بەڵام ئەمە بەس نییە بۆ هێوربوونەوە لەو ئاڵۆزی و لێڵییەی کە بەسەر نووسینەکانیەوە بووە، هەوڵدانمان بۆ ئەوەی لەو ستێرکە بگەین کە هیگڵ ئاراستەی بۆ دەکرد، وا لەسەرمانە کە بگەڕێینەوە بۆ جیاوازکاری کانت لەنێوان تیۆر و پراکتیکدا، ئەوجا دەتوانرێ فەلسەفەی هیگڵ بەوە وەسف بکەین کە جەخت لە ئەولەویەتی پراکتیکی دەکاتەوە، بەمانایەکی تەواو بۆ وشەکە، ئەو هۆیەش وای کرد کە پێش هەر شتێک بۆ هەموو چالاکییە بەشەرییەکان گرنگییەکی گەورە بە مێژوو و سروشتی مێژوویی بدات، بەڵام لە مەڕ میتۆدی جەدەلییەوە کە هەندێ ڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆ کانت و فشتە و شلنج، بێ



رسل

گومان هیگڵ لە بایەخیمان ئاگادار دەکاتەوە ئەویش بە دەرککردنی لەو پێشکەوتنەی کە بزوێنە مێژووییەکان پیایدا تێدەپەڕن، کە لە جوڵانە دەچێ لە دابەزین و بەرزبوونەوەدا، بەشێوەیەکی تایبەتی وای دەبینی کە پێشکەوتنی فەلسەفەی پێش سوکرات بەو تەرزە ڕەوتی کردووە، هەروەک پێشوتر باسمان لێوە کرد، هیگڵ ئەم میتۆدە بەرزدەکاتەوە بۆ ڕێبازی ڕاڤەکردنی مێژوویی، بە واقعیش ڕەوتی جەدەلی لە دوو داوای دژ بەیەکەوە بۆ شێوەیەک لە چارەسەری نێوەندی خۆی لەخۆیدا کارێکی زۆر بەسوودە، بەڵام هیگڵ بانگەشەیەکی تری کرد کە مێژوو دەبوایە بەو قۆناغە دیاریکراوانە تێ بپەڕیایە لەسەر بنەڕەتی ئەم میتۆدە، بێجگە لەو بانگهێشتە ئەو مەسەلەیە ناتوانرێ بسەلمێنرێ تەنیا لە ڕێگەی شێواندنی ڕاستییەکانەوە نەبێت، دان پیانان بە تەرزێک بۆ ڕووداوە مێژووییەکان شتێکە و هەڵهێنجنی مێژوو لەو میتۆدەوە شتێکی زۆر زۆر جیاوازە، بۆیەش ڕەخنەی شلنج لەم بوارەدا دەسەپێ بە قەد ئەوەندەی بەسەر فەلسەفەی سروشتدا دەسەپێ.

میتۆدی جەدەلی لە هەندێ لایەندا هەوڵدانی سوکراتمان بیردەخاتەوە وەک پەندێکی چاکە، کە لەلای هیگڵ بە هزری ڕەها دەردەکەوێ، هەروەها جەدەلی سوکراتی دوای ئەوەی سەپێنەرە تایبەتییەکانی لێ دەرکرێ لە کۆتاییدا دەگاتە وێنەی چاکە، هەروەها جەدەلی هیگڵی بەرزدەبێتەوە بۆ بیرۆکەی ڕەها، هیگڵ لە کتێبی (لۆژیک)دا ئەو پرۆسەیەی باس کردووە، ئەو باسکردنە، یان باوەڕی پێ دەهێنین، یان نەخێر، هەروەها پێویستە لە یادمان نەچێت کە لۆژیک لای هیگڵ هاوتای میتافیزیقایە لە واقیعدا، بەو شێوەیە نمایشێکی گوتەکان لەژێر لۆژیکدا دەنووسرێ کە یەک لەوی تر تەون دەکەن لە کردارەکی دیالکتیکدا و دەگۆڕێ لە (ڕەوش)ەوە The-sis بۆ بەرامبەرەکەی Antithesis دوایی بۆ تێکەڵ Synthesis، بێ گومان ئەم بیرۆکەیە لە گوتەکەی (مقولات)ی (کانت)ەوە وەرگیراوە کە خاڵی دەست پێکردن بوو لەو نمایشەی کە هیگڵ پێشکەشی کرد، بووە مەسەلەکەی (کانت) ئەویش گوتەی یەکەبوو، بەڵام دوایی هیگڵ ڕێگای تایبەتی خۆی گرتەبەر و بە زنجیرەیەکی درێژ پێکەوەی بەست، بەشێوەیەکی هەرەمەکی لە مەڕ گوتەکانەوە تا گەیشتە بیرۆکەی ڕەها، تا ئەم قۆناغە خولێکی تەواو خولاینەوە دوایی گەڕاینەوە بۆ یەکە، هیگڵ وا سەیری ئەمەی دەکرد کە زەمانەتێکە بۆ تەواوبوون و سەلامەتی بەڵگە.

بە ڕاستیش بیرۆکەی ڕەها وا خۆ دەردەخات کە بەرزترین نموونەی یەکەیە، واتە ئەوەی کە لە هەموو جیاوازییەکان دەگات، بەڵام پرۆسەی جەدەلی کە ڕەهایی لێ پەیدا دەبێ بۆ زیاتر تێگەیشتن لەو بیرۆکە ئاڵۆزە یارمەتیمان دەدات، بێ گومان پێشکەشکردنی ئەم پرۆسەیە بە زمانێکی سادە شتێکە بەدەر دەبێ لە توانای هیگڵ هەروەها لە توانای کەسێکی تر، بەڵام هیگڵ جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک لەو نموونە ڕوونانەی کە نووسینەکانی تیا دەئاخنێ، هیگڵ باسی ئەو جیاوازییەی نێوان کەسێک دەکات کە لەلای هزری ڕەها چەق نابەستێت لەسەر ناسینی ڕەوتی جەدەلی و لەنێوان کەسێک کە بەو ڕەوتەدا تێپەڕیبێ، ئەمە وێک دەچوێنێ بەدەلالەتی نوێژکردن لای منداڵ و بە دەلالەتی بۆ پیاوێکی پیر، کە هەردووکیان هەمان فۆنەتیک بەکاردەهێنن، لای منداڵەکە تەنیا کۆمەڵێک دەنگ نەبێ هیچی تر ناگەیەنێت، بەڵام لای پیرەکە ئەزموونی تەمەنێکی تەواوی پێوە دیارە، بەو شێوەیە پرەنسیپی جەدەلی بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەو ڕەهاییە کە ڕەوت دەگاتە کۆتاییەکەی، ئەوە تەنیا ڕاستییەکە، لەم بیرۆکەیەدا هیگڵ کاریگەری ئسپینوزای لەسەر بوو، ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێ کە هەر بەشێک لە هەموودا هیچ ڕاستی و مانایەکی کردەوەیی نییە لە خۆیدا، بەڵکو هیچ مانایەک ناگرێتە خۆ گەر بە تەواوی پێوەند نەبێت بە گەردوونەوە، لێرەشەوە لەسەر ئەم بنەڕەتە ئەو مەسەلەیەی کە دەبێ هەر ئەوەیە کە پێویستە لێی بدوێین ئەویش بیرۆکەی ڕەهایی حەقیقەتێکە، تەنیا هەمووە کە حەقیقەتە، هەر شتێکی بەشیش تەنیا حەقیقەتێکی بەشی هەیە لەوە زیاتری نابێ، بەڵام گەر بەدوای پێناسەی بیرۆکەی ڕەها لای هیگڵ گەڕاین، ئەوا لە لێڵی

زیاتر هیچی تر نابینین کە دەبێتە ئەو شتەی پێویست نابێت بەدوایدا بچین، بەڵام مەبەست لێی زۆر ئاسانە، بیرۆکەی ڕەها لای هیگڵ ئەو بیرۆکەیەیە کە لەخۆیدا بیردەکاتەوە، ئەمەش تێگەیشتنێکی میتافیزیکییە لە هەندێ لایەنەوە لەگەڵ هەندێ لە بۆچوونەکانی ئەرستۆ یەک دەگرنەوە، کە قەوارەیەکی گۆشەگیری نەزانراوە و بە بیری تایبەتی خۆی پێچراوە، لە هەندێ لایەنی ترەوە ئەم چەمکە بیرۆکەکەی (ئسبینوزا)مان بیردەخاتەوە کە ئەو و گەردوون یەک شت بوون هیگڵیش وەک ئسبینوزا هەر جۆرە دوالیزمێک ڕەت دەکاتەوە، ئەو وەک فشتە دەست پێدەکات واتە لە ئاوەزەوە، دوایی قسەکانی لە دەوری بیرۆکەکە دەسووڕێتەوە، هیگڵ ئەم تیۆرە میتاقیزیکییە گشتییە بەسەر مێژوودا پراکتیکە دەکات، سەرمان نەسوڕمێ کە ئەم تیۆرە لەگەڵ ئەو شێوە تەرزە گشتییە تایبەتانە دەگونجێ لەم بوارەدا، هیگڵ پرەنسیپی جەدەلی لە مێژووەوە وەرگرتووە، بەڵام ئەو شێوازەی کە ڕووداوەکانی پێ دەگێڕێتەوە هەروەک بینیمان وا پێویستە کە بەو جۆرە ڕێگە هۆزگەراییە دەستی تێوەرنەدرێ، هەروەها ئاواش ڕۆچوون بەرەو ڕەها لە مێژوودا فرسەتێکی دەداتێ بۆ پێشکەشکردنی هەندێ پڕوپاگەندەی نەتەوەیی کە زۆر لە تەوژمی پێوە دیارە.

لە دیدی ئەودا مێژوو گەیشتۆتە دوا قۆناغی لە دەوڵەتی بروسیدا هەروەک لەسەردەمی هیگڵدا دامەزرا، ئەمە ئەو ئەنجامەیە کە هیگڵ پێی دەگات و کۆتایی پێ دەهێنێ لە (فەلسەفەی مێژوو)دا، بێ گومان گەر ئێمە لەم تێڕوانینەی ئێستاماندا لێی بڕوانین، وامان بۆ دەردەکەوێ کە فەیلەسووفی بلیمەتی جەدەل لە ئەنجامەکانیدا تا ڕادەیەک پەلەی کردووە، ئەم تەرزە خۆی وا لە بەڵگەکان دەکات بۆ ورووژاندنی هیگڵ دەوڵەتێک ڕێک بخرێت بە ڕێگایەکی گشتگیری، پێشکەوتنی ڕۆح لە مێژوودا پێش هەموو شتێک بەڕای هیگڵ کاری ئەڵمانەکانە، لەبەر ئەوەی تەنیا ئەڵمانەکان توانیان ئازادی لە چوارچێوە گشتییەکەیدا تێ بگەن، لەوەی کە ئازادی چەمکێکی سلبی نییە، وا پێویستە پەیوەست بێت، بەڵام ئەم مەسەلەیە ئەوە ناگەیەنێ کە لە هەر شوێنێک یاسا هەبێت ئەوا ئازادی هەیە، هەر وەک هیگڵ بۆی دەچێ، گەر مەسەلەکە وابوایە دەبوایە (ئازادی) هاوتای ملکەچکردن بوایە بۆ یاسا، ئەو مانایە جیاوازییەکی لەگەڵ ئەو مانایەی هەیە کە بۆمان داناوە، بەڵام لە هەمان کاتدا تروسکاییەکی بلیمەتی گرنگ هەیە لە بیرۆکەی هیگڵدا لەمەڕ ئازادی، ئەوکەسەی کە سەری خۆی دەکێشی بە دیوارێکی خشتدا لەبەر ئەوەیە کە نایەوێ دان بەوەدابنێ کە ئەو قاڵبە خشتانە زۆر ڕەقترن لە ئێسکەکان، دەتوانین بە بەردەوامی وەسفی بکەین، بەڵام لەبەر ئەوە نییە کە ئازادە، بەڵام مانای ئازادی لەوە دەردەکەوێ کە دان بەو جیهانە دابنێی کە وەک خۆیەتی بە دەر لە هۆ دۆزکردنی دەروون بە وەهمەکان، مەبەستم ئەوەیە کە دەرککردنی ئەو ئاراستەیە دەستەبەر دەبێت کە پێداویستی پێیدا تێدەپەڕێ، ئەمەش ئەو بیرۆکەیەیە کە هرقلیطسترووسکایی پێ داوە، هەروەک پێشتر بینیمان، بەڵام کە مەسەلەکە پێوەندی دەبێ بە یاسا تایبەتەکانی باو لە (بروسیا) دا هیچ هۆیەک نامێنێتەوە بۆ ئەوەی بڵێین کە ئەو یاسایانە پێویستە ببنە پێداویستییەکی لۆژیکی، لەبەر ئەوەی وەسفکردن بەو شێوە وەسفە، کە مەیلی هیگڵی تێدایە وا بکات، ئەمەش سەپاندنی فەرمانی کوێرانەی وڵاتەکەیەتی کە بەسەر هاوڵاتیەکی گۆشەگیری گوناهدا دەیسەپێنێ ئاوای لێ دێت تەنیا ئەوەیە ئەو فەرمانەی پێی دەدرێت جێبەجێی بکات، میتۆدی جەدەلی سیمایەکی تری وەرگرت کە لە ئاگادارییەکانی مێژووەوە سەری هەڵدا، لەبەر ئەوەی جەخت لەسەر توخمی ململانێ لەنێوان هێزە دژ بەیەکەکان دەکاتەوە، هیگڵ وەک هرقلیطس بوو گرنگی زیاتر دەخستە سەر ململانێ و چەک داماڵین، ئەو بۆ ئەوە دەچێ کە دەڵێ جەنگ لە ڕووی ئاکارانەوە بەرزترە لە ئاشتی، گەر بۆنەتەوەکان دوژمن نەبوایە دژی بجەنگانایە ئەوا تووشی لاوازی و توانەوە دەبوون، ئاشکرا و ڕوونە کە هیگڵ حیسابێک بۆ قسەکەی هرقلیطس دەکات کە دەڵێ جەنگ دایکی هەموو شتەکانە، بیری (کانت)ی ڕەت کردەوە دەربارەی یەکێتی جیهان، هەروەها هاوپەیمانێتی پیرۆزیشی ڕەت کردەوە کە لەکۆنفرانسی (ڤیەننا) دەرچوو، دەتوانین بڵێین کە گفتوگۆی دەربارەی سیاسەت و مێژوو هەمووی دووچاری شێواندن بوو بەهۆی گرنگی پێدانی یەک لایەنەی بە مێژوویی ڕامیارییەوە، بۆ ئەمەش شانازی بە تێڕوانینەکەی فیکۆ دەکات کە وای لێ کرد دەرک بە گرنگی هونەر و ئەدەب بکات، لە توانای هیگڵدا نەبوو بگاتە ئەو ئەنجامەی کە بڵێ بوونی دوژمنی دەرەکی پێویستە بۆ ئەوەی نەتەوە تەندروستی مەعنەوی و ئاکاری دەستەبەر بکات، نەک لە تێڕوانینێکی سیاسییەوە، بەمانایەکی تەسک، گەر کەسێک تێڕوانینێکی باشتری لەوە هەبێ بۆی دەردەکەوێ کە لەهەر کۆمەڵگایەکی تایبەتدا توخمی زۆر هەن کە بوار دەدەن بۆ فووکردنە ڕۆحێکی کوشتاریانە لەلای هاووڵاتیان ئەو ڕایەی کە دەڵێ سەرپێچییەکانی نێو نەتەوەکان پێویستە لە ڕێگای جەنگەوە چارەسەر بکرێن، یان وا فەرز دەکرێ کە پەیمانێکی کۆمەڵایەتی لەنێوانیاندا دروست ببێ، وا پێویست دەکات کە مامەڵە ئاڵوگۆڕەکان وەک حاڵەتی سروشتی بێ پەرە بمێننەوە، کە تەنیا هێز

قورسایی هەبێت، لەم بارەیەوە تێڕوانینەکەی (کانت) زۆر قوولتر بوو لەهی (هیگڵ) لەبەر ئەوەی ئەم سەردەمەی ئێستامان سەلماندی کە جەنگ لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی وێرانکردن، ئەم وێرانکردنە بە کردەوەیی واتای گەیشتنی بەوپەڕی جەدەلیەت کە دەبێ لایەنگرانی بە پەرۆشی هیگڵیزم ڕازی بکات.

لەوە نامۆتر ئەوەیە کە تیۆرەکەی هیگڵ لە مەڕ سیاسەت و مێژوو لەگەڵ لۆژیکە تایبەتیەکەیدا ناگونجێ، لەبەر ئەوەی ئەو هەمووەی کە پرۆسە جەدەلیەکەی پێدەگەن هاوشێوە نییە بۆ (یەکی)یەکەی بارمیندس، کە یەکانگیرە و شێواز و جیاوازی تێدا نییە، لەگەڵ هاوشێوەکەی لەلای ئیسبینۆزا کە خۆی سروشت بوو، کە زیاتر لەگەڵ گەردووندا یەک دەگرنەوە، تا لە دواییدا تێکەڵی دەبێت، لەبەر ئەوە هیگڵ پێچەوانەی ئەوەیە، چونکە بیرکردنەوەکەی لەسەر بنەڕەتی هەموو ئەندامەکانیەتی، بیرۆکەیەکە کە دواجار کاریگەری خۆی کردە سەر فەلسەفەی دیوی، بەپێی ئەم ڕایەش تاک ڕاستی تەواو وەرناگرێ تا پێوەندی نەبێت لەگەڵ هەمووداو، هەروەک چۆن بەشە بوونەوەرەکانی ئەندامان پێکەوەن، لەوانەیە بەخەیاڵی کەسێکدا هاتبێ کە ئەوە وای لە هیگڵ کردبێ بۆ گەوارکردنی ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێ (بە بوونی دام و دەزگا جۆر بەجۆرەکان لەنێو دەوڵەتدا)، بەڵام هیچ جۆرە شتێک لەوە گەوار ناکات، دەوڵەت خۆی دەسەڵاتێکی تاکڕەوی زۆردارە، ئەمە سروشتی بوو لای هیگڵ بەوەی کە پرۆتستانییەکی بێوەی بوو، بەوەی بانگەشەی کۆنترۆڵکردنی کەنیسە بکات لەلای دەوڵەتەوە، لەبەر ئەوەی مۆرکی نەتەوەیی دەستەبەر دەکات بۆ ڕێکخستنی کڵێسا، بەڵام بۆ کڵێسەی ڕۆما هیگڵ هەڵوێستێکی بەرپەرچی هەبوو بەرامبەری بەهۆی ئەوەی لە واقیعدا جیاوازییەکی بنەڕەتی تیانەبوو، بە چاوپۆشی بۆ هەموو ئەو ڕەچاوانەی تر، لەبەر ئەوەی دەستەی دەولیە، هیگڵ هیچ بوارێکی بۆ هەوڵدانی سەربەخۆ نەهێشتەوە لەپێناو گەیشتن بە بایەخدانی ئەندامە ڕێک و پێکەکانی نێو کۆمەڵگا، سەرەڕای ئەوەی وا پێویست بوو، بەپێی ڕای ئەندامێتی، کە باوەش بۆ ئەو چالاکییانە بکاتەوە، بەڵام گەرانی پوخت یان مومارەسەکردنی ئارەزووەکان ئەمە گەوار ناکرێن، بەڵام لەسەر چ بنەڕەتێک ڕێی پێ نادرێت بۆ نموونە ئارەزووی کۆکردنەوەی پوولی نامە لە یانەیەکدا کۆبینەوە کە هیچ ستێرکێکی نییە بێجگە لەو گرنگی پێدانە هاوبەشەی هەیانە ئەویش کۆکردنەوەی پوولە؟ دەبێ ئاگاداری ئەوەش بین کەوانە مارکسییە ڕەسمییەکان لەو بارەیەوە زۆر لە هیگڵیەتی هەڵگرتووە، هەموو چالاکییەک وا سەیر دەکرێ کە ڕاستەوخۆ خزمەتی دەوڵەت دەکات، گەر لەژێر سایەی سیستەمدا یانەیەک هەبێ بۆ ئارەزووی پوول کۆکردنەوە وا سەیر ناکرێ کە یاریدەی شکۆمەندی شۆڕشی سۆشیالیستی دەدات، ئەندامەکانیان خۆیان لەوەدا دەبیننەوە کە بەزۆر قەدەغە دەکرێن لە کۆکردنەوەی پوول یان شتێکی تردا، هیچ ڕاستییەک نییە لەنێوان تیۆری هیگڵی سیاسی و ڕێبازە سیاسییەکەیدا لە مەسەلە گرنگەکانی تردا، لەبەر ئەوەی پراکتیکی ورد بۆ پرنسیپە جەدەلیەکەی دەبوایە بۆی دەربخستایە کە نەبوونی هۆ دەبێتە دانەمەزراندنی ڕێکخستنی مەعنەوی لەنێو نەتەوەکاندا، ئەمەش لە هاوشێوەی پێشنیارەکەی کانت دەچێت، بەڵام ڕاستی شتەکە ئەوەیە کە ڕەهایی لە سیاسەتدا وا دەردەکەوێ، کە (پادشایەتی بروسیا)یە، بێ گومان بۆچوونی بۆ ئەم ئەنجامە بۆش بوو، ڕاستە کەس ناتوانێ نکۆڵی لەوە بکات کە خەڵک هەبوون بە دڵێکی پاکەوە باوەڕیان بەو مەسەلەیە هەبووە، بەڵام گەر باوەڕ بوون بەو جۆرە شتانە دڵنەوایی دەدات بە دەروون لەلای هەندێ خەڵک ئەوەشی لەگەڵ ئەو بیرە ساغەدا ناگونجێ، دەبێ ڕاگەیەنین کە ئەو مەسەلانە ڕێبازن و ئاوەز بەو لایەدا دەیانبات، بەم میتۆدە کەسێک دەتوانێ لێبوردنە قەڵبەکان هەستی پێ بکات بۆ هەموو لادەر و نەهامەتییەکان کە لەم جیهانەماندا ڕوو دەدەن وای لێ دێ کە هەموو شتێک مانای نەبێت، ئێستا بابگەڕێینەوە بۆ جەدەل، کە بە ڕاستی بنکەی بیرۆکەیە لە ڕێبازی هیگڵدا، پێشوەتر بینیمان کە هەنگاوی جەدەلییەت سێ قۆناغی گرتەخۆ، یەکەمیان مەسەلەیەکە لە مەسەلەکان، دوایی مەسەلەیەکە دژیەتی و سەرپێچییەتی دوایی هەردووکیان لە تێکەڵەیەکی ڕێکدا کۆدەبنەوە، بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە با نموونەیەکی سادە پێشکەش بکەین، کەسێک دەڵێ کە ئاڵتون بەنرخە، مەسەلەی دژایەتییەکەی دێتە بەردەم کە ئەویش ئاڵتون نرخی نییە، دوای ئەوە دەگەینە تێکەڵکردنەکە بەو قسەیەی کە دەڵێ نرخی ئاڵتون لەسەر بارودۆخ ڕادەوەستێ، ئەگەر لە شەقامی ئۆکسفۆرد بیت ئەوا خەڵکان دەبینی کە ئامادەییان تیایە خواردنت بدەنێ بەرامبەر بە ئاڵتونەکە، لێرەدا ئاڵتوون بەنرخە، بەڵام ئەگەر بێ جێ و ڕێ لە دورگەیەکدا بیت و توورەگەیەک ئاڵتوونت پێ بێ پێویستیت بە ئاوبێت ئەوا لێرەدا ئاڵتون نرخی نابێت. بەو شێوەیە پێویست دەکات لە هەموو حاڵەتێکدا حساب بۆ هەموو بارودۆخێک بکەیت، لەوانە نەبوو ئەو نموونەیە لای هیگڵ پەسەند ببوایە، بەڵام یارمەتی مەبەستەکانمان دەدات لەم بوارەدا، ئەو بیرۆکەیەی کە هیگڵ جەختی لەسەر دەکاتەوە کە تێکەڵ دەبێتە مەسەلەیەکی نوێ و کردارەکی جەدەلی خۆ لە نوێوە دەست پێ دەکاتەوە، تا بەو شێوەیە دوا بەدوا تا دەگەینە

هەموو گەردوون، ئەو بیرۆکەیەی لەدوای ئەمەوەیە ئەوەیە کە بەڵگەی تەواو بۆ هەر شتێک دیارناکەوێ تا ئەوکاتەی لێی دەڕوانرێ لە هەموو پێوەندییە ئەگەریەکانەوە، واتە لەو ڕەوشەدا کە لەنێو جیهاندایە وەک هەموو، لێرەدا پێویستە هەندێ شت بخەینە بەر باس، یەکەمیان لەبارەی گرتنەخۆی مێژوویە بۆ جەدەل، زۆر زۆر ڕاستە کە هەندێ حاڵەت هەن داواکاریان تێدا بە مەحاڵ دەبێت گونجاندن لەنێوانیاندا، بە جۆرێک بە چارەکردنی نێوەند چارەسەردەکرێ، نموونەیەک دەهێنمەوە وەک من ئارەزوو ناکەم باجی دەرامەت بدەم، بەڵام بەرژەوەندی باجدان لەوەدایە کە هەڵوێستێکی دژ وەرگرێ و پێ داگرێ لەسەر ئەوەی کە هەموو شتێ ببات، دوایی دەگەینە ئەو چارەسەرییە نێوەندەی بەشێوەیەک کە هەردوو لا ڕازی دەبن، ئەمەش شتێکە هیچ لێڵییەکی تیادا نییە، پێویستە ئاگاداری ئەوە بین کە چارەسەری نێوەند لە دوو داواکاری جیاواز نایەتەدی، بەڵکو لە دوو داواکاری دژ بەیەک دێتە دی، ئەم خاڵە لۆژیکییە پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە، دوو مەسەلە لە یەک جیاواز دەبن گەر ڕاستی یەکێکیان ئەوی تر بە درۆ بخاتەوە. پێچەوانەکەی بە پێچەوانەوەیە، بەڵام دوو مەسەلەی دژ بەیەک لەوانەیە هەردووکیان درۆ بن لەوانەیە بشێ هەردووکیان لەگەڵ یەکدا ڕاستگۆبن، لەو نموونەیەی سەرەوە دەبینین کە چارەسەری نێوەند سەر پێچییە بۆ ئەو دوو داواکارییەی کە بەرامبەرن بە یەکتری، ئەو شتەی کە وا دەکات جەدەل کاری خۆی بکات لە حاڵەتە مێژووییە کردەکییەکاندا ئەوەیە کە مەحاڵە لە زۆر کاتدا بگەینە جۆرێک لە پەیمان بەپێی داواکارییە بەرامبەرەکییەکان، گەر لای هەردوولا دان بە خۆداگرتنی تەواوەتی نەبوو بۆ گەیشتن بە دارشتەیەکی بەجێ لەوانەیە گەمەکە زیاتر توندی بەخۆوە ببینێ، لە کۆتاییدا لایەنە بەهێزەکە دەیباتەوە و دۆڕا و لە یاریگادا بەجێ دەهێڵدرێ، دوایی لەم حاڵەتەدا وا سەیری داواکارییە بەرامبەرەکییەکان دەکرێ کە داواکارییە جیاوازەکانن، بەڵام ئەمە لە دواییدا ڕوو دەدات، لەبەر ئەوەی ڕوودانەکەی حەتمی نییە، کاتێک دوو ڕای جیاواز هەبێ دەربارەی باجدان بەلای هاوولاتی و لەلای دەسەڵاتدارانی دەوڵەت ئەوا هیچ کامێکیان ناچار نابن ئەوی تریان بفەوتێنن، دووەم دەبینین کە پێشکەوتنی ڕۆشنبیری بەرێیەکی میتۆدی نموونەیی دەچێت بەرێوە لەم لایەنەوە جەدەل دوو دڵ دەبێت، بۆ ئاڵوگۆڕی وەڵام و پرسیار لە گفتوگۆکەی ئەفلاتووندا، ئەمەش ئەو ڕێگایەیە کە زەین کاری پێ دەکات کاتێک کێشەیەک دێتە بەردەمی، لەوانەیە هەڵوێستێک بەربەست بێ، هەندێ بەرپەرچدانەوە بورووژێنێ، لە کاتی گفتوگۆکردندا، یان لە ڕێگای ڕای ورد لە بابەتەکەدا دەگەینە ئەنجام، یان وازهێنان لە مەسەلە چاوگەکە، گەر دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر کە پێویست بێت یەکێک لەو سەرپێچییانە گەوار بکرێت، لەم حاڵەتەدا دەتوانین بگەینە ئەنجامێکی بەجێ، بە بەرچاوی ئەوەی کە ئەو مەسەلانەی ڕووبەڕووی یەکتری دەبنەوە جیاوازین. یان دژ بەیەک بن، کێشەکەی هرقلیطس کە وتراوە و دەڵێ هەموو شتێک دەبزوێ هەروەها کێشەکەی بارمنیدس وتراوە کە دەڵێ هیچ شتێ نابزوێ، دوو کێشەی دژ بەیەکن، بەڵام ئەوەیان بەسە لە بەرپەچدانەوەیدا بۆ ڕای هرقیلطس، بەو قسەیەی کە دەڵێ هەندێ شت نابزوێن لەم حاڵەتەدا دوو کێشەکە جیاوازن، لە هەردوو حاڵەتەدا دەتوانین بگەینە ئەو چارەسەری نێوەندەی کە دەڵێ هەندێ شت دەبزوێن و هەندێکیان نابزوێن، ئەمەش جیاوازییەکی بەرچاوی گرنگ دیاری دەکات کە هیگڵ ئامادەیی تیانەبوو دانی پیابنێ، جیاوازی شتێکە ڕوودەدات لە نووسینێکدا لە وتارێکدا discourse، لەوانەیە کەسێک لە کەسێکی تر جیاواز بێت، بە واتایەکی تر لەوانەیە کێشەیەک لەکێشەیەکی تر جیاوازبێت، بەڵام لە جیهانی ڕووداوەکانی ڕۆژانەدا جیاوازییەک نابینرێ، ئەوەی هەیە ناتوانێت جیاوازبێت لەوی تر، هەروەها ئەو ڕایەش چۆن بێ دەربارەی پێوەندی نێوان زمان و جیهان، ئاوەهاش هەژاری و دەوڵەمەندی جیاوازنین، بەڵکو لە یەک ناچن، بەڵام لەبەر ئەوەی هیگڵ تێڕوانینی بۆ جیهان تێڕوانینێکی ڕۆحیە، بۆیە خۆی لەم جیاوازییە سەرەکییە دەدزێتەوە، سەرەڕای ئەوە بەپێی ئەو ڕایە زۆر ئاسانە کە هۆی پراکتیککردنی جەدەل دەرک پێ بکەین، نەک بەوەی کە کەرەستەیەکە بۆ تیۆری ئەپستمۆلۆژی، بەڵکو ستایشی ڕاستەوخۆی جیهانیشە لە هەمان کاتدا، گەر بمانەوێ گوزارش لەوە بکەین، بە زمانێکی تر، دەڵێین هیگڵ نەک تەنیا میتۆدەکەی ناخاتە شوێن ئەپستمۆلۆژی (پەیوەندی بە ئەپستمۆلۆژییەوە هەیە) بەڵکو شوێنێکی ئەنتۆلۆژی پێ دەبەخشێ (پەیوەندی بە بوونەوە هەیە)، بەپێی ئەو بنەڕەتەیە هیگڵ ڕاڤەیەکی جەدەلیانە بۆ سروشت دەکات، پێشوو باسی بەرپەرچی (شلنج)مان کرد بۆ ئەو جەدەلە، بەڵام مارکسییەکان ئەو هەموو هاتوهووتەیان لەخۆگرت، بێجگە لەوەی ئەو پرنسیپە مادییەیان دانا کە (لامتری) باسی لێوە کردووە لەجێی جەختەکەی هیگڵ بۆ لایەنگریەکەی ئاوەز، ڕووپۆشێکی نامۆی تر هەیە بۆ لایەنگری، کە لە میتۆدی جەدەلییەوە هەڵدەقوڵێ، ئەویش شەیدایی هیگڵە بۆ ژمارە سێ، وای دەبینێ لە هەموو شتێک ملکەچە بۆ ئەو ژمارەیە ئەمەش تەنیا بەوەی کە دانانی جەدەلییەت ئەم سێ هەنگاوەیە، ڕەوش و جیاوازییەکەی لەگەڵ تێکەڵ، بەو شێوەیە کە

شتێک پێویستی بەدابەشکردن هەبێ، دەبینین هیگڵ
بەسەر سێ دا دابەشی دەکات، لەو نمایشەی کە
پێشکەشی کردووە، بۆ مێژوو، وەک نموونەیەک، جیهانی
ڕۆژئاوا جیاواز دەکات ئەوجا جیهانی یۆنان و ڕۆما،
دوایی جیهانی ئەڵمانییەکان، دیارە ئەوانی تر هیچ
حسابێکیان بۆ ناکات، گەر لە گۆشەی تەنسیق و
وێناکردندا (Symmetry)وە سەیری بکەین ئەو شتە
ڕەوایە، بەڵام وەک میتۆدێکی لێکۆڵینەوەی مێژوویی
سەیری بکەین ئەوا نابێتە جێی باوەڕبوون، نموونەیەکی
تریش لە (فەرهەنگ)دا سێ دابەشکردن دەدۆزینەوە کە
بە سێ قۆناغ دەڕوانێتە ڕۆح، یەکەمیان بوون لەخۆدا کە
لۆژیکی لێی دەردەچێ، دوایی ڕۆح بەقۆناغی ئەوە
تێدەپەڕێ کە لەخۆی دەرچێ ئەم ڕەوتە لە حاڵەتی
گۆڕاندایە ئەم قۆناغەش ئەوەیە کە گفتوگۆی لەسەر کراوە
لە فەلسەفەی سروشتدا، کۆتاییەکەی ڕۆح گەشتی
ڕۆیشتن و گەڕانەوەی جەدەلیەکەی تەواو دەکات و
دەگەڕێتەوە بۆ نێو خۆی، ئەمەش بە قۆناغی فەلسەفەی
ڕۆح سەیر دەکرێ، هیگڵ ئەم هەموو پرۆسەیە وا سەیر
دەکات کە سێگۆشەی جەدەلییە، بەڵام ئەم شێوە
سەیرکردنە وشکە بەرامبەر ئاوەزی سەلیم تا ئەوەی کە
هەوادارانی هیگڵ خۆیان هەوڵی ئەوەیان نەداوە بەرگری
لێ بکەن، بەڵام بە ئەرکی خۆمانی دەزانین دوای ئەوەی
ئەم ڕشتە ڕەخنانەمان هێنایە بەرباس، بێ ئاگا نەبین لەو
بەهایەی کە فەلسەفەی هیگڵ هەیەتی، ئاگاداری
یەکەمان لەبارەی جەدەلەوەیە، لێرەدا هیگڵ بە قووڵاییدا
ڕۆدەچێ لەبارەی ئەو ڕەوتانەی کە ئاوەز بەدوایاندا
دەچێ، زۆرجار ئاوەز لەسەر ئەو فۆرمە جەدەلییە ناڕوات،
دەتوانین بڵێین کە جەدەل بێجگە لەوەی بەشێکە لە
سایکۆلۆژی گەشەی ئاوەز گەشەش بۆ دووریەکی
دیاریکراوی لایەنی توانایی ئاگاییە تروسکاییەکان
بەخۆوە دەبینێ، دووەم هیگڵیزم جەخت لەسەر گرنگی
مێژوو دەکاتەوە لەو لایەنەوە کەوا چ تروسکاییەکی پێ
دراوە، بەسەدەیەک لەوەوپێش فیکو ئەوەی گەوار
کردووە، ئەو ڕێگایەی کە هیگڵ هەڵوێستی خۆی لەسەر
نمایش دەکات ئەویش ئەو فۆنەتیکەیە کە بە وردی بە
کاری دەهێنێ، لەوانەیە ئەمە پێوەندی بەو وێناندنە
شاعیرییە تایبەتییەوە هەبێت بۆ زمانەکە خۆی، نموونەش
بۆ ئەوە: کاتێک هیگڵ دەڵێ فەلسەفە لێکۆڵینەوەی
مێژووەکەی خۆیەتی، پێویستە لەژێر تیشکی ڕێبازی
جەدەلیانە لەم گوزارەیە بڕوانین، هیگڵ دەڵێ فەلسەفە
گەشە بە پێویست بوون دەگەیەنێت، بەپێی فۆرمێکی
جەدەلییانە، دواتر لێکۆڵینەوەی جەدەلیەت کە
پرنسیپێکی سەرەکی فەلسەفەیە لێرەدا هاوشێوەی
لێکۆڵینەوەی مێژووی فەلسەفە دەبێ، بێگومان ئەم
گوزارشتە لێرەدا زۆر لوول پێچە لەو بیرۆکەیەی کە وتراوە
(تێگەیشتنی ڕاستی فەلسەفە ئەوەیە گەر بمانەوێ لە
شتێ بگەین ئەوا لە ڕێی مێژووەکەیەوە دەبێ)، کەس
ڕازی نابێ لەسەر ئەم ڕایە بەڵام بەهیچ شێوەیەک قسەی
بۆشیش نییە، ڕاستییەکەی هیگڵ زۆر یاری بە داڕشت و
مانا جیاوازەکانی فۆنەتیک دەکرد، ئەو وای دەبینی کە
زمان جۆرە ئاوەزێکی کامڵی هەیە کە بەرزترە لەو
ئاوەزانەی بەکاری دەهێنن، نامۆییش لەوەدایە هەندێ ڕا
هەن کە نزیکن لێوەی کە فەیلەسووفانی زمانی ئاسایی لە
ئۆکسفۆرد پێی دەدوێن، بەڵام بە نیسبەت ڕەوشی
مێژوویی هیگڵ ڕای وابوو کە ڕەها لەبەردەستماندایە
بۆیە سروشتی بوو دانانی و بنیات نانی ڕێبازە
فەلسەفییەکانی کانت هەمیشە لە ڕاکانیدا دەردەکەوتن و
بەشێوەیەکی پاشکۆ دێن و ئامادە دەبن، دوای ئەوەی
ڕووداوەکان خۆیان ڕوویان دا، بەشێوەیەکی لێزانانە لە
پێشەکی (فەلسەفەی یاسا)دا گوزارشتی لەوە کردووە
دەڵێ (کونەپەپوی منیرفا تا ئەو کاتە تاریکی دانەیەت
هەڵنافڕێ) فەلسەفەی هیگڵ پرنسیپێکی گشتی
هەڵدەگرێ ئەویش دەتوانێ بەدرێژایی مێژوو
سەرهەڵبداتەوە، ئەوەیە کە مەحاڵە تێگەیشتنی بەشێک
لە جیهان گەر لە چوارچێوەی گەردوونەوە، وەک (هەموو)
لێی نەڕواندرێ، دواییش (هەموو) تاکە ڕاستییە، لە
پێشوودا و لەپێش سوکراتدا ئەم ڕایە هەبووە، کاتێک
بارمنیدس باسی ئەوەی کرد کە گەردوون تۆپێکی
ڕاوەستاوە، هەوڵدان بوو بۆ گوزارشتکردن لە شتێک لەو
جۆرە، هەروەها فەیلەسووفە ماتماتیکەکانی سەر بە
قوتابخانەی فیثاگۆرس ئاماژەیان بۆ ئەو بیرۆکەیە کردووە
و تروسکاییان پێداوە، کاتێک وتیان شتەکان هەموویان
ژمارەن، نزیکترینیان لێمانەوە (ئسبینۆزا)یە نوێنەری ئەو
ڕایە بوو کە دەڵێ (تەنیا هەمووە کە تاکە ڕاستییە
بەمانای لۆژیک)، دوایی فیزیاییە ماتماتیکیەکان هاتن و
بە هەمان ڕێگای کولتووری فیثاگۆرسدا ڕۆشتن، هەروەها
گەڕان بەدوای داڕشتنێکی بەرزتر کە ڕاڤەی تەواوی
گەردوون بکات، نموونەش لەوە ئەو پێشکەوتنە مەزنەی
کە فیزیاکەی نیوتن بەدەستی هێنا، ئەو پێشکەوتنە
گەیشتە لووتکەی تیۆرە گەردوونییەکان وەک تیۆر
لابلاس، ئەوەندە گران نییە کە کەسێک بتوانێ
پووچەڵکردنەوەی بیرۆکەی ئەو ئایدیالیستەی کە
دەربارەی هەموو گەردوون بەسەریەکەوە بسەلمێنێ. لە
هەمان کاتدا هەڵەیە گەر هەمووی ڕەت بکەینەوە بێ
ئەوەی بۆمان دەربکەوێ ئەو هەوڵە بۆچی دەدرێ، گەر ئەو
هەوڵە بە ڕێگایەکی لێڵیش بێت و ئامانجەکانیشی دیار
نەبن، مەسەلە گرنگەکە ئەوەیە کە ڕێبازی
ئایدیالیستەکان بەشێوەیەکی دروست لەلایەنێکی

دیاریکراوەوە گوزارشتی لێ دەکەن، لەبەر ئەوەی بە ڕاستی پرۆژەی زانست ستێرکی فراوان کردنی تێگەیشتنی میتۆدمانە بۆ سروشت بە ڕێگایەک کە بەردەوام فراوانی بەخۆیەوە ببینێ، بەو شێوەیە تیشک دەخرێتە سەر ئەو پێوەندییە ئاڵ و گۆڕانە کە کەس پێشووتر بەلایدا نەدەچوو، بە بەردەوامی ژمارەی ڕووداوەکانی سروشت تۆمار دەکرێن لە چوارچێوەی تیۆرێکدا کە نەسقێکی تەواو پێک دەهێنن، بەلای پرنسیپەوە ئەم پێشکەوتنە هیچ کۆتایی نابێت،، بێجگە لەوە تیۆری زانستی ڕێ نادات بەهیچ چاوپۆشییەک، بەڵکو وا پێویستە کە بەسەر هەموو شوێنێکدا بسەپێنرێ، واتە یان هەموو شێک یان هیچ شتێک، بەو شێوەیە دەتوانین بڵێین ئەو ڕێبازە یان ئەو نەسقەی کە ئایدیالیستەکان لێی دەدوێن جۆرێکە لە نموونەی ئەفلاتوونی بۆ هەموو زانست، ئەویش زانستێکی خوداییانەیە هەروەک لیبینتس بۆی چوو، ڕاستیش پێوەندی هەموو شتێک بەشێوەیەک بە هەموو شتێکەوە ڕاستییەکە لە هەندێ لایەنەوە دانی پیا دانراوە، بەڵام ئەوە ڕاست نییە کە شتەکان بەگرێدانیان بە شتی ترەوە دەگۆڕێن، ئەو شێوە بیرکردنەوەیە بۆ زانست تووشی هەڵەمان دەکات لە مەسەلەی دووەمدا، ئەمەش هەڵەیە کە هەوڵ بدرێ مەسەلەکە هەمووی دەرکەوێ وەک ئەوەی ئەنجامێک بوو دامەزراو کۆتایی پێ هات، سیما شازەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی وای کرد کۆتایی پێ هاتنی مەحاڵ بێت، وا دیارە هەڵوێستی هیگڵیانە تا زۆر گرێدرابێت بە مەیلی گەشبینی زانستییەوە کە دوا بەشی سەدەی نۆزدەیەمی گرتەوە، کاتێک کۆمەڵ باوەڕی وابوو کە وەڵامی هەموو پرسیارەکان نزیک بووەتەوە، دوایی دەرکەوت کە ئەوە وەهمە و دەبوایە هەر لەسەرەتاوە چاوەڕوانی ئەمە بکرایە، لەمەڕ ئەو بابەتە بێهوودەییە پەنابردنە بەر بیری زانستی خوداییانە بۆ پاساودانەوەی ئەو هەڵوێستە ئەم جیهانەی کە تیایدا دەژین هەر چۆنێک ڕامان لەسەری بێت ئەوە نییە کە ئەو زانستە لایەنگری بێت، بەڵام ئەو جیهانەی لە دەرەوەی ئەم جیهانەماندان نابێت پێوەندییان پێمانەوە هەبێ، بەو شێوەیە نەسقی ئایدیالیستی چەمکێکی قەڵبە، بەڵام دەتوانین کە ئەو ئەنجامەی خۆی دابمەزرێنین بە نزیکبوونەوە لە مۆرکی ڕاستەوخۆ لە ڕێگای نموونە هێنانەوە، من باوەڕ بە کۆمەڵێک بیروباوەڕی دروست دەهێنم، وەک ئەو وتەیە وایە،دارتەلەکەی نلسون لە کۆشکەکەی بکنجهام بەرزترە، بەڵام هیگڵیزم شتێک لەو بابەتانە گەوار ناکات، بەڵکو بەم قسەیە ڕێی پێ دەگرێ کە (تۆ نازانیت دەربارەی چی دەدوێیت لە پێناو تێگەیشتنی ئەو ڕاستییەی لێی دەدوێیت دەبێ بزانی جۆرەکانی ئەو کەرەستانەی بەکارهێنراون لەو دوو بینایەدا، کە دروستی کردوون و بۆچی، بەو شێوەیە تا دوایی لەکۆتاییدا دەبێ حسابێک بۆ گەردوون بکەیت پێش ئەوەی بە مافی خۆتی بزانیت و بڵێیت تۆ دەزانیت کە مەبەستت چییە کاتێک دەڵێین دارتەلی نلسون بەرزترە لە کۆشکەکە) ، بەڵام لەم ڕایەدا ئەو کێشەیە دەردەکەوێ بۆم کە هەموو شتێ بزانم پێش ئەوەی شتێ بزانم، بەمەش مەحاڵ دەبێ بۆم کە بتوانم هەنگاوی یەکەم بنێم، بەڵام کەسێک نەگەیشتۆتە ئەوپەڕی لەخۆبردوویی و دان بەوەدابنێ کە زەینی هەمووی بۆشە، لەسەر ئەوەوە ئەمە شتێک نییە ڕاست بێت من زۆر چاک دەزانم کە دارتەلەکەی نلسون بەرزترە لەکۆشکەکە، گەر بەدەربووم لەوە ئەوە بانگەشەی زانستێکی خوداییانەی گشتی بۆ خۆم ناکەم ، ڕاستی شتەکەش ئەوەیە کە شتێ بزانی بێ ئەوەی هەموو شتێ دەربارەی بزانیت، وەک چۆن فۆنەتیکێک بە ڕێگایەکی ڕاست بەکاربهێنی بێ ئەوەی هەموو پیتەکانی بزانیت، وا دیارە هیگڵ لێرەدا دەیەوێ جەخت لەوە بکاتەوە کە هەر پارچەیەک لە کۆمەڵێ یاری منداڵان یەک شێوە پێک دەهێنن، تا هەموو شێوەکان چارەسەرنەکەین ناگەینە ماناکەی، بەڵام ئەزموونگەرایی دان بەوەدا دەنێ کە هەر پارچەیەک مانایەکی تایبەتی هەیە، گەر وانەبوایە ئەوا دەستمان نەدەکرد بە کۆکردنەوەی پارچەکان بەیەکەوە، ئەم ڕەخنەیەی ئەنجامێکی گرنگی هەیە لەبواری ئاکاردا کە ئاراستەی بیری نەسقی لۆژیک کراوە، لەبەر ئەوەی گەر تیۆرە لۆژیکییەکە ڕاست بوایە ئەوا ئەو تیۆرە ئاکارییەی کە لەسەری دامەزراوە ئەویش لەلای خۆیەوە ڕاست دەبێت، هەروەک وتمان دەرگا کراوەیە بۆ نارەزایی زۆر، لەم بوارەدا (واتە ئاکار) هیگڵیزم و لیبرالیەتی لوک لەسەر دوو ڕێی جیاواز دەوەستن، بەڕای هیگڵ دەوڵەت خۆی خێرخوازە، بەڵام خەڵکان لەنێو خۆیاندا هیچ گرنگیەکیان نییە، بەڵکو تەنیا لەوەدا گرنگیان هەیە کە چۆن بەشداری شکۆمەندی هەموو دەکەن و لایەنگرن بۆی، بەڵام لیبرالیزم لەڕێیەکی تردوە دەست پێ دەکات و وا سەیری دەوڵەت دەکات کە خزمەتی بەرژەوەندی کەسایەتی تاکەکانی دەکات، ئاشکراشە کە ڕای ئایدیالیستی دەمارگیری و توندوتیژی زیاد زۆرداریی لێ پەیدادەبێ، بەڵام ڕای لیبرالیزم پاڵپشتی لێبوردن و ڕێزگرتن و گونجاندن لەنێو ڕەوتە جیاوازەکان دەکات، ئایدیالیستی هیگڵ هەوڵدانێکە بۆ تێڕوانینی جیهان بەو سیفەتەی نەسقێکی پێکەوە گرێدراوە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو ناوکە گرنگەی کە تیایدا بە ڕۆحە، هیگڵیزم بەهیچ جۆرێک ئاراستەیەکی خودی تیادا نییە، بەڵکو دەتوانین بە ئایدیالیستی بابەتی وەسفی بکەین، پێشتر بینیمان

که چۆن شلنج لەم دواییەدا ڕەخنەی لە ڕێبازی بنیات گرت لە بنەڕەتی جەدەلیانەوە ئەم ڕەخنەیە لە ڕووی فەلسەفییەوە خاڵی سەرەتایی بوو بۆ هێرشێکی توند کە فەیلەسووفی دانیمارکی سورین کیرکجور کردبیە سەر هیگڵ، نووسینەکانی لەسەردەمی خۆیدا ئەو کاریگەرییەیان نەبوو، بەڵام دوای پەنجا ساڵ بووە سەرچاوەی بزووتنەوەی (بوونگەرایی)، کیرکجور (١٨١٣-١٨٥٥) لە کوبنهاگن لە دایک بووە، لە تەمەنی هەڤدە ساڵیدا پێوەندی کرد بە زانکۆی کوبنهاگنەوە، باوکی لە لاویدا ڕێی کەوتە پایتەختی دانیمارک و بە پیشەی کشتوکاڵ لەگەڵ کاری بازرگانی خەریک بوو سەرکەوتنێکی گەورەی لەو کارەیدا بە دەست هێنا، بەو شێوەیە کوڕ هیچ ناخۆشییەکی نەکەوتە ڕێگەی بۆ پەیداکردنی بژێوی، کیرکجور لە باوکییەوە ئەو زیرەکی و بەدیهییەی بۆمایەوە، بێجگە لە مەزاجی تێرامانی، لە ساڵی ١٨٤١ پلەی لە ماجستێری لاهوتدا هێنا، لەو کاتەدا کچێک بووە دەستگیرانی دوای دوودڵییەکی زۆر زانی کە جێگەی ئەو ڕێزە نەبووە وا سەیری کردووە پەیامە لاهوتییەکەیەتی بۆی، دوای جیابوونەوەی لە دەستگیرانەکەی کۆتایی بە مەسەلەکە هات، دوای ئەوەی خوێندنی تەواو کرد گەشتی بۆ بەرلین کرد و لە شلنج وانەی دەوتەوە، هەر لەو کاتەوە ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ تێرامانی لاهوتی و فەلسەفە، بەڵام ئەو کچەی کە ماوەیەک دەستگیرانی بوو ڕێگایەکی ماقوڵی گرت و شووی بە کەسێکی دی کرد، بابگەڕێینەوە بۆ ئەو ڕەخنەیەی کە شلنج ئاراستەی ڕێبازەکەی هیگڵی کرد، شلنج جیاوازی لەنێوان فەلسەفەی نەرێ و ئەرێتیدا کرد، یەکەم بەوەی بەدوای بۆچوونەکانی یان هەمووەکان یان چییەکاندا دەگەڕێ، گەر بمانەوێ زاراوەی قوتابخانەیی بۆ بەکاربهێنین واتە بەدوای (کنە- ئەوەدا دەگەڕا کە شتەکان بەچیدا دەناسرێن)، بەڵام فەلسەفەی ئەرێتی پێوەندی بە بوونی تەواوتییەوە هەیە، واتە لە (حاڵەتی شتەکاندا)، شلنج وای دەبینێ کە پێویستە فەلسەفە بە قۆناغی نەرێتی دەست پێ بکات دوایی دەگوێزرێتەوە بۆ ئاستی ئەرێتی، ئەم شێوازە ڕێبازی وەرگرتنی (شلنج)مان بیردەخاتەوە، هەروەها بەو ڕەوتەی فەلسەفە تایبەتەکەی گرتەبەر و بەرەو پێشی برد، کە بەدوو قۆناغدا تێپەڕین، نووسینەکانی یەکەمی شلنج نەرێتییە و ئەمانەی دوایی ئەرێتییە بە واتای هەردوو وشەکە، ڕەخنەی سەرەکی کە ئاراستەی هیگڵ کراوە ئەوەیە دوای ئەوەی کە لەبواری نەرێتیدا خۆی بەبێ هۆشی بینییەوە هەوڵی دا جیهانێکی واقعی کە ئەرێتی تر بێت بهێنێتە ئاراوە، سەرچاوەی بوونگەرایی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم ڕەخنەیە، ئەمەش ناڕەزاییەکی لۆژیکی بوو بەرامبەر بەهیگڵ، ناڕەزایی تر لای کیرکجور هەیە کە بایەخەکەی لەوە کەمتر نییە، ئەویش ناڕەزایی سۆزدارییە، یان ویژدانییە، هیگڵیزم ڕەوتێکی تیۆری وشکە بوار بە هەڵچوونە دەروونییەکان نادات ئەم ڕەخنەیە ڕاستگۆیانە هەموو فەلسەفەی ئایدیالیستی ئەڵمانی بەشێوەیەکی گشتی دەگرێتەوە، تەنانەت تێرامانەکانی ئەم دواییەی (شلنج)یش لێی دەرباز نەبووە، پێش ئەوە سەردەمی ڕۆشنگەری بەرەو ئەوە دەچوو بەشێوەیەک لە سەرسوڕمان بڕوانێتە ئەو هەڵچوونانە، کیرکجور دەیەوێ ڕێزە فەلسەفییەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە، ئەمەش لەگەڵ ڕۆمانتیکیەتەکەی شاعیرانەدا دەچێتە ڕێوە و بەرپەرچە لەگەڵ ئاراستەی ئەو ئاکارەدا کە چاکە بە ئەپستمۆلۆژی و خراپە بە نەزانینەوە دەبەستێتەوە، بە ڕاستی بوونگەرایی ئەوەیە گەر ئیرادەمان لە ئاوەز دابڕان بەرێگای خستنەسەر یەک، وات کرد کە سەرنجمان بۆ ئەوە ڕاکێشیت کە مرۆڤ پێویستی بەوەیە کە هەڵبژێرێ و شت بکات ئەمەش ئەنجامی بیرکردنەوەیەکی فەلسەفییانە نییە، بەڵکو پاڵنەری مومارەسەی لەخۆوەی ئیرادەیە، وا دەکات کە بوارێک بکاتەوە بەشێوەیەکی زۆر بە ئاسانی بۆ باوەڕبوون تا وای لێ دێ گەوارکردنی بیروباوەڕە دینییەکان لەم حاڵەتەدا کردارێکی ئیرادی ئازاد بێت، زۆرجار ئەم بیروباوەڕە بوونگەراییە دارشتەی ئەو وتەیە وەردەگرێ کە بوون پێش چییەکان دەبن، ئەوەش کە ناتوانین بە قسە گوزارشتی لێ بکەین، یەکەم ئێمە دەزانین کە شتێک بوونەوەرە دوای ئەوە دەزانین کەچی لێ دێ ئەمەش مانای ئەوە نییە کە بەشێک پێش هەموو دانێین، یان ئەرستۆ پێش ئەفلاتوون دابنێین، کیرکجور ئیرادەی پێش ئاوەز دانا، تاوای بۆچوو کە پێویست بێت لەسەرمان کە زۆر لە پێویست زانستی بین بۆ ئەو هەموو شتانەی پێوەندییان بە مرۆڤەوە هەیە، زانست تەنیا بەدوای ئەوەدا دەگەڕێ کە گشت بێ، ناشتوانێ دەست لە شتەکانەوە بدات تەنیا لەدەرەوە نەبێت، کیرکجور دان بەو ڕێگە بیرکردنەوەی بوونگەراییەدا دەنێ کە دەچێتە ناو ناواخنی شتەکانەوە، لە حاڵەتی مرۆڤدا، وای دەبینێ کە خۆمان لەوەی کە گرنگییەکی ڕاستی هەیە، سۆز جۆرێکی تایبەتە بە هەموو تاکێک تێگەیشتنمان بۆی تەنیا بوونگەراییانە دەبێ، کیرکجور وای دەبینێ کە تیۆرە ئاکارییەکان زۆر بە توندی عەقڵانین وەک لەوەی ڕێگا بە خەڵکان بدەن ژیانیان بەپێی ئەو ڕێک بخەن، لە توانایی هیچ تیۆرێکیدا نییە کە شێوازێکی جودا تێبگەیەنرێ بە ڕێگەیەکی بێ تەنگ و چەڵەمە بۆ ڕەفتاری ئاکاری تاک، لەسەرروو ئەوەوە دەتوانرێ هەمیشە نموونەی پێچەوانە بهێنین یان حاڵەتە بەرچاوەکان بهێنین کە سەرپێچی

بنەما دەکەن، لەپێناو ئەم هۆیەدا کیرکجور بووە هەڵگری پرنسیپە دینییەکان نەک ئاکارییەکان، ئەم هەڵوێستەش لەگەڵ کولتووری (ئۆگستین)دا ڕێکە کە کاریگەریەکەی مایەوە لەنێو پروتستانیەتدا، مرۆڤ تەنیا لەبەردەم خودا و فەرمانەکانیدا بەرپرسیارە و هیچ بوونەوەرێکی بەشەری مافی ئەوەی نییە کە خۆی تێ هەڵقورتێنێ و ئەم پێوەندییە بگۆڕێ، دین لای کیرکجور مەسیحییەکی زۆر دڵسۆز بوو، سرووشتی بوو کە ڕاکانی وای لێبکات مەسەلەیەکی بیرکردنەوەی بوونگەرییانەیە، مادامەکی لە ناخی دەروونەوە دێتە دەر، کیرکجور ڕووبەرووی کڵێسەی ڕەسمی دانیمارکی بێتەوە، بەو پێیەی کە دەزگایەکی ڕەق هەڵاتووە، دژایەتی لاهوتی عەقڵانی دەکرد لەو شێوە دارشتنەدا کە مامۆستا لێهاتووەکانی دایانڕشتبوو، کەواتە پێویستە بوونی خودا بوونگەراییانە دەرک پێ بکرێ، مەحاڵ دەبێت سەلماندنی ئەو بوونەوەرە بە هەر بەڵگەیەک کە سەر بە بواری چییەکان بێت، بەو شێوەیە کیرکجور هەروەک پێشوو ئیمان باوەڕبوون و ئاوەز لێک جودا دەکاتەوە، کیرکجور لە ڕەخنەکەی هیگڵەوە خاڵی دەرچوونی بیرۆکەکەی دەست پێ کرد، کە هەر لەسەرەتاوە ڕەخنەیەکی ڕاست بوو، بەڵام فەلسەفەی بوونگەرایی کە لەسەر ئەو ڕەخنەیە دامەزرا و بە هەمان توانایی ڕاستگۆیی ستایش ناکرێ، لەبەر ئەوەی کە چوارچێوەی ئاوەزی تەنگژە کردووە وای لێ کردووە کە دووچاری ئەو جیاوازییانەی دەکات کە جێیان نابێتەوە، وەک زانراوە ئەم جۆرە جیاوازیانە، لەسەر ئاستی باوەڕبوون، شتێکی چاوەڕوانکراو نەبووە، بەڵکو وا پێ چووە کە جێی ڕێز بووە بۆی، ئارمێکی کۆن هەیە کە باوەڕدارانی سرووش ڕێزی لێ دەگرن ئەویش (باوەڕدەهێنم لەبەر ئەوەی، ئەوەی باوەڕی پێ دەهێنم ماقوڵ نییە)، (a bsurdum Credo quia)، دەتوانین بە مانایەکی تر بڵێین کە ئەوان لەسەر هەقن لەو بارەیەوە، گەر بتەوێ ئازادیت پیادە بکەیت لە باوەڕبووندا، باشترە وایە خۆت ببەستیت بە شتێکی نەناسراوەوە، بەڵام ئەرک وایە کە کەمکردنەوە لە باری ئاوەز کەمکردنەوەی مەترسی نییە لە زیادەڕۆیی ڕێزگرتنیدا، هیگڵ زیاد لە پێویست دەیڕوانیە ئاوەز، لێرەوە کەوتە ئەو هەڵەیەوە کە باوەڕی وابوو هەموو گەردوون پێ دەچێ لە ئاوەز لە دایک بێت، بەڵام کیرکجور لە ئاراستە جیاوەزەکەدا بەرگری کرد، وای بۆچوو کە ئاوەز توانای ئەو یاریدەیەمان نادات بۆ دەرک پێکردنێکی جۆری و ئەو جۆرە ڕایەی نکۆڵی لەبەهای هەر زانستێک دەکات، کە لەگەڵ کاکڵەی ڕێبازی ڕۆمانتیکیدا یەک دەگرێ، بەو شێوەیە کیرکجور سەرەڕای ئەوەی کە ڕەخنەی توندی لەشێوازی ژیانی ڕۆمانتیکی دەگرت لەسەر ئەو بنەڕەتەی کە بە هەموو شێوەیەک ملکەچی هەڵاوگێڕە کاریگەریە دەرەکییەکانە، کە خۆشی بەو مانایە ڕۆمانتیکییەکی تەواو بوو، بەڵکو هەمان ئەو ڕێبازەی کە شێوازی بیرکردنەوەی بوونگەراییانەی لەسەر بنیات دەنرێ، بۆچوونێکی ڕۆمانتیکیانەیە کە تێکەڵی بەسەریدا زاڵە.

* * *

بەو شێوەیە ڕەتکردنەوەی هیگڵ لەلایەن بوونگەراییەوە لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ نکۆڵی کردنی ئەو هزرەی کە دەڵێ جیهان خۆی نەسقێک پێکەوە دەنێ، واقعیش بوونگەرایی تیۆری واقعیانە لە ئەپستمۆلۆژیدا دەسەپێنێ، بە مانای دژایەتی بۆ تیۆری ئایدیالیستی، سەرەڕای ئەوەی کیرکجور خۆی لەدەرگای ئەو بابەتە نەداوە، لەوانەشە نارەزایی تر بێتە کایەوە، کە جیاوازییەکی زۆر هەبێت لە فەلسەفەی هیگڵ گەر بگەڕێینەوە بۆ دوالیزمەکەی (کانت)ی ڕاستکراوە، کە لە فەلسەفەکەی (شوپنهاوەر)دا دەیبینینەوە، ئارتور شوپنهاوەر (١٧٨٩-١٨٦٠) کوڕی بازرگانێکی دانتسج Danzigی بووە ڤۆلتێر جێی سەر سوڕمانی بووە هاریکاری ڤۆلتێری دەکرد بۆ ڕێز لێگرتن لە ئینگلتەرا، کاتێک دانتسج ئازاد کرا، چووە سەر بروسیا لە ساڵی (١٧٩٣)دا خانەوادەکەی گواستیانەوە بۆ هامبۆرگ، لە ساڵی (١٧٩٧) بەرەو پاریس کەوتەرێ و لەوێ جێنشین بوو، دوو ساڵی تیا مایەوە لەوێ وای لێ هات خەریک بوو زمانی دایکی لەبیربچێتەوە لە ساڵی (١٨٠٣) بەرەو ئینگلتەرا کەوتەرێ و چووە قوتابخانەی ناوخۆیی بۆ ماوەی شەش مانگ مایەوە ئەمەش بەس بوو بۆ ئەوەی بەرامبەر قوتابخانە ئینگلیزیەکان کین هەڵگرێ، بەڵام فێری زمانەکە بوو بە درێژایی دوا ساڵەکانی خووی دابووە خوێندنەوەی ڕۆژنامەی (تایمس)ی لەندەنی، کاتێک گەڕایەوە هامبورگ بە پەرۆشەوە هەوڵی دا کە کاری بازرگانی بکات، بەڵام بەهۆی مردنی باوکیەوە وازی لێ هێنا دوایی دایکی گواستیەوە بۆ ڤیمار لەدوای ماوەیەکی کەم بووە خاوەن دیوەخانێکی ئەدەبی کە زۆر لە شاعیران و نووسەران و گەورە پیاوانی ئەوێ هات و چۆیان بۆ دەکرد، نەک هەر ئەوە، بەڵکو دوایی خۆی بووە ڕۆژنامەنووس، بەڵام کوڕەکەی لەگەڵ مەزاجی توندیدا هەڵنەکەوت شێوازی ژیانی کە بەشێک لەسەربەخۆیی تیادا بوو تووشی هەڵچوونی دەکرد کاتێک تەمەنی گەیشتە بیست و یەک ساڵ هەندێ لە میراتی پێ درا، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دوورکەوتنەوە ڕووی دا لەنێوان کوڕ و دایکدا، ئەو میراتە هەلی خوێندنی زانکۆیی بۆ ڕەخساند، یەکەم جار لە جوتنجن لە ساڵی (١٨٠٩) خوێندی، بۆ یەکەم جار فەلسەفەی (کانت)ی

بەرچاوکەوت و کەوتە خوێندنەوەی، دوایی لە ساڵی (١٨١١) گواستیەوە بۆ بەرلین خوێندنەوەکانی زیاتر لەسەر زانست بوون، واتە زیاتر قووڵ دەبۆوە لە زانستدا، فشتە ئامادەی هەندێ لە وتنەوەی وانەکانی دەبوو بەڵام گاڵتەی بە فەلسەفەکەی دەکرد، لە ساڵی (١٨١٣) خوێندنی تەواوکرد کاتێک جەنگی ڕزگاری هەڵگیرسا«١» ئەو ڕووداوانە هیچ جۆرە کاریگەرییەکیان نەکردە سەری، لە ماوەی ساڵەکانی دواتردا لە فیمار (جوتە)ی ناسی، دەستی کرد بە لێکۆڵینەوەی سۆفیزمی هندی، لە ساڵی (١٨١٩) لە زانکۆی بەرلین دەستی بەوانە وتنەوە کرد، زۆر باوەڕی بە بلیمەتی کەسایەتی خۆیەوە هەبوو، بە ئامانەتی نەدەزانی کە ئەو ڕاستییە لە خەڵک بشارێتەوە، بە تایبەتی ئەوانەی کە نەیاندەناسی، لەبەر ئەم هۆیە بۆ وانە وتنەوەکانی وادەیەکی دادەنا کە هەمان ئەو کاتەبوو هیگڵ وانەی دەوتەوە، کە زانی لەلایەن هیگڵییەکانەوە هیچ وەڵامێک نەبوو، یان وەڵامیان نەدەدایەوە بڕیاری دا وانە نەڵێتەوە و لە فرانکفۆرت نیشتەجێ ببێ تا دواساتەکانی ژیانی لەوێ بمێنێتەوە، سەرەڕای ئەوەی شوپنهاوەر وەک مرۆڤێک لە خۆبایی بوو خاوەنی هەستێکی تاڵاو و داچوون بوو، حەزی لە ناوبانگی بوو، بەڵام لەدوا ساتەکانی ژیانیدا ناوبانگی دەرکرد، شوپنهاوەر لە ساڵانی تەمەنی گەورەییدا گەیشتە ڕا فەلسەفییەکانی، ساڵی (١٨١٨) کتێبە سەرەکییەکەی بەناوی (جیهان وەکو ئیرادە و وێناکردن)ی دەرکرد، ئەمە لە تەمەنی سی ساڵیدابوو، لە سەرەتادا هیچ کەس خۆی لە کتێبەکەی نەگەیاند، لە کتێبەکەیدا شێوەیەکی ڕێکی بۆ تیۆرەکەی (کانت) پێشکەش کرد، بە ئەنقەست (بەو شتەی لەخۆیدایە)ی تیاهەڵگرت و پاراستی شوپنهاوەر بە پێچەوانەی کانت وای دەبینی کە شتێک لەخۆیدا ئیرادە خۆیەتی، بەو شێوەیە سەیری جیهانی ئەزموونی دەکرد، هەروەک کانت پێی هەستا کە لە دیاردەکان پێکدێت بە مانای (کانت)ی ئەو هۆیانەی وا لە دیاردەکان دەکەن کۆمەڵێ شت نین لەخۆیاندا کە شایستەی زانین نەبن، بەڵکو ئیرادە خۆیەتی کە خۆی شتە لە خودی خۆیدا، ئەم هەڵوێستەش زۆر لەو ڕا باوەی (کانت)ەوە نزیکە، بینیمان کە کانت وا دەیڕوانیە ئیرادە کە دەکەوێتە لایەکی شتەکان لەخۆیدا ئەمە ئەگەر مومارەسەی ئیرادەم بکەم، ئەوەی لە جیهانی ئەزموونا ئاوڕی لێ نەدراوەتەوە بزاوتی جەسەدە، کانت لەم بارەیەوە سەرنەکەوت بۆ تێپەڕاندنی ڕێبازی بۆنەیی -Oc casioealism، کەوابێ هەروەک پێشوو بینیمان مەحاڵ دەبێ کە پێوەندی هۆکارەکی هەبێت لەنێوان شتەکان لەخۆیاندا و لە دیاردەکاندا بە هەرحاڵ شوپنهاوەر وا سەیری جەسەد دەکات کە ڕووکەشێکە، حەقیقەتەکەی لە ئیرادەدا پەیدا دەبێ، لای (کانت)یش بەو شێوەیەیە، جیهانی شتەکان لەخۆیاندا شوێن و کات و گوتەکان تێدەپەڕێنێ، ئیرادە سەرەڕای ئەوەی شتە لەخۆیدا، بەڵام لەو ڕۆڵەیدا ملکەچ نییە بۆ ئەو شتانە دواییش کات و شوێنیش نییە، ئەمە تەنیاییان دەردەخات، بەقەد ئەوەندەی حەقیقی بم، مەبەستم ئەوەیە بە قەد ئەوەندەی پێوەندی بە ئیرادەمەوە هەیە لێک دابڕاو و جیاواز نابم، بەڵکو لێک دابڕاو و جیاواز هەڵخەڵەتاندنێکە لایەنگری جیهانی دیاردەکان دەبێت، ئیرادەم یەکایەتی گشتگیرە و پێچەوانەی ئەوەشە، شوپنهاوەر وا دەیڕوانیە ئەو ئیرادەیە کە لەسەرەتادا شەڕانگێزە و بەرپرسیارە لەو ئازارانەی کە حەتمەن پێوەند دەبێت بە ژیانەوە، سەرەڕای ئەوەش ئەپستمۆلۆژی ئەو چاوگە ئازادیە نییە کە لەلای هیگڵ هەیە، بەڵکو سەرچاوەی ئازارە، بەو شێوەیە لە بری ئەو مەیلە گەشبینییەی کە ڕێبازە عەقڵانییەکان پێی دەناسرێن لەلای شوپنهاوەر بووە تێڕوانینێکی ڕەشبینانە، کە تیایدا جێگای خۆشی نابێتەوە، بەڵام سێکس بە ڕۆڵی خۆی کردارێکی شەڕانگێزیە، لەبەر ئەوەی هەر کارێک کە ئەندامی زاوزێ پێی هەڵدەستێ، ئەوەیە کە قوربانی نوێ بۆ ئازار و ناخۆشی دەدەن، ئەم ڕایە پەیوەست بوو بەو ڕقەی کە شوپنهاوەر بەرامبەر ژن هەیبوو باوەڕی وا بوو ژن لەم بارەیەوە لە پیاو زیاتر ڕۆڵی ئەغز دەبینێ، لە ڕاستیدا هیچ هۆیەکی لۆژیکی نییە کە وا بکات تیۆری ئەپستمۆلۆژی کانتی بەو شێوەیە پێوەند بێت بە تێڕوانینی ڕەشبینانە بۆ جیهان، مەسەلەکە هەر ئەوەندەیە کە شوپنهاوەر خۆی بەهۆی ئەو مەزاجەی کە هەیبوو لەتوانایدا نەبوو بەختیار بێت، دواییش ڕایگەیاند کە بەختیاری شتێکە مەحاڵە پێی بگەیت پێش ئەوەی ژیان کۆتایی پێ بێت، جیهان دانی نا بە نووسینەکانیدا، باری بژێوی کەمێک باش بوو ئەمە وای لێ کرد کە لە پڕ بگۆڕدرێ بۆ کەسێکی دڵخۆش، سەرباری تیۆرەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاست نییە بەو شێوەیە وەسفی هەڵوێستی عەقڵانی زیادەڕۆیەکەی بکەین دەربارەی باوەڕ پێکردنی چاکەی ئەم جیهانە و بڵێین کە هەڵوێستێکی تەواوە، لەو ماوەیەی کە بیرمەندێکی وەک سپینۆزا نەبوو لە ڕووی تیۆریەوە ئامادەیی هەبێ بۆ بینینی خراپە، شوپنهاوەر چووە لایەنی دژەکان و نەیتوانی چاکە ببینێ لە شتەکاندا، شوپنهاوەر وای دەبینی کە چارەسەرکردنی ئەم ڕەوشە نالەبارە پێویستە لە ئەفسانەکانی (بوزیە)تەوە دەربهێنرێ، ئەوانەی دەبنە هۆی ئازارمان کردەوەکانی ئیرادە خۆیەتی، دواییش ئێمە دەتوانین لە کۆتاییدا لە ڕێگەی ئاگادارکردنەوەی ئیرادەوە

بگەینە (نرڤانا) واتە عەدەم، بێ هۆشی سۆفیزمانە وامان لێ دەکات کە پەردەی (مایا- کە هێمایە بۆ وەهم و پووچەڵ بوونەوە) ببڕین، بەو شێوەیە دەتوانین جیهان وا ببینین کە یەکە، دوای ئەوەی ئەو ئەپستمۆلۆژەمان وەرگرت، ئیرادە دەڕمێنین، لەم حاڵەتەدا زانینی یەکێتی نامان گەیەنێتە ئەوەی لەگەڵ خودا پێوەندی هەبێت، وەک ئەو حاڵەتەی لای سۆفیزمی خۆرئاواییەکان هەیە نموونەی ئەوەش ئیکهارت Eckhart دەهێنینەوە، هەروەها لەگەڵ جیهانی ئسبینوزا یەکیان ناخات کە ئەو و خودا یەک شتن، بەڵکو ئەنجامگیری بۆ هەموو هەروەها هاوسۆزی لەگەڵ ئازار و تاڵیەکان بە پێچەوانەی ئەوەوە دەستەبەری هەڵهاتنمان دەکات بۆ عەدەم، فەلسەفەی شوپنهاوەر جەخت لەسەر گرنگیەتی ئیرادە دەکاتەوە، بە پێچەوانەی ڕێبازە عەقلانیەکانی قوتابخانەی هیگڵیزمەوە، زۆربەی ئەو فەیلەسووفانەی کە خاڵی هاوبەش لە زۆر شتدا کۆی نەدەکردنەوە ئەو ڕایەیان هەڵگرت، لای نیتشەش دەبینین و هەروەها لای برگماتیەکانیش دەبینین، نموونەی ئەوەش بایەخدانی بوونگەراییە بە ئیرادە لە بری ئاوەز، بەڵام دەربارەی مەیلی سۆفیزم کە لە ڕێبازی شوپنهاوەر بەڕێ دەکرێ لە دەرەوەی ڕەوتی سەرەکی فەلسەفەدا ڕادەوەستێ، ڕاستیش ئەوەیە گەر فەلسەفەی شوپنهاوەر لە کۆتاییدا هەوڵ دەدات ڕێگایەک بدۆزێتەوە کە لەم جیهانە و ململانێکەی دەرچێ، نیتشە (١٨٤٤- ١٩٠٠) بە ڕێگەیەکی دژ دا دەڕوات، ئاسان نییە کەسێک ناوەرۆکی بیرۆکەی نیتشە پوختە بکات، بەمانای ئاشنایی فەیلەسووف نەبووە، نمایشێکی میتۆدانەی بۆ ڕاکانی بەجێ نەهێشتووە، ڕێگا بەخۆمان دەدەین کە بەخاوەن مەیلێکی مرۆڤایەتی ئەرستۆکراتی بەمانای پیت بۆ وشە وەسفی بکەین، بەرزکردنەوەی مرۆڤی لەبارتر بوو، واتای تەندروستییەکی باشی بێت و بەهێزترین کەسایەتی هەبێ، ئەمەش وای لێ کرد کە گرنگی بدات بە تۆکمەییان پتەوی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کلۆڵی، ئەمەش تا کەمێک سەرپێچی دەبێت لە پێوانە ئاکاریە بڵاوەکان گەر سەرپێچی جێبەجێی کردارە پێویستییەکان نەکات، زۆربەی خەڵک گرنگیان بەو سیمایانە دا بێ ئەوەی بیخەنە سەر ڕێی سروشتی خۆی، لە نیتشەدا مژدەدەری سیستەمێکی زۆرداری سیاسیان تیا بەدی کرد لەم سەردەمەماندا، زۆر پێ دەچێ کە هەندێ لە زۆردار لە نیتشەوە هەندێ سروشتیان وەرگرتبێ، بەڵام دادپەروەری نییە بیکەینە بەرپرسی شەڕەنگێزی ئەو خەڵکانەی کە تێی نەگەیشتوون، تەنیا ڕووکەشانە تێی گەیشتوون، لەبەر ئەوەی نیتشە ئەو نارەزاییە بەهێزەی دروست دەکرد کە وڵاتەکەی چی لێ بەسەر هاتووە بەهۆی پێشکەوتنە سیاسییەکانەوە، گەر تەمەن ڕێی پێ بدایە، ئەوا ئەو پێشکەوتنەی بەچاوی خۆی دەدی، نیتشە کوڕی قەشەیەکی پرۆتستانتی بوو، واتە لە خانەوادەیەکی باوەڕدار هاتۆتە دنیا، مانەوەی کاریگەری ئەو توخمە بە پێزانە لە ئاکارە بەرزەکەیدا و لە شاکارەکانیدا دەبینرێ، تەنانەت ئەوکارانەی کە تیایدا یاخی بوون دەگەنە ئەوپەڕی، لە هەرەتی لاویدا سەلماندی کە لێکۆڵەرەوەیەکی زانستی زۆر باشە، لە تەمەنی بیست و چوارساڵیدا بووە مامۆستای فقەی زمانە کۆنەکان لە زانکۆی (بازل)، دوای ساڵێک لەو مێژووە جەنگ لەنێوان فەرەنسا و بروسیادا هەڵگیرسا، ئەوکات نیتشە ببووە هاوڵاتیەکی سویسری تەنیا ئەوەی لەسەر بوو کە لە خزمەتی سەربازیدا کاری برین پێچی بکات، دوای ئەوەی تەندروستی تێک چوو بەهۆی نەخۆشی (دوسنتاریا)وە لە خزمەت بەربوو، گەڕایەوە بۆ بازل، ڕاستیش تەندروستی هەمیشە لەحاڵەتێکی خراپدا بووە، لەو نەخۆشییەی کە لە خزمەتکردنی سەربازیدا تووشی هات چارەسەری یەکجاری نەکراو هەر بەنەخۆشی مایەوە و وای لێ هات کە لە ساڵی (١٨٧٩)دا دەست لە پلەکەی بکێشێتەوە، مووچەیەکی وای کەوتە دەست کە توانی ژیانێکی ئاسوودە بژی، دە ساڵی دوایی تەمەنی لە سویسرا و ئیتالیا بەسەربرد بەکاری نووسینەوەی بەسەر دەبرد، زۆربەی کات گۆشەگیربوو کەس دانی پیا نەدەنا، لە ساڵی (١٨٨٩) تووشی شێتی بوو، تا مردنی بەشێتی مایەوە، شاکارەکانی نیتشە سەرچاوەکەی دەگەڕێنەوە بۆ یەکەم شوێن لە نموونەی بەرزی یۆنانی لەسەردەمی پێش سوکراتدا بەتایبەتی (ئەسبرطە)، کتێبی سەرەکی یەکەمی (لە دایک بوونی تراژیدیا) ساڵی (١٨٧٢) باس لەو جیاوازییە بەناوبانگەی نێوان هەردوو حاڵەتی (ئەلئەبولونیە) و (ئەلدیونیزیە)ی ڕۆحی یۆنانی کردووە، مەزاجی دیونیزی کە هەڵچوونێکی قووڵی پێوەیە پەیوەستە بەو ڕاستییە تراژیدیایەی کە ژیانی مرۆڤی پێ ناسراوە، بەڵام (با نشیونی ئەو لیمبی) جۆرێکە لە خەونی ڕوون کە جێگەی کاریگەری لایەنی ئازار لە ژیانی بەشەریەتدا دەگرێتەوە، ئەم خەون بینینە لەو توخمە ئەبولونییەکەی کە لە دەرووندا هەیە هەڵدەقوڵێ، بەو شێوەیە دەتوانین تراژیدیای گریکی بەشکۆمەندی ئەبولونی وەسف بکەین، لە ئارەزووە داخوازیە دیونیزییەکانە، لەپێشدا ئەوەمان بینی کە ئەرستۆ لە هەموو مەسەلەکاندا هاوشێوەی ئەو ڕایەی هەبووە، دوایی نیتشە لەو نمایشەیدا کە پێشکەشی کرد بۆ شێوازی تراژیدیا بیرۆکەی پاڵەوانی تراژیدی بوو، ئەو بە پێچەوانەی ئەرستۆوە وای نەدەبینی کە لە تراژیدیادا کەرەستەیەکی جیا هەبێ بۆ سڕینەوەی هەڵچوونەکان،

گەوارکردنێکی ئەرێتی تیادەبینی بۆ ئەو ژیانەی کە وەک خۆی چۆن هاتووە ئاواش دەروا، بەڵام شوپنهاوەر گەیشتە ئەنجامێکی ڕەشبینانە، دەبینین نیتشە هەڵوێستێکی گەشبینانە دەگرێتە بەر وای بۆ دەچێ کە لەوانەیە بگەینە ئەوە گەر تراژیدیە گریکیەکان بەشێوەیەکی تەواو ڕاڤە بکرێن، بەڵام دەبوایە ئاگاداری ئەوە بوایە کە ئەمە لەنێو خەڵکیدا گەشبینی نەبووە بەو مانا باوە، واتە جۆرێکە لە گەوارکردنی دژایەتی بۆ ڕاستییەکانی ژیانی قورس و گران ئەویش وەک شوپنهاوەر دان بە ئەولەویەی ئیرادەدا دەنێ، بەڵام هەنگاوێکی دوورتر دەهاوێ، لە ئیرادەی بەهێزدا سیماچاکەکانی مرۆڤ دەبینێ، بەڵام شوپنهاوەر ئیرادەی بەسەرچاوەی هەموو خراپەیەک دەبینی، نیتشە جیاواز کاری دەکات لەنێوان دوو جۆر خەڵکدا کە بۆ هەریەکەیان ئاکاری تایبەتیان هەیە، ئەو دوو جۆرە خەڵکە گەورەکان و کۆیلەکانن، ئەم تیۆرە ئاکاریە کە لەسەر جیاوازکاری دامەزراوە لە کتێبی (دوای چاکە و خراپە)دا نمایشی دەکات، کە لە ساڵی (١٨٨٦) بڵاوی کردۆتەوە، لەلایەکەوە ئاکاری گەورەکانمان هەیە کە چاکە لەگەڵ سەربەخۆیی و کەرەم و باوەڕ بەخۆ بوون تێیدا گرێ دراون، مەبەستم هەموو ئەو کارە چاکانەی کە مرۆڤ پێی وەسف دەکرێ (خاوەن دەروونە گەورەکان)ی لای ئەرستۆ، بەڵام کەم هێنە بەرامبەرەکەی ژێردەستەیی و بێ فیزی و خۆنەماددیی و... تاد، کە خراپە دەنوێنێ، لێرەدا بەرابەرەکی دەبینین لەنێوان چاکە و خراپەدا و یەکسان دەبێ بەلایەنی کەمەوە و دژایەتیکردنی لەنێوان پیاو چاک و بێفەڕدا هەیە، بەڵام ئاکاری کۆیلە لەسەر ڕێبازی زۆر جیاوازی دادەمەزرێ، لای ئەو چاکە شێوەیەکە لە بەدەستەوەدانێکی تەواو، تەنیا ئەو ئەرکەی لەسەرە کە ئەو ئازار و تاڵاویانە هێورکاتەوە و ئاواتەکان بکوژێ لەلایەکی ترەوە ئەو سیفەتانە ڕێک دەخات کە لە ئاکاری گەورەکاندا خێرە و بە شەڕ دەیبینێ نەک بەتەنیا بێ حاڵییەکی ئاکاریانە بێ، لەبەر ئەوەی کەسی چاک لە ئاکاری گەورەکاندا لای کۆیلە بە مەترسی دەردەکەوێ، هەموو ڕەفتارێک لە دیدی ئەودا ترس دەوروژێنێ، بەڵام ئاکاری پاڵەوان یان (مرۆباڵا- سوپرمان- Super-man) دەکەوێتە ئەودیو چاکە و خراپەوە، نیتشە ئەم بیروباوەڕەی لە کتێبی (وەها زەردەشت دوا) نمایش دەکات، لەشێوەی بانگهێشتنی ئاکار کە لە شێوازەکەیدا لاسایی وشەکانی کتێبی پیرۆز دەکاتەوە، بە ڕاستیش نیتشە لە ئەدەبدا هونەرمەندێکی بلیمەت بوو، نووسراوەکانی زیاتر نزیکترن لە پەخشانە شیعرەوە وەک لە فەلسەفە، قێزەوەنترین شت لای نیتشە سەرهەڵدانی ئەو شێوازە نوێیە بوو لە مرۆڤایەتی کۆلەکتیڤیدا کە لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای نوێدا گەشەی کرد، بەڕای ئەو، وەزیفەی ڕاست بۆ کۆمەڵ ئەوەیە کە کۆمەڵ وەک کارگەیەک وابێت بۆ هەڵهێنانی بلیمەتە دەگمەنەکان ئەوانەی دەبنە نموونەیەکی بەرزی ئەرستۆکراتییەت، بەڵام ئەو ئازار و دەردانەی کە دووچاری خەڵکانی سادە دەبن لە ڕوانگەی ئەوەوە هیچ گرنگیەکی نییە، ئەو جۆرە دەوڵەتەی کە بەخەیاڵیدا دەهات تارادەیەکی زۆر لەو دەوڵەتە نموونەیەی کۆمارەکەی ئەفلاتوون دەچوو، وای دەبینی کە بیروباوەڕە باوەکان تەنیا کەرەستەیەکن پشت بەست دەبن بە ئاکاری کۆیلەوە.

بەڕای ئەو، مرۆڤی ئازاد پێویستە دان بەوەدا بنێ کە(خودامرد)، دوایی هەوڵدانەکەی ئاراستەی ئەونابێت، بەڵکو دەچێت بۆ شێوەیەک کە باڵاتر بێ لە مرۆڤ، نیتشە وای دەبینی کە ڕوونترین فۆرم بۆ ئاکاری کۆیلە مەسیحیەتە، لەبەر ئەوەی مەسیحیەت بەرەو ڕەشبینی دەچێت کاتێک دەروونەکان هۆدوز دەبن بەو ئاواتە چاکترەی لەو دنیایەی تردا هەیە ڕێزی خۆی نیشان دەدات بەرامبەر شتە بەجێ داچووەکان، وەک خۆ بە زل نەزان و بەزەیی، ڕارەوی (ڤاگنەر) لەدوا ساڵەکانی تەمەنیدا کە بەرەو مەسیحیەت چوو وای لە نیتشە کرد هێرش بباتە سەر ئەو هونەرمەندە مۆزیکازانەی کە پێشووتر وەک هاوڕێیەک پێی سەرسام بوو، لەگەڵ پەرستنی پاڵەواندا مەیلێکی توندی کینی برەری هەبوو بەرامبەر بە ژن، حەزی دەکرد مامەڵە لەگەڵ ژن بەشێوەی ڕۆژهەڵاتیانە بکرێت واتە وەک مێگەڵ، بەڕای ئێمە ئەمە ئاراستەیەکە کە نیتشە نەیتوانی مامەڵە لەگەڵ جنسی ناسکدا بکات، ئەم تیۆرە هەندێ وردەکاری سوودبەخش دەگرێتە خۆ بۆ هەموو تەرزە بەشەرە جیاوازەکان و ڕەفتاریان بۆ چارەسەرکردنی باری ژیانیان، لایەنی زۆر هەیە بۆ بیرۆکەی بانگهێشت کردنی جۆرێک لە توندی و دیسپلین، بەو مەرجەی کە خەڵک جێبەجێی بکات بەسەر خۆیدا، بەڵام بەو شێوە ئاسانییە ناتوانین قەناعەت بکەین بە بیرۆکەی زیادەڕۆیی نەکردن بەرامبەر بەو ئازارانەی کە زۆرینە بەرگەی دەگرن لەپێناو کەمینەدا.

**(١) لێرەوە مەبەست لە ڕزگارکردنی ویلایەتەکانی ئەڵمانیایە لە ژێردەستەیی فەرەنسا لە سەردەمی (ناپلیۆن بۆناپارت)دا.**

# بارە سنوورییەکان لە فەلسەفەی (یاسپرس)دا

ئەحمەد مەظاهری
لە فارسییەوە: فەرەیدوون بێوار

کارل یاسپرس (١٨٨٣-١٩٦٩) بە یەکێک لە نوێنەرانی گرنگی فەلسەفەی ئیگزیستانسی سەدەی بیستەم دەژمێردرێت. یاسپرس سەرەتا لە بەشی دەروونناسیدا دەستی بە خوێندن کرد و پاشان ڕووی کردە فەلسەفەکاری. بەرهەمەکانی قۆناغی خوێندکاری و لێکۆڵینەوەی لە بەشی دەروونناسیدا بریتی بوون لە دوو کتێب بەناوەکانی:

«دەروونناسی جیهان بینییەکان» و «سەدەمەناسی دەروونی» لە کتێبە ناوبراوەکاندا بەتایبەتی لە کتێبی دەروونناسی جیهان بینییەکان دەتوانرێ ڕیشەکانی تێرامان و بیروراکانی دواتریشی لە بواری فەلسەفەدا بەباشی بەدی بکرێت. یاسپرس لە بواری فەلسەفەشدا بەرهەمی زۆری هەیە کە دەتوانین لەوانە ئاماژە بە «لەبارەی حەقیقەتەوە» و «فەلسەفە» و «فەیلەسووفە مەزنەکان» بکەین.

دڵەخورپەو ڕاڕایی یاسپرس هەروەکو نوێنەرانی دیکەی فەلسەفەی (ئیگزیستانس) بریتی بوو لە چەمکەکانی: بڕیار، هەڵبژاردن، تەنیایی، مەرگ، کەمتەرخەمی، دڵەڕاوکێی وجوودی، ڕەسەنی و... تاد. بەڵام یەکێک لەو تایبەتمەندییە گرنگانەی کە یاسپرس لە زۆربەی نوێنەرانی تری فەلسەفەی ئیگزیستانس جیا دەکاتەوەو خەسڵەتێکی دەستەبژێری و جیاوازی پێدەبەخشێت: سەرنجدانی جددی و سەرەکیانەیەتی بۆ «ژیرکاری-عەقلانیەت» و «زانست» و «مەعریفەی زانستی» لەم بارەیەوە یاسپرس لە ژیاننامە فەلسەفیەکەیدا دەنووسێ «لە تەواوی ژیانمدا، بیری من بەردەوام بە دوو شێوەوە سەرگەرم بووە: یەکەم هۆگری بەردەوام بە زانستەکان و جەختکردن لەسەر جوانی بنەڕەتی زانستی لەهەر کەسێکدا کەوا بانگەشەی فەیلەسووف بوونی هەمە گەواهیدان لەسەر گەورەیی و پێویستی زانستەکان دووەم هۆگری بە فەلسەفەکاری و جەختکردن لەسەر پێویستی جۆری بیرکردنەوەی بگۆڕێ، بەڵام بەبێ ئاکامی کرداری و ڕاستەقینە و گەواهیدان لەسەر پێویستبوونی واتای زانستەکان بە فەلسەفەوە» یەکێکە لە هۆکارە گرنگەکانی سەرنجدانی یاسپرس سەبارەت بە زانست و مەعریفەی زانستی کە کاریگەری قووڵی خوێندنەوەی بەرهەمەکانی (کانت)ی بەسەرەوە بووە. کەم نین ئەو باس و بابەتانەی کە یاسپرس لێیانی کۆڵیوەتەوە، بەڵام یەکێک لەو بابەتە قووڵانەی کە ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە فەلسەفەی یاسپرسدا (هەروەها تێگەیشتنی فەلسەفەی ئیگزیستانسە بەشێوەیەکی گشتی» شوێنگەی باسی «بارە سنوورییەکانە» لە فەلسەفەکەی ئەودا.

«ئەو بارانەی کە بە ڕادەی کۆتایی توانای مرۆیی (بارە سنوورییەکان) دادەنرێن بزواندنی هزری فەلسەفەکارییە، واتە بارە زۆر مەترسیدارەکان، ئەگەرچی زێتر لەچاو بزرەو بە ڕووپۆشراوی دەمێنیتەوەو هەرگیز ناگۆڕێ، بە پێچەوانەی بارە کێشەدارەکان کە سەرەنجام شیاوی کۆنترۆڵکردنە، مەسەلەی چارەسەر نەکردنی دێنێتە پێش

کە تەنیا بەشێوەیەکی ڕۆتینی و تا ڕادەیەک بێهوودە دەگونجێ لە گەڵیاندا دەست و پەنجە نەرم بکرێ هەندێک بار هەن بەهەمان شێوەی کە هەبوون، دەمێننەوە. هەرچەندە بۆ ماوەیەکی کاتی ڕوخساری بگۆڕێ و هێزی تێکشکێنەری لەبەر چاو بزر بێت، بەو واتایەی کە دەبینم، دەبێ بمرم، دەبێ هەوڵ بدەم، دەبێ لەدوای کار بگەڕێم، بە من و ڕێکەوت بەسەر منەوە حاکمەو بەناچاری ئالوودەی گوناح دەبم. ئەم جۆرە بارە ترسدارو چەسپاوانە، لەگەڵ هەستی گومان و پەرێشانی، بە ئاستێک کە لێی بە ئاگا بین، قووڵترین سەرچاوەی فەلسەفەیە. یاسپرس بە جەختکردنەوە دەڵێ: بەرهەمهێنانی ئەزموون لە (بارە سنوورییەکان)دا هاوچەشنە لەگەڵ «وجوود»دا خاڵی دوایی کە دەتوانێ ڕوونکردنەوەی ئەم چەمکە بێ کە یاسپرس بۆ (بارە سنوورییەکان) هەیەتی، بۆیە قووڵترین سەرچاوەی فەلسەفی لەم جۆرە بارانەدا بەدەست دێنێت، ئەو بارانەی کە مرۆڤ دەبێ لەگەڵ تەواوی بوونیدا تاقییان بکاتەوەو لە بەرامبەریاندا خۆڕاگر بێت، بارە سنوورییەکان زەمینەی چوونە ناوەوەی مرۆڤە بۆ بوونی کەسێتی و پانتایی و یەکتایی و تاکێتی، لەم بارانەوەیە کە مرۆڤ بەهۆی بێ بەدیلی خۆیەوە ڕادەوەستێ.

«هەموو ئێگزیستانسێکی کەسێتی، یەکتاو بێ هاوتایە، یاسپرس لەم بارەیەوە دەڵێ: ئێمە بە ڕاستی جێگر وەرناگرین. ئێمە تەنیا بەشێک نین لە بوونی گشتی، مرۆڤەکان لە ئەزموونە هاوبەشەکانی ڕۆژانەیاندا دەژین و کاکڵەی ناوەوەی ئەزموونی کەسی خۆیان لەو دیو پەردەی گوتار و ئاکارەکاندا حەشار دەدەن، بەڵام ویژدان، گوناح، ناچاری مەرگ، بەس لە ڕێگەی تەنیایی ناخی تاکەکەوە دێننە سۆراغی. مەرگی ئەوانی دی بەشێوەی ڕووداوێکی دیار هیچ پێوەندییەکی بە تێڕوانینەکانی ئێمەوە دەربارەی مەرگی خۆمان نییە.

لەو هۆکارە ڕیشەییانەی کە مرۆڤ لە ڕێگە جۆراوجۆرەکانەوە خۆی بەدوور دەگرێ لەبارە سنوورییەکان و ئەزموونە وجوودییەکانی کە لەوەوە سەرهەڵدەدەن لە هەوڵی دەرباز بووندایە لەم بارانە.

ئەوکات لەم بارانەدا، بە ئاشکراو بەبێ هۆکاری بونیادشکێنەرو هەڵدێری وجوودەکەی بەڕوونی و ئاشکراوە بەشێوەی ترسهێنەر لەژێر پێی مرۆڤدا سست دەبێت. بەدەرچوون لە دنیای وەهمی گشتی و ژیانی ڕۆژانە، ستوونە پتەوەکانی ژیانی مرۆیی سست و لاواز بووە و مرۆڤ بە ئاشکرا وجوودی خۆی بە مەترسیدار و تێکشکاو دەبینێت. نیچە لە شوێنێکدا نووسیویەتی: «ماڵەکانتان لە بناری شاخە گڕکانەکاندا چێ بکەن.» ئەم وتەیە بەجوانی نیشاندەری باری مرۆییە لەو کاتانەی کە لە بارەسنوورییەکاندا ژیان بەسەر دەبات، بەو واتایەی کە مرۆڤ هەردەم بوونێکە لەباری مەترسی و ئەزموونە قووڵ و ترس هێنەرەکان. وەستان لەباری سنووریداو ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ قووڵایی بووندا، دلێری لە ڕادەبەدەری دەوێ، بۆیە ڕوونە کە مرۆڤەکان زۆربەیان لە ڕووبەڕووبوونەوەدا لەگەڵ چەندان باری وەکو: مەرگ، هەوڵ و ڕەنج، نەخۆشی و گوناح، بەجۆرێ ڕەفتاردەکەن کە دەڵێی ئەم بارانە، دیارو گشتین، چونکە لەگەڵ ئەم جۆرە ئاکارە چاکانەدا باری بەرپرسێتی گرانترەو ئەزموونی کەسێتی و هەبوونی ئەم بارانە بەتوندی بەرەو کەمبوونەوە دەچن. نموونەو ڕاستی ئاشکرای ئەم کارە، ڕووبەڕووبوونەوەی ئاسایی خەڵکییە لەگەڵ هاوکێشەی (مەرگ)دا؛ کە واقیعترین و نەگۆڕترین ڕووداوە کە بەسەر هەموو مرۆڤێکدا دێت.

بەڵام مرۆڤ بە زیرەکی تایبەتەوە لە ڕووبەڕووبوونەوەدا لەگەڵ واقیعترین ڕووداوی ژیاندا، تێدەکەوێت. لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ مەرگدا ئێمە دەکەوینە تەنیاترین بارەوەو مەرگ هاوکێشەیەکە کە تەنیا خودی تاک دەبێ لە گەڵیان ڕووبەڕوو بێتەوەو هەر ئەم (تەنیایی)یە کە شایەنی بەرگەگرتن نییە. «بۆچوونی ئاسایی ئێمە، هەوڵێکە بۆ خۆ دەربازکردن لە بەرامبەر ڕاستێتی مەرگدا. ئێمە مەرگ بەیەکێک لەکارە ڕاستەقینەکانی دنیا دادەنێین، واتە شتێک کە لە ئاگاداری کۆچکردووەکان سەبارەت بە ئەو دەخوێنینەوە، ئەوەیە کە مەرگ شتێکە بۆ ئەوانی تریش ڕوودەدات، بەڵام هێشتا ڕووی نەداوە، بۆیە هێشتاکە شتێک لە دەرەوەی من و لە دنیای دەرەوەی مندایە.»

بە واتایەکی تر بەوتنی «هەموو دەمرین» خۆمان لە کونج و پەنای ئەم «هەموو»دا حەشار دەدەین و مەرگ دەکەینە ڕووداوێکی دیارو گشتگیر. بە بیرهێنانەوەی وتەی (هەموو ڕۆژێک دەمرین) بەجارێ مەرگ لە «تاکی مرۆیی» جیا دەکاتەوەو دەیگۆڕێ بەکارێک کە لە ئایندەیەکی دوورا ڕوودەدات. وەلێ ئاکارو ڕووبەڕووبوونەوەی مرۆڤی ڕەسەن لەگەڵ مەرگدا بەجۆرێکی ترە؛ ئەو بەجێی هەڵاتن لە ڕاسترین ڕووداوی ژیانی مرۆیی: بەهۆشیاری ناوەکی و بەشێوەی وجوودی لەگەڵ هاوکێشەی مەرگدا بەو شێوەیەی کە هاوکێشەکە پێوەندی بە بوونی کەسێتی ئەوەوەیە، ڕووبەڕوو دەبێتەوە. مرۆڤی ڕەسەن هەروەکو ڕووداوێکی دیار ناڕوانێتە مەرگ، بەڵکو هەروەکو هاوکێشەیەکی تەواو

وجـوودی و کـەسی تێی دەڕوانێ و بەجـۆرێ زانیـاری سەبارەت بەمەرگ دەست دەکەوێت کە بە شێوەیەکی قووڵ لە شێوازی ژیانی ئەودا کاریگەر دەبێت.

ئەو پرسـیـارەی کـە لێـرەدا خـراوەتە ڕوو ئەوەیە کـە بەسـەرنجـدان لە چەمکی (سنوور) کـە بەشـێـوەیەکی لۆژیکی ئاماژە بە ئەودیوی سنوور دەکات ئایا لەو دیوی سنوور و سنووردارییەکـانی نەبوونی یان مـۆغـاک هەیە یاخود بوونی باڵایی لەودیو سنووربوونی هەیە؟ یاسپرس بۆ خۆی ڕازییە لەسەر وجوودی باڵایی لەسەر سنوورەکان. وجوودێک کە ئەو بەترانساندانس (خوا) ناوی دەبات و ئەوەش بەشوێنگەی هەستان و بونیادی وجوودی مرۆیی دەزانێت. لە ڕوانگەی یاسـپـرسـەوە بنچـینەو بونیـادی وجوودی مرۆڤی لەودیوی سنوورەکانی مرۆیی-یەوەیەو بە جۆرێکی نامۆ ترانسـاندانس لەگەڵ وجـوودی مرۆڤی لە پێوەندیدایەو ئەم نسبەت و پێوەندییەش لە چەند بارێکی تایبـەتی وەکـو بارە سنوورییـەکـان بەدیار کـەوتووەو خۆ دەنوێنێ.

لەودیوی ئاست و سنوور «باڵاتر لە ئێمە، قەڵەمڕەوێکە کـە ئێـمـە بە شـێـوەی سـەیر وابەسـتـەین پێـوەی، ئەم قەڵەمڕەوەش، قەڵەمڕەوی ڕاستییە میـتافیـزیکیـەکانە. ئێمە دەبێ لە قـەڵەمڕەوی مومکینات دەربچین و بچـینە ناو قـەڵەمڕەوی پێـویست، بەڵام ئەم پێـویسـتـییـە لەگەڵ (جـەبری عـیـلمی)دا جـیـاوازی زۆری هەیە، چونکی ئەم پێویستییە، پێویستی ترانساندانسە.» هەر ئەم لایەنەش لەباسی (یاسـپـرس)دا، واتە بڕوابوون بە بوونی باڵایی لەودیوی ئاست و سنووری وجـــوودی مـــرۆیی ئەو بە دووردەخـاتەوە لەتێـوەگـلان بە قـووڵایی بێ کـۆتایی نەهیلیزم.

لە وتەی دوایی باسی (بارە سنوورییەکان)ی یاسپرسدا ئێمە بە پێداویستـییـەکان و سنووردارییـە خودییـەکانی وجوودی مرۆییمان ڕادەگرێت و بەجوانی بەدیاری دەخات کـە بەپێی یاسـای خـودیمان، ژیاندن (ڕەسـەن بوون) و ئاگـادار بوون لە قـووڵایی (وجـوود) تا چ ئاسـتـێـک دژوارەو چ لێهاتووییەکی لە ڕادەبەدەری دەوێت.

**سەرچاوە:**

**مجله جامعه نو، شماره (٨)، سال/ ٢٠٠٢**

# شیکردنەوەیەکی دەروونی زمان و چەند تێبینییەک لەبارەی زمانی کوردییەوە

زەیتۆ شێخانی

زمان بەیەکێک لە داهێنانەکانی شارستانی مرۆڤ دادەنرێت، ئەگەر زمان نەبوایە مرۆڤ نەیدەتوانی پارێزگاری لەسەر شارستانی و رۆشنبیری و کەلەپوور بکات، بۆیەش بریتییە لە سیستەمێکی رەمزی ئاڵۆز، بەوە جیا دەکرێتەوە کە:

– دەنگییە: واتە لە کۆمەڵە دەنگێک پێکهاتووە کە لە کۆئەندامی قسەکردنی مرۆڤ دەردەچێت.

– مرۆییە: واتە لە بەرهەمی توانای کۆمەلایەتی مرۆڤە.

– رەمەکییە: واتە لە رووی کۆمەلایەتییەوە بریاری لەسەر دەدرێت، بەبێ ئەوەی پێویست بکات هیچ رەمزێکی زمان پەیوەست بێت بە مانایەکی دیاریکراو.

– سیستەمییە، چونکە رێزمانێکی دیاریکراو رێکی دەخات.

– داهێندراوە: واتە لەهەر زمانێکی سروشتیدا ژمارەیەکی بێ کۆتایی لە پێکهاتووی زمانی هەیە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو زمانێک توانای دەربڕینی هەر هەڵوێستێکی نوێی هەیە بەرامبەر مرۆڤ و سروشت.

زمان لە سێ ئاست پێکهاتووە، کە ئەمانەن: سیستەمی فۆنیم و مۆرفیم و رێزمان، وا لەمەولا هەرسێکیان شی دەکەینەوە.

**دەنگەکانی زمان (فۆنیم)**

ئەگەر لە کەسێکی میللی بپرسی بچووکترین یەکەی دەنگی لە زمان چییە؟ یەکسەر پێت دەڵێت پیتە، وەلامەکەش هەڵەیە، چونکە پیتەکان دەنگ نین، بەڵکو تەنها رەمزی تۆمارکردنن، لەوانەیە پیتێک بەشێوازی جۆراوجۆر بخوێندرێتەوە، هەروەها لەوانەیە یەک دەنگ لە زمانە جیاجیاکان بە چەند شێوازێکی جیاواز بنووسرێت. بۆیە زانایانی زمان چەمکی فۆنیم بەبچووکترین یەکەی دەنگ دادەنێن و پێناسەی دەکەن و دەڵێن بچووکترین یەکەیە لە یەکەکانی قسەکردن کە دەبێتە هۆی دروستبوونی جیاوازی لە قسەکردن، ئەم جیاوازییەش تاکێکی قسەکەر یان گوێگر لە تاکەکانی کۆمەڵگەی زمانەوانی دەرکی دەکات. فۆنیم دەنگێک نییە، بەڵکو رەگەزێک یان چەند رەگەزێکی هاوبەشی رووتە لە زیاتر لە دەنگێک پێکهاتووە کە تاکەکانی کۆمەڵگەی زمانەوانی وەک یەک دەنگ دەرکی دەکەن، زانایانی دەنگ فۆنیم بۆ دووبەش دابەش دەکەن:

– دەنگە برگەییەکانی زمان. لەم بابەتەدا تەنها باسی ئەمە دەکەین چونکە پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە.

– دەنگەکانی سەرووی برگەکانی زمان.

**دەنگە برگەییەکانی زمان**

قسەکردن چەند پێکهاتەیەکی هەیە کە دەتوانین بەپێی ژمارەیەک لە یەکە قەبارە جیاوازەکان شییان بکەینەوە،

وه دەتوانین دەنگەکانی زمان بۆ شەپۆلەکانی شی بکەینەوه، یان دەتوانین یەکەی گەورەتری وەک فۆنیم بەکاربهێنین بۆ شیکردنەوەی زمان، هەروەها دەتوانین یەکەی گەورەتری وەک وشە بۆ هەمان مەبەست بەکاربهێنین.

زانایان لە مەیدانی زانستی وەسفی زمان هەولیان دا لیستێک دروست بکەن هەموو دەنگە سەرەکییەکانی قسەکردنی تێدابێت کە لە هەموو زمانەکانی جیهان هەیە، ئەم لیستەشیان ناونا ئەلف و بێی دەنگەکانی جیهان.

هەروەها هەولیان دا رەمزێکی تایبەت بۆ هەر دەنگێکی سەرەکی دیاری دەنگەکانی قسەکردن دابنێن، وە هەولیان دا هۆکارە جەستەییە کاریگەرەکان لە قسەکردن پۆلین بکەن. لە کۆتاییدا بینیان ئەم ئامانجە نایەتە دی، چونکە دەنگە بنەڕەت و دیارەکان لەیەک زمانیشدا زۆر زۆرن.

بۆیە ناکرێت چارەسەریان بکرێت. لە ڕاستیدا دەتوانین بلێین هەر دەنگێک کە دەردەچێت دەنگێکی تایبەتە، دەنگەکانی زمان جێگیر نین و گۆڕانکارییان بەسەردادێت.

ئێمە کە گوێمان لە قسەکردن دەبێت و تێیدەگەین، دەزانین ژمارەیەکی زۆر جیاوازی هەیە لە دەنگەکان، بەلام پشتگوێی دەخەین، چونکە بەجیاوازی گرنگی دانانێین لە زمانەکەمان، بەلام کە بیانییەک گوێی لێمان دەبێت و گوێمان لێی دەبێت، بەم خاسیەتە پشتگوێخراوانە ڕازی نابین تاکو زمانمان فێردەبێت و زمانی فێردەبین. بەوتەیەکی تر جیاوازی شارستانی هەیە لە دەرککردنی مرۆڤ بۆ قسەکردن. ئەم ڕاستییە خۆی سەپاندۆتە سەر زانایانی زمان بۆ ئەوەی جیاوازی بکەن لەنێوان نووسینی فۆنەتیکی و نووسینی فۆنیمی. مەبەستیش لە فۆنەتیک سیستەمێکی شارستانی بێ لایەنە بۆ تۆمارکردنی هەر قسەیەک لەهەر زمانێک بێت، بەشێوەیەک کە هەموو جیاوازییە فیزیاییەکان وەرناگرێت، چونکە ئەمە ناکرێت، بەلام تەنها ئەم جیاوازییانەی کە لەهەر زمانێکدا هەن، وەریاندەگرێت.

بەلام تۆمارکردنی فۆنیمی زمانێکی دیاریکراو، لە جیاوازی نێوان دەنگەکان دەردەچێت، کە قسەکەرانی زمانەکە بڕیاری جیاوازییە دیارەکان دەدەن.

بێگومان سیستەمی فۆنەتیکی پێویستە لەپێش سیستەمی فۆنیمیدا بێت، بۆ ئەوەی توێژەروان ئەو لایەنگیرییەی کە هەیانە بۆ زمانی نەتەوەیی خۆیان نەخەنە سەر زمانەکانی بێگانە کە دراسەی دەکەن.

زانایانی زمان دەنگەکانیان بەپێی بۆچوونە جیاوازییەکانیان بەم شێوەیە پۆلین کردووە:

١- بزوێن و نابزوێن: پۆلینکردنی تەقلیدی بۆ دەنگەکانی زمان پێویست دەکات، دەنگەکان بۆ بزوێن و نابزوێن پۆلین بکەین.

نابزوێنەکان بریتییە لە هەموو ئەو دەنگانەی کە بەهۆی ڕێگرتنی بەربەستێک بۆ ڕێرەوی هەوا بەشێوەیەکی تەواو یان نیمچە تەواو دروست دەبن، ئەم ڕێگرتنەش درێژخایەن نییە، بەلکو نامێنێت بۆ ئەوەی دەنگەکان دەربچن. شایانی باسە دەنگە نابزوێنەکانی زمانی کوردی ئەمانەن: پ، ب، ت، د، ک، گ، ق، ئـ، س، ز، ش، ژ، چ، ج، م، هـ، خ، غ، ح، ن، ل، ڵ، ر، ڕ، و، ی، ف، ڤ، ع.

بزوێنەکان ئەو دەنگانەن پەیدادەبن کە هەوا دوای قورگ دەڕوات بەبێ ئەوەی تووشی هیچ بەربەستێک بێت. بزوێنەکان بەپێی سێ خاسیەت پۆلین دەکرێن خاسیەتەکانیش ئەمانەن:

– ئەو بەشە زمانەی کە بەکاردێت وەک ڕێکارێک بۆ قسەکردن. زانایان دەڵێن ئەو بەشانەی بۆ دەرچوونی دەنگە بزوێنەکان بەکاردێن سێنە: کۆتایی زمان و ناوەندی زمان و نووکی زمان.

– بەرزبوونەوەی زمان لەکاتی دەرچوونی دەنگە بزوێنەکان، زانایان (بلوک و تریکۆ) دەڵێن: زمان لەکاتی دەرچوونی دەنگە بزوێنەکان حەوت بەرزبوونەوەی هەیە

– شێوەی لێوەکان لەکاتی قسەکردن. شێوەی لێوەکان دوونە ئەویش بازنەیی و کراوەیە. ئەگەر هەموو ئەگەرەکان جووت بکەین ئەوا چل و دوو دەنگی بزوێنمان بۆ دەردەچێت (٣ × ٧ × ٢ = ٤٢) ئەم دەنگانەش هەموو ئەو بزوێنانە دەگرێتەوە کە ئادەمیزاد قسەی پێ دەکات. بەپێی ئەو سێ خاسیەتەی لە پێشەوە باسمان کرد دەنگە بزوێنە سەرەکییەکانی زمانی کوردی ئەمانەن:- ا، ە، و، وو، ۆ، ی، ێ، (بزرۆکە).

٢- کپ و گڕ: هەندێک لە زانایان دەنگەکان لەسەر بناغەی ڕادەی ئاشکراییان پۆلین دەکەن، مەبەستیش لە ئاشکرایی دەنگ ڕادەی جوولانەوەی وەتەرەکانی دەنگە لەکاتی قسەکردن. وە دەتوانین دەستنیشانی دەنگە گڕو کپەکانی زمانی کوردی بکەین بەم شێوەیە: دەنگە گڕەکان ئەمانەن:- ب، د، گ، ج، ز، ژ، ڤ، ع، غ، م، ن، ل، ڵ، ر، ڕ، و، ی.

بەلام دەنگە کپەکان ئەمانەن:- پ، ت، ک، چ، س،

ش، ف، ح، خ، ق، ئ، ه.

هەروەها هەر لە زمانی کوردی هەندێک دەنگی گڕ هەیە وەک دال و باء لە دەنگی کپ نزیکن. وە دەنگی (ڕ) لە هەموو نابزوێنەکان گڕترە... .

٣- چۆنیەتی قسەکردن: بریتییە لە چۆنیەتی چارەسەرکردنی قسەکەر بۆ ڕۆشتنی هەوا بۆ سییەکان و دەرچوونی قسە بەهۆی قورگ و ئەندامانی تری قسەکردن. وە پێنج جۆر قسەکردن هەیە کە ئەمانەن:-

- وەستانەکان: ئەم دەنگانەن کە لەکاتی داخستنی تەواوی ڕێڕەوی هەواو بوونەوەی لەناکاو دروست دەبن. وەک دەنگی (باء).

- دەنگە خشێنەرەکان: ئەمە بەهۆی کردنەوەیەکی تەسک و تێپەڕبوونی هەوا لە ئەندامەکانی قسەکردن دروست دەبێت، وەک دەنگی (فاء و شین).

- دەنگەکانی تەنیشت: لێرەدا زمان بەرز دەبێتەوە بۆ ناوەندی دەم و ڕێگا بەهەوا دەدات بە هەردوو تەنیشتیەوە تێپەڕێت. وەک دەنگی (لام).

- دەنگە ئیرتجالیەکان: لێرەدا قسەکەر شەپۆلی هەوا بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی یەکێک لە ئەندامەکانی قسەکردن بەخێرایی بلەرێتەوە وەک دەنگی (ڕاء).

- بزوێنەکان: لە پێشەوە باسی ئەم خاڵەمان کرد، بەڵام لێرەدا تەنها ئەوە زیاد دەکەین کە ئەم دەنگانە بە بەشێک لە شێوە سەرەکییەکانی قسەکردن دانانرێت، وە هەندێک لەم دەنگانە بەهۆی لووتەوە پەیدا دەبن، وەک دەنگی (میم) و (نون). ئەمەش بەلادانێک دادەنرێت لەوەی کە لە پێشەوە باسمان کرد.

٤- شوێنی دەرچوونی دەنگەکان: بریتییە لەم خاڵەی کە شەپۆلەکانی هەوا تێیدا تووشی بەربەست دەبن، ئەمەش بەهۆی نزیکبوونەوەی دوو ئەندامی قسەکردن لەیەکتر یان بەیەک گەیشتن و داخستنی هەندێک لە ئەندامەکانی قسەکردن ڕوودەدات، وە زانایانی دەنگ ڕێڕەوی هەویان کردووە بە چواربەش، وەهەر بەشێک لەم بەشانەش لە چەند ئەندامێک پێکهاتووە بەشەکانیش ئەمانەن:-

بەشی یەکەم: لە سییەکان و بۆری هەناسەوە دەست پێدەکات تاکو ژێیەکانی قورگ کە پێی دەوترێت بەشی خوارەوەی زمانە بچکۆڵە.

ئەرکی ئەم بەشە بریتییە لە ناردنی هەوا بۆ بەشەکانی سەرەوە.

بەشی دووەم: لە زمانە بچکۆڵە دەست پێدەکات تاکو نەرمەگۆشتی پشت مەلاشوو، کە پێی دەوترێت بەشی سەرەوەی زمانە بچکۆڵە.

زۆربەی دەنگەکانی زمان لەم بەشەدا دروست دەبێت، چونکە لە چەند ئەندامێکی سەرەکی قسەکردنەوە پێکهاتووە وەک قورگ و بەشەکانی تر.

بەشی سێیەم: لە نەرمە گۆشتی پشت مەلاشوو دەست پێدەکات تاکو دەرچوونی هەوا لە دەمەوە، بۆیە پێی دەوترێت ڕێڕەوی دەمی لەم بەشەشدا زۆربەی دەنگەکانی تر دروست دەبێت.

بەشی چوارەم: لە نەرمە گۆشتی پشت مەلاشوو دەست پێدەکات تاکو دەرچوونی هەوا لە لووتەوە، بۆیە پێی دەوترێت ڕێڕەوی لووتی، ئەرکی ئەم بەشەش لە زمانی کوردیدا دوو دەنگی سەرەکی لێ دروست دەبێت ئەویش دەنگی (ن) و (م)ە. وە هەندێک جاریش دەنگی (نگ)ی لێ دروست دەبێت.

وە ئەندامەکانی قسەکردن لای مرۆڤ ئەمانەن:-

١- لێو، ٢- ددان، ٣- پووکی ددان، ٤- مەلاشووی ڕەق، ٥- مەلاشووی نەرم ٦- نەرمە گۆشتی پشت مەلاشوو، ٧- بۆشایی لووت، ٨- نووکی زمان، ٩-پێشەوەی زمان، ١٠- ناوەڕاستی زمان، ١١-پاشەوەی زمان، ١٢- بۆشایی قورگ، ١٣- زمانە بچکۆڵە، ١٤- شوێنی ژێیەکانی قورگ.

شایانی باسە هەندێک لەم ئەندامانە جێگیرن و هەندێکی تر دەجوولێن، ئەگەر هاتوو هەر ئەندامێکی جێگیر لەگەڵ ئەندامێکی جوولەدار بەیەک بگەیەنین ئەوا (٤٠) دەنگی جیاوازمان بۆ دروست دەبێت بەڵام ئەمە بەهیچ شێوەیەک نابێت، چونکە هەندێک لە ئەندامەکان بەیەک ناگەن. لە ڕاستیدا تەنها دەتوانین (١٠) شوێنی قسەکردن لە بەیەک گەیشتنی ئەندامەکان بەدەست بهێنین.

**مۆرفیمەکان**

وتمان وشەکان یەکەی دەنگی بەمانان، وە دەنگەکانی زمان و برگەکانیش بەتەنها هیچ مانایەک ناگەیەنن، بۆ نموونە برگەی (با) بەتەنها هیچ مانایەک نابەخشێت، بەڵام بۆ دیاریکردنی وشەش تووشی چەند گیروگرفتێک دەبین، بۆ نموونە (هات) وشەیە، بەڵام ئایا (هاتن)یش وشەیە؟..... هتد.

بۆ چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتە و چەند گیروگرفتێکی تر زانایانی زمان چەمکێکی نوێیان هێنایە کایەوە، ئەویش چەمکی مۆرفیمە، بەپێی ئەم چەمکە وشەکان لە مۆرفیمێک یان زیاتر پێکهاتوون. زانایانی زمان

مۆرفیمیان بۆ چەند بەشێکی جیاواز دابەش کردووە، ئێمەش لێرەدا بەکورتی باسیان دەکەین:

- بڕگەی کراوەو داخراو: بڕگەی کراوە ئەو بڕگەیەیە کە دەتوانین وەک یەکەیەکی سەربەخۆ لە زماندا بەکاری بهێنین. وەک ماڵ، شار، دار، ئاو.... هتد.

بەڵام بڕگەی داخراو ئەو بڕگەیەیە کە بەتەنها هیچ مانایەک نابەخشێت بەڵکو پێویستی بە بڕگەیەکی تر هەیە، جا ئەم بڕگەیە کراوەبێت یان داخراو، پێشگر بێت یان پاشگر. وەبڕگەی داخراویش دەبێت بەدوو بەش:

أ- مۆرفیمی دەرهێندراو: بریتییە لەم زیادانەی کە دەخرێتە سەر سەرەتا یان کۆتایی وشە بۆ دەرهێنانی وشەیەکی تر، بۆ نموونە لە زمانی کوردی وشەی (ڕووا) ئەگەر پاشگرێکی بۆ زیاد بکەین دەبێتە (ڕوواندی)... هتد. بەهۆی زیادکردنی پێشگر یان پاشگر لەوانەیە وشەکە بگۆردرێت بۆ بکەر یان فەرمان... هتد.

ب- مۆرفیمە بڕگەییەکان: ئەمەش بریتییە لەم زیادە ڕێزمانییەی کە دەخرێتە سەر وشە، بۆ ئەوەی مانای کۆ بدات، وشەی (منداڵ) بە زیادکردنی (ان) دەبێتە (منداڵان). گۆڕانکارییەک بەسەر وشەکەدا هات و لە تاکەوە بوو بەکۆ. یاساکانی ڕێزمان ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە دروستکردنی وشەی نوێ پێویستە ئەوەش بڵێین بڕگە ڕێزمانییەکان لە هەموو زمانەکان لە ڕێگای پاشگرو پێشگر وشەی نوێ دروست ناکەن.

**لایەنە دەروونییەکانی وشە:**

لێرەدا هەوڵ دەدەین وشە لەڕووی دەروونییەوە شی بکەینەوە.

وشە ئاگادارکردنەوەیەکی ئاڵۆزە لە ڕووی دەرککردنی قسەو تێگەیشتنی بەهۆی بیستن و خوێندنەوە. هەروەها وەڵامدانەوەیەکی ئاڵۆزی تاکە لە ڕووی قسەکردن و نووسینەوە. لە ڕووی ئاگادارکردنەوە دوو شێوەی هەیە ئەویش بیستن و بینینە، بەڵام وەڵامدانەوە لایەنێکی جوولەیی تێدایە ئەویش قسەکردنە بە وشەو بەنووسین. بۆیە تێگەیشتنی وشەو قسەپێکردنی پێوەندییەکی بەهێزی هەیە بەشێوەیەک لە شێوەکانی وروژاندن کە دەکەوێتە توێکڵی دەماخ، ئەویش ماسولکەکانی قسەپێکردن و نووسین ئاراستە دەکات، کەواتە وشە لێکدراوێکی ئاڵۆزی بینین و بیستن و جوولەییە.

لایەنێکی تری وشە لایەنی خەیاڵە، کە پەیوەستە بەپێکهاتەی جوولەو بینین و بیستنی وشە. کە دەڵێین (پشیلە) خەیاڵی گیاندارێک دەکەینەوە کە چەند سیفەتێکی دیاریکراوی هەیە. ئەم لایەنەش پێوەندییەکی بەهێزی هەیە بە ماناکەی. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە وشە دوولایەنی هەیە، لایەنی هەستی جوولەیی و لایەنی مەعنەوی، ئێمە لێرەدا جەخت دەکەینە سەر لایەنی مەعنەوی چونکە لایەنی هەستی جوولەیی پێوەندی بەلایەنی فیزیایی هەیە.

پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان چەمکەکان و وشەکان هەیە، بۆیە پێویستە بچینە ناو چەمکەکان و چۆنیەتی پێکهاتنیان بزانین. چەمک بەپێی دەرککردنی مرۆڤ و بیرکردنەوەی پێکدێت. وە چەمکەکان لەوانەیە بوونیان هەبێت بەبێ بوونی وشە لە ڕووی تیۆرییەوە.

بۆ نموونە تواندراوە چەمکی سێگۆشە لەلای گیاندارێکی وەکو مشک پێک بهێندرێت بەبێ بوونی وشە. بۆیە دەتوانین بڵێین چەمکەکان پێش وشە دروست دەبن، بەڵام لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە بوونیان پەیوەستە بە وشە، چەمک کردارێکی ناوخۆیییەو چەند سیفەتێکی هاوبەش لەنێوان شتەکان و ڕووداوەکان هەیە. بە وشەیەک یان زیاتر دەری دەبڕین. بۆ نموونە کە دەڵێین (ئەسپ) باسی یەک جۆر لە گیاندار دەکەین کە چەند سیفەتێکی هاوبەشی دیاریکراوی هەیە، ئەگەرچی جیاوازی زۆر هەیە لەنێوانیان لە ڕەنگ و تەمەن و قەبارە، بەڵام هەندێک سیفەتی هاوبەش هەیە لە گیاندارەکانی وەک ماسی و مانگاو مەڕ... هتد جیای دەکاتەوە.

چەمک جیاوازی هەیە لەگەڵ خەیاڵ، چونکە خەیاڵ لە چەمک فرەوانترە، بۆ نموونە دەتوانین خەیاڵی بەرخی سپی و ڕەش و گەورەو بچووک... هتد بکەین، بەڵام خودی بەرخ یەک چەمکە.

هەروەها ناتوانین چەمک پێک بهێنین بەبوونی یەک خەیاڵ، بەڵکو پێکهاتنی چەمک پشت دەبەستێت بەو بەراوردەی کە مرۆڤ دەیکات لەنێوان ئاگادارکەرەوەکان، بەم شێوەیە مرۆڤ دەرکی لەیەکچووەکان و جیاوازییەکان دەکات، لە پاشان سیفەتەکان دیاری دەکات و چەمکێک پێک دەهێنێت، بۆ نموونە چەند سیفەتێکی لەیەکچوو هەیە لەنێوان هەموو (کەوەکان)ەوە چەند جیاوازییەکی نابنەڕەتی لەنێوانیاندا هەیە، بەڵام مرۆڤ جەخت دەکاتە سەر سیفەتە بنەڕەتییەکان و لەیەکچووەکان. کەواتە چەمکی (کەو) لە دەرککردنی لەیەکچووە بنەڕەتییەکان و پشتگوێ خستنی سیفەتە نابنەڕەتییەکان پێکدێت، چەمک ناوەرۆک و ماوەی هەیە، بۆ نموونە کە دەڵێین

(منداڵ) ناوەرۆکەکەی کۆمەڵێک سیفەتی هاوبەشە لەنێوان منداڵان، بەڵام ئەم سیفەتانە ماوەیەکی دیاریکراوی هەیە.

مرۆڤ لە درێژایی ژیانیدا ڕووبەڕووی ژمارەیەکی زۆر لە شتەکان دەبێتەوە، وەگوێی لە ژمارەیەکی زۆری ناوی شتەکان دەبێت کە لەگەڵیدا دەژین. لەو کاتەی ناوی شتەکان فێردەبێت، هەوڵ دەدات ناو لە شتە هەست پێکراوەکان بنێت، بەڵام لە پاشان هەست دەکات کە ئەم ناوانە تەنها لەیەک شت ناندرێن. بۆ نموونە کە مرۆڤ ناوی فڕۆکە فێردەبێت، ناوەکە بەشتێکی دیاریکراو دەبەستێتەوە کە بینیویەتی، لەکاتی جێبەجێکردن هەست دەکات چەمکی فڕۆکە ژمارەیەکی زۆر لە پۆل و جۆرەکان دەگرێتەوە، وەک فڕۆکەی سەربازی و فڕۆکەی مەدەنی و فڕۆکەی بە پەروانەو فڕۆکەی بێ پەروانە... هتد. وە هەریەک لەم جۆرانەش چەند بەشێکی لێ دەبێتەوە، بۆ نموونە فڕۆکەی سەربازی لە چەند جۆرێک پێکهاتووە، وەک فڕۆکەی شەڕکەرو فڕۆکەی بۆمبابارانکردن و فڕۆکەی بارهەڵگر... هتد.

بۆ ئەوەی چەمکەکان دروست بن پێویستیمان بە وشەو ژمارەیەکی زۆر لە شتەکان هەیە کە یەک پۆلین دەکرێن، کە وشەیەک بۆ شتێک بەکاردەهێنین، یەکسەر لە پۆلینێکی دیاریکراو دایدەنێین، بەڵام ئەگەر چەند وشەیەکی جیاوازمان بۆ یەک شت بەکارهێنا ئەوا هەر جارێک لە پۆلینێکی جیاوازی دادەنێین. بۆ نموونە خودی تاک خۆی مرۆڤە، منداڵە، نێرە، قوتابییە، کوردە... هتد.

چەمکەکان پێوەندی دیاریکراویان لەگەڵ یەکتردا هەیە، ئەم پێوەندیانەش چوار جۆرن:

١- شوێنکەوتن:

ئەم پێوەندییە کاتێک دروست دەبێت کە چەمکی (أ) تەسک بێت و لەناو چەمکی (ب) بێت کە فرەوانە. بۆ نموونە چەمکی (دارتاش و کرێکار)، دارتاش چەمکێکی تەسکە، بەڵام کرێکار چەمکێکی فرەوانە، هەموو دارتاشێک کرێکارە، بەڵام هەموو کرێکارێک دارتاش نییە، بۆیە چەمکی (أ) بە چەمکی تایبەت و چەمکی (ب) بە چەمکی گشتی ناو دەبرێت، چەمکی گشتی ژمارەیەک لە چەمکی تایبەت دەگرێتەوە، کە هیچ کاتێک لە دوو چەمک کەمتر نییە.

٢- لەیەکچوونی تەواو:

واتە ئەم چەمکانە لە ناوەرۆکدا جیاوازن، بەڵام لە ماوەدا لەیەک دەچن، وەک دژبەیەک و دوژمن، وەڵامدانەوە و کاردانەوە... هتد.

٣- نیمچە لەیەکچوون:

لێرەدا بەشێک لە چەمکی (أ) لەگەڵ بەشێک لە چەمکی (ب) بەیەک دەچن، کە دەڵێین (زانای دەروونزانی- پرۆفیسۆر) دەرک دەکەین کە هەندێک لە زانایانی دەروونزانی پرۆفیسۆرن، بەڵام هەندێکی تر پرۆفیسۆر نین. هەندێک لە پرۆفیسۆرەکان زانای دەروونزانین، هەندێکی تر زانای دەروونزانی و پرۆفیسۆرن.

٤- جیاکەرەوەی گۆڕدراو:

لەم پێوەندییەدا هەردوو چەمکەکە دژ بەیەکترن و هاوبەش نین بۆ نموونە کە دەڵێین (زیندوو- مردوو) مەبەستمان ئەوەیە کە تاک یان زیندووە یان مردووە، هیچ کەسێک نییە هەردوو سیفەتەکەی لەیەک کاتدا هەڵگرتبێت.

ئەم پێوەندییانەی کە لە پێشەوە باسمان کرد ڕەنگ دەداتەوە سەر وشەکان و بەکارهێنانیان. بۆ نموونە بە دارێک دەڵێین (گوێز)، بەڵام هەموو دارێک گوێز نییە... تاد.

کە وشەیەک لەگەڵ وشەیەکی تر یەکسان دەبێت لە ناوەرۆک و ماوەیدا پێی دەڵێین وشەی یەک واتایی.

پێوەندی نێوان چەمکەکان تا ڕادەیەکی زۆر پێوەندی نێوان وشەکان دیاری دەکات و ملکەچ دەبێت بۆ بەکارهێنانەکانی.

بەڵام ئەمڕۆ لە ژیانی ڕۆژانەماندا ڕووبەڕووی هەندێک وشە دەبینەوە، لەم شێوازانەی باسمان کرد دەردەچێت. بۆ نموونە پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت (هەر کەس گوێز لە باری خۆی دەژمێرێت)، لێرەدا مەبەست ژماردنی گوێز نییە، بەڵکو واتایەکی تری هەیە، کە ژماردنی گوێز ڕەمزێکە بۆ ئەم واتایە، هەروەها لەیەکچوونێک هەیە لە ڕووی مەعنەوییەوە لەنێوان ژماردنی باری گوێزو شتە دەروونییەکانی ناو ناخی مرۆڤ.

بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین سیستەمی واتاکان بۆ هەر وشەیەک بەرامبەری سیستەمی چەمک هەیە کە پەیوەستە بە وشەکە.

### وشەو چەمکەکان لە زمانە جیاوازەکانی جیهاندا

کۆمەڵگەکان ئەو چەمکانەی بۆ ناولێنانی شتەکان بەکاری دەهێنن جیاوازن.

لەوانەیە ژیانی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو وا پێویست بکات جیاوازی زۆر ورد لەنێوان هەندێک شت بکەن،

لەنێوان هەندێکی تردا ئەم جیاوازییە نەکەن. بۆ نموونە کۆمەڵگەی (ئەسکیمۆ) ژمارەیەکی زۆر لە وشەیان هەیە بۆ بەفرو جۆرەکانی، بەڵام لە کۆمەڵگەی تر ئەم ژمارە زۆرەی وشە نییە بۆ ئەم چەمکە. ئێمەش لە کۆمەڵگەی کوردی ژمارەیەک لە وشەمان هەیە بۆ چەمکی بەفر وەک (بەفر، سەهۆڵ، کرێوە، تەرزە یان تەزرە، بووز، شەختە، جلیت...هتد) لەوانەیە لە کۆمەڵگەیەکی تر کە شوێنەکەیان گەرم بێت و بەفری لێ نەبارێت ئەم هەموو وشەیە بەدی نەکەین.

لە زمانی کوردی چەمکی خاڵ و مام لێک جیا دەکرێتەوە، بەڵام لە زمانی ئینگلیزی ئەم جیاکردنەوە نییە.

هەروەها لە هەندێک کۆمەڵگەدا هەندێک چەمک هەیە لە کۆمەڵگەی تر بەدی ناکرێت، بۆ نموونە لە کوردی و عەرەبی چەمکی (چێشتان) و (الضحی) هەیە، بەڵام ناتوانین وەریبگێرین بۆ (Midday) چونکە نیوەی ڕۆژ، نیوەڕۆیە لای ئێمە. لە زمانی فەرەنسی چەمکێک هەیە پێی دەڵێن (Curte) واتە ئامادەکردنی شتێک بە یارمەتی ئاگر ئەم چەمکە لە زمانی کوردی و عەرەبی و ڕوسی بەرامبەری نییە. لێرەدا پرسیارێکی گرنگ خۆی دەسەپێنێت، ئەویش ئەوەیە: ئایا گەلان کە لە سیستەمی چەمکەکان جیاوازن ناتوانن هەمان چەمک و بیروڕا بەدەست بهێنن؟ لە وەڵامدا دەڵێین هەموو مرۆڤێک لەهەر نەتەوەیەک یا زمانێک بێت دەتوانێت هەموو چەمکێک وەربگرێت کە هەر مرۆڤێک هەیبێت، ئەگەر بە وشەیەک نەیتوانی دەریببڕێت ئەوا دوو وشە یان زیاتر بەکاردەهێنێت.

### ڕێزمان

ئەگەر سەیری بڕگەکانی قسەکردن بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە بڕگەکان بە تەنها مانای تەواو نابەخشن تاکو لە ڕستەدا بەکارنەهێندرێن.

بۆ نموونە لە زمانی کوردی هەردوو وشە (بار، خۆماڵی) ئەگەر لە ڕستەدا بەکاریان بهێنین ئەوا مانای تەواومان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

١- خۆماڵیکردنی نەوت باری ئابووری وڵات چاک دەکات.

٢- پەنیری خۆماڵی بارکرا بۆ دەرەوەی کوردستان.

لە ڕستەی یەکەمدا وشەی (خۆماڵی و بار) مانای جیاوازە لەوەی کە لە ڕستەی دووەمدا هاتووە.

وە لە زمانی ئینگلیزی وشەی (Spring) بە چەندین مانا دێت، وەک بەهار، بازدان، کانی... هتد، لەوکاتەی کە لە ڕستەدا بەکاری دەهێنین دەتوانین ماناکەی بەتەواوی دیاری بکەین، ئەم دیاردەیەش لە هەموو زمانەکانی جیهان هەیە. کەواتە ڕێزمان باسی ڕەفتاری زمان دەکات کە پێوەندی بە دروستکردنی ڕستەو کاریگەری بۆ سەر مانا هەیە.

یەکێک لەم تیۆرانەی کە سەدەی پێشوو بەدیارکەوت قوتابخانەی وەسفی تەشکیلییە، ئەم تیۆرە پشت بە دراسەی ئەنثرۆپۆلۆجیا دەبەستێت، کە باسی زمانی ئەو تیرە سەرەتاییانە دەکات کە زمانەکەیان نەنووسراوەتەوەو دراسە نەکراوەو ڕێزمانی بۆ دانەنراوە، هەروەها ئەم تیۆرە پشت بە قوتابخانەی ڕەفتاری دەروونزانی دەبەستێت.

دەتوانین دەقی تیۆرەکە لەم چەند خاڵە کورت بکەینەوە:

- ڕەفتارییەکان سەیری زمان دەکەن وەک ڕەفتار، ڕەفتاریش بە نەریت دادەنێن، بۆیە زمانیش وەک نەریتێک سەیر دەکەن. تیۆری وەسفیش هەمان بۆچوونی هەیە.

- ئاراستەی تیۆرەکە بۆ دراسەی زمان ئاراستەیەکی وەسفییەو دوورکەوتنەوەیە لە پرۆگرامی پێوەری. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە زانایان پێویستە دراسەی ئەو زمانە بکەن کە خەڵک بەکاری دەهێنن، بۆ دەرهێنانی ڕێزمان.

- ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە زمانی قسەکردن بنەڕەتەو زمانی نووسین بە چەندین قۆناغی گۆڕان و چاکردن و ڕاستکردنەوەدا تێدەپەڕێت بەپێی دراسەی مەیدانی ئەنثرۆپۆلۆجی بۆمان دەردەکەوێت کە زمانی گەلە سەرەتاییەکان هەر چۆن بێت زمانێکی ئاڵۆزەو سیستەمی ڕێزمانی و مۆرفیمی و فۆنۆلۆجی ئەوتۆی هەیە کە هەموو پێویستییەکانیان دابین دەکات.

هەروەها زانایانی ئەم تیۆرە گرنگییەکی زۆر بە ڕستە دەدەن.

دراسەکردنی ڕستەش دراسەیەکی تەقلیدی تاڕادەیەک ئاسانە، چونکە نموونەکانی لە زمانی ئەدەبی بەرز وەرگیراون. ئەم زمانەش هەروەک باسمان کرد گۆڕانکارییەکی زۆری بەسەردا هاتووە، بەڵام دراسەکردنی ڕستە لە گفتوگۆیەکی ئاسایی شتێکی ئاسان نییە. ئەگەر سەیرێکی ئەم گفتوگۆیە بکەین کە لەنێوان ئەمینداری پەرتووکخانەو قوتابییەک ڕووی داوە، بۆمان دەردەکەوێت کە هەردوولا لەیەکتر دەگەن بەڵام ناتوانین هەر بەشێک لە گفتوگۆکە بە ڕستە دابنێین.

ئەمەش دەقی گفتوگۆکەیە:

- ئایا لە پەرتووکخانە پەرتووکێکت لایە دەربارەی زمانی کوردی؟
- بەڵێ
- بردراوە یان ماوە؟
- دەتەوێ بیبەی؟
- نەوانەیە.
- ئەو پەرتووکەیە کە مامۆستا دایناوە بۆ خوێندنەوەو بەکارهێنانی ناوخۆیی؟
- پەرتووکەکە لای نازدار خانە.

لەم گفتوگۆیەدا پێناسەی ڕستە ئاسان نییە، ئەم گرفتەش لە هەموو زمانەکانی جیهان هەیە.

ئەم قوتابخانەیە ڕێگایەکی تریان داهێنا بۆ شیکردنەوەی ڕستە، ئەویش شیکردنەوەی پێکهاتووە ڕاستەوخۆکانە. بەپێی ئەم ڕێگایە ڕستە بۆ پێکهاتووە گەورەکان لە پاشان بچووکەکان شی دەکرێتەوە.

زانایانی نوێی دەروونزانی زمان چەند ڕەخنەیەکیان ئاراستەی ئەم تیۆرە کردووە، ئەمەش کورتکراوەی ڕەخنەکانە:

- ئەم قوتابخانەیە پێوەندییە وەزیفەییەکانی زمانیان پشتگوێ خستووە، هەروەها گرنگییان بە پێوەندی نێوان ڕەگەزەکانی ڕستەو پێکهاتووەکانی نەداوە. هەندێک لە شوێنکەوتووانی ئەم تیۆرە هەوڵیان دا بەرپەرچی ئەم ڕەخنەیە بدەنەوە، بە داهێنانی چەمکی چوارچێوەکان، لەسەر ئەم بناغەیە ڕستەیان دابەش کرد بۆ چەند چوارچێوەیەک، وەک چوارچێوەی نیهادو گوزارە... هتد.

- ئەم تیۆرە سەرکەوتوو نەبوو لە تێگەیشتنی پێوەندی نێوان ئەو ڕستانەی کە لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر دەگۆڕێن، وەک گۆڕانی ڕستە لە ئەرێوە بۆ نەرێ، لە ئەرێوە بۆ ڕستەی پرسیاری... هتد.

- ئەم تیۆرە لەکاتی دراسەکردنی ڕێزمان گرنگییەکی ئەوتۆ بە مانا نادات، ئەمەش بەهۆی پشت بەستن بە قوتابخانەی ڕەفتاری.

- زانایانی زمان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ناتوانین سوود لەم شیکردنەوەی ڕستە وەربگرین، چونکە ئەم تیۆرە ناتوانێت هەندێک ڕستە شی بکاتەوە.

زانای زمانەوانی چۆمسکی تیۆرێکی تری بۆ دراسەی زمان داهێنا، ئێمەش کورتەیەک لە بۆچوونەکەی دەخەینە ڕوو:

- چۆمسکی دوو لایەنی زمان لەیەکتر جیا دەکاتەوە ئەویش توانا و ئەنجامدانە. توانا بریتییە لەو توانایەی کە لای هەموو تاکێک لە تاکەکانی کۆمەڵگەی زمانەوانی بەدی دەکرێت بۆ وتنی ئەوەی کە دەیەوێت بیڵێت، بەشێوەی ڕستەیەک کە پێشتر گوێی لێ نەبووە. گرنگترین بناغەکانی توانا، شارەزایی قسەکەرە بۆ ڕێزمان و مۆرفیم کە بە هۆیانەوە ڕستە پێکدێت. بۆ نموونە منداڵی کورد دەتوانێت ڕستەی ڕاست لە زمانی میللی دروست بکات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە منداڵ ڕێزمان و مۆرفیمی دیالێکتی میللی دەزانێت.

ئەنجامدانیش بریتییە لەم قسانەی کە تاکەکانی کۆمەڵگەی زمانەوانی ئەنجامی دەدەن.

جیاوازی نێوان توانا و ئەنجامدان ئەوەیە کە ئەنجامدان ڕەفتارە، تواناش سنوورو پێوەری ئەم ڕەفتارەیە.

قوتابخانەی ڕەفتاری لە دەروونزانی و قوتابخانەی وەسفی تەشکیلی لە زانستی زمان جەخت لەسەر دراسەی ئەنجامدانی زمان دەکەنەوە، بەڵام چۆمسکی گرنگی نادات بە دراسەی ئەنجامدان، بەڵکو گرنگی بە دراسەی ئەو ڕێزمانە دەدات کە توانای لەسەر دامەزراوە. ڕێزمان بەپێی بۆچوونی چۆمسکی ئەو ڕێزمانەیە کە ڕێگا بە پەیدابوونی ژمارەیەکی بێ کۆتایی لە ڕستەی ڕاست دەدات، ڕستەی ڕاستیش لای ئەو، ئەو ڕستەیەیە کە تاکەکانی کۆمەڵگەی زمانەوانی پەسندی دەکەن، بەڵام ڕستەی ناڕاست ئەو ڕستەیەیە کە تاکەکانی کۆمەڵگەی زمانەوانی پەسندی ناکەن.

- چۆمسکی بناغەی سەرڕێیی و بناغەی قووڵ لێک جیا دەکاتەوە. دەڵێت لەوانەیە بناغەی سەرڕێیی دوو ڕستە یەک بێت، بەڵام بناغەی قووڵی جیاوازە.

ئەگەر سەیرێکی شیکردنەوەی ئەم دوو ڕستەیە بکەین لە زمانی کوردی:

أ- پیاوەکە ئۆتۆمبیلەکەی ئیش پێکرد.
پیاوەکە: بکەرە
ئۆتۆمبیلەکە: تەواوکەرە
ئیش پێکرد: فرمانە

ب- بەنزینەکە ئۆتۆمبیلەکەی ئیش پێکرد.
بەنزینەکە: بکەرە
ئۆتۆمبیلەکە: تەواوکەرە
ئیش پێکرد: فرمانە

ئەوا بۆمان دەردەکەوێت هەردوو ڕستەکە هەمان بناغەی سەرڕێییان هەیە (بکەرو تەواوکەرو فرمان)، بەڵام لە ڕستەی یەکەمدا (پیاوەکە) بکەری ڕاستەقینەیە، لە ڕستەی دووەمدا (بەنزین) بکەری ڕاستەقینە نییە، چونکە ئیش پێکەری ئۆتۆمبیلەکە نییە، بەڵکو یەکێکە

لە ڕەگەزەکانی ئیش پێکردنی ئۆتۆمبیل.

هەروەها لەوانەیە یەک ڕستە دوو بناغەی قووڵی جیاوازی هەبێت، بۆ نموونە کە دەڵێین (قوتابییەکان بەهۆی سووکایەتی پێکردنی مامۆستایان تووڕەبوون) هۆی تووڕەبوونی قوتابییەکان دیارنییە، بەهۆی بوونی دوو بناغەی قووڵی جیاواز لە ڕستەکەدا، لەوانەیە ڕستەکە ئەوە بگەیەنێت کە قوتابییەکان تووڕەبوون، چونکە مامۆستایان سووکایەتی پێکردن، یان قوتابییەکان تووڕەبوون، چونکە مامۆستایان سووکایەتی پێکرا.

- چۆمسکی ڕستەی وەک یەکەیەکی سەرەکی شیکردنەوە وەرگرتووە بەبێ گرنگیدان بە فۆنیمەکان و وشەکان، هەروەها دەڵێت پێویستە دراسەی یەکە بچووکەکان لەژێر ڕۆشنایی گۆڕانکارییەکانی ڕستە بکەین. ئەم بۆچوونەی چۆمسکی گرنگییەکی زۆری هەیە لە دراسەی زمان، چونکە ئەم هەڵوێستە پێچەوانەی هەڵوێستی قوتابخانەی ڕەفتارییە کە بەشە بچووکەکان پێش بەشە گەورەکان بۆ پێکهێنانی ڕەفتار وەردەگرێت، ئەم ناراستەیە وا لە دراسەی ڕێزمان دەکات ببێتە ناوەڕۆکی دراسەی زمان.

- مرۆڤ کە لە دایک دەبێت توانایەکی زگماکی هەیە بۆ فێربوون و وەرگرتنی ڕێزمان هەرچەند ئاڵۆزبێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە منداڵ لە زگماکییەوە زمان دەزانێت، بەڵام ئەو میکانزمانە دەزانێت کە بەهۆیەوە دەتوانێت زمان شی بکاتەوەو ڕێزمانەکەی لێ هەڵێنجێت. ئەمەش پێچەوانەی ئەم بۆچوونەیە کە دەڵێت منداڵ لاسایی خەڵک دەکاتەوەو ئەقڵی لاپەڕەیەکی سپییە.

- ئەو ڕستە ڕاستانەی کە لەهەر زمانێک لەوانەیە دروست بن نائژمێردرێن، واتە مرۆڤ دەتوانێت ژمارەیەکی بێ کۆتایی ڕستە لە زمانەکەی دروست بکات. لەمەش زیاتر دەتوانێت یەک ڕستە درێژە پێ بدات بۆ ژمارەیەکی بێ کۆتایی، بەڵام ڕێزمان لەهەر زمانێک ژمارەیەکی دیاریکراوی ڕستەی لێ دروست دەکرێت.

ئەگەرچی تیۆرەکەی چۆمسکی کاریگەرییەکی زۆری هەبوو بۆسەر زانستی زمان، بەڵام زانایانی هاوچەرخی زمان داوای پێداچوونەوەی تیۆرەکەیان کرد.

زانای هاوچەرخ (فلمور) تیۆرێکی تری داهێنا بەناوی (تیۆری ڕێزمانی باری شیکردنەوە) ئەم تیۆرە داوا دەکات کە لە زانستی واتاکان دەست پێ بکەین بۆ تێگەیشتنی زمان، (فلمور) دەڵێت ئەگەر سەیری ئەم ڕستانە بکەین:

پیاوەکە بەلەمەکەی پاڵدا

سەوڵەکە بەلەمەکەی پاڵدا

شەپۆلەکە بەلەمەکەی پاڵدا

ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە هەرسێ ڕستەکە یەک شیکردنەوەی هەیە (بکەر- تەواوکەر- فرمان)، بەڵام لە ڕستەی دووەمدا سەوڵەکە بکەر نییە، بەڵکو ئامێرێکی پاڵنەرە. لە ڕستەی سێیەم شەپۆلەکە هۆکاری پاڵنانی بەلەمەکەیە، بەڵام بکەری ڕاستەقینە (پیاوەکە)یە.

لەلایەکی تر خاوەنی ئەم تیۆرە دەڵێت: دەتوانین ڕستەی جۆراوجۆر دروست بکەین بۆ دەربڕینی یەک چەمک. بۆ نموونە:

تکایە خێرایی کەم کەرەوە.

وا بزانم ئۆتۆمبیلەکە بەخێرایی لێ دەخوڕێ.

گوێت لێ بووە دەڵێن هۆکاری ڕووداوەکانی ئۆتۆمبیل خێراییە.

ئۆتۆمبیل ئەمانی نامێنێ لەکاتی خێرایی.

لەم ڕستانەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە یەک چەمکن و یەک مانایان هەیە، بەڵام بەشێوازی جیاواز دارێژراون.

دوای ئەوەی کە هەر سێ سیستەمەکەی زمانمان بەکورتی شی کردەوە، لە کۆتاییدا ئەوە ماوە بڵێین ئەم سیستەمانە لە یەکتر جیاناکرێنەوە تەنها بۆ مەبەستی دراسەکردن نەبێت، چونکە پێوەندی توندو بەهێزیان لەگەڵ یەکتردا هەیە.

**سەرچاوەکان:**


١- ئاورەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا.

٢- ڕێزمانی کوردی، پۆلی یەکەم و دووەم و سێیەمی ناوەندی.

٣- د. الحمداني. موفق، اللغة وعلم النفس، دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، ١٩٨٢.

٤- لندال. دافيدوف. ترجمة (د. سيد الطواب، د. محمود عمر وآخرون) مدخل علم النفس، دار ماكجروهيل للنشر، القاهرة ١٩٨٣.

# کوردستان لە کێشەی ڕۆژهەڵاتیدا (١٨٠٠ - ١٩٠٠)

دڵشاد مەحموود عەبدوڕەحمان(*)

### دەروازە

زاراوەی «کێشەی ڕۆژهەڵاتی» لگینە بۆ یەکەم جار لە «کۆنگرەی ڤێرۆنا» (**) بەکاربرابێ، تاوەکو ئەو گیروگرفتە نێو دەوڵەتیانە بگرێتە خۆ کە لەسەر ئەگەری لەنێوچوونی ئیمپراتۆریەتی تورکی بەرپا ببوو)«١». ئەم کێشە پڕ لە ئاڵۆز و بلۆزە قەبارە گەلێکی بەرفراوان لەخۆ دەگرێ.

بەشێوەیەکی گشتی، دەتوانرێ بوترێ کە کێشەی ڕۆژهەڵاتی بریتییە لە: لەخۆگرتنی بەرژەوەندییە دژ بەیەکەکان و ململانێ و کێبڕکێی توند کە لەنێوان وڵاتە ئەوروپییەکان و ڕۆژهەڵاتی نزیک کەوتەوە لەسەر ئاستەکانی سیاسی و ئابووری و ئایینی«٢».

ئەم کێشەیە لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەوە دەست پێدەکات تاکو ڕووخان و لەنێوچوونی ڕژێمی سەڵتەنەت لە تورکیای نوێ (١٩٢٣)«٣».

شیاوی باسە، هەندێک لە لێکۆڵەرەوان کێشەی ڕۆژهەڵاتی دەگێڕنەوە بۆ قۆناغێکی کۆن و بە دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانی و فراوانخوازییەکانی لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا (باڵکان) لە قەڵەمی دەدەن. کەچی هەندێکی دیکە زۆر گشتگیری دەکەن تا ئەو ڕادەیەی کە هەموو کێبڕکێ و ململانێیەکانی نێوان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات لە هەموو سەردەمە مێژووییەکان گوزارشت لێ دەکەن«٤».

جێی سەرنج لێگرتنە، کێشەی ڕۆژهەڵاتی وەک لە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی مێژوودا، بەتایبەت لە لاپەڕەکانی مێژووی هەرێمی باڵکاندا بە دەردەکەوێت، لەگەڵ پەیدابوون و سەرهەڵدانی ئەو گێرمە و کێشمەی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و وڵاتە ئەوروپییەکان هاتۆتە کایەوە، پێناسەی ڕاستەقینەی ناسنامەی لەت لەت کردن و دابەشینەوەی موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی و هەڵلوشینی سامانە زۆر و زەبەندەکانی بوو«٥». لێ لە خوێندنەوە و تێڕوانینی مێژووی کێشەی ڕۆژهەڵاتی ئاشکرایانە توێژەر ڕەچاوی سێ قۆناغی جیاواز دەکات لە ڕووی تایبەتمەندییە گشتییەکانیەوە.

### قۆناغەکانی کێشەی ڕۆژهەڵاتی، تایبەتمەندی و ڕووداوەکانیان

بەڵگەنەویستە زۆربەی توێژەران کێشەی ڕۆژهەڵاتییان لە سۆنگەی تایبەتمەندییە گشتییەکانی دابەشکردووەتە سەر سێ قۆناغ: قۆناغی یەکەم: لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەوە دەست پێدەکات تاکو کۆتایی هاتنی جەنگی قرم (Kriam)(١٨٥٣-١٨٥٦). قۆناغی دووەم: لە کۆتایی جەنگی قرم بۆ کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم دەگرێتەوە. قۆناغی سێیەم: لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەوە دەست پێدەکات تاکو ڕووخانی دەوڵەتی

عوسمانی لە ساڵی (١٩٢٣)«٦».

## قۆناغی یەکەمی کێشەی رۆژهەڵاتی

ئەم قۆناغە بەوە دەناسرێتەوە کە رۆڵی روسیا لە کێشەی رۆژهەڵاتیدا لە لوتکەی گەشەسەندن و پەرەسەندنی خۆیدا بووە و چالاکترین رۆڵی بینیوە لە رووی فراوانخوازیی لە جەستەی دەوڵەتی عوسمانی«٧». هەر لە قۆناغی یەکەمدا تورکەکان هەرەشەیەکی راستەقینەیان لەسەر سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە رۆژهەڵاتی ئەوروپا پێک دەهێنا«٨».

لە سەرنج لێگرتنێکی وردی قۆناغی یەکەمدا بە دەردەکەوێت کە دەوڵەتی عوسمانی لە رووکاری کەوشنەکانی لەگەڵ رووسیای قەیسەریدا، دووچاری گرفتی خۆی ببوو، رووسیا لەو قۆناخەدا یەکێک بوو لە دوژمنە هەرە سەرسەختەکانی دەوڵەتی عوسمانی«٩». جەنگی قرم کە گەورەترین رووداوی قۆناغی یەکەمی کێشەی رۆژهەڵاتی بوو، هەروا خاڵی وەرچەرخانی نێوان دوو قۆناغی لێک جیای کێشەی رۆژهەڵاتی پێک دەهێنا، روسیا جەمسەرێکی ئەو جەنگە بوو بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی لە نیوچەی دوورگەی قرم، کە لە سۆنگەیەوە ئەو جەنگەی لێ بەرپا ببوو«١٠».

سەبارەت بە رووداوەکانی دیکەی قۆناغی یەکەمی کێشەی رۆژهەڵاتی، لە راستیدا ئاژاوە و پشێوی ناوچەکانی باڵکان بەتایبەتی راپەرین و شۆڕشی چەکداری نەتەوەکانی یۆنان و سرب و سلاڤ نەژادەکان- لە پای گەیشتن بە ماف و داواکانیان بۆ خۆبەڕێوەبردن و رزگاربوون لە ئیدارەی عوسمانی- لە رووداوە دیار و بەرچاوەکانی قۆناغی یەکەم بوون«١١».

رووداوێکی بەرچاوتری ئەم قۆناغە خۆی لە بزووتنەوەکەی محەمەد عەلیی گەورە پاشای میسردا دەبینێتەوە، محەمەد عەلی پاشا پاش پاککردنەوەی میسر لە پاشاگەردانی و قایمکردنی دەسەلاتداریتییەکەی؛ کەوتە بەرەنگاربوونی دەوڵەتی عوسمانی بەسەر لەشکریی ئیبراهیم پاشای کوری«١٢»، بەڵام لەبەر ئەوەی سیاسەتی وڵاتانی زلهێزی ئەو رۆژگارە بریتی بوو لە پاراستنی یەک پارچەیی خاک و موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی و هێشتنەوەی بارودۆخی دەوڵەت وەک خۆی (واتە نە بەرەو پێش بروات کە نەتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێ نە بێهێز بکرێ و ببێتە هۆی پارچە پارچەبوونی بۆ سەر چەند گلۆتێکی بەهێزی بچووک)، ئیدی لە سۆنگەی یارمەتی و هاوکارییەکانی ئەو وڵاتە زلهێزانەوە هەوڵەکانی محەمەد عەلی گەورەش لە (کۆنگرەی لەندەن)(١٨٤٠) سنووری بۆ دانرا پاش ئەوەی هەرەشەیەکی زۆر ترسناکی لەسەر جەستەی دەوڵەتی عوسمانی دروست کردبوو«١٣».

## قۆناغی دووەمی کێشەی رۆژهەڵاتی

قۆناغی دووەمی کێشەی رۆژهەڵاتی بەوە دەناسرێتەوە کە رۆڵی روسیا بەرەو کەمبوونەوە دەچوو، ئەو گڕوتینەی قۆناغی یەکەمی لە دەست دابوو، ئەوەش لە ئەنجامی ئەو لاوازییەی کە لە بەرەنجامی جەنگی قرم دووچاری هات و بە دۆڕاوی لەو جەنگە هاتە دەر«١٤»، لە بەرامبەریشدا لە سەروبەندی ئەو قۆناغەدا بەریتانیا و فەرەنسا و نەمسا گرنگی زیاتریان بە دەوڵەتی عوسمانی دەدا لە سۆنگەی ئەوەی کە سەرچاوەی کەرەستەی خاو و بازاڕێکیشە بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمهێنراوە پیشەسازییەکانیان.

بۆیە ئەو وڵاتانە پەنایان بردە بەر دەوڵەتی عوسمانی بە چەند دەستەواژەیەک، لەوانە: «پرەنسیپی پارێزگاریکردن لە رەوشی ئەوسای دەوڵەتی عوسمانی» و هەروەها «جەختکردنەوە لەسەر پاراستنی یەکێتی خاکەکانی ئیمپراتۆریەت و حەسانەی هەرێمەکانی». ئەوە لەکاتێکدا هەر هەلێکی لە بارو شیاویان بۆ برەخسایە گورج دەیانقۆزتەوە لەپێناو بەرژەوەندییەکانی خۆیان«١٥».

لەماوەی ئەم قۆناغەدا دەوڵەتی عوسمانی تەواو دەستەوەستانی خۆی بەرامبەر بە مەرام و نیازەکانی وڵاتانی زلهێزی ئەوروپی- بەتایبەت بەریتانیا- بۆ دەرکەوت. هەر لەم قۆناغەدا لاپەڕەیەکی نوێ لە رکابەری و ململانێی توند لەنێوان روسیا و دەوڵەتی عوسمانی هەڵدرایەوە، کە دێڕەکانی بە خوێنی سوور و گەشی چەندین بێتاوان وشە بە وشە تۆمار کران، ئەویش جەنگی روسی عوسمانی نێوان ساڵانی (١٨٧٧-١٨٧٨)بوو«١٦».

جەنگی ساڵانی (١٨٧٧-١٨٧٨)ی نێوان روسای تەزاری و عوسمانییەکان لە گرنگترین رووداوەکانی قۆناغی دووەمی کێشەی رۆژهەڵاتی؛ دەژمێردرێت و خاڵی گرنگی وەرچەرخانیش بوو سەبارەت بە شەقڵی تایبەتی کێشەی رۆژهەڵاتی، بەو پێوەدانگەی کە لەو جەنگە بەدواوە وڵاتە زلهێزە ئەوروپییەکان چیدیکە ئەو

پارێزەرەی یەکێتیی خاکەکانی دەوڵەتی عوسمانی نەبوون و بگرە بە پێچەوانەوە خۆیان کەوتنە هەڵپەی پارچە پارچەکردن و دابەشکردن و داپچڕینی خاک و هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانی. بۆ نموونە بەریتانیا ساڵی (١٨٧٨) دوورگەی قوبرسی پچڕی و ساڵی (١٨٨٢)یش هەڵسا بە پاوانکردنی میسر و نۆکەندی سوێس«١٧». فەرەنساش وەک زلهێزێک پاش ئەوەی لە ساڵی (١٨٣٠)ەوە دەستی بەسەر جەزائیردا گرتبوو، ساڵی (١٨٨١) هەڵسا بە ڕاگەیاندنی یاسای پاراستن بەسەر توونسدا«١٨». ڕوسیاش لە کۆنگرەی بەرلین (١٨٧٨)دا توانیبووی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەش کە هەردوو شاری قارس (Kars) و باتووم (batum)ی لەخۆ دەگرت، لە دەوڵەتی عوسمانی بپچڕێ«١٩».

## قۆناغی سێیەمی کێشەی ڕۆژهەڵاتی

قۆناغی سێیەمی کێشەی ڕۆژهەڵاتی بەوە جیا دەکرێتەوە کە کێشەی ڕۆژهەڵاتی لەم قۆناغەیدا، لە جوغزی جارانی دەرچوو و بووە ئەو کێشە هەرە هەستیار و گرنگەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و لەو ئاکامەشدا ڕۆژهەڵاتی دوور و ئەفریقیا و ئەمریکای لاتینی تێخزا«٢٠».

ئەڵمانیای یەکگرتوویش کە تازە بەسەرکردایەتی (هێربەرت بسمارک) کەوتبووە سەر پێ؛ لە گەڕانێکی جددی دابوو بۆ پەیداکردنی بازاڕ بە مەبەستی بەگەڕخستنی سەرمایەی ئەڵمانی. لە ئاکامەدا سیاسەتی کشان ڕووە و ڕۆژهەڵاتی لێکەوتەوە«٢١».

بە شێوەیەکی گشتی هاتنە ناوەوەی ئەڵمانەکان بۆ ڕۆژهەڵات، باری ئەو ململانێیەی ڕژدتر و ئاڵۆزتر کرد کە لەنێوان وڵاتە زلهێزەکان هاتبووە کایەوە لەمەڕ موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی«٢٢»، کە ئەوەش جەوهەری کێشەی ڕۆژهەڵاتی ئەو ڕۆژگارەی پێک دەهێنا.

خاڵێکی جیاکەرەوەی تری ئەم قۆناغە بەرزبوونەوەی ئاستی بزاڤی ئازادیخوازی نەتەوەییە لەلای گەلە جۆر بە جۆرەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە کاریگەری دیاری هەبوو لەسەر سیاسەتی وڵاتە زلهێزەکانی ئەورووپی بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی، بەتایبەت لەسەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهانی«٢٣». لە ڕووداوە گرنگەکانی ئەم قۆناغە کوشتارییەکانی ئەرمەنە لەنێوان ساڵانی (١٨٩٤- ١٨٩٦) و (١٩١٥)دا«٢٤»، کە سەرچاوەکان لە مەڕ ڕێژەی ئەو کوشتارییانە جیاوازیان هەیە لە (١٠٠) هەزار کەسەوە بۆ نیو ملیۆن«٢٥».

گەورەترین ڕووداوی قۆناغی سێیەمی کێشەی ڕۆژهەڵاتی بەرپابوون و درێژەکێشانی جەنگی یەکەمی جیهانی بوو، کە ڕەنگێکی ئەو جەنگە لە کێشەی ڕۆژهەڵاتیدا ڕۆچوو بوو.

## پێگەی کوردستان لە کێشەی ڕۆژهەڵاتیدا

کوردستان وەک هەرێمەک لە چوارچێوەی نەخشەی سیاسی دەوڵەتی عوسمانی بەدەر نەبوو لە ڕووداوە تیژەکانی کێشەی ڕۆژهەڵاتی، چونکێ خودی دەوڵەتی عوسمانی جەمسەرێکی سەرەکیی و ئامانجێکی بنەڕەتی بەرپابوونی کێشەی ڕۆژهەڵاتیی بوو، ئیدی هاتنە کایەی کێشەی ڕۆژهەڵاتیی و ململانێ و ڕکابەری توند و تیژی نێوان وڵاتە زلهێزە ئەورووپییەکان و دەوڵەتی عوسمانی، بە نۆرەی خۆی و پێ بە پێ بە «میکانیزمێکی چالاک»(***)، کوردستانی خزاندە نێو بازنەی ململانێ و کێبڕکێی کێشەی ڕۆژهەڵاتییەوە.

## سەبارەت بە بەریتانیا

کوردستان لە نەخشەی ئابووری و سیاسی و سەربازییەکانی بەریتانیادا پایەیەکی کاریگەری پچڕی بوو، بەتایبەت کە یەکێک بوو لەو ناوچەی کە بەکورتترین ڕێگا لە قەڵەم دەدرا بۆ گەیشتن بە هندستان«٢٦». ئەو هندستانەی کە بەتاجی بەریتانیا دەژمێردرا. ئیدی لە سۆنگەی ئەمەوە ناوەندە بەرپرسەکانی ئینگلیز لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا زۆرترین لێکۆڵینەوەی لە بوارە جیاجیاکانی کوردستاندا بە ئەنجام گەیاند. هاوکات شێلگیرانە ئینگلیزەکان دەستیان بە پێوەندی بەستن کرد لەگەڵ سەرۆک خێڵ و عەشیرەتە کوردەکان وەک هەنگاوێکی سەرەتایی بۆ پێدزەکردن«٢٧».

بەریتانیا هەوڵەکانی بۆ بنیاتنانی پێگەی لە کوردستاندا، لە ڕاستیدا دەگەڕایەوە بۆ سەرەتای سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە، کە لەو کاتەدا کاپیتان (جۆن مالکولم) بە فەرمانی بەرپرسە بەریتانیاییەکان لە هیند ڕووی لە ئێران کرد و بەدەست و دیارییەکی گرانبەهاوە چووە خزمەت (فەتح عەلی شای قاجار)(١٧٩٧-١٨٣٤)«٢٨»، پاشتر بۆ کاپیتان

مالکۆڵم لوا کە لەمیانەی گەشتەکەیدا سەردانی ناوچەکانی کوردستان بکات و زانیارییەکی زۆر لە بوارە جۆراوجۆرەکانیدا کۆبکاتەوە«٢٩»، لە ساڵی (١٨٢٠)دا بۆ نوماینەدەی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی کلۆدیۆس جیمس ریچ ڕەخسا کە گەشتێک بە کوردستاندا بکات و زانیارییەکی زۆر بەکەڵک، کەڵەکەی سەر زانیارییەکانی کاپیتان جۆن مالکۆڵم بکات«٣٠» ئەم پێنگاوانە هەمووی بۆ دەسەڵات پەیداکردن بوون لەنێو جەستەی دەوڵەتی عوسمانی کە کوردستانیش هەرێمێکی گرنگی بوو.

ڕاستیی، سەرەکیترین هۆ و ئەنگێزەکانی بەریتانیا بۆ پەیداکردنی دەسەڵات لە جەستەی دەوڵەتی عوسمانیدا بۆ بەرژەوەندی ئابووری لەناوچەکە دەگەڕایەوە. بەتایبەت لەو ڕۆژگارەدا، لە سۆنگەی شۆڕشی پیشەسازییەوە سەرمایەی بازرگانی وەرچەرخا بوو بۆ سەرمایەی پیشەسازی، ئیدی ئەوەش گۆڕانکارییەکی گەورەی لە ستراتیژیەتی بازرگانی لەنێو ئەو وڵاتە ئیمپریالیزمیە و دەوڵەتی عوسمانی (کوردستان) بەدواوە بوو. بەریتانیا دەوڵەتی عوسمانی بە کوردستانەوە هەر لەو ڕوانگەیەوە تەماشا نەدەکرد کە سەرچاوەی بەدەستخستنی کەرەستەی سەرەتاییە، بەڵکو سەرباری ئەوەش دەوڵەتی عوسمانییان کردبووە بازاڕێک بۆ ساغکردنەوەی کاڵا و شتومەکە بازرگانییەکانیان«٣١». بازاڕەکانی کوردستانیش بە نۆرەی خۆیان بە بازاڕە نێو دەوڵەتییەکانی جیهانییەوە بەسترانەوە. ئەوەی کە پەنجەرەیەکی فرە فراوانی بەڕووی کوردستاندا واڵا کرد و، گورزێکی کوشندەشی لە برێک ڕووەوە ئاراستەی پیشەسازی خۆماڵی و ئاستی ئابووری کوردستان کرد«٣٢».

## سەبارەت بە ڕووسیا

ڕوسیا بۆ بەدیهێنانی خەونە شیرینەکەی، کە گەیشتن بوو بە ئاوە گەرمەکان، ساڵی (١٨٠٤) و ساڵانی دواتری، ڕاستەوخۆ پێوەندی لەگەڵ کورددا دامەزراند«٣٣». پاشتر لە ئەنجامی مۆرکردنی پەیماننامەکانی (گولستان)(١٨١٣) و (تورکمانچای)(١٨٢٨) لەگەڵ ئێران و«٣٤» پەیماننامەکانی (سان ستیفانۆ)(١٨٧٨) و دواتر (بەرلین)(١٨٧٨) لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا«٣٥»، ڕوسەکان پێوەندییان توند و تۆڵتر بوو بە کوردەکانەوە.

بە تایبەت کە لە ئەنجامی ئەو زنجیرە پەیماننامانەوە هێندێک ناوچەی کوردستان و ژمارەیەک خێڵی گەورەی کورد کەوتنە بازنەی دەسەڵاتیەوە.

ڕوسیا بایەخێکی زۆری بە کوردەکان دەدا، لە سۆنگەی دلێری و ئازایی کوردەکان لە کاتی جەنگدا، بۆیە مەیلی بەلای ڕاکێشانی کوردەکاندا هەبوو تا بتوانێت دژی دەوڵەتی عوسمانی لە کاریان بێنێ، یان هەر هیچ نەبێ وایان لێ بکات بێ لایەن بوەستن لە جەنگەکانی دژ بە دەوڵەتی عوسمانی«٣٦». بەو پێودانگەش ڕوسیا بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی هەڵسا بە پێکهێنانی چەند تیپێکی سوارە و پیادە لە کوردەکان کە ژمارەی ئەو جەنگاوەرە کوردانە خۆی لە نزیکەی (١٣٠٠) جەنگاوەر دەدا«٣٧».

ڕاستییەک جێی سەرنجە، کوردەکان دەرکی تەواویان نەبوو سەبارەت بە کێشەی ڕۆژهەڵاتی و پێوەندییە جەنجاڵەکانی نێو دەوڵەتیی ڕۆژگار، بۆیە لەسەرجەم هەنگاو هەڵنانەوەکانیاندا دووچاری شکست و دەرگا بە ڕووداخستن بوونەوە. هانا بردنی یەزدانشێر لەکاتی جموجۆڵەکەیدا (١٨٥٤-١٨٥٦)«٣٨» بۆ ڕوسەکان و پشت لێکردنی ڕوس و ئینگلیزەکان لێی و هەروەها شۆڕشی گەورەی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری (١٨٨٠-١٨٨١) و هەڵوێستی ڕوسی بەریتانی«٣٩»، دوو بەڵگە و گەواهی ڕاستی ئەم قسەیەن. لەو ماوە هەستیار و ناسکە مێژوویانەدا نە ئینگلیز بە کەڵکی کورد هات نە ڕوس ئەو دڵسووتاوەی کورد بوو کە بانگەشەی بۆ دەکرد.

## سەبارەت بە ئەڵمانیا

ئەڵمانیا و قەیسەرەکەی (ولهەمی دووەم)(١٨٨٨-١٩٠١) لە سەرووی ئەو زلهێزانەی دییەوە بوون کە گرنگییان بە کوردستان دەدا و چاویان بڕیبووە کوردستان وەک پێگەیەکی پڕ بایەخی ستراتیژی لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی. ئەوەی هەڵزنانی ئەڵمانیای بەرەو ئەو دەڤەرە ئاسانتر دەکرد ئەوە بوو کە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦-١٩٠٩)، بەو پێودانگەی خەلیفەی موسڵمانان بوو! پێی وابوو ئەڵمانیا تاکە هێزە هاوسۆز بێت لەسەرگرتنی کۆمەڵەی ئیسلامی (الجامعة الاسلامية) کە سوڵتان هەوڵی بۆ دەدا لەپێناو وەدیهێنانی مەرامە سیاسییەکانی خۆی. هەروا هاوکات ئەڵمانەکان پێوەندییان لەگەڵ عوسمانییەکان گرێدا بوو و

نیـاز پاکی خـۆیشـیـان بۆ سـوڵتـان دەربڕیـبـوو، سیـاسەتکارەکـانیـان پەیتـا پەیتـا وایان ڕادەگـەیاند کە ئامانجی ئەوان بە تەنیـا ئابوورییە و هیـچ چاوتێبڕینێکی سیاسییان لە جەستەی دەوڵەتی عوسمانیدا نییە«٤٠». دواتر ڕوون بوویەوە کـە زەبەلاحـتـریـن پرۆژەی ئیمپریالیزمیان بەدەستەوەیە، ئەویش پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەغدا- بەرلین بوو(****)، کـە مـەبەست لێی بەگەڕخستنی سەرمایەی ئەڵمانی بوو لە چوارچێوەی سوود وەرگرتن لە سەرچاوەی کانزایی و کشتوکاڵییەکانی دەوڵەتی عـوسـمـانی«٤١». گـفـتـوگـۆکـان لە بارەی بەخشینی جیاووکی ئەو پرۆژەیە لە سـاڵی (١٨٩٩)دا بەکۆتا گەیشت«٤٢».

ئەو گـۆڕانانەی لە کـۆتایی سـەدەی نۆزدەیەمـدا لە دەوڵەتی عوسمانی ڕوویان دا، بایەخی کوردستانیان زێتر کـرد. بێ سـۆنگە نیـیـە لە سـاڵی (١٨٩٠)دا دەوڵەتی عوسمانی سوارەی حەمیدی لە خێڵە کوردەکان پێکهێنا. کە ئەڵمـانەکان ڕۆڵی گەورەیان لەمـەدا هەبوو، بۆ ئەوەی ئەو دەڤەرە لەژێر نفوزی عـوسمانییەکان بهێڵنەوە و ڕوس و ئینگلیـزەکـان نەپرژێنە سـەر ئەوەی لەم ڕۆچنەیەوە (کـوردسـتـان) خـۆیان لە کـاروباری عـوسـمـانیـیـەکـان هەڵقورتێنن«٤٣». ئەم پێنگاوە ئەو ڕاستـیـیـە دووپاتە دەکاتەوە کە دەوڵەمەندیی کوردستان و بوونی ئەو هەموو سـامـانە تیـایدا، لە پاڵ شـوێنە سـتـراتیـژیی و جـیـۆپۆلەتیکەکـەی، وای کـردبوو هەریەک لە لایەنە ڕکابەرەکـان هەوڵبـدات ئەوانەی تر لە کـوردسـتـان دوور بخاتەوە«٤٤».

## کۆتایی

کـوردسـتـان لەبەر گـرنگی و سـتـراتیـژی هەڵکـەوتەی جوگرافیەکەی پێگەی لە بازنەی کێشەی ڕۆژهەلاتیدا پێ بەپێ ڕوو لە هەڵکشـان بوو. بەتایبـەت پاش ئەوەی لە سنوگەی شۆڕشی پیشەسازییەوە سەرمایەی بازرگانی ئەورووپی وەرچەرخا بۆ سەرمایەی پیشەسازی، کە ئەوەش گۆڕانکارییەکی گەورەی لە ستراتیژیەتی بازرگانی لەنێو ئەو وڵاتە زلهێـزە ئەورووپیـانە و دەوڵەتی عـوسـمـانیـدا کـوردسـتـان- بەدواوە بوو. وڵاتە زلهـێـزەکـان دەوڵەتی عـوسـمـانیـیـان نەک هەر بە تـەنیـا وەک سـەرچاوەی بەدەستخستنی کەرەستەی سەرەتایی تەماشا نەدەکرد، بەڵکو سەرباری ئەوەش دەوڵەتی عـوسـمـانییان کـردبووە بازاڕێک بۆ سـاغکردنەوەی کـالاو شـتـومـەکـە بازرگـانیـیـەکـان، کە ئەوەش وای کـرد کە کـوردسـتـان بە نۆرەی خۆی بە بازاڕە نێو دەوڵەتیەکانەوە ببەسترێتەوە.

لەسەرێکی دیکەوە کـورد وەک چۆن خاکـەکـەی پێگەی گـرنگی لە بازنەی کـێشـەی ڕۆژهەلاتیـدا داگیـرکـردبوو، ئەوهاش خۆی ببووە ئامرازێکی گرنگی ململانێکانی ئەو کێشـەیە. ڕوسـیـا بایەخێکی زۆری بەکوردەکـان دەدا کە دەیویست لە دژی دەوڵەتی عـوسـمـانی لەکـاریان بێنێ یا لانی کـەم هیچ نەبێ وایان لێ بکات بێلایەن بوەستن لە جەنگەکانیان دژ بە دەوڵەتی عوسمانی.

ئەو گـۆڕانانەی لەکـۆتایی سـەدەی نۆزدەیەمـدا لە دەوڵەتی عـوسمـانی ڕوویان دا بایەخی کوردستانیان زێتر کـرد. هەڵزنانی ئەڵمـەنەکان بەرەو ئەم ناوچەیە لە تینی ئەو ئاگـرەی خـۆشـتـر کـرد کە لەنێـوان وڵاتە زلهـێـزەکـان دایسـابوو لەسـەر بە پەراوێزکـردنی ڕۆڵ و ئامـادەیی وڵاتانی دی لەناوچەکەدا.

**ژێدەر و پەراوێزەکان:**

(*) قوتابی ماستەر لە بەشی مێژووی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر.

(**) کۆنگرەی ڤیێرۆنا ساڵی (١٨٢٢) لەلایەن وڵاتە ئەورووپییـەکـانەوە بەسترا بۆ گەنگەشکردنی ئەو ڕەوشە ناهەمـوارەی کـە لە سـاڵی (١٨٢١)دا لە ناوچەکـانی باڵکان کـەوتبـووە دژ بە زاڵبـوونی دەسـەلاتی عوسـمـانیـەکـان. بۆ زانیـاریی زێتر، بڕوانە: د. فـاضل حسین و د.کـاظم هاشم نعـمـة، التاريخ الاوربي الحديث (١٨٥١-١٩٣٩)، الطبـعـة الاولى، الموصل، (١٩٨٢)، ص٥٢-٥٨.

(١) زين نورالدين زين، الصراع الدولي في الشـرق الاوسط و ولادة دولتي سوريا ولبنان، بيروت، ١٩٧١، ص٢٢.

(٢) زين نورالدين زين، م.ن، ص٢٢.

(٣) د. هاشم صالح التكريتي، المسألة الشرقيـة- المرحلة الاولى- (١٧٧٤-١٨٥٦)، بغداد، (١٩٩٠)، ص٢١.

(٤) بـروانـه: حسين لبيب، تاريخ المسألة الشرقية،

مصر، ١٩٢١، ص١. (الهامش).

(٥) ئەم لێکۆڵینەوەیە، لە سۆنگەی ئەو ڕەهەندەوە بە ئەنجام گەیاندراوە کە پارچەیەکی گەورەی کوردستان وەک سەرجەم ناوچە و وڵاتەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی نزیک بەشێک بوون لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و سەرچاوەیەکی بە پیت و بە ڕمێتی دەوڵەت بوون بە درێژەپێدانی بازنەی ململانێی کێشەکە، وەک لەم لێکۆڵینەوەیەدا بە ئاشکراو ڕاشکاوانە ئاماژەی پێدراوە.

(٦) د. هاشم صالح التكريتي، م.س، ص٢٢.

(٧) د. هاشم صالح التكريتي، م.س، ص٢٢.

(٨) زين نورالدين زين، م.ن، ص٢٣.

(٩) د. هاشم صالح التكريتي، م.س، ص٢٢.

(١٠) أ. ب. ج تايلور، الصراع على السيادة في اوربا (١٨٤٨-١٩١٨)، (ترجمة: د. كاظم هاشم نعمة و د. يوئيل يوسف عزيز)، بغداد، (١٩٨٠)، ص٨٤ و مابعدها.

(١١) دەربارەی بڕوانە: كارلتون هيز، تاريخ الاوربي الحديث (١٧٨٩-١٩١٤)، (ترجمة: د. فاضل حسين)، بغداد، (١٩٨٧)، ص١٠٠- و مابعدها.

(١٢) گەورەترین بەرەنگاربوونەوە لە ساڵی (١٨٣٩)دا ڕووی دا، لە جەنگێکدا کە بە جەنگی (نوسەیبین) ناسراوە، لەو جەنگەدا دەوڵەتی عوسمانی وڵاتە پشتیوانەکانی خۆی (واتە بەریتانیا و فەرەنسا) خەجاڵەتبار کرد، بەوەی کە تووشی شکستێکی تەواو ئابڕووبەرانە هات لەسەر دەستی ئیبراهیم پاشا. لەم بارەوە بڕوانە: سعيد احمد برجاوي، الامبراطورية العثمانية تاريخها السياسي و العسكري، بيروت، (١٩٩٣)، ص٢٢٥.

(١٣) د. هاشم صالح التكريتي، م.س، ص١٤٨.

(١٤) محمد بك المحامي، تاريخ الدولة العلية العثمانية، بيروت، ١٩٧٧، ص٢٦١- وما بعدها.

(١٥) د. هاشم صالح التكريتي، م.س، ص٢٣.

(١٦) دەربارەی بڕوانە: د. محمد كمال الدسوقي، الدولة العثمانية و المسألة الشرقية، القاهرة، ١٩٧٦، ص٢٥٤- ومابعدها.

(١٧) د. جلال يحيى، التاريخ الاوربي الحديث والمعاصر، اسكندرية، (١٩٦٥)، ص٤٤٣-٤٤٤.

(١٨) د. سيار كوكب علي جميل، تكوين العرب الحديث (١٥١٦-١٩١٦)، الطبعة الاولى، الموصل، (١٩٩١)، ص٤٢٢.

(١٩) د. محمد كمال الدسوقي، م.س، ص٢٥٩-٢٦٠، حسين لبيب، م.س، ص٨٣.

(٢٠) د. هاشم صالح التكريتي، م.س، ص٢٣.

(٢١) د. محمد انيس، الدولة العثمانية والشرق العربي (١٥١٤-١٩١٤)، القاهرة، دون سنة الطبع، ص١٧١.

(٢٢) فواز مطر نصيف الدليمي، تغلغل النفوذ البريطاني في العراق (١٨٦٩-١٩١٤)، اطروحة ماجستير غير المنشورة، مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة بغداد، ١٩٨٩، ص١٥٩.

(٢٣) د. هاشم صالح التكريتي، م.س، ص٢٣-٢٤.

(٢٤) بۆ زانیاریی لە بارەیەوە بڕوانە: د. كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، (ترجمة: محمد الملا عبدالكريم)، الطبعة العثمانية، بغداد، (١٩٨٤)، ص٢٥٠-٢٥٩.

(٢٥) د. الما وتلن، عبدالحميد ظل الله على الارض، (ترجمة: راسم رشدي)، القاهرة (١٩٥٠)، ص١٣٤.

(***) کوردستان لە سۆنگەی ئەوەی پایەیەکی ستراتیژیی و جیۆپۆلەتیکی کاریگەری هەبوو لە دەڤەرەکەدا، ببووە مەیدان و گۆڕەپانی ململانێ و جلیتبازی نێوان وڵاتە ئیمپریالیزمەکان. لەم بارەوە بڕوانە: جليلي جليل و اخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، (ترجمة: د. عبدي ناجي)، الطبعة الاولى، بيروت، (١٩٩٢)، ص٥١- و مابعدها.

(٢٦) ن. ا. خالفين، صراع على كردستان، (ترجمة: احمد عثمان ابوبكر)، بغداد، (١٩٧٨)، ص٣٣.

(٢٧) خالفين، م.ن، ص. ٣٥

(٢٨) د. ابراهيم خليل احمد و د. خليل علي مراد، ايران و تركيا (دراسة في التاريخ الحديث و المعاصر)، الموصل، (١٩٩٢)، ص٧٠.

(٢٩) د. كمال مظهر احمد، دراسات في تاريخ ايران الحديث و المعاصر، بغداد، ١٩٨٥، ص٢٣٥.

(٣٠) بڕوانە: کلۆدیۆس جێمس ڕیچ، گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان (١٨٢٠)، (وەرگێڕانی: محەمەد حەمە باقی)، چاپی سێیەم، هەولێر، (٢٠٠٢).

(٣١) د. كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص٢١.

(٣٢) ا. م. منتشا شفيلي، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، (ترجمة: د. هاشم صالح

التكريتي)، بغداد، (١٩٧٨)، ص٩٣.
(٣٣) سعدي عثمان حسين، كوردستان والامبراطورية العثمانية (دراسة في تطورها السياسي)، (١٥١٤-١٨٥١)، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة صلاح الدين- اربيل، ١٩٩٥، ص١١٩.
(٣٤) سعدي عثمان حسين، م. ن، ص١١٩-١٢١.
(٣٥) عبدالله محمد علي، كردستان في عهد الدولة العثمانية من منتصف القرن التاسع عشر الى بدء الحرب العالمية الاولى (دراسة في التاريخ السياسي)، اطروحة دكتورا غير منشورة، مقدمة الي مجلس كلية الآداب بجامعة صلاح الدين- أربيل (١٩٩٨)، ص٥٦-٥٨.
(٣٦) جەلیلی جەلیل، ڕاپەڕینی کوردەکان ساڵی (١٨٨٠)، (وەرگێڕ: د. کاوس قەفتان)، بەغدا، (١٩٨٧)، ل٥٠.
(٣٧) مینورسكي، الاكراد، (ترجمة: د. معروف خزندار)، بغداد (١٩٦٩)، ص٨٢-٨٣.
(٣٨) بڕوانە: خالفين، م.س، ص٨١-٨٣.
(٣٩) بڕوانە: صالح محمد امین، کورد و عەجەم (مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران)، چاپی یەکەم، بێ شوێنی چاپ، (١٩٩٢)، ل١٨١-١٨٥.
(٤٠) فواز مطر نصيف الدليمي، م. س، ص١٥٩.
(****) ئەم هێڵە بریتی بوو لە تۆڕێکی زەبەلاحی ئاسنی، کە لەگەرووی بوسفۆرەوە تا حەڵەب درێژ دەبۆوە و لەوێش لقێکی بۆ نیوچە دوورگەی عەرەب و لقێکی دی بە ناو خاکی وڵاتی دوو ڕووباردا (میسۆپۆتامیا) بۆ ڕێژگەی فارسی دەچوو. ئەم تۆڕە هێڵانە دەکرا لە ئەناتۆڵیا بەهێڵی ئاسنیی ئەوروپای ناوەڕاست ببەسترێتەوە. بڕوانە: د. محمد انيس، م.س، ص١٧١.
(٤١) د. محمد انيس، م.س، ص١٧١.
(٤٢) اورخان محمد علي، السلطان عبدالحميد الثاني (حياتة و أحداث عهدة)، الطبعة الاولى، الرمادي، (١٩٨٧)، ص٢٣٤.
(٤٣) کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین، کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتیی و ناوچەییدا (١٨٩٠-١٩٣٢)، چاپی یەکەم، سلێمانی، (٢٠٠٠)، ل٣٩.
(٤٤) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین، ه.س، ل٣١- بەدواوە.

# دوای تەواوبوونی دوالیزمی «زۆردار و زۆرلێکراو» ئەرکی ڕۆشنبیرانمان چییە؟

ڕزگار لوتفی
(کوردستانی ئێران)

«پێوەندیم لە تەک دەوروبەردا ئاگاییمە» (١) واتە فاکتەرە زیندووەکانی دەوروبەری تاکە کە بەرەو پلەی تێگەیشتنی و ئاگایی هانی دەدەن و دەبنە کۆی ئەو زانیاریانەی کە عەقلانییەت لە سەرووبەوە بنیات دەنرێت. هەستی تاک لەمەڕ خۆی و جێ و شوێنی لە کۆمەڵگادا و هەروەها هەست بە بەردەوامبوونی مێژووی خۆی، بەم مانایە کە تاک توانای هەیە خۆی لە سەرجەم دەورانەکانی ژیانیدا وەسف بکات، پرۆسەیەکە کە بە «بەهای کۆمەڵایەتی تاک» ناو دەبردرێت. ئەو کاتە بەهای کۆمەڵایەتی بۆ تاک دەبێتە ئەمرێکی واقیعی کە ئەو تایبەتمەندییانەی کۆمەڵگە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەم بەهایە خولقاندوونی لەگەڵ داخوازییەکانی تاکدا بێتەوەو ئەوانی دیکەش پەسەندیان بێت. بە واتایەکی دیکە هەر کاتێک کە کۆمەڵگە تایبەتمەندییەکانی تاکبوونی تاکەکانی خۆی لە دەهلیزەکانی خۆیدا چەسپاند و توانای ئەوەی بوو بەهای کۆمەڵایەتی تاک هاوتەریب لەگەڵ داخوازییە دەروونییەکانی تاکدا بسەلمێنێت، ئەوا پرۆسەی بەهای کۆمەڵایەتی تاک لەو کۆمەڵگەیەدا بە ئەنجام گەیشتووەو نیشاندەری دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگەیە بە هەموو عەیارە تایبەتییەکانیەوە:

«مرۆڤ زیندەوەرێکە کە تەنیا لە کۆمەڵگەدا دەتوانێت تاکییەتی خۆی دەرببڕێت، خەیاڵکردنی بەرهەمێکی تاکەکەسی، بە مرۆڤێکی تەنیایی تەریک لە کۆمەڵگە (کە هەنووکە ڕەنگە ئەو مرۆڤە شارستانییەتە بێت بە هەموو ئیمکاناتێکی کۆمەڵایەتییەوە)، هەر بەو ڕادەیە تەوساوییە کە ئێمە بیر لەوە بکەینەوە کە گەشە و پێشکەوتنی زمان، بەبێ بوونی کەسانێک کە بەیەکەوە بژین و لەتەک یەکدیدا قسە بکەن، ئیمکانی هەیە» (٢) لێرەدا ئەوە دەسەلمێت کە بەهای کۆمەڵایەتی تاک لە لایەن کۆمەڵگەوە ئامادە دەبێت و بەبێ ئەو ژینگەیەش، تاک توانای نییە لەم مەسەلەیە بۆ چەسپاندنی تاکیەتی خۆی کەڵک وەربگرێت. ئێمە بە دوای ئەم شیکردنەوەیەدا ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە دەبینەوە کە ئایا کۆمەڵگەی ئێمە ئەو زەمینەیەی تێدا پێکهاتووە کە بتوانێت پرۆسەی شکڵ گرتنی بەهای کۆمەڵایەتی تاکی تێدا بەرجەستە بکرێتەوە؟ کە ئەمەش زەمینەیەکی دییە بۆ گەشەو هەڵزنانی کۆمەڵگە بە پەیژەی گەشەکردن و نوێگەریدا.

لە کۆمەڵگەی کوردیدا یەکەم کارتێکەری بنچینەیی بۆ ژێر پێنانی بەهای کۆمەڵایەتی تاک، سیستەمی دیکتاتۆری و باوک سالارییە لە شکڵە جۆراوجۆرەکانی ئابووری، ڕامیاری، بنەماڵەیی و ئایینیدا.

لەنێوچوونی بەهای کۆمەڵایەتی تاکیش دەبێتە هۆی نامۆبوون کە بەرهەمەکەی چەشنێک مەسخی کەسیەتی تاکە.

لەم کۆمەڵگەیەدا بەهۆی ڕەگ داکوتانی سیستەمی دیکتاتۆرییەت لە هەموو بوارەکانی ژیاندا وەک سیستەمی بەڕێوەبەری حکومی، پەروەردە، بازاڕی، ئابووری و تەنانەت بنەماڵەش، تاک هەموو تایبەتمەندییەکانی تاکییەتی خۆی هەر لەسەرەتای بوونییەوە لێی دەسێنرێتەوەو لە ژێر پۆششی ئەم جۆرە سیستەمانەدا پەروەردە دەکرێت، کە ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی لەنێوچوونی بەهای کۆمەڵایەتی تاکە کەس و سڕینەوەی کەسییەتی تاکە کەسی ئەوان. هەر لەم حاڵەشدا بەهۆی بەردەوامبوونی ئەم جۆرە سیستەمە و بارهاتن لە ژێر سێبەری سیستەمی دەسەڵاتدا، میکانیزمی دۆزینەوەی «خود» لە جێگەی «بەهای کۆمەڵایەتی تاک» لە ڕێگەی وەرگرتنی کەسییەتی لەلایەن دەزگەو گرووپی دەسەڵاتدارەوە جێبەجێ دەکرێت. ئەم ڕەوتەش لەسەر شکڵ وەرگرتنی کەسییەتی ڕۆشنبیری کورد بەهەمان ڕیتمی پێشووەو ئەزموونی مێژوویی کۆمەڵگەی کوردیش بە ڕوونی پیشانی داوە کە ڕۆشنبیرانی کۆمەڵگە یان «سیاسی» بوون یان «خۆیان بە دەزگەی دەسەڵات» فرۆشتووە.

ئەو چەند کەسەی کە بە هەر هۆیەک لەم ڕەوتە جەبرییە خۆیان پاراستووەو بێلایەن ماونەتەوە، بەکردەوە لە ئەرکی کۆمەڵایەتی خۆیاندا هەڵسووڕێنەر نەبوون و دەسەڵاتی سەپێنەر دەرفەتی پێنەداون. ئەوەش لە بیرنەکەین کە ڕەهەندی دەسەڵات لە بوارەکانی ژیاندا بە چەشنێکە کە ڕێ بە بێلایەن مانەوە بە کەس نادات و ئەمەش یەکێکە لەو تایبەتمەندییانەی دەوڵەت لە کۆمەڵگە دیکتاتۆرلێدراوەکاندا. جا خەبات لە دژی دیکتاتۆرییەت بەبێ تێگەیشتن لە چەمکی «بەهای کۆمەڵایەتی تاک» و کۆشش لە بەرزکردنەوەی ئەم جۆرە چەمکەدا کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبووەو لە باشترین چەشنی خۆیدا «دیموکراسی»یەکانی شێوەی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی بەدواوەیە.

لێرەداو لە کۆمەڵگەی کوردیدا دەتوانین ڕۆشنبیران بەسێ کەرت دیاری بکەین:

أ- ڕۆشنبیرانی سیاسی کە خەبات دەکەن لە دژی دەسەڵاتی سیاسی داگیرکەر.

ب- ڕۆشنبیرانێک کە خۆیان بە دەزگەی دەسەڵات فرۆشتووە.

ج- ڕۆشنبیرانی بێلایەن کە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لەسەر کۆمەڵگە نەبووە.

ئەو ڕۆشنبیرانەی کە بە هەر چەشنێک تێکەڵی سیستەمی دەسەڵات بوون، هاوکات لە لایەنی ڕۆشنبیری خۆیان بە قازانجی دەسەڵات سوودیان وەرگرتووە کە هەنووکە لە خانەی باسەکەی ئێمەدا ناگونجێن.

ڕۆشنبیرانی بێلایەنیش بەو هۆیەوە کە نەیانتوانیوە ڕۆڵێکی کاریگەر لە کۆمەڵگەدا بگێڕن و لە کەمینەدا ماونەتەوە بەو جۆرە لەم دەقەدا شایانی باسکردن نین. لێرەدا ئاوڕدانەوەی بنەڕەتی لەسەر ڕۆڵی ڕۆشنبیرانی سیاسی کوردە و دیاریکردنی دەوری کاریگەریان لەم کۆمەڵگەیەدا.

ئەو وتەزایەی کە گەلێک جار لە نێو ڕۆشنبیرانی سیاسیدا بووەتە دروشم و زۆرجاریش بە هەڵە کەڵکی لێوەرگیراوە وتەزای دیموکراسییە. لەو کۆمەڵگانەدا کە دیکتاتۆرییەت لەگەڵ خواردن و خەوتنی حەشیمەت تێکەڵ بووە، کەمتر ڕۆشنبیرێک هەیە کە هەڵوێستی سیاسی نەبێت و کەمتر ڕۆشنبیرێکی سیاسی هەڵدەکەوێت کە بەردی دیموکراسی لە سنگ نەدات.

ڕۆشنبیرانی سیاسی کورد بەداخەوە بە تێگەیشتنێکی بەرتەسک بە چەمکی دیموکراسی، زۆربەیان ئەم چەمکەیان تا بازنەی سنوورداری دەرەکی تاکە کەسی خۆیان نزم کردووەتەوە. واتە بە تێگەیشتنی خۆیان لەم چەمکە بەرینە مامەڵەیان لە تەک دیموکراسیدا کردووە. هەر لەسەر ئەم بنچینەیەشەوەیە کە ئەمڕۆکە ئەو شتەی کە ناوی دیموکراسی لێ دەنێن، سبەی بە دیکتاتۆرییەت ناوی دەبەن و ئەو شتەی کە هەنووکە لە ڕوانگەی ئەوانەوە مەحکومە، سبەی بە سیاسەتی خۆیانی دەکەن.

بۆ ڕۆشنبیرانی سیاسی کورد خەبات بۆ وەدیهێنانی دیموکراسی لە کەناڵی هەستی تاکەکەسییەوە بەنیسبەت بێ عەدالەتی ئەنجام دەدرێت. لەنێو ئەواندا، تێگەیشتنی ئازادی و دیموکراسی تەنیا لە ڕێگەی خەباتێکی سەرسەخت و بەردەوامی دەروونی، کە بریتییە لە خەبات لە تەک بۆچوونی ئایینی، کێشەکانی پەسکیۆلۆژیک و پیاوسالارییەوەیە کە وەدی دێت. بە واتایەکی دیکە ڕۆشنبیرانی سیاسی لە دیموکراسی وەک چەکێک بە دژی جەمسەری زۆردار و دەسەڵاتدار کەڵک وەردەگرن و بەهۆی بوونی دوالیزمی «زۆردار و زۆرلێکراو» بەپێی مێژووی کۆمەڵگە، ئەم چەکە بووەتە هێزی جووڵەو حەرەکەتیان بۆ بەربەرەکانی سیستەمی دەسەڵاتدار، لە کاتێکدا چەمکی «دیموکراسی» کاتێک بە تروپکی وەدیهاتنی دەگات کە کۆمەڵگە توانای هەڵگرتنی هەر جۆرە بۆچوونێکی جیاوازی هەبێت و ئەو سوونەتانەی کە تا ناخ بە دەروونی مرۆڤی کورددا ڕۆچوون، نەبنە کۆسپ لەبەردەم زەوق و بۆچوونە جیاوازەکاندا.

بۆ نموونە لە کۆمەڵگەیەکدا کە دیاردە نەریتی،

سەلەفی، ئاینییەکانی خۆی ڕاگرتبێت و لە هەمان کاتیشدا تەکنیکی دیموکراسی کە بریتین لە: هەڵبژاردنی ئازاد، مافی دەنگدانی گشتی، پێڕەوی کەمینە لە زۆرینە، ئازادی ڕاگەیاندن و بڵاوکەرەوەکان و... بەکارهێناوە، لەو کۆمەڵگەیەدا کە ناتواندرێ بۆچوونی لایەنێک یان ڕوانگەیەکی مۆدێرن و نوێ هەزم بکرێت و هەموویان بێبەشن لە مافی شارستانی خۆیان، ئایا کەڵک وەرگرتن لەم تەکنیکی دیموکراسییەتە نەبووەتە کەرەسەیەک بەدەستی چینێکی دیاریکراوی ڕۆشنبیری سیاسی بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات؟ واتە هەمان دوالیزمی «زۆردار و زۆرلێکراو» دیسانەوە دووپات بکرێتەوەو دروستکردنی ڕۆحی دیموکراتیک و پەرەپێدانی لە کۆمەڵگەدا ببێتە خەونێکی ساواو سادە. بیری دیموکراسییەت لە خۆیدا دەبێتە هۆی فنۆمنێک کە پانتاییەکی بەرینی لە چەمکەکانی نێوان تاکەکەسی-کۆمەڵایەتی، ئابووری و سازدانی بونیادە نوێیە کۆمەڵایەتییەکان بۆ پەروەردەو فێرکردنی دیموکراسی لەخۆ دەگرێت. لەم فنۆمنەدا ناتوانرێ مرۆڤەکان بە «دەنگدەرانی ئازاد»، «کۆمەڵە حزبییەکان»، یان «خلق الله» ناوزەد بکرێن. دیموکراسی و عەدالەتیش دوو چەمکی جیا لەیەکتری نین و چەمکی یاسایی کەسییەتی «ئیستثمار»ی مرۆڤ لە مرۆڤیش لەخۆ ناگرێت، بەم پێیە لەهەر کۆمەڵەو گرووپێکدا چ سیاسی و چ ناسیاسی تا ڕۆحی دیموکراسی تۆوی خۆی لە دەروونی تاکەکاندا نەچێنێت و چەمکی دیموکراسییەت چەکەرە نەکات هەر جۆرە هەوڵدان و دەنگ هەڵبڕینێک بە مەبەستی گەیشتن و داخوازی دیموکراسیەت دروشمێکە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و دووپاتبوونەوەی هەمان دوالیزمی «زۆردار و زۆرلێکراو». لێرەدا لەسنگدانی بەردی دیموکراسی لەلایەن ڕۆشنبیرانی سیاسییەوە دەبێتە هەوڵێکی پڕۆپاگەندەیی و لە قاوغی تیۆری خۆی ناترازێ و لە بەرژەوەندی و قازانجی بەرتەسکدایە نەوەک لە دەرک پێکردنێکی ڕۆحی ئەم چەمکەدا. ئەو شتەی کە لێرەدا جارێکی دیکە ڕۆشنبیران بەشێوەیەکی بازنەیی پێی دەگەنەوە گەڕانە بەدوای بەهای کۆمەڵایەتی تاکەکەس لە نێو ڕەهەندەکانی سیاسەت و گرووپە سیاسییەکانداو گەیشتن بە ئاستێک کە ئازادی دەستەبەر بکرێت کە ئەمەش ئەمرێکی ناسروشتییە، چونکە کۆمەڵگە بەمانای بنچینەیی وشە چەمکی دیموکراسییەتی هەزم نەکردووەو دیموکراتیزە نەبووە.

هەنووکە بەو ئەنجامە دەگەین کە بەهۆی بەردەوامبوونی سیستەمی دەسەڵاتی سیاسی سەپێنەرو دووپاتبوونەوەی ئەو دوالیزمەی ئیشارەتمان پێدا، ڕۆشنبیران توانایەکی ئەوتۆیان لە گۆڕانی کۆمەڵگە نەبووە. ئەوان تا ئەم قۆناغەش هەوڵی ئاڵوگۆڕکردنی دەسەڵاتیان لە غەیرە کوردەوە بۆ کورد داوەو کەمتر لە شۆڕبوونەوە لە ناخی کۆمەڵگەدا بۆ بنیاتنانەوەیەکی نوێ و سەردەمانە. ئێستاکە کە دەرفەتێکی گونجاو هاتووەتە دی و ڕۆشنبیری سیاسی کورد لە هەڵگرتنی ئەم خەمە قورسە ڕەخساوە، دەبێ لە ڕێگەی مەنتقی خۆیەوە بوارەکانی کۆمەڵگە بۆ گۆڕانکاری دەسنیشان بکات و پرۆگرامی قۆناغێکی نوێ بۆ کردەوەی کۆمەڵایەتی خۆی دابڕێژێت.

ڕێکخراوە جۆراوجۆرەکانی نێو کۆمەڵگە وەک قوتابخانە، ڕێکخراوی حکومی، ڕێکخراوی «عقد ازدواج»، ڕێکخراوی ئایینی و... تاد، هەر کامێکیان بەیارمەتی فاکتەرێکی زەینی کە بە (عەقلانییەت - Rationality) ناوبانگی دەرکردووە لە حاڵەتی مانەوەو بەردەوامیدا دەمێننەوە لەو شوێنەشەوە کە عەقلانییەت بەردەوام بەهێزی ئەزموونە نوێیەکان دەکەوێتە بەر هێرش و پەلامار بە مەبەستی نوێبوونەوە، پێویستی بە بەرگرییەک هەیە کە لە ڕێگەی لۆژیکی (باڵا)وە (Logos) بەرهەم دێت. پێوەندی ئەم لۆژیکی (باڵا)یەو عەقلانییەتەش لە ڕێگەی (ئیمانەوە- Faith) بە ئەنجام دەگات.

ئەڵقەی ئەو پێوەندییەی کە زەینییەتی تاک لەگەڵ واقعییەتەکانی کۆمەڵگەی خۆی هەیەتی عەقلانییەت دیاری دەکات. زەینییەت کە لەژێر کاریگەری دنیای دەرەوەدایە بەردەوام گۆڕانکاری بە سەردا دێت، بەڵام لەو شوێنەوە کە زەینییەت فاکتەرێکی وەستاو نییە بەهەر ئەزموونێکی نوێ، عەقلانییەت دەخاتە بەر پەلاماری خۆی. عەقلانییەتیش کە مەنتقی (باڵا)ی لەخۆ گرتووە، پانتایی کۆمەڵگەی تەژی کردووە لە لەوحە پیرۆزەکان و زەینییەت لە ڕێگەی ئیمانەوە لەتەک واقیعییەتەکاندا پێوەندی دەگرێت. پیرۆزی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگە هەر لە قوتابخانەوە بگرە تا ڕێکخراوی ئایینی و بنەماڵەیی و حزبی سیاسیش هەر هەموویان لەم مەنتیقەوە سەرچاوەیان گرتووە.

ئەرکی ڕۆشنبیران بەدوای تەواوبوونی ئەرکی پێشینەی خۆیان (خەبات لە دژی دەسەڵاتی داگیرکەر) ئەوەیە کە بەکارکردن لە پانتایی عەقلانییەتدا کە لەلایەن سوننەت، فەرهەنگ، یاسا و.... لە ڕابردوودا بەرهەم هاتووە، تێبکۆشن کە ئەم پێوەندییانە بە شێوەیەکی نوێ و شارستانی بگۆڕن. بۆ وێنە لە ڕێکخراوە سیاسییەکاندا کە بۆ گۆڕانی کۆمەڵگە هەوڵ دەدەن، بێجگە لە کۆسپە

بونیادی و فەرهەنگییەکان، فاکتەرێکی زەینی تایبەت کە لە ئاکامی بەردەوامبوونی فکری ئایینیدا دروست بووە، رۆڵێکی سەرەکی دەبینێت. لەم چەشنە زەینییەتەدا بەو هۆیەوە کە لۆژیکی «بالا» رەهەندێکی سەرەکی هەیە، تاک خود بە خود دەبێ بە تاکێکی ئۆتۆریتە و هەر بەم ریتمەش کۆمەڵگە دەبێتە بەردەوامییەک لەم تاکە ئۆتۆریتییانە. جا لێرەدا رۆڵی رۆشنبیران گرنگییەکی تایبەتی پێ دەدرێت و رەوتێکی پڕ مەترسی دەگرێتە ئەستۆ کە ئەویش بە لەبەرچاو گرتنی پێشکەوتنە ئابووری، سیاسی، زانستییەکانی سەردەم دەبێ بەردەوام پرسیار بخرێتە بەردەم کۆمەڵگەو پێکهاتەکانی و فەزایەک بەرهەم بێت کە تاکی ئۆتۆریتە گۆڕانکاری بەسەردابێت و بەهای کۆمەڵایەتی تاکییەتی پێبدرێت. لە ئەنجامدا بگەرێتەوە سەر ئەو حاڵەتە سروشتییەی خۆی بە هەموو حەزو ئارەزوو و غەریزە دروستەکانییەوە.

ئەگەر رۆشنبیران توانای ئەوەیان نەبێت کە کۆمەڵگە لە لەوحە پیرۆزەکان پاک بکەنەوەو ئەساسی پێوەندی لەسەر بەهای دوو لایەنی کۆمەڵگەو تاک بنیات بنێنەوە، ئەوا زەمینەی دووبارە بۆ سازبوونەوەی هەمان دەسەڵاتی دیکتاتۆری خۆش دەکرێتەوەو تاکەکان بە مەرەکەبی قەڵەم جافی دەسەڵاتی سەپێنەر رەش دەکرێنەوە. مەترسییەکی دیکەش کە لەم حاڵەتەدا رۆشنبیران دەگرێتەوە، ئەوەیە کە دیسانەوە دەبێ ناسنامەی کۆمەڵایەتی و کردەوەی کۆمەڵایەتی خۆیان لە دەسەڵاتی سیاسییەوە وەربگرن و لە رێی پاداشتی باش و خراپی ئەم سیستەمەدا چاوەڕوانی بەرهەمی خێرو شەڕی خۆیان بن.

**پەراوێزەکان:**

**١- مارکس، ئیدیۆلۆژی ئەڵمانی. ل٣٨**

**٢- مارکس، گروندریسە، وەرگێرانی بۆ فارسی (باقر پرهام، احمد تدین)، بلاوکەرەوەی ئاگاه، ١٣٦٢، ل٧**

*** بۆ نووسینی ئەم وتارە بەشێوەیەکی بەرین لە وتاری «رۆشنبیران و سۆسیالیزم»، نووسینی: ف، صنعتکار سوود وەرگیراوە.**

# چارەنووسی ئایندەی جیهان لەبەردەم شەپۆلی گۆڕانکارییەکاندا

ئا: عومەر عەلی محەمەد
(سلێمانی)

لەگەڵ نزیکبوونەوەی سەدەی بیستویەکدا هەر گەل و نەتەوەیەک بەشێوازی جۆراو جۆری ستراتیجیەتی سیاسی و ڕۆشنبیری و ئابووری و کۆمەلایەتییەکانی خۆی دەخاتە ڕوو، ئەویش لەپێناو ڕۆشنکردنەوەی هەنگاوەکانی داهاتوو و گەیشتن بە باشترین پلانی ئایندەیانە، بۆ بەرەو پێشبردنی گەل و وڵاتیان لەسەر بنەمایەکی زانستی ئەکادیمی واقیعی کە تێیدا ژیان لە ئایندەدا مسۆگەر بێت و کار لەسەر لابردنی ڕێگر و کۆسپەکان بکرێت. جیهانی ئەمڕۆ لە گۆڕانێکی خێرا و کتوپڕدایە، بە جۆرێک کە ئەوەی لەم چەند ساڵەی دواییدا ڕووی داوە بەدرێژایی مێژوو گۆڕانی وای بەخۆوە نەبینیوە، کە هەندێک لە پسپۆڕانی ئەم بوارە بە شەپۆلی سێیەم ناوی دەبەن، لەدوای قۆناغی یەکەم کە لە جیهاندا ڕووی دا لە دوای دۆزینەوەی کشتوکاڵ کە پێش (١٠٠٠٠) ساڵ ڕووی دا، کە لە ئەنجامی ئەمەدا گوند و کۆمەڵگا و ئوردوگا نشتەنیە سەرەتاییەکان دروست بوون. کە ئەمەش سەرەتای دروستبوونی شارستانیەتی مرۆڤایەتی بوو، هەندێک پسپۆری ئەم بوارە ئەم قۆناغەیان بە مۆدێرنیزمی یەکەم ناو بردووە.

قۆناغی دووەم کە پێش (٣٠٠) ساڵ لە ئێستا ڕووی دا کە بووە هۆی گواستنەوەی کۆمەڵگای مرۆڤی لە قۆناغی کشتوکاڵەوە بۆ پیشەسازی، کە بووە هۆی گواستنەوە و گۆڕان و جمان لەسەر ئاستێکی فراوانی گۆی زەوی، کە چارەکێکی گرتبووەوە کە ناسراون بە نەتەوە پێشکەوتووەکان. کە لە ڕوانگەی هەندێک پسپۆڕەوە بە مۆدێرنیزمی دووەم دادەنرێت، بەڵام قۆناغی سێیەم ئەو قۆناغەیە کە ئێستا تێیدا دەژین. کە لەگەڵ خۆیدا گەورەترین گێژەڵۆکەی گۆڕانکاری هەڵگرتووە. کە هەندێک بە قۆناغی پۆست مۆدێرنیزم ناوی دەبەن.

لە بارەی ئەم سێ قۆناغە و گۆڕانکارییەکانی لێکۆڵەرەوەی بەناوبانگ لە بواری لێکۆڵینەوەکانی ئایندەوە (ئالفین توفلر) بەدرێژی باسی لێوە کردووە لە کتێبێکیدا کە لە ساڵی (١٩٨٠)دا دەرچووە بەناوی «شەپۆلی سێیەم».

ئەو بارودۆخەی کە ئێستا جیهان پێیدا تێپەڕ دەبێت، وای لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی کردووە ئامادە و بەپیت بێت بە ڕوودانی زۆرترین گۆڕانکاری کە شوێنکاری خۆی لەسەر هەموو لایەنەکانی ژیان بەشێوەیەکی گشتگیر بەجێ دەهێڵێت.

کات بەشێوەیەکی خێرا گوزەر دەکات، بەهۆی ئەو گەشەکردنە مەزنەی کە لە بواری ئەبستمۆلۆجیادا هاتۆتە ئاراوە، [دوای ئەوەی ئەبستمۆلۆجیا گۆڕانێکی ڕیشەیی بەخۆوە بینی، ئەگەر لە ڕابردوودا زانست تەنیا بە گۆڕانی چاخەکانی تازە دەبووەوە، بەڵام هەنووکە ئەبستمۆلۆجیا هەر حەوت ساڵ دوو هێندە دەبێت، ئەمەش بەرەو پێش چوونێکی سەرسوڕهێنەرە، کە بۆ نموونە تەنیا ئەوەندە

بەسە کە بڵێین ساڵانە (٤٠٠٠٠) زاراوەی نوێ لە بوارە جیاوازەکانی زانستدا دێتە ئاراوە، هەر دوو خولەکێک وتارێکی زانستی دەنووسرێت لە گۆشەیەکی ئەم جیهانەدا.]«١»

ئەبستمۆلۆجیا بەدرێژایی مێژوو گەورەترین کاریگەری هەبووە لەسەر گۆڕانی ژیانی مرۆڤ و شێوەی گوزەران و رێگەکانی بیرکردنەوە و ئامێرەکانی کە لەگەڵ سروشت و دەوروبەردا بەکاری هێناون.

هەموو گۆڕان و گەشەکردنێک لە ئەبستمۆلۆجیادا، لە دوایەوە گۆڕانکاری روودەدات کە ناتوانرێت پێوەر و دووری و تەنانەت کاتیشی دیاری بکرێت، چونکە زانست لەگەڵ مرۆڤدا دەمێنێتەوە و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر. لە شارستانیەکەوە بۆ شارستانیەکی تر دەگوازرێتەوە.

هەرچەندە ئێستا مرۆڤایەتی گەیشتۆتە کەنارەکانی سەدەی بیست و یەک، بەڵام هەتا ئێستاش کاریگەرە بە زانست و مەعریفەیەک کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش زایین، ئەمەش مەزنی و کاریگەری هێزی زانست دەردەخات.

پێویستە بزانین کە ئەم گۆڕانکاریانە بەیەک شێواز و ئاراستە لە رووی خێرایی و فراوانییەوە روونادەن، بەڵکو لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکی تر و لە شارستانیەتێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت. لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا لە کێبڕکێیەکی خێرادایە بە چالاکییەکی زۆر ئەمەش لە کۆمەڵگاکانی ئەمریکای باکوور و ئەورووپا و یابان و هەندێک وڵاتی وەک کۆریای باشوور و تایوان لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیادا بە روونی دیارە.

بەڵام بەشێوەیەکی کەمتر لە کۆمەڵگا تازە گەشەسەندووەکاندا. دەتوانین بڵێین لە هەندێک کۆمەڵگای وەک ئەفریقیا و ئەمریکای لاتیندا بەتەواوی وەستاوە، بە هەمان شێوەش لە شوێنی جیاوازی تردا کە بەتەواوی لە جیهان دابڕاون، کە لە رووی کات و مێژووەوە پێوەندیان بە جیهانەوە نەماوە.

لە راستیدا ئەو وێنەیەش کە پێشنیار دەکرێت کە لە ئەدەبیاتی عەرەبی و ئیسلامیدا لە بارەی قەبارەی گۆڕانکاریەکان و جۆرەکەی و هەمەلایەنیەکەیەوە نزیکە لە هەمان وێنەی گۆڕانەکانی کە ئێستا کۆمەڵگای رۆژئاوایی بەخۆیەوەی دەبینێت، خەریکە بە جۆرێک تەعبیر لە هەستی خۆمان دەکەین کە هەمان هەستی ئەوانە بۆ گۆڕانکاری، بەڵام پێویستی ئێمە تێڕوانینمان هەڵقوڵاوی واقیع و ئاستی گۆڕانە ناوخۆییەکان بێت، نەک بە پێوەری کۆمەڵگای رۆژئاوایی خۆمان بکێشین، بۆ ئەوەی بتوانین بەشێوەیەکی واقیعی لێکۆڵینەوە و باسی لێ بکەین کە لە چوار چێوەی بابەتیانە دەرنەچێت.

هەستکردنمان بەم گۆڕانکاریانە روو لە زیادبوون دەکات، لەگەڵ فراوانبوون و پێشکەوتنی ئەو هۆیانەی کە کەنارەکانی جیهان بەیەکەوە دەبەستێتەوە. ئەمیش ئەو هۆکارانەن کە دەروازەی بۆ خستووینەتە سەر پشت بەسەر جیهاندا. کە لە رێگەیەوە پێشوازیمان لە کاریگەریەکانی کردووە. جیهانیش سوودی لە کارتێکردن لێمان بینیوە. هەر لە رادیۆ و تەلەڤزیۆن و تەکنۆلۆجیای پێشکەوتوو لە بواری هۆکارە پێوەندیە جیهانییەکانی وەک پەخشکردنی تەلەڤزیۆن لە رێگەی مانگی دەستکرد و ئامێری ژمێریار (حاسوب) بۆ تۆڕەکانی جیهانی زانیاری «ئەنتەرنێت». ئەوانەش کە بەشێوەیەکی پێشکەوتووتر پێمان دەگەن. بەتایبەتی لەم بوارەدا. بواری پێوەندی تەکنولۆجیا کە ئێستا چووەتە نێو ئابووری بازاڕی جیهانی بە گرنگیەکی زۆرەوە. ئێستا کێبڕکێیەکی فراوانی لەسەر دەکرێت لەلایەن ژمارەیەک لە کۆمپانیا گەورەکانی کە هەریەکەیان دەیانەوێت پێشبڕکێ بکەن لە پێشخستن و بەرەو پێشبردنیدا ئەوەش ئەو پێشکەوتنە خێرایە روون دەکاتەوە بەتایبەتی لە بواری ژمێریار (حاسوب)دا.

بەم هۆکارانەوە ئاسۆکانمان فراوان بوون بەسەر ئەو گۆڕانە جوانە و پێشکەوتنانەی کە لە جیهاندا رووی داوە.

ئەگەر وریابوونەوەی ئێمە بۆ ئەم گۆڕانکاریانە بگەڕێتەوە بۆ پێش دە ساڵ لەمەوبەر بۆ دەوروبەری (١٩٨٥). ئەوا هوشیار بوونەوەی رۆژئاوا دەگەڕێتەوە بۆ دوای جەنگی دووەمی جیهانی لەسەر ئاستی کۆمەڵێکی دیاریکراوی لێپۆر، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای حەفتاکان لەسەر ئاستی جەماوەری رۆژئاوا بەشێوەیەکی گشتی.

[لە دوای جەنگی دووەمی جیهانیەوە داهێنان و دۆزینەوەکان لە بوارە جۆر بەجۆرەکاندا هەنگاوی گەورەیان ناوە، بە جۆرێک کە دەستکەوتی سەدەکانی پێشوویان بەجێ هێشت، لەوانەش پەخشی تەلەڤزیۆنی بەهۆی مانگە دەستکردەکانی و ئامێرە ئەلکترۆنیەکان و ئامێری لەبەرگرتنەوە و کوتانەکانی (سولک- SALK) لە دژی ئیفلیجی منداڵ، و نەشتەرگەری و چاندنی دڵ، لە دوای ساڵی (١٩٤٥) مرۆڤ توانی بچێتە سەر بەرزترین لوتکەی چیاکان و قووڵایی دەریاکانیشی پشکنی، لەوانە کەندری ماریاناس بۆ چەند هەفتەیەک توانی لەژێر قووڵایی سەدان پێ لە دەریادا بژی، چووەسەر مانگ و لەوێوە وێنە و زانیاری گەیاندە ئەو ئەستێرانەی کە لە زەویەوە دوورن و لەسەر زەویش ئەو زانیاریانە

سـوودیان لێ بینرا.. هەروەها چەندین ڕوانگەی جۆراوجۆری دا بۆ ئاگاداربوون لە ڕەمز و شەپۆلەکانی دەرەوەی زەوی. لەم ماوەیەشدا [١٩٤٥-١٩٧٦] هەشت وڵاتی تازە دەرکەوتن و بەمەش ژمارەی وڵاتانی جیهان گەیشتە (١٦٠) دەوڵەت و ژمارەی دانیشتووانی سەرزەویش بە ژمارەی (١,٧٠٠٠٠٠) کەس زیادی کرد لەسەر ئەو (٤) ملیارەی کە لە ساڵی (١٩٧٦)دا هەبوو. لە بەرامبەریشدا بەرهەمی جیهان زیادی کرد بەشێوەیەکی خێرا.. کە لە ساڵی (١٩٥٠)وە لە (٧٠٠) ملیارەوە بەرز بووەوە بۆ (٣,٢) ترلیۆن دۆلار لە بەرامبەریشدا نرخیش دابەزی هەتا ساڵی (١٩٧٠).]«٢»

بە وردبوونەوە لەو لێکۆڵینەوەیەی کە لە ساڵی (١٩٧٥) ئامادەکراوە [کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بە خێراترین قۆناغەکانی مێژووی خۆیدا تێپەڕدەبێت، بەڵام لە لایەن کێوە ئەوە ڕابەرایەتی دەکرێت، یان ئەنجامی کۆتایی چی دەبێت. ئەوەی زانراو و بەڵگەنەویستە ئەوەیە کەگێژەلووکەیەکی گۆڕانکاری لە گشت دام و دەزگاکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا ڕوودەدات. کە هەڵگەڕانەوە لەناوبردن و داهێنانی نوێی بەدواوە دەبێت. ئەمەش لە تەمەنی بەرەیەکی مرۆڤدا دەبێت، کە زۆر زیاتر دەبێت لەوەی لە چەند سەدەی ڕابردوو، یان هەزاران ساڵی ڕابردوودا ڕووی داوە. هیچ هێزێکی ئەوتۆش ناتوانێت لەبەردەم ئەم شاڵاوی گۆڕانکاریەدا بوەستێت، چونکە چەند بەرەیەک نامێنن پێش ئەوەی بتوانن دەست بگرن بەسەر چالاکییە تەکنیکی و کۆمەڵایەتییە بەهێزەکانی ئێستا، یان بیانەوێت ڕێگەی پێ بگرن.]«٣»

[ئەم لێکۆڵینەوەیە بەشێکە لە بۆچوونەکانی زانای بواری مرۆڤایەتی (علم الانسانیات)، (جون پلات) لە بارەی ئەم گۆڕانکاریانەوە باس دەکات کە دەڵێت:

گۆڕانکاریەکانی ئێستای جیهان زۆر گەورەن، خەریکە یەکسان دەبێت بە (١٠) شۆڕشی پیشەسازی و (١٠) بزووتنەوەی ریفۆرمی پرۆتستانتی ئەمانە هەمووی لە یەک شۆڕشدا کۆبوونەوە، لە سەردەمی یەک بەرەی مرۆڤدا]«٤»

ئەم وتەیەی (جون پلات) بۆ ساڵی (١٩٧٣)ی زایینی دەگەڕێتەوە، ئەی ئایا دوای ئەو هەموو گۆڕانکارییەی لە جیهاندا ڕوویان داوە، دەبێت تێڕوانینەکانمان چی بەسەربێت.

ئەوەی کە زۆرتر هەستی خەڵکی جووڵاند کە هەست بە گۆڕانکاریە خێراو کتوپڕەکانی جیهان بکەن، کتێبی (صدمة المستقبل)ی «ئالفین توفلەر»بوو کە لە ساڵی (١٩٧٠)دا دەرچووە. لە کاتی خۆیدا ئەم کتێبە لە ڕیزی ئەو کتێبانەدا نووسرابوو کە یەکێکە لە ئەو کتێبانەی کە زۆرترین ژمارەیان لێ فرۆشراوە لە جیهاندا، کە زیاتر لە (٦) ملیۆن دانەی لێ فرۆشرا بە زیاتر لە (٢٠) زمان، ئەم ژمارەیەش بە ژمارەی پێوانەیی دادەنرێت لە بواری بڵاوکردنەوەدا. وە لەگەڵ ئەو دەنگدانەوە گەورەیەی کە ئەم کتێبە دروستی کرد. ناونیشانەکەیشی «صدمة المستقبل» بووە زاراوەیەک لە فەرهەنگە جیهانییەکاندا لەسەر ئاستێکی فراوانی جیهانی بەکارهێنرا...

[ئەم زاراوەیە «ڕاچڵەکاندنی ئاینده» لەلایەن «ئیدوارد کۆرنیش» ڕەخنەی لێ گیرا کە ئێستا سەرپەرشتی گەورەترین کاری لێکۆڵینەوەی ئاییندەیە لە ڕێگەی باس و بەدواداچوون و شیکردنەوەوە. ئەو لەو بڕوایەدا بوو کە (ڕاچڵەکاندنی ئاینده) کە «ئالفین تۆفلەر دای هێناوە و بڵاوبوونەوە بە شێوەیەکی فراوان. ئەویش لە ڕێگەی کتێبێکی بە بایەخ کە هەمان ناونیشانی هەبوو ئەم زاراوەیە زیندوو و بەرچاوەیە، بەڵام هەڵەیە، چونکە ڕاچڵەکاندن ئاینده دروستی ناکات، بەڵکو گۆڕانی کۆمەلایەتی خێرا دروستی دەکات. من وای بۆ دەچم کە باشترین زاراوە بریتی بێت لە ڕاچڵەکاندنی گۆڕان»]«٥»

بە بڕوای من هیچ دژایەتیەک لەنێوان ئەم دوو زاراوەیەدا نییە، چونکە لەلایەکەوە گۆڕانی کۆمەلایەتی خێرا بووەتە هۆی دروستکردنی ئەم ڕاچڵەکاندنە هەر ئەمەشە کە «توفلەر» بڕوای پێیەتی، بەڵام جیاوازی ئەوەیە کە ئەم گۆڕانە خێرایە کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری پێشکەوتنەکانی زانست و تەکنولۆژیا وەک «توفلەر» بڕوای پێیەتی کە لە ئاییندەدا بەرەو ڕوومان دێت، ئەمەش کاریگەری لەسەر ژیانی کۆمەلایەتی و سیستەمی گشتی دەبێت کە ئەمەش ڕاچڵەکاندنێکە بۆ خەڵک، ئەوەش بە هۆی ئەوەی کە بزووتنەوەی گۆڕانکاری لە دوو هێندە بوون و زیاد بووندایە. زانستیش ڕۆژ بەڕۆژ و ژیان بەرەو پێش دەبات، لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تریش، زانست شەپۆلێک لە گێژە لووکەی گۆڕانکاری دروست دەکات، ئەمەش لە ئاییندەدا ڕاچڵەکاندن لای خەڵک دروست دەکات، کەواتە جیاوازییەکان لە مانادا نابینرێت، بەڵکو لە زمان و شێوازی دەربڕیندا خۆی دەبینێتەوە.

لەلایەکی ترەوە ڕاچڵەکاندنی ئاینده، کە پێشبینی دەکرێت، ڕووبدات، ڕاچڵەکان نییە لە عەقڵی مرۆڤدا. لەدوای ئەوەی خەیاڵی مرۆڤ بە جۆرێک فراوان بووە کە دەتوانێت بگاتە دوورترین سنوور و هەنووکە ئەمە وەک حاڵەتێکی ئەفسانەیی لێ هاتووە، دوای ئەوەی بیری

مرۆڤ فراوان و رۆشن بوو بەسەر جۆرەها ئەگەری ئایندەدا، چونکە بەپێی ئەم تیۆرە ئەوەی کە نەدەتوانرا بهێنرێتە دی، ئێستا لە ئایندەدا دێتە دی و لە واقیعدا دەچەسپێت.

بۆ ئەمەش فەلسەفەی «پۆست مۆدێرنیزم» دامەزراوە، کە دەیەوێت عەقڵی رۆژئاوایی لە شتە نەگۆڕ و چەسپاوەکان و زانستی رەهاوە بگۆڕێت بۆ نیسبی (رێژەیی) و پەرەسەندنی بێ سنوور، واتە وەستاویی و نەگۆڕان و باوەری وەستاو نییە لە زانست و عەقڵدا بەپێی ئەم فەلسەفەیە.

ئەوەی کە ئێستا خەڵک باوەری پێیەتی سبەینێ هەرەس دەهێنێ.. هەر بەو شێوەیە بەبێ وەستان گۆڕان روودەدات.

ئەوانەی رەخنە لە پۆست مۆدێرنیزم دەگرن لە رۆژئاوادا مەترسییەکەی لەوەدا دەبینن کە عەقڵانیەت تێک دەشکێنێ شتە یەقینەکانی لێ زەوت دەکات و وا لە عەقڵی مرۆڤ دەکات کە لە بارێکی نەوەستاوی و لەرەلەرێکی بەردەوام دابێت.

رۆژئاواییەکان بەزوویی هوشیاربوونەوە لە ئەو مەترسیانەی کە رووبەروویان دەبێتەوە لەسەر ئەم گۆڕانە کتوپڕ و خێرایانە لە رووی دەروونی و کۆمەلایەتی و پەروەردە و ئابووریدا. لە کاتێکدا کە ئەو کۆمەڵگایانە شانۆی ئەو گۆڕانکاریانەن و کاریگەریەکەشی سەرەتا لەسەر خۆیان دەبێت، چونکە هەر خۆشیان جووڵە و خێرایی پێ دەبەخشن، بەڵام ئایا باری کۆمەڵگاکانی تری جیهانی و ئیسلامی چۆن دەبێت لە کاتێکدا کە زۆر درەنگ خەبەریان دەبێتەوە لەم گۆڕانکاریانە و خۆشیان لەنێوان دوو بەرداشدا دەبن، یان بەرەو رووی بوەستنەوە، یان هەرەس بهێنن و بکەونە سەر زەوی، کەوتنەکەش بۆ کاتێکی کەم بێت بۆ وەرگرتنی پشوو و چاکبوونەوە و خۆسازدان و پاشان دەست بکەن بە رینیسانسێک، یان بۆ کاتێک بێت کە کۆتاییەکەی دیارنەبێت.

ئەوەی پێشبینی دەکرێت، ئەم گۆڕانکاریانە کاریگەری خراپیان لەسەر کۆمەڵگاکانی ئێمە دەبێت (لەبەر ئەوە ئەو هەستکردنە وای کردووە... بە ترسەوە لەگەڵ ئەم گۆڕانکاریانەدا مامەڵە بکرێت، ئەویش بەهۆی دواکەوتوویی و بێ ئاگایی و خۆئامادە نەکردن بۆ پێشوازیکردن لێی.. هەروەها لاوازییەکی گشتی هەست پێکراو لە ژێرخان و پەیکەری بنەرەتی ئەم کۆمەڵگایانە کە ناتوانێت لەگەڵ ئەم گۆڕانانەدا مامەڵە بکات بە جۆرێک کە نەخشەیەکی ئامادەکراوی هەبێت بە ئاراستەیەکی ئیجابی مامەڵەی لەگەڵدا بکات، یان بەجۆرێک مامەڵەی لەگەڵدا بکات کە خۆی لە رووە مەترسیدارەکانی بپارێزێت.

لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەدا کە رۆژ بە رۆژ روو لە زیادبوون دەکەن. کە ناتوانرێت دەستی بەسەردابگیرێت، یان رێگەی لێ بگیرێ.. ئەمە بووەتە گەورەترین هاندەر کە سەیری ئایندە بکرێت و گرنگی بە بابەت و لێکۆڵینەوە لەسەر ئایندە بدرێت بۆ ئەوەی بزانرێت کە ئایا کاریگەری ئەو گۆڕانانە لەسەر داهاتوودا چی دەبێت بە تایبەتی لەسەر هەموو لایەنەکانی ژیانی خەڵک بۆ ئەوەی بزانرێت کە ئایا داهاتوو چی لەناو دۆسیەکانی خۆیدا هەڵگرتووە بۆمان. بۆ ئەوەی هەوڵ بدرێ کاری لەسەر بکرێت و خۆی بۆ ئامادە بکرێت و ئاگاداریش وەربگیرێت... بەرامبەر ئەو گێژەلووکەیەی کە دروستی دەکات لە گۆڕانکاری.

**سەرچاوە:**

المسئلة الحضارية كيف نبتكر مستقبلنا في عالم متغير، زكي ميلاد، الطبعة الاولى (١٩٩٩)، المركز الثقافي العربي، ص١٠٣-١٠٨.

**پەراوێزەکان:**

١- الحرب الحضارية الاولى مستقبل الماضي وماضي المستقبل، د. مهدي المنجرة، دارالبيضاء (١٩٩٤)، ص٣٥٥.

٢- المستقبلية: مقدمة في فن وعلم فهم وبناء عالم الغد، ادوارد كورنيش، ترجمة محمود فلاحة، دمشق، وزارة الثقافة (١٩٩٤) ص١١.

٣- هەمان سەرچاوە ل١١.

٤- هەمان سەرچاوە ل١٢.

٥- المستقبلية ص٣١.

# مۆڕاڵیتی پاسۆلۆژی و ئاڤانت- گارد

سیلڤیا پلاث
لە ئینگلیزییەوە: ئازاد خدر

سیلڤیا پلاث دەمانخاتە نێو گێژەنی ئەو کێشانەی کە پەیوەستن بە جەرگەی پێوەندی نێوان مرۆڤ و کەلتوورەکەی لەم ڕۆژگارەماندا. ئەو بەرپەرچی گشت گریمانە تیۆرییەکانی Hypothesis، کەلتووری (ماثیۆ ئارنۆڵد) دەداتەوە، ئەوەی دەڵێ، خوێندنەوەی ئەدەب سوودی بۆ هەستیاریی مرۆڤ هەیە، پلاث ئەو ئافرەتەیە کە شیعری جوان دەنووسێ و ڕۆدەچێتە نێو قووڵایی جیهانی ئینچوێیشن.

intuation- استبطان- تەواو دەورووژێ بە بیرۆکەی خۆکوشتن و کوشتن و بە هیچ شێوەیەک بڕوای بەوە نییە کە مەرگ بریتییە لە ڕێگەیەک بۆ ژیانەوە. بێگومان قوتابخانەی ئاڤانت گارد بەشداری لەم جۆرە میتافیزیکە ناکات و لەم وتارەشمدا هەوڵدەدەم کارەکانی پلاث ڕاڤە بکەم بۆ ئەوەی دژی ڕاڤەکەی قوتابخانەی ناوبراو بوەستم سەبارەت بەم شاعیرە. بە بڕوای من هزرمەندانی ئاڤانت- گارد ڕەتکردنەوەی بێهێزی و ترسنۆکی مرۆڤ دەشێوێنن کە سەرچاوەکەی مۆڕاڵیتی (ڕەوشتخوازی) پاسۆلۆژییە هەروەک (میچێل پۆلانی) ناوی لێدەنێ. پۆلانی لەو وتارەیدا کە دەستەواژەی مۆڕاڵیتی پاسۆلۆژی بەکاردێنێ، لە توێژینەوەکەی (سیمۆن دی بۆڤوار) لەسەر (مارکیزدی ساد) خواستوێتی، باس لە (لێکدانەوەی مۆڕاڵیتی- ڕەوشتخوازی) دەکات وەک (هەلومەرجێک کە لەنێویدا ئامانجە بەرزەکەی ڕەوشت تەنیا، وەک هێزێکی نا مرۆڤایەتی شاراوە، ڕاشکاوانە پراکتیزە دەکرێ). لێرەدا دێڕەکانی ناکۆکخوازی دەگەنە بوونخوازی فەرەنسی و لەگەڵیدا تێکەڵ دەبن. دی بۆڤوار، سڵاو لە مارکیزدی ساد دەکا و وەک ڕەوشتخوازێکی مەزن سەیری دەکا، لەو کاتەدا کە (ساد) لەسەر زاری یەکێک لە کارێکتەرەکانی ئەوە ڕووندەکاتەوە کە، من هەر هەموو ئەو شتانەم لەناو دڵمدا وێران کرد، کە لەوانەیە بەربەست بن لەبەردەم چێژەکانمدا، ئەم سەرکەوتنەش بەسەر ئاگایی و وێژداندا، هەروەک دی بۆڤوار دەڵێ- کە لە نێو دەستەواژە مارکسییەکانی ئەودا لێکدەدرێتەوە- ئەوەیە: (ساد پاسۆلۆژیانە- نەخۆشانە- گاڵتەجارییەکی بۆرژوایی دەسەپێنێتە سەرمان، ئەوەی پێی دادەگرێ لەسەر دامەزراندنی بەرژەوەندی چینێک لەنێو پرەنسیپەکانی مۆڕاڵیتی گشتگیردا.

دەمارگیری نیهیلیستی کە لەم لێکدانەوە مۆڕاڵیەدا سەرهەڵدەدا، چاوگەکەی لە مۆرکە سروشتییەکەی مرۆڤدایە، بەتایبەتی لەو مۆرکە ڕەشبینییەی (فرۆید) سەبارەت بە سەلیقە و گەشەی مرۆڤ: مرۆڤ بریتییە لە کۆمەڵە شەهوتێک و ڕاستترین شتیش دەربارەی ئەو بریتییە لە پاڵنەرە (ئید id)یە زگماکییەکانی. (ئید)یش هیچ ئاکارێکی بەرزی نییە، مۆڕاڵیتی کۆمەڵ

سەپاندوێتی بەسەریدا، هەروەک وەک دی بۆڤوار گومانخوازی ڕەوشتی دەبەستێتەوە بە چارسی ڕەوشتییەوە، بۆیە هەر جۆرە ناکۆکبوونێکی لۆژیکی ڕەتدەکاتەوە. لەڕاستیدا، ناکۆکبوون دەبێتە شتێکی نائاسایی کاتێک کە ڕەخنەگرانی قوتابخانەی (ئاڤانت گارد) سەیری شتە پاسۆلۆژییەکانی سیمای نەخۆشی ناو تاکەکان دەکەن وەک چەند مانیفیستۆیەکی بەرز و شکۆداری پەیوەست بە پرسی ئازادییەوە. لەم پێوەدنگەشدا، ڕەخنەگری ئەمریکی (جۆرج ئی. وێلوارث) لە بارەی نووسەری شانۆیی فەرەنسی (چاری) دەڵێ (بیرۆکە مەزنەکەی سەبارەت بەیاخیبوون لە (کحولیزم)ەکەیدا بەرجەستە دەبێ، چونکە چاری وا دیارە دەیەوێ بەم جۆرە خواردنەوەیە خۆی پتر بەرەو مەرگ بەرێ، یاخیبوون هەروەک چاری سەیری دەکرد، داوایەک بوو بۆ ئازادییەکی تەواو و نارەزاییەک دژی کۆیلاتییەکی ڕەها، کە بریتییە لە مەرگ. چاری ڕێگەی یاخیبوونی هەڵبژارد لە دژی ئەم ڕەها مەرگخوازە لەنێو خۆڕماندنێکی سیستماتیکدا، لەم ڕێگەیەشدا بەشێوەیەکی پارادۆکسی (ناکۆکی) زاڵبوو بەسەر ئاگایی و پەرتبوون لەنێو مەرگدا. ویستی کۆنترۆڵی مەرگی خۆی بکات، توانی خۆی بە تەواوی بوەشێنێتە ناو ئازادییەوە و سەرجەم مانیفیستۆی ڕێسا کۆمەڵایەتییەکانیش ڕیسوا بکات لەماوەی ئەو ساتانەی ژیانیدا کە بۆی مابوون).

بۆ خوێنەرێک کە ئەبڵەق نەبووە بە (ئاڤانت گارد)ەوە شتێکی نائاساییە بڕوا بەوە بکات کە یەکێک دەتوانێ یاخی ببێ لە کۆتایی و چارەنووسی خۆی، بە وێرانکردنی خۆی پێش ئەوەی پرۆسە سروشتییەکەی ژیان ئەوە بکات، هەر لەبەرئەوەش ئێمە تووشی کێشەیەکی ئاڵۆز دەبین لەنێو جیهانی ڕۆشنبیریدا. دەمەوێ بڵێم، ئایا (ئاڤانت گارد) هەوڵی ئەوە دەدا تاکو دەمارگیری نیهیلیستی بەپێزمان پێببەخشێ یان نا؟ ئەم پرسیارە هەتاکو ئێستا بە تەواوی وەڵامی نەدراوەتەوە. لەوانەیە بزووتنەوەی بوونخوازیی نوێی فەرەنسا دەربارەی ئەدەب یارمەتیمان بدات لە بەرپەرچدانەوەی پرسەکانی کۆتایی بوونمان: لەوانەشە ئەم پرسانە ئاڵوزتر بکاتەوە، لەناو گێژەنی وەهمە پاسۆلۆژییەکاندا، لێرەدا ڕەنگە شتێکی بەپێز بێت زانینی ئەو مامەڵەیەی کە نووسەرانی دەرەوەی دیسپلینەکانی ئەدەب دەیکەن لەگەڵ ئەم جۆرە پرسانە. دکتۆر (ڕۆلۆمێی) کە نووسەرێکی بوونخوازە و شیکەرەوەیەکی سایکۆلۆژییە، لە بارەی درامای نوێیەوە دەڵێ (زۆربەی دراما نوێیەکان بە ڕاستی نەرێگەراین، هەندێکیشیان بەشێوەیەکی زۆر ترسناک لە ڕۆحی نیهیلیزم نزیکدەبنەوە، بەڵام ئەم نیهیلیزمە لەو جۆرەیە کە بە ئاگامان دێنێتەوە بۆ ئەوەی بەرەنگاری بۆشایی ڕەها ببینەوە، سەرەڕای ئەوەش گوێبیستی ئاخاوتنەکەیان بێت، دەزانێ وتەکانیان لە دەرەوەی ئەم بۆشاییە ڕەهایە دایە، لێرەدا دەستەواژەی ئاخاوتن لە جۆری یاخود مەقولەیەکی ترانسیندرێنتە- متعالی- باڵابووە- و قووڵترە و پتر تێگەیشتنێکی دەماودەستە) ئەگەر هیچ بەهایەکی هەبێت ئەم ئەنگاوتەیە (صدمة) کاتێک کە (بەرەنگاری ئەو بۆشاییە دەبین) ئەوا ئێمە دەبێ جێنشینی (بوون) بین تاکو خۆمان بدۆزینەوە و بپرسین: بوون بە مرۆڤ چییە؟ نیهیلیزم هەروەک (کامۆ) ڕوونی کردەوە، خۆی لە خۆیدا نامەعقوولییەکی لۆژیکییە، چونکە کەسێکی نیهیلیست چارەسەری ئاڵۆزیی کێشە فەلسەفییەکانی خۆی ناکات و پتر پاشەکشێ دەکات بەرەو مەرگ، جگە لەمەش فەلسەفەکەی خۆی دەوەشێنێتە نێو جیهان تاکو خەڵکی دیکە بورووژێنێ، واتە دەتوانین لێی بپرسین: بۆچی ئەو هەیە ئەگەر هەموو شتێک لەم جیهانەدا- هەروەک ئەو دەڵێ- بەتاڵ و نەزۆکە بێت؟ ترپەی وزە مۆڕاڵییەکەی خودی هەر نیهیلیستێک، نیهیلیزمییەکەی ئەو وەک نامەعقوولییەک نمایش دەکات، لە گۆشەنیگای فەلسەفەی ئەنترۆپۆلۆژییە کەوا دیارە چاوگەکەی لەم جۆرە دیسپلینانەی وەک شیکردنەوەی دەروونی و فینۆمینۆلۆژیا (دیاردەگەرایی)ی ئیمڕۆ بەرجەستە دەبێ، هەتا نیهیلیستێک وەک ئێمەمانان تووشی بێهوودەیی دەبێت لە وەڵامدانەوەی پرسیاری ناوبراودا، لەنێو دەقەکانی (پلاث)دا لەوانەیە وەڵامەکان بۆ پرسیاری ناوبراو بدۆزینەوە کە زۆر ڕاستن و لە هەمان کاتیشدا درۆی سەرخۆشین، بێگومان لەم وتارەدا ناتوانین بەتەواوی ڕاڤەی واتای (ڕاست و درۆ) بکەین لێرە، بەڵام بە بڕوای من، کە زۆر جیاوازە لە بیرۆکەکەی (فرۆید)، لە هەر تاکێکدا جۆرە ڕاستییەکی خودایی بەدی دەکرێ کەوای لێدەکات توانای خۆی بزانێت چەندە.

هەروەها پەروەردەی دایکەکەشی یارمەتی دەدا لەم کارەیدا بەتایبەتی لە چەند مانگی یەکەمی لە دایکبوونیدا، سیمایەکی گرنگی ئەم خۆناسینەی بەرایی، بریتییە لە زانینی سروشتی خۆی بەپێی پرینسیپەکانی گەشەکردن واتە بریتییە لە زانینی ئاگاییە سروشتییەکەی کە وەک ئاکارێکی ساغڵەمی سروشتی ئەو تاکەیە، لەوانەشە لەپشت ئەم پرۆسەیەشدا جۆرە ترسێک هەبێ لە بەتاڵی و بێ واتایی بوون: کێشەی یاخود پرسی

یاخیبوون له چارەنووسی کۆتایی. لەبەر ئەوەش کە تاک مرۆڤە و لاوازە و هەروەها دایکەکانیش مرۆڤ و لاوازن، ئەوا ئەم پرۆسەیە ڕەنگە بە هەڵەدابچێ، چونکە لەوانەیە منداڵیش پێویستی بە نەستی ناسنامە بێت، ئەوەی پیاوی گەورەش تا مابێ لە ژیاندا بە دەستییەوە دەناڵێنێ، بەتایبەتی پاش ئەوەی کە- هەروەک ر. د. لێینگ ناوی لێدەنێ- نا ئارامی ئەنتۆلۆژی، دایدەگرێ کە شێوەیەکە لە گومانێکی فاندەمێنتالی (ئوسولی) دەربارەی ڕەچەڵەکی بوونی، لەبەر ئەوە دەبێ پەنا بۆ چارەنووسی (درۆ) بەرێ سەبارەت بە پرسی بوون و (خودێکی درۆ)ش دادەمەزرێنێ، لەسەر ئەم (خودە درۆ)یە بۆی هەیە پاڵەوان بێت، بەڵام بەردەوام کردەوەی (درۆ)ی لێ دەردەچێ، ئەو شێوەیە وەردەگرێ کە (دەگونجێ) لەگەڵ ئەو خودەی کە کۆمەڵ داوای لێدەکات، جا لەبەر ئەوە تاک ڕقی لەم (گونجاندنە) دەبێتەوە، چونکە بەهیچ جۆرێک نابێتە ڕێگەیەک بۆ دەستەبەرکردنی خودی ڕاستەقینە، کەواتە لە دەروونە نەخۆشەکەی (سایکۆپاتی) تاکدا لەوانەیە جۆرە ڕقێک هەبێت لە (کۆمەڵگە) و گونجان لەگەڵیدا. لەوانەیە بەڕای ئەم تاکەدا (کۆمەڵگە) دەیچەپێنێ. بەم جۆرەش ڕقەکەی دەروون نەخۆش لە کۆمەڵ، سەرهەڵدەدا و هەر ئەمەش ڕاڤەی ئەوە دەکات کە بۆچی زۆربەی تاکە دەروون نەخۆشەکان شۆڕشگێڕ و (ئاڤانت گارد)ن. هەر سەبارەت بەم خاڵە (فلێر بایرن)، ئەوە ڕووندەکاتەوە کە تاکە دەروون هەڵچووەکان، لێکدانەوەی مۆراڵی توندیان دەبێ بۆ خودی مۆراڵیەتی ئەم تاکە، لەبەر ئەوەی بڕوای بەوە نییە کە هێمای خۆشەویستی، مرۆیی یاخود مرۆڤدۆستی ئەو بەهێزتر دەکات، ئەوا لەم خۆشەویستییە دەترسێ. ئەم تێبینییە پێشتر (ر. لێینگ) لە کتێبی (خودی دابەش بوو)دا پێشبینی کردووە. ئەم جۆرە تاکە ئەوەندە دەترسێ لە (بەتاڵی دەروون) بە ڕادەیەک کە وای لێدەکات بترسێ لەوە، کە خۆشەویستی پڕی بکاتەوە و بتەقێتەوە لەنێو (بۆشایی جەرگەی ناخیدا) یان ئەوەندە دەترسێ و نائومێدە لە (پێستی) خۆی بەڕادەیەک کە وای لێدێ هەست بەوە بکات، کە زۆر ئاسانە بۆ خەڵکانی تر، بە تایبەتی ئەگەر زۆر نزیک ببنەوە لێی، بەتاڵی بکەن لە جەوهەر و زەرووڕەتی خۆی، لەبەر ئەوە تەنانەت لەوەش دەترسێ تێکەڵی خەڵک بێت، ئەم دیاردەیە لە کتێبی (گۆرانی ئەڤین)ی (تید هیوگ) بە تێروتەسەلی ڕاڤەکراوە، هەر لەبەر ئەم تۆقانە لە خۆشەویستی و بەتاڵی دەروون، تاکی (سایکۆپات: دەروون نەخۆش) ڕق و کینە دەگۆڕێتەوە بە خۆشەویستی.

هەوڵدەدا خەڵک نامۆ بکات لەخۆی، خۆی دوورخاتەوە لێیان، بەپێی دوو دیدگای فاندەمێنتالی (ئوسولی) مۆراڵی یاخود تراژیدی مامەڵە لەگەڵ جیهاندا دەکات، بڕوای بەوە دەبێت خۆشەویستی شتێکی ناخۆش و دژوارە و ئەرکی زۆرە، لەبەر ئەوە چاکترە بۆی یاخود ئاسانترە بۆی ژیانی خۆی لەسەر ڕق و کینەدا سازبدات، چونکە مامەڵە کردن لەگەڵ جیهاندا لەنێو خۆشەویستیدا دەبێتە مایەی مەترسی و هەڕەشە بۆ خەڵکانی دیکە، بەڵام ئەمە مۆتیڤێکی نامۆراڵیستی لێدەکەوێتەوە، ئەویش ئەوەیە، لەبەر ئەوە کە چێژەکانی ئەڤینی بۆ ئەو مایەی بارگرانییە تاهەتایە، ئەوا ئەم جۆرە تاکە لەوانەیە بیر لەوە بکاتەوە کە وەرچەرخێ بۆ چێژەکانی ڕق و کینە، چونکە هیچ بارگرانییەکی نییە بۆی لە ژیانیدا. لە هەردوو هەلومەرجدا ئەم تاکە بەم جۆرە بیردەکاتەوە: شەیتان تۆ ببە بەخودای من، ئەی خودا تۆش ببە بەشەیتانی من. ئەگەر بڕوا بە بیرۆکە ڕووناکبیرەکەی (فێربایرن) بکەین دەربارەی ئەم جۆرە تاکە بە قووڵی لە سایەی (داپڵۆسینی بوون) دەناڵێنێ، ئەوا ڕەنگە بتوانین پەی بەو ڕاستییە ببەین، کە دەڵێ زۆربەی ڕۆشنبیرە بەتواناکانی ئەم سەردەمەمان مەیلی دەمارگیری نیهیلیستیان هەیە، ئەم بۆچوونە پتر دەگونجێ بۆ ئەوانی کە لایەنگیری (سارتەر) و لێکدانەوە بوونخوازەکەی دەکەن، بۆ (دی ساد) و (گینیت) لە بارەی هەلومەرج و هەڵوێستی شەهید بوون، ئەنالیزەکەی (شیکردنەوەکەی)، (فێربایرن) شرۆڤەی ئەوە دەکا چۆن مۆراڵیزمی پاسۆلۆژی (ڕەوشتخوازی نەخۆش) لەنێو کەلتوورەکەماندا سەرهەڵدەدا، کە لە هەمان کاتدا سەرچاوەکەی لە بیروباوەڕێکی مۆراڵی دایە. ڕاهاتن لەسەر توندوتیژی کە لەنێو کارەکانی نووسەرێکی وەک (سلیڤیا پلاث) بەدی دەکرێ، هۆیەکەی بۆ هەمان ئەو مۆراڵە پاسۆلۆژییە دەگەڕێتەوە. دەتوانین بڵێین ئەم شاعیرە لەناوەڕاستی ڕێگاکاندا چەقی گرتووە، ئەگەر یەکێک بیەوێ بیخوێنێتەوە، دەبێ دەقەکانی هەڵبژێرێ، هەندێ لە هۆنراوەکانی بە توندی ڕۆدەچنە نێو قووڵایی هەستکردن بە ئەشکەنجە و ناهاوسەنگی و ئازارەکانی مرۆڤ، خۆشەویستی و ڕق تێکەڵ یەک دەبن لەناو بێهێزیدا، ئەم هەستکردنە بە سەرجەم گوناه و داپڵۆسینەکانی (بوون بە مرۆڤ) ئاشنامان دەکا. هەندێ هۆنراوەی دیکەشی ڕێگەی دیکە دەگرنەبەر، ڕێگە چارەکانی مرۆڤ ڕەتدەکەنەوە و مامەڵە لەگەڵ ڕق و (ئەنتی مرۆڤ)دا دەکەن. ئەو نووکە چەقۆیەی کە ئەو لەسەریدا دەیەوێ خۆی هاوسەنگ بکات، ئەو شتەیە کە دەبێ هەموو ژیانی خۆی بۆ تەرخان

بکات، ئەمە لەوانەیە بە ئاسانی لەنێو واتاکانی پرسە ترسناکەکانی ئەودا پراکتیزە بکرێ، واتە لەنێو ئەو جۆرە پرسیارانەدا: ئایا منداڵەکانی خۆی بکوژێ یان تا پاش ئەوەی کە بە تۆمەتی خۆکوشتن تاوانبار دەکرێ؟ ڕەنگە بە تەنیا ئەم کێشەیە گرتییەکانی شیعری ئەو بەشێوەیەک بخاتە ڕوو کە لەوانەیە هێمای مۆڕاڵی حاشا هەڵنەگری لێبکەوێتەوە: نابێ کەس مشەخۆری خەڵکی دیکە بێت، تا ئەو ڕادەیەی کە ببێتە هۆی ڕمانی ئەوان؟ هەتا ئەگەر یەکێک مافی ئەوەی هەبێت کە خۆی بفەوتێنێ، بەڵام مافی ئەوەی نییە منداڵەکانی خۆی لەناو ببات، هەتا ئەگەر خولقاوی نێو دامێنیشی بن؟ تەوژمی ئەم جۆرە کردەوە (ئەنتی مرۆییە)، دەبێ وەک شتێکی (پاسۆلۆژی) سەیر نەکرێ و وەک شتێکی مۆڕاڵی و کۆمەڵایەتی ڕێگەی پێنەدرێ؟ ئەگەر ڕازی بووین بەوانە، ئەوا ئێمە لەوانەیە ئەوکاتە بزانین پێویستیمان چەندە بەم جۆرە ورووژاندنە بۆ ستانداردەکانی ڕاستگۆیی و دڵسۆزی و مۆڕاڵی و مافە کۆمەڵایەتییەکان و هەڵە و تەنانەت لەنێو بواری ڕۆشنبیریشدا. بۆ ئەوەی چاکتر بەدوای (پلاث)دا بچین، ڕەنگە هۆنراوەی (یو ئار- You are) کە بۆ کۆرپە چاوەڕوان کراوەکەی/ نەخولقاوەکەی ناو سکی نووسراوە، باشترین دەستپێک بێت. بۆ ئەم پێداچوونەوەمان. ئەم هۆنراوەیە پڕە لەهیوا و ئاواتی مژدەبەخشی و شاد، دایکەکە (واتە پلاث) لێرە دەیەوێ وەسفی دەم و چاوی ئەم بوونەوەرە تازەیە بکات کە هێشتا نەبووە و هیچ ڕوخسار و دەم و چاوێکی نییە ئێستا: (بەردێکی ساف و لووس کە دەم و چاوی تۆی لەسەرە...) بێگومان بەردی ساف و لووس دەم و چاوی خۆی هەیە، بەڵام ئاخۆ دەبێ ئەم بوونەوەرە چی بێت کە لەسەر ئەوی دیکە وەستاوە: (کۆرپەکەم بڵندترین ڕۆژهەڵاتنە، سەرکە بچووکەکەمە، پۆستی ئاواتمە، چرپەی ماری ناو ئاوە، گشت خورەی ئاوەکانە). (لویس ئامس) دەڵێ: دایکەکە خۆی وا بیردەکاتەوە کە کۆرپەکەی (ناسنامەکەی ئەو توندتر دەکات، (پلاث)ی دایک خۆی ئەگەر سەیری شیعر و ڕۆمانەکانی بکەین و بیانکەینە بەڵگە بۆ ئەو ئەزموونە دەروونییەی ئەو... بە تەواوی هەستی بەوە نەکردووە کە (خۆی ڕەنگ دەداتەوە) لەناو بوونیدا لەنێو سالانی تەمەنیدا،دێڕەکانی (پلاث) پڕن لەم جۆرە فیگەرانە: مانگەکانی ڕوو، سپی، حەوزەکان، ئاوێنەکانی، خڕیلەیی جیوە. ئەم هەموو فیگەرانەش هیچ شتێکی واتا بەخش لەنێویاندا ڕەنگ ناداتەوە، بەڵکو تەنیا ئاماژە بۆ ڕق و دەمارگیری نێرڤیستە دەکەن: (درزە ڕەشەکانی مانگ)، کاتێکیش سەیری ئاسەوارە کۆنەکان دەکات لەنێو جامخانەکەی مۆزەخانەکەدا، ئەوەی ئەو پێیان دەڵێ (ئەی مردووە ئازیزەکان)، تەنیا ئەم جۆرە شتانە دێنەوە بیری: دایکی، داپیرەی، وێنەی ئافرەتەکانی خانەوادەکەی، ئەوانەی ئەویان لەسەر سک ڕاکێشا لەنێو حەوزدا، سەرەڕای هەبوونە سەربەخۆکەی خۆی لەنێویاندا ڕەنگی دەداوە کە وەک (پەیکەرە ئێسکی سەرکێکی دێرینە و ئاژەڵێک گۆشت و پێستی کراندووە). لەپشت هۆنراوەکانی (پلاث)دا، (پوختەی گەمەی خواردنێک) بەدی دەکرێ، کە بریتییە لە (مەرگ) کە هەر هەمووەمان دەلووشێ، بەڵام مەرگەکە لەگەڵ ئاکارەکانی خۆشەویستیدا سەرهەڵدەدا - هاوبەندییەکانی خێزان تاکەکان بەیەکەوە دەلکێنێ و تەنانەت خودی دایکایەتیش ئەوەی بەرجەستەی شێوەیەک لە یەکانگیری دەکات. هۆنراوەکانی ئەو دەربارەی منداڵی ساوایە، بەگشتی مامەڵە لەگەڵ (سپیاتی)دا دەکەن، کە پەیوەستە بە پێویستی منداڵ بۆ ڕەنگدانەوەی لەنێویدا. سیمبولی منداڵ لەم دەقانەی ئەودا، گوزارشت لە منداڵە ڕاستەقینەکانی جیهان ناکات، بەڵکو پتر ئاماژە بۆ منداڵێکی دەروون نەخۆشی ناو سکی ئافرەتێک، کە هێشتا لە دایک نەبووە. ڕەخنەگر (گۆنتریپ) ئەوە ڕوونەکاتەوە (کە چۆن نەخۆشانی دەروونی هەمیشە جۆرە خەونێک دەبینن، تێیدا منداڵی بەرمەمکان یاخود ساوا لەناو چەکمەجەیەکی ئاسندا دادەخرێن و تا هەتایە دەرفەتی گەشەکردنیان نامێنێ). (ڕەوە مێشەنگوین) هۆنراوەیەکی دیکەی (پلاث)ە، کە تێیدا ئافرەتێکی (پرۆتاگۆنیست) بەچاوخەوەوە گوێی لە تەقەیەک دەبێ و ڕادەچڵەکێ، کاتێک خەوەکەی دەزڕێ و دەچێتە لای پەنجەرەکە و سەیری شەقام دەکات، یەکسەر چیرۆکی (ناپلیۆن)ی دێتەوە بیری و تێکەڵی دەکا بەم تەقەیەی ئەم بەرەبەیانە، کە سەرچاوەکەی پیاوێکە و بەم بەیانییە تەقە لە ڕەوە مێشەنگوینێک دەکا.

فانتازیای بەرجەستەکردنی ئاوەز بۆ ڕەوە مێشەنگوینێک، بەراورد دەکرێ لەگەڵ ئەو ڕقەدا کە پاڵی بە ناپلیۆنەوە نا تاکو هەوڵبدا بۆ تاواندنەوەی گومبەتەکانی کڵێسەی ڕووسی لەنێو فانتازیاکانی (دەروونە حەسوودەکەی)دا، هۆنراوەکە بەرجەستەی شتێکی لەق دەکات: ئایا یادی خەونەکانمان بکەینەوە، یان ڕاستییەکی پراکتیک بەچاکتر بزانین؟ ئایا ئێمە پێمان خۆشبوو کە ویلینگتۆن ناپلیۆنی بەزاند؟ ئایا ئێمە تەزکیەی میانڕەویی مێشەنگوینە بەزیوەکان دەکەین؟ ئایا خەون بینین بە ئەورووپایەکی یەکگرتوو لەسەر (تەنێک

هەنگوین) پتر مژدە بەخشە؟. هۆنراوەکە نەستێکی بڵندگـۆ لای خـوێنەر دروست دەکـات، دەربارەی ئەو مـەینەتی و مـەترسـییانەی کە لەوانەیە سەرهەڵبدەن لە کۆمەڵە وەهمێکی هەڵخەڵەتێنەری هەر تاکێک، ئەمەش گەواهی ئەوەیە کە (دەروونێکی نەخۆشی شۆڕشگێڕ) ڕەنگە ئەویش مێژوو بخولقێنێ و جۆرێک لە سەروەری بۆ خۆی تۆمار بکات، بەڵام لە کۆتاییدا ئەم سەروەرییە نابێتە پتر لە سوجدەبردنی جەنەڕاڵەکان بۆ میحرابی مەزارێک، وەک (کرمێک لەناو شانە مێشەنگوینێکدا) و ڕەوە مـێـشـەنگوینەکـەش (دەردەپەڕێندرێن بۆ ناو پۆپیتەی کەڵەشێرێک) و وەک کا بەبا دەدرێن، لەلایەن پیاوێکی پراکتیکی بە دوو دەستەواژەی ئەبستیستییەوە. دوا هۆنراوەکـانی (پلاث) هەروەک ڕەخنەگر (ئالڤارێز) دەڵێ: دیسان مامەڵە لەگەڵ هەمان بابەتدا دەکەن: چێژەکانی ڕق و کینە، بەتایبەتی لە هۆنراوەی (لێدی لازۆرس)دا (پلاث) دەبێتە جوولەکەیەکی ئەندێشەیی، بێگومان (هیرۆشیما) و (داچاو) شایەدی دوو کردەوەی چەپەڵی ڕق و کینەی دەروونێکی نەخۆشن: بەڵام هزرە جوداخوازەکەی ئەو لەشێوەی لۆژیکە درۆزنەکەیدا، خۆی لەخۆیدا و لە هەمان کاتیشدا پاساو بۆ ئەو ئاوەزە نەخۆشانە دێنێ کە منداڵی ساوایان فڕێدەدا ناو فڕنەکان و ددانە زێڕەکانی جوولەکەکانیان لێدەکردەوە و مۆڕاڵییەکی پاسۆلۆژی پاڵیانی پێوەدەنا، بۆ بڕیاردان لەسەر (چارەسەری کۆتایی) بۆ کێشەی بوون و بۆ (ڕقێکی) ئەبستراکتی کوێر کە تا هەتایە پرسی (بوون بەمرۆڤ)ی بێهێز و بێ دەسەڵاتی هەڵواسی، چەوساوەیی (پلاث) تەنیا شتێکی ئەندێشەییە و هەڵچوونی ڕقەکەشی دژی خۆی تەنیا ڕێگەیەکی وەهمی بوو بۆ دۆزینەوەی هێز. هەموو ئەوکارانەی کە مۆڕاڵێکی پاسۆلۆژی بەرجەستە دەکەن، وا لە ئەدەب و ڕەخنە دەکەن دوور بکەونەوە لە پیرۆزیی مرۆڤ. لە ڕاستیدا، ئەو جۆرە بوێرییەش کە لە دەقەکانی (پلاث) و قوتابخانەی (ئاڤانت- گارد)دا بەدی دەکرێ (هەرچەندە هی پلاث یەکجار جیاوازە) لە باشترین دۆخیدا دەبێ ڕاستگۆیی خۆی بسەلمێنێ بەرامبەر بە خودی نووسەرەکە.


**سەرچاوە:**

وەرگێڕدراوە لە ئینگلیزییەوە:

Sylvia Plath: Pathological Morality and the AVAT- GARD.

دێڤید هۆلبرۆک

Penguin Books- London- 1980.

# ڕۆمان و کۆمەڵگای ئازاد

**عەلی ڕەزا غەفووری**
**لە فارسییەوە: سلێمان دڵسۆز**
**(پیرانشار)**

تا ئێستا لە بارەی دوو چەمکی «کولتوور» و «کۆمەڵگای تەکدەنگ» و لەمەڕ خەسارناسیی پێوەندیی نێوانی ئەو دوو چەمکەوە ڕاوبۆچوونی زۆریان دەربڕیوە، بەڵام لەبارەی چۆنیەتی سەرهەڵدانی ڕەفتاری دیکتاتۆری و پێوەندیی ئەو لە تەک کتێبدا، بابەتێکی بەکەڵکی ئەوتۆ نەنووسراوە.

ئەم نووسینە تێڕامانێکی کورتی خەسارناسیی یەکێک لە ڕەفتارە فەرهەنگییەکانە. هەموو ئەوەی ئێمە بە ڕەفتاری فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی ناوی دەبەین، خۆشیمان بێ و ترشیمان بێ، ڕەنگدانەوەی شێوە بیرکردنەوەی دیکتاتۆرییە. لە سیستەمی دیکتاتۆریدا ڕەفتاری کۆی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایە لەسەر بناغەی ئیکلام کێشان و ملکەچکردن بۆ دەسەڵات و دەستوپێوەندەکانی و ڕەتکردنەوەی هاوشانان و بەدەربڕینی باشتر سڕینەوەی «ئەوانی تر» دامەزراوە. هەر کام لەم «ئەوی تر»انە وەک لەمپەر و خەنیمێک لەبەردەم خۆ نزیک کردنەوەی تاکەکان لە دامودەزگای دەسەڵات چاو لێدەکرێن، کەوابوو دەبێ ڕەت بکرێنەوە، حاشایان لێبکرێ و بەلاوە بنرێن.

تا دەسەڵات دیکتاتۆرتر و خۆپەرستتربێ ئەو چەشنە ڕەفتارە پتر پەرە دەستێنێ و تاکەکان هەوڵ دەدەن هەرچی زیاتر، پارادایە بایەخی و ڕەفتارییەکانی دامودەزگای دەسەڵات بکەنە جێگرەوەی ڕەفتاری سروشتی و زاتیی خۆیان. لەم لاشەوە «ئەوی تر» تا زل و قەبەتر بێ زیاتر دەکەوێتە بەر شیروتیری سڕینەوە و نکوولی لێکردن.

ئێستا بە ئاسانی دەتوانین جێگە و پێگەی نووسەرێک- کە هەرچەند نکوولیشی لێبکەین پێگەی لەهی یەک یەکی تاکەکانی کۆمەڵگا دیکتاتۆرییەکان بەرزترە- وێنابکەین و تەنانەت بەچاو ببینین تا چ ڕادەیەک دەکەوێتە بەر غەزەبی لالووتی و ڕەتکردنەوە و نکوولی لێکردن،. هەر بەو پێودانگەش دەتوانین تێبگەین کە کتێب و کتێب خوێندنەوە- کە بەشێوەیەک قەبوولکردنی «ئەوی تر»ە- لەلای زەینییەتە دیکتاتۆر لێدراوەکان خاوەنی چ پێگەیەکە.

لەلایەکی دیکەوە تاک لە سیستەمێکی ئاوادا چونکە ئیعتراف بە «ئەوی تر» ناکا، بەشێوەیەکی گشتی مەسەلەی وەڵامدانەوەو قەبوولکردنی بەرپرسیارەتی بەرامبەر «ئەوی تر» مانای نامێنێ.

جا لەبەر ئەوەی هەموو نووسراوەیەک پێویستی بە وەڵامدانەوە یا بەڵگەهێنانەوەیە، نڤیسار وەک دیاردەیەکی وەڕسکەر و تەنانەت تێکدەر حیسابی بۆ دەکرێ و ئەمە سەرەتای پەرەسەندنی کولتووری «گوتار- بونیاد»ە لە هەمبەر کولتووری «نڤیسار- بونیاد»دا. هەروەک لە ناوەکەیەوە دیارە لە کولتووری «گوتار- بونیاد»دا گێڕانەوەی زارەکی و نەقڵ و نەزیلەی دەموێژی

سەربهۆرد و هەواڵەکان، بە سەرەکیترین دەزگای ڕاگەیاندنی مەعریفە و زانیاریی کۆمەڵگا دادەنرێ. دەی سروشتییە لە وەها کولتوورێکدا کتێب و نووسەرەکەی نەک هەر ڕێز و پاداشتێکیان نییە، بەڵکو زۆرجار بەچاوی دوژمن سەیر دەکرێن. مانەوەی تائیستای چیرۆکبێژ و حیکایەتخوانان، پاشماوەی لۆژیکیی وەها کولتوورێکە.

ڕەنگبێ جەوهەری مۆسیقای سوننەتیی ئێرانیش کە قورساییەکەی بەلای مەقامدا دەشکێتەوەو خۆ مەقامیش بەجارێ لە خزمەتی شیعردایە، لەوەها کولتوورێکەوە هەڵقوڵیبێ. دەکرێ لەجیاتی ئەوەی شیعر بخوێنینەوە و تووشی ڕامان و بیرکردنەوە بین، شیعر ببیسین و تەنیا چێژی لێوەربگرین.

ئاشکراشە مەودای نێوان بیرکردنەوە و چێژوەرگرتن ئاسمان و ڕێسمانە.

کاتێ شیعرێک و چیرۆکێکمان بۆ دەخوێننەوە یان دەگێرنەوە، لە ڕاستیدا تەسلیمی خوێندنەوەی ئەو خوێنەرەوە یان بگێڕەوە لە دەقەکە دەبین و لایەنەکانی دیکەی خوێندنەوەی دەقەکە لەخۆوە لەناو دەچن، بەم جۆرە خوێندنەوەی ژیان و مەعریفە لە دیدی حکومەتی دیکتاتۆری و کەسی دیکتاتۆرەوە لە ڕێگای خوێندنەوەی زاڵی بگێڕەوە چیرۆکبێژەکانەوە زاوزێ دەکا.

لەنێو هەموو چەشنەکانی ئەدەبی نقیساریدا تەنیا ژنری ڕۆمانە کە بۆ گێرانەوەی زارەکی مل نادات. لەجیدا جەوهەری ڕۆمان جۆرێکە کە بەناچار دەبێ بخوێندرێتەوە، چونکە ئەگەر تەنانەت بکرێ بۆ کەسێکی بگێڕیەوە، ئیتر ڕۆمان نییە و تەنیا کورتۆکەیەک و ڕاپۆرتێکە لە ڕۆمانەکە نەک ڕۆمانەکە خۆی.

خوێندنەوەی ڕۆمان خۆی ڕەفتارێکی مەدەنی، شارەبی و نادیکتاتۆری دەوێ. تۆ بۆ خوێندنەوەی ڕۆمانێک یا دەبێ بیکڕیت، کە ئەمە پێویستی بە خەرجکردنی پارە هەیە و هەروەها ئەزبەتی چوونە کتێبفرۆشی و دیتنی گەلێ کتێبی دیکە و هەڵبەت لێکەوتنەوەی توانای هەڵبژاردن و تێگەڕان کە خۆی لایەنێکی ئازادییە، یان دەبێ لە کتێبخانەیەکی گشتی وەری بگریت کە جگە لەوەی بە دڵخوازی خۆت و بە پێی بڕیاری پێشوەخت ئەم کارە دەکەی، ناچاری ڕێز لە هەندێ عورف و ڕێساش بگری کە هەموو ئەمانە دەرەنجام و نیشانەی کۆمەڵگای مۆدێرن و ئازادی ویستن، یانژی دەبێ کتێب لە هاوڕێیەک بخوازیتەوە کە لەم حاڵەتەشدا پێت ناوەتە بازنەی پێوەندی لەگەڵ کەسانی کتێبخوێنەوەو خوێندەوار و دەبێ هەندێ ئەگەری فکری/ ڕەفتاریی ئەو جۆرە کەس و دەستەیە لەبەرچاو بگریت کە لە ڕاستیدا ئەمە خۆی قەبووڵکردن و تەنانەت دانوستانە لەگەڵ هەمان «ئەوی تر»دا.

خوێندنەوەی ڕۆمان لەجێدا، بەشێوەیەک ئەزموونکردنی ئازادییە. خوێنەر لەکاتی خوێندنەوەی ڕۆماندا سەرەڕای ئەوەی لە کولتووری زارەکی و خوێندنەوەی موتڵەقی بگێڕەوان قوتار دەبێ، بە چوونە ناو دنیایەکی جیاواز و بە بەرەوڕوو بوون لەگەڵ کەسێتیی جۆراوجۆر و بە بیرو هزری جیاوە، لە جیهانی فرە دەنگی و فرە چەمکی دەگا کە ڕاست پێچەوانەی جیهانی تەکدەنگی و تەکچەمکییە.

لەسایەی خوێندنەوەی ڕۆماندایە کە تاکەکانی ئاشنای جیهانە مومکین، بەڵام نەدیوەکان دەبن و ئەو گوڕو توانایە پەیدا دەکەن دنیای دەوروبەری خۆیان بەشێوەیەکی ئایدیال و بەدڵخوازی خۆ لە زەینیاندا دابڕێژنەوەو بە دەروونی کردنی ئەو وێنە زەینییە دەست بدەنە داڕشتنەوەو چێکردنەوەی دنیای دەوروبەری خۆیان. بۆیە دەگمەنترین دیاردەی فەرهەنگی لای کۆمەڵگا دیکتاتۆرییەکان، دیاردەی ڕۆمانە و دەگمەنترین ڕەفتاری فەرهەنگی، خوێندنەوەی ڕۆمان.

ئاشکرایە تا لە قووڵایی گیانمانەوە تینووی سەربەستی نەبین، مەحاڵە لەگەڵ دیاردەی کتێب و کتێب خوێندنەوە ئاشت بینەوە. تەنیا کاتێک کتێب [ڕۆمان] جێگای شیاوی خۆی لەناو سیستەمی مەعریفیی ئێمەدا دەکاتەوە کە بتوانین و ئیعتراف بە «ئەوی تر»ی گەورەتر و تێگەیشتووتر لە خۆمان بکەین. تەنیا لە سایەی قەبووڵکردن و وەرگرتنی گشت «ئەوانی تر»دایە کە میللەتێ دەبێتە خاوەن ڕۆحی نەتەوەیی.

ڕاستە: «کتێب کلیلی ئاشت بوونەوەی نەتەوەییە.»

**سەرچاوە:**

غفوری، علیرضا، رمان و جامعه آزاد، مجله جامعه نو، سال دوم، شماره ١٨، مرداد ١٣٨٢، ص٣١

# ئامادۆ باوكی چەوسێنراوەكان

## ئامادۆ لە قاوە و سامبا و چاچا و بێلیێ چاكتر بەڕازیلی بە جیهان ناساند

ئا: باسل خۆشناو

جۆرج ئامادۆ ئەندامی ئەكادیمیەی وێژەكانی بەڕازیلی و ناودارترین نووسەری بەڕازیلی لە دەرەوەی بەڕازیل كە ڕۆمانەكانی وەرگێڕدراونەتە سەر زیندووترین زمانەكانی جیهانی هەر لە ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتالی و ئیسپانیەوە تا دەگاتە چیكی و هەنگاری و ڕووسی و چینی و هیندی و عەرەبی و... هتد. فەرەنساو بەتایبەتیش پاریس ئاوێنەی ناوبانگی ئامادۆ بوو، چونكە هەردەم كتێبەكانی پێش هەموو زمانێك بۆ فەرەنسی وەردەگێردران بۆیە جارێك بەگاڵتە گوتبووی: كتێبەكانم لە پاریس بڵاودەبنەوە پێش ئەوەی لە لشبۆنە بڵاوببنەوە، ئامادۆ بەشێكی زۆری ئەو (٨٩) ساڵەی تەمەنی وەكو نووسەر و خەباتگێڕ بەسەر بردو هەر چەند بە (ڕۆماننووسی ڕووحی بەڕازیل) ناوبانگی دەركردبوو، بەڵام ئەو توانی سنوورەكان ببەزێنێت و خەم و ئازاری گەلەكەی بگەیەنێتە هەموو سووچێكی جیهان.

ئەم ڕۆماننووسە بەناوبانگە ژیانی پڕ دەردەسەری و پشێوی بوو، بەتایبەتی كاتێك كە فاشیزم لە وڵاتەكەی باڵا دەست بوو، ئامادۆ بەندكراوەو دوورخراوەتەوە و مافی پەرلەمانتاریتی لێ سەندراوەتەوە كە نوێنەری (سان پاولۆ) بووە لە پەرلەمانی فیدرالی.

جۆرج ئامادۆ كە یەكەمین ڕۆمانی (وڵاتی كەرنەڤاڵ)ی لەساڵی (١٩٣١)دا بڵاوكردەوە نەبووە خاوەن ناوێكی دیار، بەڵام ڕۆمانی (دەریای مردوو) بایەخدانێكی جیهانی بەربڵاوی بەخۆوە بینیوە كە وەرگێڕدراوەتە سەر بیست زمانی جیهانی و، چەند جار فیلمی سینەمایی لێ وەرگیراوە. كە دواجاریان فیلمێكی ئیتالی بوو لە دەرهێنانی (بۆنتی) و نواندنی (سۆفیا لۆرین) و چەند سەمفۆنیایەكیشی بۆ نووسراوە، هەروەها بۆ شانۆگەری و چەند چوارینەیەكی ڕادیۆییش ئامادەكراوەو گۆرانی میللی وای بۆ وتراوە كە لە ئەمەریكای باشوور هەروەك لە ئەورووپاو ئەفەریقیای پورتوگالی بە ئاستێكی بەرچاو بڵاوبووەتەوە.

ئەوەی وێژەی ئامادۆ جیادەكاتەوە ئاوێتەكردنێكی ژیرانەی خەیاڵە بەڕاستی كە جێگا و جوگرافیا دەستە وەستانن بەرامبەر بەو هەموو هەستە مرۆڤایەتیەی لە چوارچێوەی ڕووداوەكاندا بەدیاری دەخات. جۆرج ئامادۆ مرۆڤ بەشوێنێكی نادیاردا دەبات و دەیگەیەنێتە كاتێكی نەهاتوو، كاتی ئەو مرۆڤەی لەسەری نووسراوە لەشوێن و خودی خۆی یاخی بێت لە پێناو مرۆڤایەتیەك خود و شوێنێكی لە جوگرافیا بەدەری هەیە.

ڕەگەكانی ڕۆمانەكانی ئامادۆ لە هەرێمێكی پڕ توندوتیژی فرە نەژاد و كلتووری هەڵقوڵاوە، ئەو لە باوكێكی وەرزێری دەستكورت و دایكێكی هیندی سوور- وەك زۆربەی بەڕازیلییە خەلاسیە دوو ڕەگەكان- لە ١٠ی ئابی ١٩١٢ لە (بیرنجی)ی باشووری هەرێمی (باهیا) لە دایك بووە، باهیای مەڵبەندی سەرەكی بازرگانی كۆیلە لە بەڕازیل، باهیای دایەنگای هەموو جۆرە مەینەتییەكانی مرۆڤایەتی، ئەو باهیایەی لەگەڵ سروشتە لادێییە دڵڕفێن و كەنارە خەیاڵاویەكەی بەشێكە لەو چەند لا وشكاییەی كە چنگی لە قوڕگی ملیۆنەها بەڕازیلی توندكردووە- ئەو بەڕازیلەی بەرزترین ڕادەی

منداڵانی سەرجادەی هەیە کە ژمارەیان دەگاتە (٣٠ ملیۆن) لەکاتێکدا کە ژمارەی دانیشتوانی بەرازیل (١٥٠ملیۆن) کەسە-، بەڵام باهیا بەتەواوی وڵاتی وشکانی نییە، چونکە ساڵانە کە بارانی وەرزی دەبارێت خێروبێری لەگەڵدا دێت، دارە پیرۆزەکەی (ئەمبۆزێرو) چقڵ دەردەکات و گوڵاوی (ئەمبورانس) تێکەڵ بە ناوازی گۆرانییە میللییەکان و سەمای سامباو چاچای کوڕ و کچە بەرازیلیەکان دەبێت. لەناکاو لافاو دێت و کۆتایی بەخۆشی و سەوزی دێنێت و رووەک پووچ دەکات و خەزەڵی وەریو لەسەر کەلاوەی ئەو خانووانە کۆدەبێتەوە کە لافاوەکە راپماڵیون، بەڵام سروشت هەرچەند بەهێز بێت و بەهەر جۆرێک خۆی بنوێنێت بەرگەی هێزی لەبن نەهاتووی ئەو مرۆڤە ناگرێت کە ویستی بوونی هەبێت.

لەناو ئەو هەموو گێژاوەدا ئامادۆ چاودەبڕێتە دەریا، دەریای مۆڵگەی ئەڤین و مردن و جەژنەکان و خنکان و هۆزان و توندوتیژی، ژیانی هاوولاتیانی هەندێک جار بەروونی و زۆرجاریش بەلێڵی دەبینێت و زوقمی زامەکانی بەچیرۆکی وادادەرێژێت کە خوێنەر لە ناخەوە بۆ ناوجەرگەی رووداوەکان پەلکێش دەکات و بە بەردەوامی دەنووسێت و بیروبۆچوون هەڵدەرێژێت تا ژمارەی رۆمانەکانی بەدەیان دەژمێردرێت و بۆ (٤٨) زمانی جیهانی وەردەگێردرێت و زیاتر لە (٢٠ ملیۆن) دانەی لێ دەفرۆشرێت.

سێ خەمی بەردەوام بەروونی لە نووسینەکانی جۆرج ئامادۆ رەنگیان داوەتەوە:

یەکەمیان یارمەتیدانی برسییەکانی هەرێمی باکوری بەرازیل کە ساڵانە پانتاییەکی فراوانی ئەو هەرێمە تووشی وشکە ساڵی دەبێت بەرادەیەک بەروبوومی کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەگشتی لەو هەرێمە لەناو دەچن، دووەمیان سەرکەوتنی سۆسیالیزم و جێبەجێکردنی دادوەری کۆمەڵایەتی لە بەرازیل و گشت ئەمەریکای لاتینیدا، سێیەمیشیان بەرەنگاری سەرمایەداری ئەمەریکی کە خۆی لە کۆمپانیا فرەرەگەزەکان دەنوێنێت و هەژاری لەو دەڤەرەدا بلاودەکاتەوە. ئەمانە هەر لەسەرەتای نووسینی یەکەم رۆمانی (وڵاتی کەرنەڤاڵ) رەنگدانەوەی لەکارەکانی ئامادۆ هەبووەو لەهەردوو رۆمانی (کاکا- ١٩٣٣) و (رەگەز- ١٩٣٤) خوێنەر ئەم خولیایە لە دەمارەکانی نووسەردا هەست پێدەکات، لەولاپەڕانەی کە پڕە لە ئازارەکانی جوتیار و فەرمانبەرە بچووکەکان و بازرگانە مایە پووچەکان، رۆمانەکانی ئەو رەنگە تەڵخەیان گرتووە کە لە سەروسیمای خەڵکی رەنگ دەداتەوە.

هەروەها رۆمانی (بەرهەمی سوور- ١٩٤٢) بۆنی ئازار و مەینەتییەکانی مرۆڤی لێدێ، دیارە کە رۆمانەکانی ئامادۆ تاکە رێگابوون لە پێشی بۆ ئەوەی مافە خوراوەکانی مرۆڤە ژێردەست و زۆرلێکراوانی تێدا بداتەوەو هەوڵبدات ژیانیان تێدا ئاسوودە بکات، بۆیە ژیننامەی دووکەسی وای نووسیەوە کە داواکاری دادوەری کۆمەڵایەتی بوون، یەکەمیان (کاسترۆ ئەلفێس)ی هۆزانڤانی خەلاسی کە لەپێناو کۆیلەکاندا تێدەکۆشاو هەر لەو پێناوەشدا شەهید کرا. دووەمیشیان (بویس کارلۆس برستس)بوو کە بە لەشکرێکی نەوازی هەزار کەسییەوە دژی پازدە لەشکری ملیۆنێک کەسی فیدراڵی دەجەنگا، ئەو ئەفسەرە بەو لەشکرە ئەفسووناوییە لە هەرێمی (ریۆگراندی دۆسۆل)ەوە هاتبوو هاریکاری شۆڕشە دەستووریەکەی (سان پۆلۆ) بکات، لە ئەنجامدا شکستی هێناو خۆی و کۆمەڵەکەی بەرەو پاراگوای دوورخرانەوە، لەکاتی پاشەکشێ بەرەو هەرێمەکانی ناوەوە پاشماوەی کۆیلایەتی (پاش پتر لە سەد ساڵ لەلابردنی) دیت، بینی چۆن جوتیارەکان جەلدەیان لێدەدرێ و ژنەکانیان بە رۆژی رووناک دەستدرێژیان بۆ دەکرێ، دەرەبەگ خاوەنی هەموو کەس و شت بوو، ئامادۆ لە رۆمانی (سوارچاکانی هیوا)، ئەمانەی هەموو خستە روو، ئەم کتێبەو کتێبی (ێ.ب.پ. کاسترۆ ئەلفێس) هەردووکیانی دژی کۆیلایەتی و زوڵم و زۆری کۆمەڵایەتی نووسیوە.

جۆرج ئامادۆ کە بەئەندامی ئەکادیمیەی ویژەکانی بەرازیلی هەڵبژێردرا لەشەستەکانی سەدەی رابردوو وتی:- (رۆمانەکانی سییەکان لە دڵەڕاوکێی هەژاری بوون)، ئەمەو (جۆزێیە ئەمێرکۆدی ئالمیدا) و (لینس ریگۆ) و (گارسیانۆرامس) و (راکێل دی کیرۆز)ی کردە نموونەی نووسەرانی گەلە ستەمدیدەکەی بەرازیل.

یەکێک لە رەخنەگران دەڵێت: (ئامادۆ بەردەوام رێبازێکی گرتۆتەبەر کە کارتێکی نارەزاییە لە دیدێکی مرۆڤانە لە دایک بووەو سروشتی گەلی بەرازیل لەکارەکان، هۆنراوەکان و تێبینیەکانیدا بەرجەستە دەبێت). بەڵام ئامادۆ خەونەکانی لە رووبەڕووبوونەوەی سەرمایەداری ئەمریکی نەهاتنە دی، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەستەڵاتی سەرمایەداری ئەمریکی پتەوتربوو بەتایبەتی بە پتەوبوونی بنەماکانی جیهانگیری و زیادبوونی دەستەڵاتی کۆمپانیا فرە رەگەزەکان بەسەر جیهانداو پێشێلکردنی ئەو دادوەرییە کۆمەڵایەتییەی کە ئامادۆ خەونی پێوە دەدیت. ئەمەو ئامادۆ تووشی شکستیەکی گەورەتربوو کە ئابلۆقە سەپێنرایە سەری تا خەلاتی نۆبلی لێ قەدەغە بکرێت کە زیاتر لەجارێک شایستەی بوو بەو پێیەی کە بەرجەستەکاری کلتووری پورتوگالی بوو لەجیهاندا، لەکاتێکدا نووسەرێکی وەک (ساماراگۆ)ی

پورتوگالی خەلاتەکە وەربگریت، ئەمە ئازاریکی زۆری بە ئامادۆ گەیاند، چونکە زۆر ستەمە (ساماراگۆ) بەراورد بکریت و بخریتە تای تەرازویکەوە لەگەڵ ئەو ئامادۆیەی گۆڤاری تایمزی ئەمریکی نازناوی (گەوهەرە ڕەشەکەی بەڕازیل)ی پێدابوو و بە پڕ فرۆشترین نووسەرەکانی ئەمەریکای لاتینی دانابوو.

لە ڕۆمانی (بەرهەمی سوور) و لە بەشی یەکەمدا (ڕێچکەکانی برسیەتی) ئامادۆ باسی ئازارەکانی ئەو جوتیارانە دەکات کە (عەقید)ە دەرەبەگەکە لە زەوی و زاری خۆیان دەریان دەکات، ئەو دەرەبەگە خاوەنی گشت شتەکانەو لە ڕۆژانی وشکەساڵیشدا تەسلیم بەو چارەنووسە نادیارەیان دەکات کە لە خاکێکی بێ سەوزایی و ئاودا ڕووبەڕووی مەرگ دەبنەوە لە برسان و بەدانی مارە ژەهراویەکان.

هەروەها تێبینی هاوسۆزی ئامادۆ دەکرێت بۆ هەژاران لە ڕۆمانەکانی (کوڕەکەی ڕۆڵەی شار) و (تێریزا پاتێستا)و (گابریێلا) تا ئەو ڕادەیەی بیانوو بۆ کارە خەراپەکانیشیان دێنێتەوە، ئەو کوڕەی فڕێدراوەتە سەر شەقام و لە خەرەندی گومڕایی و ئاوارەییدا دەژی مافی خۆیەتی ڕقی لە کۆمەڵگە ببێتەوە، (تێریزا) ئەو کچە جوانەی فرۆشراوەتە (نەقیب)ی دڕندە کە ڕۆژانە ئازاری جەستەیی دەدات و دەستدرێژی سێکسی لێدەکات، هیچ گوناه نییە بەچاوی ڕق و گومانەوە بڕوانێتە کۆمەڵگەکەی، (گابریێلا) ئەو کچە لادێیەی بۆ پاروویەک نان ئاغاو کوڕە لاوەکانی یەک لەدوای یەک دەستدرێژی بۆ دەکەن، تاوانی نییە گەر هەمان هەڵە لەگەڵ ئەو عەرەبە دووبارە بکاتەوە کە زاوای ئەو پیاوەیە کە دالدەی دا و کردنی بەژنی خۆی، ئەوانە قوربانی کۆمەڵگەیەکن کە ڕێز لە کەرامەتی مرۆڤی هەژار تیایدا ناگیرێت.

مامەڵەکردنی ئامادۆ لەگەڵ چینە باڵادەستەکانیش بەهەمان شێوەیە واتە بەرێسای کاروکاردانەوە، بەم ڕێسایە ئەو هیچ کاتێک ڕقی دانەبارانەوتە سەریان لەبەر بۆچوونی سیاسی، بەڵکو لەبەر هەڵسوکەوتی چەوتیان لەگەڵ هەژاراندا، تەنانەت زۆرجار حەزی خێرخوازی و مرۆڤانەی لەکەسێک دیاردەخست ئەگەر لە چینی کۆمەڵایەتی ئەویش نەبووبێت، هەروەک باسی (مۆندینیۆ)ی دەوڵەمەند دەکات کە لە (ریۆ)وە هاتووە بۆ (باهیا) بۆ وەستان دژی ئەو شەڕو دواکەوتوویەی کە لە مێشکی چینە کۆنە دەستەڵاتدارەکەدا هێلانەی کردووە، نووسەر لە ڕۆمانی (گابریێلا) زۆر بەڕێزەوە باسی ئەو دەوڵەمەندە پێشکەوتنخوازە دەکات لەکاتێکدا دەبوایە وەک چەپێکی دۆگما بە دوژمنی چەوساوەکانی دابنێ و

هەمان بۆچوون لە ڕۆمانی (تێریزا پاتێستا) بەدی دەکرێت کە پیاوە دەوڵەمەندەکەی خاوەن کارگەیەکی شەکر و چەند بێستانێکی گەورە کچەکەی خۆش دەوێت و بەمیهرەبانییەوە دەیگرێتە باوەش و پارێزگاری دەکات، لێرەدا نووسەر بە چاوێکی مارکسیانە تەماشای ناکات، بەڵکو بەچاوێکی مرۆڤانەو بابەتییانە، ئەمەش ڕاستگۆییەکی گەورەیە لە باسکردنی بیرۆکەی وێژەییدا، بەڵام ڕاستگۆیی تەواوی ئامادۆ ئەوکاتە بەدیارکەوت کە ڕۆمانی (دکتۆر ژیڤاگۆ)ی (بۆریس باسترناک) پاڵێورا بۆ خەلاتی نۆبڵ و ڕەخنەی ئەوەی لێ دەگیرا کە هێرشکردنە لەسەر شۆڕشی ئۆکتۆبەری بەلشەفی، کەچی کاتێک پرسیاریان لە ئامادۆی مارکسی کرد زۆر بە ڕاشکاوی و ڕاستگۆیانە وتی: (ڕۆمانەکە کارێکی نەوازەیەو شایانی خەلاتی نۆبڵە). جۆرج ئامادۆ بەردەوام باوەڕێکی نەگۆڕی بەهێزی بەگەل هەبووەو ئەم بۆچوونەش لەوکاتە ڕوون دەبێتەوە کە مژدەی ئەوە دەدات گەل توانای بەرەنگاری ستەم و هەژاری و دەستەڵاتدارێتی نارەوای هەیە؛ لە ڕۆمانەکانی: (جۆبابیا- ١٩٣٢)، (دەریای مردوو- ١٩٣٦)، (سەرهەنگەکانی لەکان - ١٩٣٧)، ئەمەو ڕۆمانەکانی جۆرج ئامادۆ پڕن لە نارەزایی کۆمەڵایەتی دژی چەوسانەوەو هەژاری و پێشێلکاری بەها بەرزەکانی مرۆڤ وەک لە:- (وڵاتی کاکاو)، (بۆسە گورەکە) و.... هتد، هەروەها کاتێک ڕووی کردە بەرهەمهێنانی کەسایەتی کەموێنەی ئافرەتی وەک لە ڕۆمانەکانی (گابریێلا)، (مێخەک)، (دۆنافلۆرو دوومێردەکەی)، (ئافرەتە بزنەکە) و (تێریزا پاتێستا ماندووە لەشەڕ) کە ئەمەیان یەکێکە لە شاکارەکانی ئامادۆ و لەگەڵ ئەوەی پاڵێوراوە بۆ خەلاتی نۆبڵ، بەڵام لە بواری وەرگێڕاندا بۆ زمانە جیهانییەکان ئەو بایەخەی پێ نەدراوە کە بەسەرجەم کارەکانی تری ئامادۆ دراوە لەبەر قورسی زمانی ڕۆمانەکەو بەکارهێنانی هێماو وشەکانی زمانی هیندیە سوورەکان کە لە ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە پێویست بووە، بۆیە ڕۆمانی (تێریزا پاتێستا) دوو تایبەتمەندی هەیە کە کردوویەتیە جێی ئەو هەموو سەرنج و لێکۆڵینەوەی دەربارەی کراوە، یەکەمیان زمانێکی تایبەتی لە ڕۆمانەکەدا هەیە کە نقومی سروشتی ناوچەی ڕووداوەکانت دەکات و، دووەمیان ئەوەیە کە ئامادۆ (تێریزا)ی کردووەتە هێمای بەڕازیل بەهەموو زام و ئازارو خۆڕاگرییەوە. تێریزای پاڵەوانی ڕۆمانەکە کەسایەتییەکی تایبەتییە، ژیانی پڕە لە کارەسات و مەینەتی، جوانێکی بێ هاوتایە، هۆزانڤانان ناویان ناوە (کچی حەزو ئارەزوو)، لەلای چەوسێنراوان ناوی (تێریزای هیوا)یە، لەلای خەڵکانی دیوەخانان

(تیریزای حەوت حەسرەتەکانە)و لە چاوی ئەوانەی لە تاعون ڕزگاری کردوون (تیریزای ئۆمۆلۆی خواوەندە)، هەریەک لەم ناوانە لەبەشێکی ڕۆمانەکە پێی بەخشراوەو کارەساتێکی لەگەڵدا بووەو تووشی بگرەوبەردەی کردووەو دڵی هەزارانی ڕفاندووەو داوای ویساڵیان کردووە، بەڵام ئەو لە پارووە نانێک و خۆشەویستی بێگەرد و ئازادی و سەربەرزی زیاتر خوازیاری هیچی تر نەبووە. تیریزا جیهانی سێیەمە، کاردانەوەی میللەتانی ژێر دەستە دژ بە پیلانگێری جیهانیی دەستەلاتداری داگیرکەر کە دەیەوێت میللەتانی تینووی ئازادی و سەرفرازی و بنیاتنانی مرۆڤایەتی نوێ زیندەبەچاڵ بکات.

ڕاستە جۆرج ئامادۆ ویستوویەتی (تیریزا پاتێستا) بکاتە هێمای بەڕازیل، بەڵام ئەوە بووە هێمای گشت گەلە ستەمدیدەکانی جیهانی خاوەن مێژووی پڕ لە کارەساتی ڕەشی دڵتەزێن، بۆیە ئامادۆ ناسنامەیەکی جیهانی بۆ ڕۆمانەکانی وەرگرت.

جۆرج ئامادۆ کە وازی لەکاری ڕامیاری هێنا وتی:-
(بۆیە بڕیارم دا واز لە کاری ڕامیاری بهێنم وەکو پەرلەمانتارێک چونکە من هەڵگری چەکێکی گرنگترم، ئیدی لەمیانەی کتێبەکانم دەست بەشەڕە ڕامیاریەکانم دەکەم، چونکە نووسین گرنگترین کارە لە ژیاندا).

ئەمڕۆش کەژاوە پیرۆزەکەی تەرمی کوڕە نەبەزەکەی باهیا بەرەو ئارامگەی هەمیشەیی دەگەڕێتەوەو ئەو گەورە دەستەلاتدارانەی کە بە درێژایی ژیانی فەرامۆشی کردبوون و خۆی لێیان دوورەپەرێز دەگرت (چونکە وەک دەیگوت ئەوان خەون بەسەروەری ئەسینا دەبینن و خۆشیان لە ئازارەکانی گەلی بەڕازیل کەڕ کردووە) پێشبڕکێیانە بۆ بەشداریکردن لە ناشتن و پیاهەڵدانیدا.

ماوە بڵێین نووسەری پورتوگالی و هەڵگری خەڵاتی نۆبڵی ساڵی (١٩٩٨) دەڵێت: (مردنی جۆرج ئامادۆ بەسە بۆ ئەوەی بەڕازیل پرسەی نیشتمانی ڕابگەیەنێت، ئامادۆ بزر بوو لەنێوماندا، بەڵام نووسینەکانی ماون و نەمرن).

**سەرچاوەکان:**

١- تريزا باتيستا/ جورج أمادو/ ترجمة- عوني ابراهيم الديري/ مطبعة الانتصار/ بغداد/ الطبعة الاولى/ ١٩٨٩.
٢- جريدة الحياة/ العدد ١٤٠٢٥.
٣- هەفتەنامەی گوڵان/ ژمارە ٣٤٢.

# پیربوون

ئازاد دڵزار

ئەمشەو بەفرم لێ باریوە.
زستانی شووم،
بە لەشکری کفن لەبەر
چوار کناری لێم تەنیوە!
بە دەستێکی پەمۆ ئاسا
قژ و بژم دادەهێنێ.
لۆچ دەخاتە روخسارمەوە و،
بەسەر ئاوێنەی دادێنێ!
ئاوێنەکە:
پارچە ئەڵماسە سەوزەکەی
بەرباخەڵ و
سەر دیواری ژوور و هەیوان.
وەک لەتێ مانگ،
وەک کانیاوێکی مەییوی
بەر سایەقەی هەیوە شەوان.
سەردەمێک بوو
لە بنیدا جمەی دەهات
پانکە ماسی و،
ترپەی دڵی ئەستێرەکان!
ئێستە وەک قاپێ مەی بەتاڵ
بێ تەجەللا و بێ جیلوەیە.
بێ نەشئە و دڵەخورپەیە.
دوای تەمەنێک سەرەتاتکێ و سەوداسەری،
دوای هەزاران بیرەوەری.
ئەو پێنەزان و سپڵەیە
ئەوەی لە رووی میهرو وەفا
ئێستا پێم رەوا دەبینێ،
تەنها دوو لاجانگی سپی و
چاوی شێلو و،
سەر و قژێکی وەریوی رووتەڵەیە!

* * *

زۆر دڵنیام،
سبەی بەسەر پردێکی پان و بەریندا
دەپەڕمەوە.
لەوبەرەوە،
لە جیاتی کوانووی ئاگر
فریشتەیەک چاوەڕێمە
بە فانۆسێکی سەوزەوە!



لەوێندەرێش
نەچاوم لە جۆباری هەنگوینی مفتەو،
نەبالآی حوور.
نەبێ بە جۆگەلەی شیرەوە دەنێم و
نە چەمی شەرابی تەهوورا
لەوێندەریش
دەچمەوە سەر گردێکی بلند،
بەلکم کوردستانەکەی خۆم لێ رادیاربێ.
دەچمەوە سەر رێی کۆچەران،
بەلکم سەر قافلەچی یاربێ!
* * *
زستان ئەوا چوار کناری لێم تەنیوە.
لەشکرێکی کفن لەبەر
بە چەتری زیوینی بەفر،
لەسەر سەرم دابەزیوە!
هەلپەیەتی
قەلآی دلم داگیربکاو،
بیرووخێنێ.
کە ئەستەم هەلەمووتە.
چەند لەشکری بەفرو کەرەسیسەی تێکا،
خۆی راناگرێ و هەرەس دێنێ!
بۆیە دەبێ بگەرێمەوە،
ببم بە سۆفی و تۆبەکار.
لەسەر بەرمالی ئەشقەوە
هەردەم سەر بەسوجدەوە نێم.
لەجوانی بپارێمەوە،
هێز و توانای بخاتە کار.
نور لە چاوەکانم نەبڕێ.
هیدایەتی دلە ئەویندارەکەم دا،
دەست لەشکری
دلرەقی زستان نەکەوێ.



* ئەمن دەچمەوە سەر بانەکی بلند بەلکو بەژنی مەحبوبە گچکەلانەکەی خۆم لێرا دیاربێ (فۆلکلۆر).

* ئەوکاتەی دەمبەن بۆ بەهەشت ئەوسا دەلێم ئاخ نیشتمان (ناظم حیکمەت).

# چەند کورتە شیعرێک

نازێ عەزیزی
(مەهاباد)

### شانۆ

من شانۆی
تراژێدیێکی قورسی بەسەرهاتم
لە دوایین پەردەیدا
بەتاڵ و بۆش
دەبم بەهاوارێ
کە لە دانیشتوانی ئەم شانۆ قووڵ و خەمینە
دەڕوا بۆ ئاسمان.

### پەیکەرە

بەسەرم دا ئەباری ئەمشەو
بارانی خۆشەویستی
لە نیگایدا
هەناسەبڕکەی چاوم
لە چاوەڕوانیدا
خەریکە دا ئەتاشێ
پەیکەرەی عەشق لە ڕۆحمدا.

### وەرزی تۆ

لە چاوەڕوانی وەرزی تۆدا
هەرچوار وەرزی تەمەنم
سەمفۆنیای چاوەڕوانی بوو.
ئێستاکەش
لەژێربارانی ساڵەکان
- بەدوای یەکدا
ڕوحم دیلی وەرزی هاتنی تۆیە
هاتنێکی کەسک و سوورە
هاتنی وەرزی حەسانەوەیە.



# پێست لە دووردەستدا پێستە

پەرویز زەبیح غولامی
(سنە)

پێست لە دووردەستدا پێستە
- چاو لە چلدرداو
ئەنگوست لە مردوودا-
کاتژمێر دوور ناژمێرێت
* * *
سێ پاڵووی گۆشت ئەڕووخێ
بورجی ئێسقان ئەڕووخێ
هەتاکو دوور چەندی ماوە
- چاو بەرەو جادەو
ئەنگوست بەرەو ئامادە-
چی بێزوو و بۆچی بێزوو بە دوور ئەکات
* * *
پیاو ئەزانێت
بێ چاویلکەو بەچاویلکەوە عاشقەو
کاتژمێر نزیک ئەژمێرێت
بەڵام
پێست لە دووردەستدا پێستە.

چی لە پێستدا هەڵدێت
کەڵەشێری تاڵ و مەپرسە
ڕووداو بچووکەو
مشتێک ئێسک و پەڕ بەبا ئەچێ
ژنێک لە دوایین جیهاندا درێژەی هەیەو
شەو ڕووخاوە.
* * *
پێست لەچیدا هەڵدێت
عەمارەتی کاغەزەو مەپرسە
بارانی ئەلفوبێ دائەکات
ڕووداو بچووکەو
ژنێک لە پێست و پەلکە بەبانەچێ.

پێستت سەیارەی شیرەو
مەنفای هەتاو
کاتێ ئەیڕی:
بەیانی باش!
سەیارە چوار وەرزی هاوینەو
ئەسووتێم.
* * *
با ڕوومەتی خۆڵەمێش بێت و
بە ئەنگوستی خەڵووز نەوازشت کەم
با ڕوومەتی دووکەڵ بێت و
بە چاوی بلۆق بۆت بڕوانم
* * *
ئەسووتێم و
زۆر پێم خۆشە
عاشقانە لە سەیارەی خۆمدا بمرێم.
پێستت سەیارەی شەوەو
مەنفای باران
کاتێ ئەیڕی:
شەوباش!

# سواسيتكا

ئامينا زكرى
(دهۆک)

بنێره،
رۆژ ئاڤا بوو
و
هێشتا
ئەز
و
تو
دناڤ مەيخانا فيرعەونى دا
دوو بەلگێن
پاييزى نە.
قامەتا تەيا چەمياى
و
ل سەر رالێكا عشقاتە
ئەزا شكەستى.
رۆژ ئاڤابوو
و
قەلەم رەنگ،
چيرۆكا دوماهيا مە
نيگار دكەن.
ئەزا ب دوماهى دهێم..
تويێ ب دوماهى دهێى..
دەستێن مەيێن بێ تپلن
و
وێڤەتر، شەهيانە
تو دبينى؟

دارێن پاييزێ
سەرچوپى يا گرتى
و
د ئاهەنگا سێداره دانا
جەژنا بوونا مەدا
يێن سەمايێ دكەن.
بارانە
و
تۆزە!
ببووره،
چەند سالە تۆزا سپى
بازێرێ تە
پوشاندى يە!
دەنگێ تەيێ
خامووش
دگرنژيت و.. نيگاهەكاتە..(گرى يێن ئەڤران درەون)(١)
بێدەنگيا
عەشقەكا خامووش
دئاخڤيت.
ئاخ،
چەند ژتە خەريبم
ژ ئاخفتنێن تە
ژ ساكويێ تەيێ بێ سێهوانە
ژ نيگاهەكا تەيا مەست
ژ شەڤێن تە يێن بێ دارستان
ژ بێدەنگيا عشقاتە
يا چلورەيى
چەند خەريبم؟
سويندێ دەمەتە
ب شەڤا يلدا(٢)
و نڤێژێن نەكرى يێن مە
من دناڤ دادگەها
ئەزينى يا خوەدا،
مەحكوم نەكە،
هێ.. هێ گوه بدێ،
ل رەخ گوندێ
باپيرێ من
پيرهەڤيرک چيرۆكا دوماهيامە
يا كريە داستانەک
و
ئەز
و

تو
دبینه دوو ئایەتێن پیرۆز.. لێ،
عەشقا مە فانووسە،
فانووسەکا دەریایی...
ئەز بەرزە بووم...
تو بەرزە بووی...
ئەڤە چ دەنگە؟
هەمی پێن دکەنن
ئەز و تو ژی
دڤێت بکەنین.. بکەنە،
چونکی سێدارەدانا مەیە
و
چ خوین نارێژن.
ل رەخێ دی
تۆفانە
و
پەنجەرێن ژوورێن مە
پێن شەلاندینە!
گازییەکا گژلۆکی
مە ددەنە رێ.. مەدبن و دبەن و دبەن.. تا...
!.....
لێ،
شەمال ل سینگێ مە ناروینن
ل بەر
تیکا جاداهە،
ئەز
و
تو
و
پاییز
سێکوشەینە،
و
دناڤ پەحەنکا
دەستێن بەفرێ دا،
پیاسان دکەین.
تبلێن من
و
تیکا ل بەرانێ تە
تڤانەکە،
و
پشتی دەمەکێ..
پارزینکێ جگارێن مە،
دبنە دویکێل!
من نەزانی
کێ پەری پێن گوندێ مەدزین؟!
کێ پەزێن شڤان
و بێری پێن مەدزین؟
.....؟!
ئەز نزانم،
تو مەسیحی یان بۆدایی؟
لێ دزانم،
سواستیکا
دەسپێکا عەشقا مەیە.
ئاه،
مەسیحێ ژیانامن
(هەر پێنج تبلێن برسی پێن تە
زارۆکەکن ب سینگێ منڤە)(٣)
و
د هەمبێزا من وتەدا
میترایە،
ژ دایک دبیت.
لێ،
چ بکەین
دوماهی یە،
دوماهای یە
و
ئەز دێ مرم
تو دێ مری
و
هەمی خەونێن
نەرستی پێن مە
دێ بنە کەلەخەکێ مرار
لێ، بنڤە،
بنڤە
و
پەشێمان نەبە
بابا نوئێل،
ل سەر کە لەخسێ مە
شەهیانێ دکەن
و
ماچەکا عەشقێ
دوماهیا مەیە.

(١) کویلەکا سترانەکا فارسی یە.
(٢) دەسپێکا شەڤا زڤستانێ یە و بلندترین شەڤا سالێ یە کو دڤێ شەڤێ دا (میترا) ژ دایک دبیت و ئیرانیان دڤێ شەڤێ دا جەژنەکا مەزن دکر.
(٣) یا ژ شیعرەکا عارف حیتۆی هاتیە وەرگرتن.

# خەیاڵاتی جەنگ

جۆن دی. لیۆچنه
لە ئینگلیزییەوە: مەحموود ئیبراهیم پێماڵکی

لەتاریکایی نیوەشەودا بەرەو گردە بەرداویەکان
هەور دەنەڕێنێ و لەدامێنی شیوەکە دەنگ دەداتەوە
کە ئاپاڵمی پرتەقاڵی ڕەنگ لە ئاسماندا دەدرەوشێتەوە
هەناسەی مردن نزیک دەبێ.
لەتاریکاییدا، ناڵە ناڵ دێ
دەنگی گریانی منداڵ دەبیسترێ
زەوی لەژێر پامدا دەگرمێنێ
هەناسەی مردن نزیک دەبێ.
بەرە بەیان دادێ بەسەر شەوەزەنگدا
لاشەی هەمەچەشنە لەسەر زەوی ڕاکشاون
ترس و لەرز هەموو هەستەکانی داگرتووم
هەناسەی مردن نزیک دەبێ.
کە لەسەر پێخەفەکەی خۆم ڕاکشاوم
جۆگەلەی ڕووناکی بە پەنجەرەکەدا دێ
وازیاتر لەچل ساڵ تێپەڕی
هێشتا هەناسەی مردن نزیک دەبێ.

## بەرەبەیان

لۆری زەرینگ

دیمەنێکی چەندە جوانە لەبەر چاوم کە دەبینم،
تازە خۆری هەڵاتوو کە بەسەرمدا دەڕژێ
بەمێشکێکی پڕ ئاسوودەیی- کە تازە لەخەون دیتن ڕاست
بوومەوە،
جیهان لەبەرچاوم وا دەردەکەوێ،
هێندە پڕ ئاشتی و هێدیەتییە- هێندە پڕ ژیان و بەرەو
پێشەوەیە،
ڕۆژ لەتەم دێتە دەرو پەرش و بڵاو دەبێ،
هەورەکان هاتوچۆ دەکەن- سروشت گۆرانییە جوانەکانی،
پێشکەش دەکا- باڵندەکان دەخوێنن،
دارو درەخت، گژوگیاو ئەو باڵندانەی زوو هاتوونەتە
دەرەوە لە وەرزی بەهاردا،
هەموویان بەیەکەوە دەردەکەون- شتێکی ئەوەندە جوانە،
ئەوانە هێندە مەندو هێواشن،
کاتێکی زۆر خۆشە- ژیان هێندە مەندو هێواشە،
خێرا قەڵەباڵغی دێت و جیهان لەخەو ڕادەپەڕێ،
هەنووکە بەیانی مەندو هێواش و پڕ ئاشتیم بەسەرچوو،
ئێستاکە کاتی ئەوەیە خەریکی کاروباری ڕۆژمان بین،
با هەموومان لەو کاتەدا دوعا بکەین،



هیوادارم هەموو کەس جوانی و پڕ مانایی،
ئەوە ببینێ کە لەخودی من و تۆدایە!

## ژیان

جۆن دی. کلارک

ژیان هیچ نییە جگە لەشوێنی بەیەکگەیشتن
وێستگەیەکە بەرەو ڕێگا،
بەرەو ڕێگایەک کە هەموومان لێی دەترسێن
بەلام دەبێ ڕۆژێک بێ بۆی بچین.
ژیان تەنیا زنجیرەیەکە
لە هەواڵپرسی و خواحافیزی.
ژیان پڕە لە پرسیار،
بەلام لەراستیدا کێ هۆیەکانی دەزانێ؟
ژیان تەنیا لەشوێنی کۆبوونەوەیە،
وەستانێکە بۆ ماوەیەکی کورت.
ژیان دەرفەتێکە کە چێژ لەخەڵکانی تر وەربگری و
هاوبەشی هەست و ئەوین و زەردەخەنە بکەی.
ژیان پڕە لە سۆز
کە یاری بەهۆشی ئێمە دەکا.
ژیان وەکو ڕێگەی وڵاتە،
تۆ هەرگیز نازانی بەرەو کوێ پێچ دەکاتەوە.
ژیان شتەکان وا پیشان دەدات کە هەرگیز نابن
کاتێک بەسەریەکدا دەڕووخێن
لەژیاندا هەموو شتێک دووبارە و نوێ دەبێتەوە
ئەگەر ئێمە تەنیا خۆشەویستیمان لەبیربێت.



سەرچاوە:
Adrift on the Breeze.، دانەری کتێب،
Mells. R. Stokes

# زێمارەکا کەل

عسمەت محەمەد بەدەل
(دهۆک)

هەتاڤا چریا پاشیێ د پەنجەرا بچووکا ژووریٚ ڕا گەرماتیەکا شرین و خاڤ ب سەر لەشێ وی یێ تێهنەکا کێم تێدا مای بەرددەت، پێ د حەست بێهنا وی تەنگ دبت، دنیا ل پێش چاڤێن نیڤ تاری تاریتر لێ دهێت، دەستێ خوە یێ راستێ درێژ دکت سەرێ لحێفا دقرێژێ ڕا زەربووی، ژ سەر لەڤەنۆکێن پێ یێن خوە ڕا دکت، خوە نێزیکی سۆپێ دکت، بالیفکێ دکێشتە بەر پشتا خوە، بەرێ وی دکەفتە دیواری، چاڤێن وی ب خورتی دکارن وێنەیێن کوڕێن وی ب تاقیڤە رێزکری ژ هەڤ جۆدا بکن، ئاخینکەکا کوور بەرددت، دەستێ خوە دکێشیتە کیسکێ رەخ بالیفکێ ڤە، جگارەکا پێچای تێدا ب شخاتا ل بەر لێڤا سوپێ بەرددەتێ، هێڤ دکت وێنەیان. کابانیا وی دەری ڤەدکت، ب تۆڕەیی ل جگارا وی دنێرت:

– تە خوە ب وان جگاران کوشت، ما دێ کەنگی هێلی؟ هندی دختور دبێژیتە تە!! بێی خوە د ئاخفتنا وێ بگەهینت، دەستێ خوە درێژدکت گۆپالێ ل بەر دیواری، ساکۆیێ خوە دهاڤێژت سەر ملێن خوە، هلددت سەرخوەو پێن خوە ب دوو خوە رادکێشت، هەتا ژ دەرێ ئودێ دناڤ هەوشا بچووکا ڤالاڕا خوە دگەهینت بەر دەری، دو سێ جاران بۆ بێهنێ رادوەستت، کابانیا وی لێ دەردکەڤت، لێ دنێریت:

– بزڤڕەڤە ناڤ نڤینێن خوە، دێ چ کی؟ دێ تە سار بت.

دیسان خوە های ژێ نەی دکت، دەری ڤەدکت، ل سەر تەقچکێ بەر دەرێ رۆژانە لێ دروونشت دروونت، چاڤەڕێ یێ ل هیڤیەکا بەرزەبووی دکت، سەرێ خوە بۆ هەر دو ئالیان با ددت، ژبلی هندەک زارۆیان ل وێڤەتر یاریا دکن کەسێ ل وان دەران نابینت، کەفا گۆپالی دئێخت بن ئەرزنکا خوە، سەرێ وی ل بەر پێن خوە درێژ دکت، تزبیا ژبەرووکا ساکۆی دەردئێخت، مووركێن وێ یێن دخەلەکەکا بێ دووماهیدا ب دەزیڤە درستی دناڤ تلیێن خوەرا دەرباز دکت. گەرماتیا تاڤێ لەشێ وی یێ ئێشەوی خاڤ دکت، دسەر رێزێن خانیێن ل بەرامبەری ویرا چاڤێن وی ب چیا دکەڤن و پێڤەدمێن هلاویستی، بیردانکا وی د ئازرت، دپەنگت، دپەقت. دیمەنێ گوندێ دووکێل ژێ بلند دبوو ل بەرچاڤێن وی یە دەمێ بۆ جارا دووماهیێ لێ دنێڕا و بەر ب رێیەکا بێ سەروشوون دگەل قورتالبوویان دداڕێ.. چاڤێن وی ب زارۆیان ڤە مژوول دبن، هەڤڕکیا وان گەرم دبت، وێنە یێن مژەوی د سەریدا تێکەل دبن، یاریا زارۆیان پیچەکێ ئارام دکت، خەو دلێ وی دگرت، ل ناڤ چەمی سێڤا دچن، کابانیا وی سەڤیا دادگرت، هەر سێ کوڕێن وی ل سەر دارێ نە، د



هەژین و سـێف دوەریێن، ئەو لێ دنێـرت و ژ دل دکەنت.

- باب، تو ژی وەرە ڤێرێ..

- باب ڤێرێ خوەشە، تو ژی وەرە

و ئەو ژ دل پێ دکەنت

کابانیا وی ل هنداڤ سەری یە:

- درەنگە وەرە ژوور، دێ نها رۆژئاڤا بت.

تاڤـزەرکا روژێ چاڤـێن وی تاری دکت، سەرێ خوە لێ بلند دکت.

- بۆچی ئەڤرۆ کەس دیار نەبوو؟

- تو بەحسێ کێ دکی، جامێرۆ، کی دێ هێت؟

زارۆ یاریا خوە ب داوی دئینن، بژاله دبن، تەزیاتیا رۆژئاڤابوونێ د لەشیدا دچت خوار.

- ئەڤرۆ ژی کەس نەهات، سوبەهی.

گۆپالێ خوە ددتە بەر خوە، پێنگاڤێن خوە یێن گران ب دوو خوەرا دکێشت. هەتا دگەهت ناڤ نڤینکێن خوە دو سێ جاران یان پتر بۆ بێهنێ رادوەستت. بێن ب سەر دگەڤت، چاڤێن وی ب وێنە یێن ب دیواریڤە درێزکری دمینن هلاویستی، ڤێ جارێ د چاڤێن وان را گرنژینەکێ دخوینت، پێ د حەست ئێدی هیڤیا وی ب ڤـەگـەریانا وان دچرمـست، دناڤ نڤـینکێن خـوەدا درازت، چاڤێن وی ب وێنەیانڤە دوەستن.

کابانیا وی سێنیا شیڤێ دئینت ژوور، ل بەرامبەر رادوەسـتت، ل چاڤـێن وی یێن بەق دنێـرت، ژێ دترست، بانگ دکەتێ، دەنگێ خوە لێ بلند دکت، لێ نێـزیک دبت، ملێ وی دهەژینت، دەنگ ژێ نائێت، دەستێ خوە درێژ دکت راستا چاڤان، دهەژینت، چاڤ نالڤن، چاڤـێن وی ددانت سـەرێک، ب کـەسـەرەک مەزن زێمارەکا کەل ب بەختێ خوە یێ رەش دلورینت.

# جەستەی من؛ ئەو، یان کەسێکی دی

**یووسف عزەددین**
**(سدنی - ئوستورالیا)**

(............!!؟) پیرەمێردەکە هێندەی گوت و کۆتایی بەدێڕەکانی هێنا کە بەشێوەیەکی سەیرو سەمەرە دارێژرابوو.. هیچی لێ تێنەگەیشتم و لە مەبەستی حاڵی نەبووم. دەبێت ئەم دێڕانەی بۆ لەبەر کردبێت و چ مەبەستێکی هەبێت. وەک ئەختەبووت دێڕەکانی تێم دەئاڵان و ڕێگەی بیرکردنەوە و قسەکردن و لێدوانیان لێدەبەستمەوە. بەردەوام وشە و ئاماژە و دێڕەکانی لەبەرچاومدا زەق دەبوونەوە و هەرچۆنێکیشم ڕیز دەکردن، هیچی لێ حاڵی نەدەبووم.

ئیدی هیچ چارەیەکم نەما و کەوتمە وێنەکێشانی وشەو دێڕەکانی بەو شێوەیەی کە لە زەینمدا چەسپ بوو بوون. وێنەیەک یان چەند وێنەیەکی منارە و تاق و سەکۆ و مینبەر و میحراب و کۆشک و شتی سەیروسەمەرەی لەو چەشنە دەهاتە پێش چاوم.

یەکەم جار وێنەکان تەڵخ بوون؛ دواتر ڕوون بوونەوە.. وێنەی ڕێگەیەکی خۆڵاوی تابلێی بێ کۆتاو تەڵخ.. لەوە دەچوو ڕێگەی سەفەری گەڕیدەیەک بووبێت.. نەمدەزانی بۆچی و لەبەرچی دەبێت بەوێدا تێپەڕ بووبێت.. تەواو کەوتبوومە نێو خەیاڵ و ئەندێشەی جۆراوجۆرەوە. کاتێک پیرەمێردەکە وێنەی گەڕیدەکەی لە بەرکی هێنایە دەر و پیشانی دام؛ کە لێی وردبوومەوە لە من دەچوو.

تەنها ئەوەندە هەبوو ئەو ڕیش و سمێڵی سپی و پڕ بوو.. لەکاتێکدا من ڕیش و سمێڵێکی ڕەش و تەنکم هەبوو.. قژ و سەری پڕ و ئاڵۆزکاو بوون، بەڵام من شانەکراو و لە تەپڵی سەرمەوە ڕووتابۆوە. چاویلکەکانمان لەیەک دەچوو؛ تەنانەت هاوێنەکانیشی وەک ئەوەی من بوو. جل و بەرگی دەگەڕایەوە بۆ مێژوویەکی دێرین.. ناوێکی نامۆ و سەیری هەبوو لە هەردوو سەرەوە دەخوێندرایەوە و هەمان ناوی دەکرد.

لەوەدا بوو لە پیرەمێردەکە بپرسم، بەڵام هەروەک ئەوەی، بزانێت کە دەمەوێت شتێک بڵێم، دەمی هەڵێناو گوتی:

«هیچم لێ مەپرسە و ڕێگە خۆڵاوییەکە بگرە و خوات لەگەڵ»

«- بەڵام من گەڕیدە نیم و هیچ پێوەندییەکم بەو زاتەوە نییە و لەو مێژووەی ئەویشدا ناژیم، من و ئەو»

بە تووڕەییەوە هەستایە سەر پێ و ئاماژەی بۆ ڕێگەکە کرد. ئەو ڕێگەیەی کە کەمێک لەمەو پێش بۆ خۆم نەخشاندم؛ وا ئێستاش بەرجەستە و ڕێک و ڕاست لەبەردەمدا قووت بۆتەوە.

هیچ چارەیەکم نەبوو. ئەسیری وشە و دێڕو تەلیسم و لوغز و سیحر و جادووی پیرەمێردەکە بووم.. هێدی هێدی کەوتمە ڕێ.. لەگەڵ زیادبوونی هەنگاوەکانمدا ڕێگەکە ڕوونتر دەبۆوە، لە دوورەوە منارەکە بەدیارکەوت کە دەوری بەدار کاژێکی چڕ و پڕ تەنرابوو.. دواتر دەرگای کۆشکەکەم لێ



بەدەرکەوت، کە پێشتر بە وێنە بینیبووم.

دەبوو شتێک بێنمە جێ کە بۆ خۆشم نایزانم؛ جارێکی دیکە کەوتمە بیرکردنەوە لە وشە و دێڕەکانی پیرەمێردەکە، یەک دوو وشەی تریشم بۆ زیادکردن و لە نێوەڕاستی ڕێگاکەدا بە چۆکدا هاتم و بەچیلکەیەک کەوتمە وێنەکێشان.. هێندەی نەبرد خۆم لەنێو شەڕە جەنگێکدا بینییەوە.. خۆم و چەند کەسێکی دۆست لەگەڵ چەند کەسێکی تردا کە دیار بوو دوژمن بوون.. دەجەنگاین.. ڕەنگ و دەنگی لێکدانی شمشێرەکانمان گوێی کاس دەکرد. ئەسپەکانمان ماندوو و شەکەت حیلەیان دەگەیشتە عەرشی عەزیم، ئارەقەمان لێ دەچۆڕا؛ ڕەنگ و بۆشمان لەگەڵ خۆڵی عەردەکەدا فەرقی نەبوو.

پیرەمێردەکە لە گۆشەیەکەوە تێی دەڕوانین.

شمشێرەکەم بەڕاست و چەپدا ڕادەوەشاند و لە دڵی سوار چاکەکەی بەرامبەرم گیرکرد. بە کوشتنی ئەو کۆتاییم بەشەڕەکە هێناو بۆ جارێکی دیکە پیرەمێردەکە هەمان دێڕە تێکەڵ و پێکەڵەکانی دووبارە کردەوە. بە چمکی عەباکەی ئاماژەی بۆ کوژراوەکە کرد.. تەواو لە مەبەستی حاڵی نەبووم و وام زانی پێم دەڵێ دەمامکەکەی بترازێنە، خێرا دەمامکەکەیم کردەوە!!؟

کە بە ئاگاهاتمەوە خوێن بە ڕووکارمەوە قەتماغەی بەستبوو.. گۆج و ئیفلیج لە گەورەترین ژووری کۆشکەکەدا ڕاکشابووم. پیرەمێردەکە لە سووچێکی ژوورەکەدا شتێکی دەکوڵاند کە بۆن ژەهری لێ دەهات.

دەمم هەڵێنایەوەو پێم گوت: «ئەوەی کوشتم کێ بوو، پێم بڵێ!؟»

ژوورەکەی جێهێشت.

دەمویست هاواربکەم و بڵێم: «هەموو ئەمانە تۆ بەمنت کرد: من بۆ ئەم ڕێگەیەم گرتەبەر و بۆچی و لەبەرچی....»

بەڵام دیارە من بۆخۆم جەستەیەکی ساردوسڕ بووم و بەهیچ شێوەیەک سەرنجی ئەوم بەلای خۆمدا بۆ ڕانەدەکێشرا. پاش تاوێک چوار کەللە زلی تێکسمڕاو لە دەرگاکەوە هاتنە ژوور و وەک ئەوەی بۆن لاشەیەک کاسیان بکات دەستیان بەلووتیانەوە گرتبوو.. هەریەکەیان لەلایەکەوە منیان بەرزکردەوەو پاش تێپەڕکردنی یەک دوو ژوور بە قادرمەیەکی دوور و درێژدا بردیانمە خوار و لەپاڵ وێنەیەکی کۆندا جێیان هێشتم. بەتیلەی چاو تێم ڕوانی، وێنەی گەڕیدەکە بوو؛ کە سمێڵ و ڕیش و سەر و قژی لە ئێستای من دەچوو. پێ دەچوو هەر ئێستاش وێنەی گیرابێت و بەپەلەش خوێنە قەتماغە کراوەکەی دەم و چاویان سڕیبێتەوە.

(بەڵام ئەی ئەو، بۆ دەبێت خوێنە قەتماغەکراوەکەی دەم و چاوی من هەروەک خۆی بێت!!؟) لەبەر خۆمەوە گوتم.

هاوارم کرد یان پێم وابوو هاوار دەکەم:

«بۆ گوێیان لێم نییە.. من کێم کوشتووە.. بۆ هیچ ئەندامێکی جەستەم ناجووڵێت.

کەی هەڵدەستمەوە و دەگەڕێمەوە بۆ دۆخی جارانم».

پیرەمێردەکە لێم نزیک بۆوە و یەک دوو قومی لەشتە بۆن ژەهراوییەکە دامێ و پاش تاوێک لەهۆش خۆم چووم.

کە بە ئاگا هاتمەوە لەبەردەم دەرگا گەورەکەی کۆشکەکەدا ڕاوەستا بووم؛ ساتە وەختێکی زۆرم لە چاوەڕوانیدا بردە سەر و نەمدەزانی گەر ددرگاکە بترازێت چی بڵێم و کێم بووێت.. بەڵام دیارە ئەم دەرگایە، نەپێشتر ترازابوو نە ئێستا و نە لە داهاتووشدا دەترازێ!

خۆم لەبەردەم ڕێگەیەکی خۆڵاویدا بینییەوە...

بەڕوونی جێگە و شوێنی چوارناڵەی ئەسپەکان و شوێن جێگەی ڕم و شمشێر و گلان و تلانەوەی جەنگاوەرەکان و وێنەی خۆشم دەبینییەوە.. ئەو دەمەی شمشێرەکە ڕادەوەشێنم و ئەو دەمەش کە شمێرەکە لە جەستەمدا ئۆقرەی گرتووە.

نەمدەزانی چۆن چۆنی سەرەتا و دەسپێکی ماجەراکە بدۆزمەوە و لە کوێوە بکەومە ڕێ و بۆ کوێ بچم و بەشوێن چیدا بگەڕێم!؟ پرسیار بەچەشنی تێکچرژانی هەنگ لە مێشکمدا وورووژا بوو... بە هەموو لایەکدا پەلە قاژەم بوو.. پاش شەکەت بوون و ماندوو بوونێکی زۆر لەنێوەڕاستی ڕێگەکەدا وەک تاتە بەردێک داسەکنام.. یان ڕەنگە وەک جەستەیەکی مردوو لەنێوەڕاستی ڕێگە خۆڵاوییەکەدا ڕاکشابێتم!؟ یان ڕەنگە هەستابێتمەوە و هەمان ڕێگەم گرتبێتەوە بەر..

سەرباری ئەوەی کە هیچ شتێکم لێ ڕوون و ئاشکرا نەبوو.. لە بوونی خۆشم دڵنیا نەبووم و نەمدەزانی ئەوە منم، یان کەسێکی دی.

بەهیچ نەدەگەیشتمە یەقین و حەقیقەت!؟

ئەو هەموو ماجەرایەی کە بینیبووم.. لە چوارچێوەی ساڵ و ڕۆژ و سەعاتێکدا کۆ نەدەکرایەوە و پێ دەچوو زەمەن ماناو واتای خۆی لە دەست دابێت.

تەواو گومانم لە بوون و نەبوونم هەبوو.. مردوو.. زیندوو.. وەهم و خەیاڵ یاخود حەقیقەت!!؟

لەوەدابوو دوا وشەم بڵێم کاتێک پیرەمێردەکە بە ئاگای هێنامەوە و گوتی:

«تۆ کێی؟!»

دڵنیا نیم لەوەی کە وەڵامم دایەوە، یان نا.. بەڵام هێندە هەبوو بەدەر لە ویستی خۆم کەوتمە دووبارەکردنەوەی پرسیارەکەی و بەردەوام و بێ پسانەوە بەخۆمم دەگوت:

«من کێم؟».

# زاوا

**هۆشەنگ شێخ محەمەد**
**(دهۆک)**

«بێژەن»، بۆ ڕۆژی سێیەم بە تەنیا لە ژوورەکەی بوو، لەسەر کورسیی پشت مێزەکەی دانیشتبوو..، کۆمەڵێ کاغەز لەسەر مێزەکەی پەرشوبڵاوببوون، چاوە ڕەشە تیژەکانی ئاراستەی دەرەوە کردبوون.. بەچی دەدەیت..؟ ئەوەی ببینێ.. ڕەنگە بڵێ سەیری چیای سەفین بکات.. یان یەکێک لەو دارانەی لەبەر پەنجەرەکەیەوە دیارن.. یان سەرنج بداتە ئەو چۆلەکانەی لەسەردارەکان دەنیشنەوە، بەڵام نەء.. ئەگەر بزانی ئەوە سێ ڕۆژە «بێژەن» بەتەنیا لەم ژوورەیەو.. هیچی نەخواردووە.. نە نان نە ئاو.. سێ ڕۆژە تەنیا خەریکی خوێندنەوەی ئەو کاغەزانەی سەر مێزەکەیەتی.. لەگەڵ تەماشاکردنی ئەو وێنەیەی لەناو جام و چوارچێوەیەکی چکۆلەدایە و لەسەر مێزەکەی دایناوە.. دووچاوی ڕەش.. وەک شەوێکی بریسکەداری «دیستویفسکی»، لووتێکی چکۆلەو دوو لێوی تەنکی کەمێک پەمبە لەگەڵ سیمایەکی گەنمڕەنگی باریک و وردیلە. وێنەی کچێک کە ڕەنگە تەمەنی «٢٠» ساڵ بێت..

وێنەی «ڕێزان» کـە بێژەن خۆشی دەوێ و بەدەسگیرانی خۆی بانگی دەکات.. بڕیارە دوای دوو ڕۆژی دیکە بە بووکی بیگوێزنەوە بۆ کابرایەکی دیکە.. کەسێکی کە ڕێزان خۆشی ناوێ و نایەوێ..

«بێژەن» خۆشی دەوێت و دەیپەرستێ، هۆگری هەموو شتێکی دەسگیرانەکەیەتی.. چاوەکانی بەژن و باڵای.. ناوی.. وشەکانی.. تەمەنی.. ڕووحی.. هەست دەکا «ڕێزان» ئەوەو خۆیەتی! دوای ئەوەی خۆشەویستییەکەیان ئاشکرابوو، بەناچاری چووە خوازبێنی بۆ ئەوەی چارەسەری بارەکە بکا، باوکی ڕێزان پێ گوت:

- کچمان نییە بۆ بەمێرد دان، جارێکی تریش دەرگەمان نەکوتییەوە؟

«بێژەن» چەند جارێکی دیکەش، پێکۆڵی کرد، بەڵام سەر ئەنجام، ئەوەبوو کە بەهیچ جۆرێک ئەو کچەی نادەنێ،

زۆربەی خەڵکی بەم چیرۆکەیان زانی، بۆ ماوەیەکی زۆریش «ڕێزان و بێژەن» لەسەر زاران بوون، هەندێک خەڵک بەسووکی و هەندێک بەگلەیی و هەندێکیش بە چاکی و هەندێک بە گاڵتە و هەندێک بەگوناه و بێ تاوان.. بگرە هەندێک بە خاوەن هەقیش، باسیان کردن، هەروەک چۆن بەبێ ناموسیش!

مەسەلەکە ماوەیەک گەرم بوو دوایی ساردبووەوە.. هەروەک دەیان مەسەلەی دیکە.. وەک خۆ کوشتنی ژنی برایمی یان ڕەدووکەوتنی کچی ساڵح مەندۆی، یان کوشتنی ئەحمەد بلۆی لەسەر ناموسی یان وەک بەمێرد دانی کچی فاتمە ڕەشەی و یان ژنهێنانی کوڕی حەیشێ و کۆمەڵێ ڕووداوی دیکە.

بەڵام ئەوەتا ئەوە سێ چوار ڕۆژە مەسەلەکە گەرم بۆتەوە، ئەویش گوایە ڕۆژی هەینی کە دەکاتە دوای دوو ڕۆژی دیکە «ڕێزان» بە بووکی دەگوێزنەوە



بۆ کوڕێکی دەوڵەمەند کە ماوەیەکی کەمە لە هەندەران گەڕاوەتەوە و یەکەم سیفەت کە خەڵکی باسی لێوە دەکەن ئەوەیە دەوڵەمەندە! ئێستاش خەڵک بە زۆر شێوە قسە دەکەن..

- دەیباتە هەندەران.. لەوە باشتر!
- کێ هەیە کچی خۆی نەداتە مێردێکی وا!
- ئەدی بێژەن؟!
- کە پارە و عەشق کەوتنە تەرازوو.. پارە دەباتەوە!
- بەخوا گوناهە ئەو دوو دڵە لێک دەکەن.
- گوناهی چی و حاڵی چی.. بابەکەم ئەوە «حۆلە»یە و دەیباتە دەرەوە.
- عەشق و قسەی قوڕ!
- ڕێزان هەر لە بێژەن دێت. کفرە بۆ یەکێکی دیکە بێت.
- دەڵێن بێژەن سوێندی خواردووە زاوا دەکوژێ!
- دەڵێن گوتوویەتی.. خۆم دەکوژم!
- بابی ڕێزانیش گوتوویەتی خوا دەکا دایک و باوکیشی دەکوژێ!
- پێم وایە بێژەن نیازی وایە ڕێزان هەڵگرێ..
- ڕێزانیش ڕەدووی دەکەوێ..
- هەقی خۆیانە!
- دەبا بڕۆن! ئاوی ساردبخۆنەوە!
- ڕێزان خۆی دەسووتێنێ.. ئینجا ئەوکاتە بڵێن چاوی دایکی کوێربێ باشە؟!
- کوڕەکاکە ڕێزان خۆیشی ڕازییە و مێرد بەو حۆلەیە دەکا..
- بۆ کێ هەڵدەکەوێ بچێتە هەندەران؟
- خۆزگە منیش کچی خۆم دەدایە کەسێکی وا.
- ئەی قوڕتان بەسەری.. بەخوا هەژارن کچێ بەخوای ئەوەی چووبێتە دەرەوە پەشیمانە.
- مەسەلە عەشقە.. عەشق: ئەگەر کوڕەو کچە عاشق نەبووبانا..قەیناکە.. بەڵام عاشقی یەکترن، بۆیە نابێ ڕێزان بۆ یەکێکی دیکە بێت.
- بەخوا کوڕو کچەکە هیچ هەڵەیەکیان نەکردووە.
- ئێ خۆ ئەگەر عەشق هەڵەبێت.. دەوەڵڵاهی با هەموو کەس ئەو هەڵەیە بکات!

ئەمەو دەهێندەو سەد جۆر قسەی دیکەی لەو بابەتە دەکران.. دوای ئەوەی بێژەن بەمەی زانی.. چووەوە خوازبێنی ڕێزان، بەڵام باوکی ڕێزان گوتی:

- ببوورە کچەکەمان بە شوودراوەو.. ، کچمان بۆ شووکردن نەماون.

چوو بە کابرای «حۆلە»ی وت.. ئەو کچە هەرگیز بە تۆ ڕازی نییە.. من و ئەو یەکتریان خۆشدەوێ و ئێمە یەک کەسین.. یەک جەستە و ڕووح و مرۆڤین.

بەڵام ئەویش سوودی نەبوو.. کابرای هەندەران لەوە دەچوو زیاتر گاڵتەیەک بکا نەک ژن بێنێت.. نەک.. ڕێزان» بێنێت!

دوا وشە ئەوەبوو بێژەن پێی وت «ڕێزان خۆشی دەوێم.. هەرگیز شوو بە تۆ ناکا، چونکە خۆشی ناوێی.. تێبگە خۆشی ناوێی!»

بێژەن، چاوە تیژەکانی کە تروسکەیەکی ڕوون و شەوقێکی سپییان تێدا بەدی دەکرا.. گەڕاندنەوە سەر وێنەکەی ڕێزان. ئەم وێنەیە تەنیا وێنەی کچێک نەبوو، ڕێزان تەنیا کچێک نییە... خەون و هیوای سەوزی مرۆڤێکە.. خوێن و کەفی دەمارەکانی لەشێکە حەزی تەمەنێکە.. ڕێزان تەنیا جەستەیەک نییە.. ڕووحە.. ڕووحی گەرمی هەموو خەونە خوێنگەرمەکانی مرۆڤە.. ڕێزان.. ئەو کچەی هەموو جوانی و نەمری و پاکی و بێ گەردیی لەخۆیدا هەڵگرتووە.. «بوونە».. ڕێزان عەشقە!

بێژەنیش ئێستاکە بۆ سێیەم ڕۆژ لە ژوورەکەیەتی و سەیری ئەو تابلۆیە پڕ لە هێمایەی بەرامبەری دەکا، وشەکانی دەخوێنێتەوە، «وشەی ئەو نامانەی لەسەردەمی بەر لە ئاشکرابوونی عەشقەکەیاندا بۆ بێژەنی ناردبوون..، لەگەڵ هەر وشەیەکدا بێژەن یەقینتر دەبێت.. کە ڕێزان ناتوانێ ئەو کابرایەی خۆش بوێ.. ناتوانێ شووی پێ بکات.. یەقینە هەرچەند جارێک وشەکانی ڕێزان دەخوێنێتەوە کە پێی دەڵێ «خۆشم دەوێی.. خۆشم دەوێی» ڕێزان زیاترو زیاتر، زیاتر لە هەموو کاتێک لێی نزیکتر دەبێتەوە و.. زیاتر یەکانگیری یەکتری دەبن و بەناخی یەکتریدا ڕوو دەچنە خوارو.. زیاتریش عەشقەکەیان لە هەموو مەبەستێک دەتەکێننەوە و.. عەشق بۆ عەشق بۆ مرۆڤ دەکەن..، ڕێزان بۆتە ئەوو ئەویش ئەوە و هەردووکیان کەسێکن.. پەیکەرێکن لە عەشق و خۆشەویستی..

هەواڵی مانەوەی بێژەن بۆ سێ ڕۆژو بێ نان خواردن و بێ ئەوەی دەرگا لە کەسێک بکاتەوە یان وەڵامی یەکێک بداتەوە، گەیشتبووە باوکی ڕێزان و زاواکەیشی.. باوکی ڕێزان زۆر قەڵس بوو، بەڵام دەیوت.. «کچم بەمێرد داوە دوای دوو ڕۆژی دی بە بووکی دەبەن و نەک هەر لەم شارە، بەڵکو هەر لە وڵات نامێنێ.. بێژەنیش با هەر مان بگرێ و خۆی بەند بکات! با باشیش بزانێ.. بەم کردارە قوڕو سەخیفانەی.. کچم بدەمە هەر کێیەک نایدەمە ئەو.. دنیاشم بۆ برووخێنێ هەر نایدەمێ! نایدەمێ و نایدەمێ! دوای ئەوەش کچەش ڕازییە و خۆی

رای لەسەرە مێردی پێ بکات، راستە کچەکەم رۆژێ لەرۆژان.. بێژەن توانی هەڵیخەڵەتێنێ بە قسەی قۆڕو پووچ، بەڵام شوکر کچەکەم تێگەیشت کە هەڵە بووە و لێی پەشیمان بووەوە..»

بێژەن نامەکانی دەخوێندنەوە.. وشە گەرم و پڕ لە رووحەکانی.. وشە پڕ لە رەنگ و دەنگ و عەشق و ژیان و بوون..، ئەو وشانەی جوانترین تابلۆی تەمەن بوون..

وشەکانی خودێکی سەرمەستی عەشق و ڤیان – وشەی رووحێکی عاشق بە عەشق و ئاوس بە جوانی و میهرەبانی و بەخشندەیی.. ئەو وشانە زیاتر لەوە دەچوون لە خەونێکدا نووسرابن لە ساتێکدا نووسرابن کە زات دێتەگۆ.. کە ناخ قسە دەکات.. لەو چرکە وەختانەی کە راستگۆیی.. حەقیقەتی مرۆڤێکی عاشق تێیدا دەژیێ.. جوانترین و ناسکترین ساتەکانی بێ ئاگایی.. ئەو بێئاگاییەی دڵبەرترین ئاماژە و ماناکان بەخۆوە هەڵدەگرێت.. وشەکان لەو دەمانەدا نووسراون کە تا ئەزەل حەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگر بۆ کۆتا دەبێژن.. خوێندنەوەی ئەم وشانە بۆیان هەیە چارە نووسی سەرهەنیە و تەویڵەکان بسڕنەوە..، بەڵکو ئەم وشانە بە هەموو سادەیی خۆیانەوە، دەبنە ڤیان و ئیرادەیەک کە ئاڵۆزترین هێماکانی قەدەر دەکەنەوە و.. دەیگۆڕن و وەک خواستی دڵ دایدەرێژنەوە. ئەسڵەن ئەو وشانە بۆ ئەوە نووسراون گاڵتە بە قەدەر بکەن.. گاڵتە بەدەسەڵاتی بەدەر لەدەسەڵاتی عەشق و خۆشەویستی!

بڕیار وایە دوای دوو رۆژی دیکە رێزان بە بووکی بگوێزنەوە، بێژەنیش دوو رۆژی تر لە ژوورەوە دەبێ و نامەکان دەخوێنێتەوە و تەماشای وێنەکە دەکا یەقینە لەوەی خوێندنەوەی نامەکان.. گوتنەوەی وشەکانی رێزان..، پرۆژەی ئەو بووک گواستنەوە هەڵبوەشێنێتەوە.

ئەمرۆ سێیەم رۆژە.. تازە دایکە هەژارو باوکەکەی دەزانن کە بێژەن.. تەنیا لە حەژمەتی خەمێکی قورس لە ژوورەوە نییە.. رۆژی یەکەم و دووەم دایکی زۆر لە دەرگای داو بانگی کرد.. دوایی ناچار گریاو فرمێسکی بۆ رشتن، بەڵام بێژەن دەرگەی لێ نەکردەوە، ئەمرۆکە.. بێژەن بەناچاری لەپشت دەرگەکەوە بانگی دایکی کردو گوتی: «تا پێتان دەکرێ بێ دەنگ بن و هێمنی بپارێزن.. کەس بانگم نەکات.. کاری زۆرم هەیە و پێویستم بە بێدەنگییە..، ئەگەر دەتانەوێ رێزان شوونەکات بێدەنگ بن!»

تەنیا هێندەی وت و بێدەنگ بووەوە.. ئەم چەند وشانەی زۆر بوون بۆ ئەوەی دڵی دایکی خۆی بداتەوە و وای لێبکا بێدەنگ بێت و بانگی نەکاتەوە..

ئەم وشانە گەیشتنە کۆڵان، خەڵکی هەمدیسان کەوتنەوە سەر قسەو لێکدانەوەکانیان هەندێک گوتیان بێژەن شێت بووە.. هەندێکی دی دەیانگوت لەبرسان دەمرێ.. هەندێکی دیکە پێیان وابوو بێژەن کارێکی وا دەکا ئەو بووک گواستنەوەیە سەر نەگرێ.. هەندێکیش دەیانگوت.. مەسەلە ئەوەیە هیچی لەدەست نایەت و خۆی لە ژوورەوە بەند کردووە.. چاوەڕێیە، بەڵکو باوکی رێزان دڵی پێی بسووتێتەوە.

باوکی رێزانیش گوتی: «هەر سیحرو جادووی مابوو.. رێزان هەر شوودەکات.. شوو بەو کابرایە دەکات و دەبیاتە هەندەران.. زۆر هەڵەیە. رێزان ئەوی خۆش بوێ»

سێیەم رۆژە و.. ئەمرۆ خەڵکی رێزان و دەسگیرانەکەیان لەبازاڕ پێکەوە دیتن، زۆربەی زۆری گومانی نەبوو.. کە رێزان بۆتە هی ئەو کابرایەو تەواو.. ئەوەی بێژەن دەیکا شتێکی خەیاڵییە و پڕو پووچە.. تەنانەت زۆر کەس دەیانگوت ئەو کچە هەرگیز بێژەنی خۆش نەویستووە.. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەبوو بڕوای بەوە هەبوو کە بێژەن لە ژوورەکەیدا گاڵتە ناکاو شتێک دەکا.. کەس نەیدەزانی ئەو شتە چییە، بەڵام گومانیان نەبوو، ئەو شتە کارێک دەکا کە رێزان و ئەو کابرایە بۆ یەک نەبن.. جا یان کابرا دەمرێ.. یان یەکێکیان پەشیمان دەبێتەوە یان رێزان رەدووی بێژەن دەکەوێ.. یان باوکی دەمرێ.. یان.. گەلێ ئەگەری دیکە.

لە رۆژی چوارەمدا.. هەواڵی گۆشەگیری بێژەن لەژوورکەیدا بە تەنیاو بەبێ نان خواردن و بەبێ قسەکردن سەرنجی هەموو کەسێکی راکێشا بوو.. ژووری بێژەن پارچەیەک بێ دەنگی بوو.. هیچ دەنگێک لە ژوورەکەیەوە نەدەهات.. تەنیا هەندێ جار ورتەی ئەو وشانە نەبێت کە لەبن لێوانییەوە هەڵدەستان، بێژەن کە سەیری ئەو دوو چاوە رەشە گەشە پڕ لە سیحرانەی رێزان دەکا.. بەدەیان و هەزاران سەرنجیان لێ بڵند دەبن، لە تەماشاکردنی وێنەکە بەدەیان خەونی رەنگاورەنگ و خۆزگەی گەرم و ئومێدی وەنەوشەیی و هیوای عاشقانەی پڕ لە جوانی بۆ چارەنووسی بوون و مرۆڤایەتی لێ هەڵدەستن.. ئەو نیگاو چاوە رەشانە.. دووچاوی ئادەمی پڕ لە حەزو ئارەزووی خوێن گەرمن، دووچاو.. مرۆڤ پەلکێش دەکەنە ناو خەون و خەیاڵێکی هێندە شیرین کە هەموو خۆزگەیەک دەکاتە حەقیقەتێکی بەردەست.

خەڵکی وردە وردە زیاتر سەرنجیان دەدا مەسەلەکە.. وای لێهات.. بە جۆرێکی قووڵتر سەیری ئەو کارەی بێژەن بکەن.. زیاتریش گرنگیی کارەکەی بزانن..

باوکی رێزان لەلای خۆیەوە تەنگاوببوو، بەڵام پێکۆڵی

دەکرد بەسەرخۆی نەهێنێ.. تەنیا ڕۆژێک مابوو.. بۆ ئەوەی کۆتایی بە خەونی بێژەن بێنێ.. ڕۆژێک و بەس.. ئەوکاتە دەتوانێ بە ئاسوودەیی بمرێ.. ئەگەر ببینێ ڕێزانی کچی دەداتە کەسێکی دی و نایداتە بێژەن ئەویش بۆ ئەوی بیسەلمێنێ کە ڕێزان خۆشی ناوێ و هەرچییەک دەکا بابیکا با قەت لەو ژووره نەیەتە دەر..

بێژەن زیاتر سەیری ئەو چاوەڕەشانەی دەکرد.. چاوی ڕەشی ئەو باخەوانەی کلیلی خەون و فڕینی دەدایە بێژەن.. ئەو باخەوانەی سەبەتەی سەری پڕ دەکرد لەسێوی عەشق و زەیتوونەکانی چاوی شیعرو هەڵووژەکانی بەختەوەری..

ئەو چاوانەی سروودی کامەرانییان دەچڕی..

چەند خۆشە مرۆڤ باڵەکانی لە وەرزی ئەڤیندا بکاتەوە! چەند خۆشە لە باخچەکانی عەشقدا دەفتەرەکانی بەخشندەیی بنووسێتەوە! چەند خۆشە حەرف حەرف ڕەشنووسی هەنجیرەکانی ڤیان و ڕەهابوون بخوێنێتەوە، گەر عەشق نەبێت لەو بازاڕە سەر شێتەدا چی پێی دەکرێ فڕین بگەیەنێتە ئاوایییەکانی دەستنووسی خەونەکان؟! گەر عەشق نەبێت لەو ئاسمانە وێرانەدا چی تریفە دەڕژێنێتە سەر باڵای وەنەوشەی پەیڤەکان؟! گەر عەشق نەبێت چی وادەکا.. سروودێکی میهرەبانی بکاتە گۆرێچکەی دەفتەرەکان؟ عەشق، خۆشترین گەمەی ڕووحە سەرمەستەکان.. دڵبەرترین ئایینی جەستەڕەهاکان، عەشق ڕەنگینترین ئاماژەی ساتە بێ ئاگاییەکانی سەر.. عەشق تریفەییترین وەرزی سۆزی دڵ و دەماغ. وەنەوشەییترین ئاوازی ناخ و جەستە.

«قسەی قۆڕ!» باوکی ڕێزان چەندین جار، بە عەشقی دەوت... ئەمڕۆکەش لە ڕۆژی چوارەمدا کە بێژەن لە پەرستگەکەیەتی و بەیانی ڕۆژی بووک گواستنەوەی ڕێزانە هەمان وشەی وتەوە کاتێ زاواکەی وتی: «کچەکەت منی خۆش ناوێ.. هەموو شتێ تەواو!!» پرۆژەکە هەڵوەشایەوە زاوا و بووک گواستنەوە و هەندەران.. تەواو.. نەمان! ئەم هەواڵە وەک بوومەلەرزە بەشاردا بڵاوبووەوە..

- ئەموت ئەم شتە سەرناگرێ!
- عەشق..! گاڵتە بەعەشق ناکرێ!
- زاواکە چەند غەریب ببوو!
- باوکی ڕێزان لە حەژمەتان دەمرێ!
- دەڵێن ویستوویەتی ڕێزان بکوژێ!
- ڕێزانیش هەڵاتووەو چۆتە ماڵی بێژەن!!
- باوکی هەردووکیان دەکوژێ!

ئەوەتا باوکی ڕێزان بەپەلە لەماڵ دەرکەوت و بەرەو ماڵی بێژەن دەڕوا.. هەنگاوی گەورەو توورە. دەهاوێژێ.. «ماقوولە! ئەمە کاری شەیتانە!، بەڵام بێژەن ئەمەت بۆ ناهێڵم! ماقووڵ نییە.. خەیاڵ ئەمەی لە دەست بێ..! خەیاڵی بێچووە سەگێکی وەک بێژەن زاوایەکم لە دەست بدات..، ماقووڵە خەیاڵ کچەکەم بگەیێنێتە ئەوێ!!، نیازی وایە هەردووکیان بکوژێ.. قەد قەدیان بکات!

- بێژەن بەخوا باوکم شێت بووە، دەمانکوژێ!
+ باوکت؟ باوکت خۆی کوژراوە.
- ئەندێشەی تۆ مەرگ لە باوکم دەبینێتەوە؟
+ وەک چۆن ئەندێشەم ژیان لەتۆدا دەبینێتەوە.
- کێ بەرگری لە ئەندێشە دەکا.. بەتایبەتی ئەندێشەی عاشق؟!
+ «ڤارتەر» لە بێ عەشقیدا یان لە عەشقدا خۆی کوشت؟ دەبێ لە مەبگەین!
- ئای! لەچ بێ عەشقێکداین؟!
+ گەر هێزی خەیاڵ نەبێت.. کێ لەگەڵ ئەم بێ عەشقییەدا هەڵدەکات؟!
- ئێستا باوکم دێت.. چی لەگەڵ بکەین؟
+ یارییەکی لەگەڵ دەکەین.. خەونێکی نیشان دەدەین.
- بەڵام...
+ مادام خەونە ڕەهاین، دەچین ماسییەکانی حەوشە بەرەڵای دنیا دەکەین.. بەجۆرێک لەنێو ماسییەکاندا ون دەبین..، کەس نەتوانێ بماندۆزێتەوە.. ئەگەر ئێمە بە ئەندێشەیەکی باڵا خۆمان بشارینەوە، باوکت ناماندۆزێتەوە.
- ئەوکاتە لە سەرووی فریشتەکان دەبین.
+ جا تۆ خەیاڵی ئەوە بکە حەوشەکەمان.. ژوورەکانی ماڵمان.. ژوورەکەی من، سەرمێزو ناو کتێبخانە و نێو پەنجەرەو هەموو سووچێکی ژوور پڕ بن لە ماسی..، ماسیی ڕەنگاو ڕەنگ بۆنخۆش، گەورەو بچووک.. ڕوو بەخەندەو بە پێکەنین.. بە پوولەکە بریق و باقەکانیان جوانی و خۆشی ببەخشنە تاق و دیوارەکانی ژوورو ماڵ.. ماسییەکان هەڵبەزن و دابەزنەوە.. هەڵپەڕن، سەما بکەن، گۆرانی بڵێن.. ماسییەکان تازە لەدایک دەبن.. ئازادانە خۆ فڕێ دەدەنە سەر هەموو شتێک و دەکەونە هەڵەکە سەما..

کانییەکە دەبێتە دەریا.. دەچینە ناوی و ماسییەکان فڕێ دەدەینە حەوشە.. ماسییەک و دەیان و سەدان و

هەزارنین..

- ماسییەکان دەبنە رووبارو بەسەر تاق و دیواری ماڵ شەپۆل دەدەن.. ریز دەبەستن و هەروژم دەبەن.. لەنێو لا دیوارەکاندا جێگایان نابێتەوە.. بە بەرزایی دیوارەکان سەردەکەون.. بۆ سەر بان.. بۆ سەر دەروازە و پەنجەرەو شوورەکان.. تاق و دیوارو دەروازەکان دەهێننە لەرزە.. دیوارەکان خەریک دەبن قڵیش ببەن و لەکەفی رەنگاو رەنگی ماسییەکاندا بتاوێنەوە، دەنگی شەپۆلی ماسییەکان وردە وردە بڵند دەبێت و گرمە پەیدا دەکات..

+ من و تۆش لەنێو رەنگی ماسییەکاندا وەک دوو ئادەمی رەنگ بدەین، قەبارەو بارستەی ماسییەکان زۆر ببێت.. گەورەببێت دیوارو دەرگاو پەنجەرەکان بتەقنەوە هەزارەها ماسیی رەنگاو رەنگ دەرپەرن.. شەپۆلی رەنگینی ماسییەکان لە هەموو لایەک بەرزبێتەوە.. ماسی بە پێکەنینەوە بێنە دەر.. بەخێرایی بازبدەن.. ماڵ دەبێتە کانیاوی ماسییەکان.. ماسی لە ژوور دەر دەکەون و دەکەونە کۆڵان.. لەکۆڵان خۆیان بە کووچەو تاق و دیوارو دەرگاو پەنجەرەی ماڵەکاندا دەدەن.. ماسییەکان کەف دەدەن.. خوێن بە لەشیاندا دەگەڕێ.. بریقەیان دنیا دەهەژێنێ.. وای لێ دێ هەر ماسییەک خۆی لە شوێنێک دەدا.. بەدەیان و سەدان ماسیی تری لێ دێنە دەر ئەوانیش خۆیان دەدەن لەتاق و دیوارو ماسییتری لێ دێنە دەر..

قەرەباڵغی ماسییەکان دەکەوێتە کۆڵان.. باوکی رێزان لەسەری کۆڵانەو بە پتەوی هەنگاوە تووڕەکانی دەهاوێژێ.. بە پەلەیە بگاتە ماڵی بێژەن و لای کچەکەی، رێزان بباتەوەو بیخاتەوە ژێر رکێفی خۆی کە گەیشتە ماسییەکان.. وردە وردە هەنگاوەکانی سست بوون، ماسییەکان هەر لە هەڵچوون و زۆربوون و خێراتربوون لای ماڵی بێژەن ببووە تابلۆیەک لەماسی.. ماڵ دیار نەمابوو لەبەر رەنگ و کەفی ماسییەکان کەفەکان تێکەڵ یەک دەبوون و هەموو رەنگێکیان دروست کردبوو و شەپۆلیان دەدا..

هەڵدەچوون.. بەرزدەبوونەوە و دادەبەزین.. وەک تاڤگە لەسەر بان دەهاتنە خوار دەبوونە تاڤگەو ماسییان هەڵدەدات.. ماسییەکان کەفیان هەڵدەداو لەناو کەفاوە رەنگینەکانیشدا ماسی دەردەپەڕین.. بەدەیانیان خۆیان لە باوکی رێزان دا.. بەبن پێیی وەردەبوون.. بەناو لینگانی دەرباز دەبوون.. تا ئەو نزیکتر دەبووەوە.. شاڵاوی ماسییەکان بەهێزتر دەبوو.. زیاتر لێی دەخشان لە ئەژنۆی.. لەپشتی.. لە دەستەکانی.. هەندێکیان لەبەر دەموچاوی.. ماسییەکان بەری دەکەوتن و لەو دەرباز دەبوون.. دەکەوتنە پشتی و شەپۆلیان بۆ پێشەوە دەدا.. ئەو لەماڵی بێژەن لەکانیاوی ماسییەکان نزیک دەبووەوە.. ماسییەکانیش بەرەو کۆڵان و ماڵەکان شەپۆلیان دەدا.. کەفی رەنگین بەسەر خاکدا وەردەبوو.. رەنگی خاکی دەسڕییەوە و رەنگینی دەکرد.. دیواری ماڵەکانی سواغ دەدا.. تا نزیکتر دەبووەوە هەنگاوەکانی دەکەوتنە نێو کەفاوەکەو هەستی بە بۆشایی دەکرد.. هەنگاوە پتەوەکانی سستتر دەبوون.. هێزیان کەم دەبووەوە.. گرانتر دەڕۆی.. تووڕەییەکەشی زیاتر دەبوو.. شەقی رادەوەشاندە ماسییەکان و رێگای خۆی دەکردەوە.. ماسییەکان بەپێکەنینەوە خۆیان تێهەڵدەسوی و کەفیان بەسەردا دەرژاند.. خۆی گەیاندە بەر دەرگاکە.. کەفاوەکە تا سینگی هاتبوو.. ماسییەکان بە خوڕو تیژ تێدەپەڕین.. گەیشتە حەوشە.. گوێی لە تریقەی پێکەنینی بێژەن و رێزان بوو.. زۆر بە زەحمەت زیاتر چووە پێشەوە.. خۆی گەیاندە ئەو دارەی لە حەوشەبوو.. دەستەکانی خۆی تێ ئاڵاندن.. درەختەکەش.. ماسی و کەفی دەردەدا.. ماسی بە سەری دەکەوتن.. بەر لە شی دەکەوتن شەلاڵی کەفاوەکە ببوو.. هاواری کردە رێزان:

- رێزان هاتووم بیبەمەوە.. جاوەرە..

رێزان و بێژەن. قاقا لەگەڵ دەرکەوتنی هورووژمی ماسییەکان پێدەکەنین.. ماسییەکان خۆیان تێهەڵدەسوین.. رەنگی کەفاوی ماسییەکانیان گرتبوو.. لەناو ماسییەکاندا مەلەیان دەکرد.. سەمایان دەکرد.. یەکتریان ماچ دەکرد.. یەکتریان دەگوشی.. هەناسەیان بۆن و رەنگی ماسییەکانی گرتبوو.. خوێنیان دەگۆڕییەوە.. ماسییەکان دەردەپەڕین ژوور ببووە سەرچاوەیەکی رەنگاو رەنگ.. لەگەڵ دەرکەوتنی ماسییەکان.. سەدان ئامازەو مانای رەنگین بەرپا دەبوون.. عەشق و حەزو ئارەزوو دەتەقینەوە.. کانیاو کانیاوی ڤیان بوو.. رەنگی سۆزی دڵ و هزرو ئامازەکانی جەستە هەڵدەقولان و بە سیمای بووندا وەدەنووسان..

دەنگی باوک لەنێو هورووژم و تافە تافی کەفاوی ماسییەکاندا ون بوو.. ئەمجارەیان توندتری نەراند.. «هاتووم بتبەمەوە.. دەتبەمەوە!»

دەیویست زیاتر بچێتە پێش، بەڵام بۆی نەکرا کەفاوەکە تا ئەوکی هاتبوو.. ماسییەکان بەرجەستەی دەکەوتن.. خێراترو تیژتر بەری دەکەوتن.. بەهێزتر لەشیان دەسمی توندتر خۆی بە دارەکەوە گرتبوو.. رق و ترسی گەورەتر دەبوو..

- گوێت لێمە هاتووم بتبەمەوە..!

شاڵاوی ماسییەکان هەموو کۆڵانی پڕ کرد.. تاق و

دیوارەکانیان دەهەژاند.. دەرگاکانیان دەخستنە سەر پشت و هەڵیان دەتەکاندن.. دەروازەکان.. پەنجەرەکانیان دەکردنەوە.. دیوارەکانیان دەڕووخاندن.. شەقامەکان و بەربەستەکانی شەق دەکرد.. ئارەزووەکانیان دەتەقاندنەوە.. بۆنی ماسییەکان ئارەزوویان هەڵدەستاند.. کەفاوە ڕەنگینەکە دنیای تێکدەداو.. بەجۆرێکی نزیک لە ئارەزووی دڵی ڕێکدەخستەوە.. دەیگەڕاندەوە سەر ڕەسەن.. شیرازەی خانووەکانی دەشکاند.. هەموو شتێک ڕەنگی ماسییەکانی دەگرت و ماسییان دەردەدا.. دەرگاو پەنجەرەی شکاو.. دیواری ڕووخاوو خەڵک دەکەوتنە زەمەنی ماسییەکان و بۆنی ماسییەکان و ڕەنگی ماسییەکان.. شوێن کەفاوێکی ڕەنگاو ڕەنگ و مەیدانی تەقینەوەی ئارەزووە پەنهانەکان.. ماسی لە هەموو کەسێک دەردەپەڕین.. بەربەستێک نەبوو ڕێیان لێ بگرێ..

- لێ ناگەڕێم ئەم یارییە سەر سەختەم لەگەڵ بکەن.. دەتبەمەوە..

بێژەن و ڕێزان سەری ئەویان دەدی کە خەریک بوو لەنێو کەفاوەکەدا ون ببێ.. کەفاو لەسەروچاوی دەچۆڕایەوە.. ماسی خۆیان پێدا دەدا.. ئارەقەی تووڕەیی دەردەدا.. دەیویست وەک شەپۆلی ماسییەکان.. شالاویان بۆ ببا..

لەکۆلانیش شالاو بلندتر دەبوو.. ماڵ و خانوو و خەڵکێکی زۆری پەلکێش دەکرد، خەڵک دەکەوتنە نێو کەفاو و لەنێو ماسییەکاندا تێکەڵ دەبوون.. تێکەڵ بەیەک و تێکەڵ بە ماسییەکان..،

باوکی ڕێزان نەیدەوێرا هەنگاوێکی دیکە بچێتە پێش.. دەترسا دەستەکانی لە دارەکە بکاتەوە و شەپۆلی ماسییەکان ڕایپێچێ، کانی بەسەدان و هەزاران ماسیی لێ دەهاتنە دەر هەندێکیان یەک بەژن بلند دەبوون و تێکەڵ بە ڕووباری ماسییەکان دەبوون و شەپۆلیان دەدا.. بێژەن و ڕێزان جار جارە دەکەوتنە بەرچاوی.. دەیدی دەستیان لە ملی یەکترەو مەلە دەکەن.. یەکتری ماچ دەکەن.. پێدەکەنن.. ڕووت بوونەتەوە و بەرووتی یەکدی دەگوشن، لێوی یەکتری دەگرن و دەچنە بن کەفاوە ڕەنگینەکەو بەسەدان ماسی لە دەوریاندا باز دەدەن و بلند دەبنەوە، دەچنە بن کەفاوەکەو پێکەوە بلند دەبنەوە، تا نێو قەدیانەوە ڕووتن، دەکولا.. ببووە پارچەیەک لە تووڕەیی.. فرمێسکی تووڕەیی لەچاوەکانیدا دەربریسکانەوە، بەلام چی پێ نەدەکرا.. دەیزانی هەر دەستەکانی لە دارەکە بکاتەوە ئەوا شەپۆلی ماسییەکان هەڵیدەلووشن.. دەیویست هاوار بکات، بەلام دەنگی نووسا.. نەهاتە دەر..

بێژەن و ڕێزان لە باوەشی یەکدی بوون و ڕووچوونە ناو ئاوەکە، بەدەیان و سەدان ماسی لەجێی جەستەیان بلندبوون و کەف و بۆن و بریقەو تروسکەیان لێ هەڵدەستا، هەردووکیان پێکەوە هەر لەباوەشی یەکتری بوون و لەسەر ڕووی ئاوە ڕەنگینەکە بلند بوونەوە.. بێژەن و ڕێزان کە ڕەنگی ماسییەکانیان گرتبوو بلند بوونەوە و لەخوار سکیانەوە هەردووکیان ڕەنگی ماسییان گرتبوو.. هەردووکیان ببوونە دوو فریشتەی ئاوی و تروسکەی پوولەکەکانیان خەریک بوو.. بینایی باوکی ڕێزان لێڵ بکەن.. چاکتر دیقەتی داو دەیویست گومانەکەی بڕەوێنێتەوە و بزانێ ئەمە بێژەن و ڕێزانن یان جەستەی دوو فریشتەی ئاوین! لێی تێکەڵ بوو.. سەرسام بوو بەبینینی ئەو دوو جەستە پوولەکەدارە، تووڕەییەکەشی دەیورووژاند.. دەیکولاندو کەفی تووڕەیی دەردەدا.. لەبەرچاوی ون بوون.. هەردووکیان دیار نەمان.. چاوەڕێ بوو سەربکەونەوە.. بیانبینێتەوە چاکتر تەماشایان بکات.. تەماشای جەستەیان بکات.. جەستەی پوولەکەداری ئەو دوو ئادەمییەی ڕەنگی ماسییان گرتووە.. سەرنەکەوتنەوە!، خوێنی تووڕەیی دەیهەژاند.. دەیورووژاند.. بینایی لێڵ دەکرد.. ئارەقەی پێ دەردەدا.. خوێنی تووڕەیی لە لەشیدا کەفی دەکردو تای ساردو گەرمی پێکەوە دەهێنانێ، سەرنەکەوتنەوە!.. دەستی لە قەدی دارەکە شل کردو.. کوێرانە هەنگاوە شێتەکانی هاوێشتن.. بەرەو ژوور.. بەرەو ئەو شوێنەی بێژەن و ڕێزان بە جەستە پوولەکەدارەکانیان ڕووچوونە ناو ئاوەکە، کەفاو و ئاوی ڕەنگین و ماسییەکانێ شەق کردوو.. خۆیشی نەیزانی چۆن گەیشتە ژوورەکە، لە ژووردا وەک ئەوەی یەکێک زللەیەکی بەبنا گوێدا بێنێ ئاوای لێهات!.. چاوەکانی هەڵگلۆفتن و لێلایی بەربینایی بەردا.. ئارەقە لە هەموو لەشی دەچۆڕایەوە.. چەند هەنگاوێک چووە پێش.. سەیری مێزەکەی کرد بینی وێنەی ڕێزان کە نیوەی کچەو نیوەکەی تریشی ماسییە.. لەگەڵ کۆمەڵێ کاغەزی سپی کە لەسەر کاغەزەکان جۆرەها پوولەکەی ڕەنگاو ڕەنگ پەرش و بلاوبوونەتەوە لەسەر مێزەکەن، ویستی بگەڕێتەوە حەوشە.. هەنگاوێکی هاوێشت.. هەنگاوەکەی قورس بوو، کە سەیری پێیەکانی کرد.. بینی پێلاوەکانی پڕن لە کەفاوێکی لینجی ڕەنگاو ڕەنگ و بۆنی ماسییان لێ دێ.. ماڵی بێژەنیش بۆنی بووک و زاوایەتیی دەپژاند!!

# بکوژان

**ئێرنست هەمنگوای**
**لە ئینگلیزییەوە: حوسێن مەردانی (مەهاباد)**

دەرگای ژووری نانخواردنی هێنری کرایەوە، دوو پیاو هاتنە ژوور و لەپاش شووشە بەندەکە دانیشتن. جۆرج رووی لەوان کردو گوتی: «ئێوە چ دەخۆن؟»
یەکیان گوتی: نازانم، «ئال» ئەتۆ ئیشتیات لەچییە؟
ئال: نازانم. نازانم ئیشتیام لە چییە.
لەدەرەوە هەوا تاریک ببوو. رووناکی شەقامەکە لەدەرەوەی پەنجەرەوە دەدیترا. ئەو دوو پیاوەی لەپاش شووشە بەندەکە دانیشتبوون، خەریکی سەیرکردنی لیستەی چێشتەکان بوون. لەو لای شووشە بەندەکە «نیک ئادامز» چاوی پێیانەوە بوو.
کە ئەو دوو کەسە وەژوور دەکەوتن، نیک لەگەڵ جۆرج قسەی دەکرد.
کابرای یەکەم گوتی: من گۆشتی سوورکراوەی بەراز لەگەڵ شۆرباو پەتاتە دەخۆم.
-: ئەو چێشتە چەلی حازرنییە.
کابرا: ئەی بۆچی لێرە ناوتان نووسیوە؟
جۆرج: ئەوە شێوە، ئێوە دەتوانن سەعات شەش ئەم چێشتە بخۆن.
جۆرج چاوی لەکاتژمێری دیوار کرد و گوتی: ئەلعان سەعات پێنجە.
کابرای دووەمی: سەعات پێنج و بیست دەقەیە.
-: ئەم کاتژمێرە بیست دەقە لەپێشە.
کابرای یەکەم گوتی: بە جەهەندەم، ئێستا چیتان بۆ خواردن هەیە؟
جۆرج: چەند جۆر ساندەویچی (بابۆڵە)ی باشمان هەیە. گۆشت و هێلکە، کالباس و هێلکە، جەرگ و ...تاد.
-: ئەمن مریشکم دەوێت لەگەڵ نۆکاو و شۆرباو یارەماسی.
جۆرج: ئەوەش ئی نانی شەوە و ئێستا نایدەن.
-: هەرچیمان داواکرد، گوتتان بۆ شێو دەدرێ، ئێوە ئاوا کاردەکەن!
جۆرج: ئەمن دەتوانم گۆشت و هێلکە، کالباس و هێلکەو.
ئەو کابرای دی ناوی (ئال) بوو گوتی: من گۆشت و هێلکە دەخۆم.
کڵاوێکی لەسەر نابوو و کۆتێکی ڕەشی لەبەر کردبوو و قۆپچەکانی داخستبوون. سیمایەکی وردیلە و ڕەش ئەسمەری هەبوو و لێوەکانی لێک هەڵ نەدەپچڕی. ملیوانێکی هاوریشمی و هەروەها جووتێک دەستەوانەی بەدەستیەوە بوو.
کابرایەکەی دیکە گوتی: من کالباس و هێلکە دەخۆم.
ئەویش دەکرێ بڵێین بالای بە قەد بالای (ئال) دەبوو. دەم و چاویان لەگەڵ یەکدی جیاوازی هەبوو، بەڵام هەرێکیان وەک دووانە جلیان پۆشیبوو. کۆتێکیان لەبەردابوو ددت گوت زۆر بۆیان تەنگە. ئانیشکیان خستبووە سەر شووشە بەندەکە و بۆ پێشەوە پاڵیان دابۆوە.
(ئال) پرسی: ساردەمەنیمان هەیە؟
جۆرج: ساردەمەنی ئەلکۆلیمان (مەشروب) نییە.
-: مەبەستم ئەوەیە کە هەر ساردەمەنی بێت، جا هەرچی بێت.



جۆرج: هەر ئەوەی وتم، ئەوەمان هەیە.
کابراکەی تر گوتی: شارێکی گەرمە، ناوی چییە؟
جۆرج: سامیت.
(ئال) ڕووی لە هاوڕێیەکەی کردو گوتی: تاکو بە ئێستا ناوت بیستبوو؟
-: نا.
(ئال) پرسی: شەوانە لێرە چ دەکەن؟
هاوڕێیەکەی وەڵامی دایەوە: ئەوانە لێرە نانی شەو دەخۆن، هەموویان دێنە ئێرەو شێو دەخۆن.
جۆرج: دروستە.
ئال ڕووی لە جۆرج کردو پرسی: تۆ پێت وایە ئەو شتە دروستە؟
جۆرج: بەدڵنیاییەوە.
-: ئەتۆ مرۆڤێکی وریای؟
جۆرج: ئەوە شتێکی دیارە.
کابرایەکەی دیکە گوتی: تۆ وریانی. ڕووی لە ئال کردو گوتی:
وایە؟
ئال: ئەو گەوجە.
پاشان ڕووی لە (نیک) کردو گوتی: ئەتۆ ناوت چییە؟
-: نادامز.
ئال: مرۆڤێکی وشیاری تر، مەگەروانییە، ماکس؟
ماکس: شار پڕە لە ئینسانی وشیارو چاوکراوە.
جۆرج دوو دەوری لەسەر مێزەکە، یەکیان هێلکەو گۆشتی تیابوو و ئەوی تر هێلکەو کالباس. دووقاپ یارە ماسی سوورکراوەشی بۆ دانان و لەپاشان دەلاقەی متبەقەکەی داخست.
جۆرج ڕووی لە ئال کردو پرسی: کامەیان هی تۆیە؟
- مەگەر نازانی؟
جۆرج: گۆشت و هێلکە.
ماکس گوتی: بەوەی دەڵێن مرۆڤی وشیارو چاوکراوە.
دەستی بەخواردن کرد. هەردووکیان لەکاتێکدا دەستەوانەکانیان لەدەستیدابوو، چێشتەکەیان خوارد.
جۆرج بەکاتی خواردنی چێشت سەیری دەکردن.
ماکس: ئەوە چاو لەچی دەکەی؟
جۆرج: هیچ.
کابرا: ئەتۆ سەیری منت دەکرد.
ئال: بەشکەم مەبەستی شۆخی بووبێ
جۆرج پێکەنی.
ماکس: ئەتۆ نابێ پێبکەنی. حاڵی بووی، پێ مەکەنە؟
جۆرج: ڕاست دەکەی.
ماکس ڕووی لە ئال کردو گوتی: ئەو لای وایە کە دروستە. ئینسانێکی باشە.
ئال گوتی: ئینسانێکی بیرمەندە.
پاشان خەریکی نان خواردن بوون.

ئال ڕووی لەماکس کردو گوتی: ئەو کوڕە وشیارەی خوار شووشە بەندەکە ناوی چییە؟
ماکس ڕووی لەنیک کردو گوتی: هۆی، کاکی وشیار، بڕۆ ئەولای شووشە بەندەکە لەگەڵ ئەو کوڕەی هاوڕێت.
نیک: مەبەستت چییە؟
-: مەبەستێکی وام نییە.
ئال: واباشترە بڕۆی.
نیک چوو بۆ لای پشتەوەی شووشەبەندەکە.
جۆرج: گەرەکتە چ بکەی؟
ئال: ئەوە پێوەندی بەتۆوە نییە؟ کێ لە متبەقە (ژووری چێشت لێنان)؟
-: ڕەش پێستێکی لێیە؟
-: مەبەستت چییە لە ڕەش پێست؟
-: مەبەستم ئەوەیە کە ئەم ڕەش پێستە چێشت لێنەرە.
-: پێی بڵێ بێتە دەرێ.
-: دەتانهەوێ چ بکەن؟
-: بڵێ بێتە دەرێ.
-: دەزانی ئێستا لەچ شوێنێکی؟
ئەو کابرایەی ناوی ماکس بوو، گوتی: ئێمە زۆر باش دەزانین لەکوێین، پێت وایە گەوجین؟
ئال ڕووی تێ کردو گوتی: ئەتۆ گەوجانە قسەدەکەی، بۆچی لەتەک ئەم کوڕێژگەیە دەمەقاڵە دەکەی؟
پاشان ڕووی لەجۆرج کردو گوتی: بەو ڕەشە بڵێ کە بێتە دەرێ.
-: دەتانهەوێ چی لەگەڵ بکەن؟
-: هیچی لێ ناکەم، کەمێک بیری لێ کەنەوە، کاکی وشیار، ئێمە لەگەڵ ڕەش پێستێک دەمانهەوێ چی بکەین؟
جۆرج دەلاقەی متبەقەکەی کردەوەو هاواری کرد:
«سام، دەقەیەک وەرە دەرێ».
درگای ژووری چێشت لێنان کرایەوە و ڕەش پێستەکە هاتە دەرو گوتی: چ بووە؟
دوو پیاوی پاش شووشە بەندەکە سەیرێکیان کرد.
ئال گوتی: زۆر باشە ڕەشە، ئەتۆ لەوێ ڕاوەستە.
(سام)ی ڕەش پێست بە بەرهەڵبێنەکەی ڕاوەستابوو، سەیری دوو کابرای پشت شووشە بەندەکەی کرد وگوتی:
«بەسەرچاو، جەناب».
ئال لەسەر چەرپایەکەی هەڵستاو گوتی: من لەگەڵ ئەم ڕەش پێستە و ئەم برا وشیارە دەچینە ژووری چێشت لێنان.
-: بچۆ بۆ متبەقەڕەشە. کاکی وشیار تۆش لەگەڵی بچۆ.
کابراکە بەدوای نیک و سام چوو بۆ متبەق. درگاکە لەپاش سەریان داخرا.
ئەو پیاوەی ناوی ماکس بوو، لەپاش شووشە بەندەکە بەرامبەر جۆرج دانیشتبوو... چاوی لەجۆرج نەدەکرد،

بەڵکو سەیری ئەو ئاوێنەیەی دەکرد کە تەواوەتی دیوارەکەی پشتە سەری (جۆرج)ی داگرتبوو. ئەوێ دوکانێکی مەشروب فرۆشتن بوو کە کردبوویان بەژووری نانخواردن.
ماکس هەر ئەم جۆرە کە دەیڕوانییە ئاوێنەکە، گوتی: باشە، کاکە ئەوە بۆ قسەیەک ناکەی؟
- ئەو کارانە بۆ چییە؟
ماکس بانگی لە ئال کرد: هێی، ئال، ئەم کاکە وشیارە گەرەکیەتی هۆی ئەم کارە بزانێت؟
دەنگی ئال لەمتبەقەوە بیسترا کە گوتی: باشە، بۆچی پێی ناڵێی؟
-: پێت وایە ئەم کارانە بۆ چین؟
-: نازانم.
-: پێت وایە چییە؟
لەو ماوەیەدا کە ماکس قسەی دەکرد، چاوی هەر بە ئاوێنەکەوە بوو.
-: نامهەوێ باسی بکەم.
-: هەی ئال، ئەو کورە نایهەوێ پێمان بڵێت کە بیر لە چی دەکاتەوە.
ئال لەژووری متبەقەوە گوتی: گوێم لەقسەکانتانە.
بە بتڵێک دەلاقەی چێشتخانەی کردەوە و گوتی:
«گوێ بگرە، کاکە، تۆزێ بڕۆ پێشتر لە ئاستی شووشە بەندەکە بوێستە، تۆش جۆرج کەمێک بۆ لای چەپ بڕۆ».
دەتگوت وێنەگرێکە کە کۆمەڵە کەسێک بۆ وێنەگرتن حازر دەکات.
ماکس گوتی: لەگەڵ من قسە بکە کاکە، پێت وایە چ ڕوو دەدات؟
جۆرج متەقی لەخۆی بری.
ماکس گوتی: ئەلعان پێت دەڵێم، گەرەکمانە کەسێک بکوژین، ئال ئاندێرسۆن دەناسی؟
-: بەڵێ.
-: هەموو شەوێ بۆ خواردنی شێو دێتە ئێرە، وایە؟
-: جاری وایە دێت.
-: سەعات شەش دێت، وایە؟
-: ئەگەر بێت.
ماکس ئێمە ئەوە دەزانین کاکی وریا، باسی شتێکی ترمان بۆ بکە، قەت دەچی بۆ سینەما؟
-: جار جار؟
-: دەبێ زیاتر بچی، سینەما بۆ کەسێکی وەک تۆ باشە.
-: بۆچی دەتانهەوێ ئاندێرسۆن بکوژن؟ چی لەگەڵ ئێوە کردووە؟
-: ئەو قەت هیچ کارێکی لەگەڵ ئێمە نەکردووە چونکو هەر بەعومراتی ئێمەی نەدیوە.
ئال لەمتبەقەوە هاواری کرد: ئەو تەنیا جارێک لە عومراتیدا ئێمە دەبینێت.
جۆرج: کە وایە دەتانهەوێ بیکوژن؟
جۆرج: کە وایە گەرەکتانە بیکوژن؟
-: ئێمە لەبەر خاتری دۆستێکمان دەیکوژین، بۆ چاکەکردن لەگەڵ دۆستێک.
ئال لە متبەقەوە هاواری کرد: وس بە، زۆر دەم درێژی دەکەی.
-: هەر چۆن بێت دەبێ ئەو کورەی بخافڵێنم، مەگەرنا، کوڕی زرینگ؟
ئال: ئەتۆ زۆری لێ دەڵێی، کوڕی زرینگی من و ئەو ڕەشە بەیەکەوە سەریان قاڵە وەکو دەستە خوشکێکی ناو کلیسا پێکەوەم بەستوونەوە!.
-: پێم وایە لەکلیساش بووی.
-: قەت نازانی.
-: لەکلیسایەکی جوولەکەکان بووی.
جۆرج چاوی لە کاتژمێری دیواری کرد.
-: ئەگەر کەسێک بۆ شێو خواردن هات، بڵێ کە چێشت لێنەرەکە بۆ پشوودان چووە و ئەگەر هەر نەڕۆیشتن بڵێ بۆ خۆتان دەبێ بچن چێشت ساز بکەن، تێگەیشتی کاکە؟
جۆرج: بەڵێ، دوایە چیمان لێ دەکەن؟
ماکس: دیارنییە، ئەوە شتێکە تا کاتی خۆی کەس نازانێت چ ڕوودەدات.
جۆرج سەیری کاتژمێری کرد، شەش و چارەگێک بوو. دەرگا کراوە و لێخوڕێکی تراموا هاتە ژوور و گوتی:
-: سلاو جۆرج، شێو حازرە؟
-: سام چۆتە دەرێ و نیوسەعاتی دیکە دێتەوە.
-: ئەگەر وایە بچمەوە بۆ ناو شەقام باشترە.
جۆرج هەمیسان چاوی لەسەعات کرد، بیست دەقە لەشەش لای دابوو.
ماکس: زۆرباش بوو کوڕی ژیر، ئەتۆ زۆر ڕێک و پێکی.
ئال لە متبەقەوە دەنگی بەرز بۆوە: ئەو دەیزانی کە لێرەوە کەللەی سەری دەپژێنم.
ماکس: نا واش نییە، کوڕە باشە، خۆشیم لێ دێت.
کاتژمێر بوو بەشەش و پەنجاو پێنج دەقە، جۆرج گوتی: ئیتر ئەو نایەت.
دووکەسی دیکە بۆ خواردنگەکە هاتبوون، کەرەتێکیش جۆرج چوو بۆ متبەق تاوەکو بابۆڵەی گۆشت و هێلکە بۆ ئەو کابرایە بپێچێتەوە کە دەیهەویست لەگەڵ خۆی بیبات.
لەناو متبەقدا چاوی بە (ئال) کەوتبوو کە لەسەر کورسیلەیەک لە پەنا دەلاقەی متبەقەکە دانیشتبوو لەکاتێکدا کلاوەکەی بۆ پشتەوە لار کردبۆوە و چەکێکی لەسەر لێواری دەلاقەکە دانا بوو و ڕوو بەدەرێ ڕاگرتبوو، چاوەڕوان مابۆوە.
نیک و ڕەشە پشت بە پشتی یەکدی بەسترابوونەوە و یەکەی خاولییەکیان لەزاری ڕاکرابوو. جۆرج بابۆڵەکەی سازکردو دوای پێچانەوەی لەکاغەزێکی ناو خستیە ناو

نایلۆنێک هاتەدەر ودای بەکابراکە. کابراش پارەی بابۆڵەکەی پێدابوو و ڕۆیشتبوو.
ماکس: ئەو کوڕە زیرە دەتوانێ هەموو شتێک بکات. ئەوەتا چێشت لێ دەنێت، شت ساز دەکات. ئاخرێکەی دەبێ بەهاوسەرێکی باش لە بۆ کەنیشکێک.
جۆرج: (ئاندێرسۆن)ی هاوڕێتان ئیتر نایەت؟
ماکس سەرەتا چاوی لە ئاوێنە کردو پاشان سەیری کاتژمێری کرد. سەعات حەوت بوو و لە پاشان حەوت و پێنج دەقە، بە (ئال)ی گوت: وەرە بڕۆین، ئیتر ئەو نایەت.
ئال: پێنج دەقەی دیکە کاتی بۆ دادەنێین.
لەوکاتەدا پیاوێک هاتە ناو چێشتخانەکە و جۆرج گوتی کە چێشت لێنەر نەخۆشە.
پیاوەکەش بە قەڵس بوونەوە گوتی: بۆچی کەسێکی دیکە نامێنێ؟ مەگەر ئەم خواردنگەیە تۆ بەڕێوەی نابەی؟ لەپاشان وەدەرکەوت.
ماکس: وەرە بڕۆین، ئال.
ئال: چ لەم دووانەو ڕەش پێستەیە بکەین؟
ماکس: ئەوان هەر دەمێننەوە، کارەکەیان بەباشی بەڕێوەبرد.
ئال: تۆ وابیردەکەیەوە؟
ماکس: بەڵێ، بەرنامەکە کۆتایی هات.
ئال: حەز ناکەم، زۆر تێکەڵ و پێکەڵ بووە، تۆش زۆری لێ دەڵێین.
ماکس: هیچ نەبووە، ئەی دەبێ ئێمەش سەرمان قاڵ کەین، مەرگەنە؟
ئال: هەرچۆن بێت زۆر لەسەری دەڕۆی،
ئال لەمتبەق هاتە دەرێ.
لوولەی چەکەکە لەژێر کۆتەکەیدا هەڵسابوو.
لەکاتێکدا دەستەوانەکانی هەر بەدەستیەوە بوو، کۆتەکەی ڕێک کرد-
-: دەتبینمەوە، کاکە. ئەتۆ شانست زۆر بوو.
ماکس: ڕاستە، ئەتۆ دەبێ لەکێبەرکێیەکاندا گرێو بکەی، کاکە.
هەرێکیان چوونەدەرێ. جۆرج هەر سەیری دەکردن، لە جامی پەنجەرەکەوە دیتی کە لەبەر تیشکی گڵۆپ لەشەقام تێپەڕین و بۆ ئەولای چوون. بەو کۆت و کڵاوەیان لەگرووپەکانی نومایشت دەچوون.
جۆرج چوو بۆ متبەق. نیک درگاکەی لێ کردەوە.
چێشت لێنەر گوتی: من ئیتر تاقەتی ئەم شتانەم نەماوە.
نیک هەستایە سەرپێ، ئەو تاکو بە ئێستا قەت خاولی لەزاری نەهاویشتبوو.
جۆرج گوتی: ئەوان دەیانەویست کاتێ (ئال ئاندێرسۆن) وەژوور دەکەوێ، بیکوژن!
-: ئاندێرسۆن؟
-: بەڵێ.

چێشت لێنەر لێواری زاری بەدەستی شێلاو پرسی: (ئەوان ڕۆیشتن؟)
جۆرج: بەڵێ، هەر ئێستا ڕۆیشتن.
چێشت لێنەر: قەت شتی وام پێ خۆش نەبووە، و حەزی پێ ناکەم.
جۆرج ڕووی لەنیک کردو گوتی: گوێ بگرە بڕۆ ئاندێرسۆن بدۆزەوە.
نیک: باشە.
چێشت لێنەر: بە قسەم دەکەی، مەچوو، واباشترە هەر خۆت لەم شتە بەدوور ڕاگری.
جۆرج: ئەگەر پێت خۆش نییە، مەچوو.
چێشت لێنەر: خۆ تێ هەڵقوتاندن لەم شتە بە قازانجت نییە، باشترە کە لەهیچ و خۆڕاییی خۆی لێ نەدەی.
نیک گوتی: دەچم ببینم، ماڵەکەیان لەکوێیە؟
چێشت لێنەر لێیان دوورکەوتەوە و گوتی: کوڕیژگەکان هەموو کات دەزانن کە چ دەکەن.
جۆرج گوتی: ئەو لە ژوورێکی خانووی هیرچ دایە.
-: دەڕۆم بۆ وێ.
لە دەرەوە تیشکی گڵۆپەکان لەناو لق و پۆپی بەتاڵی درەختەکان دەدرەوشانەوە.
نیک بەپێیان بەرەو ژووری شەقام چوو و بای داوە بۆ شەقامێکی تر. سێ خانوو سەرەوەی شەقامەکە، ماڵەکانی هیرچ هەڵکەوتبوون. نیک لەیەک دوو پلیکان وەسەرکەوت و لەزەنگی ماڵەکەی دا. ژنێک درگای کردەوە.
-: ئاغای ئاندێرسۆن لێرەن؟
-: گەرەکتانە ببینن؟
-: بەڵێ، ئەگەر لەماڵن.
نیک بەدوای ژنەکە لە پلیکانەکان چووە سەرو هاتنە ناو دالانێک. ژنەکە لەدرگای دا.
-: کێیە؟
ژنە گوتی: کەسێک هاتووە کاری بە ئێوەیە، جەنابی ئەندێرسۆن.
-: نیک ئادامزم.
ئاندێرسۆن وەرە ژوورێ.
نیک دەرگای کردەوە و چووە ژوور (ئال ئاندێرسۆن) لەسەر قەرەوێڵە، لەکاتێکدا تەواوی جلەکانی لەبەردابوو، ڕاکشا بوو و بێ وەی کە سەیری نیک بکا، پرسی:
-: مەسەلە چییە؟
نیک: من لەخواردنگەوە هاتووم، دوو کابرا هاتن بۆ وێ، من و چێشت لێنەرەکەیان بەستەوە و گوتیان دەیانهەوێ بەکاتی هاتنی ئێوە بۆ خواردنگە، بتانکوژن.
کاتێ نیک ئەم قسانەی دەکرد دەتگوت خەریکە شتی گەوجانە دەڵێت.
(ئال ئەندێرسۆن) هیچی نەگوت.
نیک ئاوای درێژەدا: ئێمەیان دەمتبەق کردو وتیان کە

کاتێ ئێوە بۆ شێو خواردن دێن، دەتکوژن.
(ئال ئاندێرسۆن) چاوی لەدیوار کردو متەقی لێوە نەهات.
نیک گوتی: جۆرج وای بەباش زانی کە من بێم و ئەوشتەتان پێ بڵێم.
(ئال ئاندێرسۆن): نازانم لەو بارەوە هیچ کارێک بکەم.
نیک: پێتان دەڵێم کە سەروسەکوتیان چۆن بوو.
ئاندێرسۆن: نامهەوێ قەیافەیان بناسم. زۆر مەمنوون کە هاتی و ئەو شتەت پێ وتم.
نیک چاوی لەو کابرا کەڵەگەتەکرد کە لەسەر قەرەوێڵە ڕاکشابوو گوتی:
«ناتانەوێ بە پۆلیس ڕابگەیەنم»
-: نا ئەوان هیچ ناکەن.
نیک: کارێکتان بەمن نییە.
- نا، هیچ کارێکم نییە.
نیک: لەوانە هەر هەڕەشەو گوڕەشە بووبێت.
- نا، هەڕەشە و گوڕەشە نییە.
(ئال ئاندێرسۆن) ئەوەی گوت و بۆلای دیوار خۆی وەرسووڕاند و گوتی:
شتەکە لێرەدایە کە من ناتوانم بڕیاری خۆم بدەم و بچمەدەرێ، ئەوڕۆ هەر لەماڵێ بووم.
نیک: ناتوانن لەشار وەدەرکەون؟
- نا، بەڕادەی پێویست ڕاکردن و دەرچوونم هەبووە.
هەر ئاوا کە سەیری دیواری دەکرد، گوتی: کارێکی وانییە کە ئێستا بتوانرێ بکرێ.
نیک: ناتوانن بەجۆرێ کێشەکە چارەسەر بکەن؟
ئاندێرسۆن هەر بەو دەنگە بۆڕەی گوتی: نا، من تووشی کارێکی هەڵەبووم. هیچی لەگەڵ ناکرێ.
پاش ماوەیەک بڕیاری خۆم دەدەم و وەدەردەکەوم.
نیک گوتی: باشتروایە بچمەوە و جۆرج ببینم.
(ئال ئاندێرسۆن) بێ ئەوەی سەرنجی نیک بدات، گوتی: دەت بینمەوە، مەمنوون کە بۆ ئێرە هاتی.
نیک چووە دەر و لەکاتێکدا درگای قەپات دەکرد، دیتی ئاندێرسۆن هەروا بەجل و بەرگەوە لەسەر تەخت درێژبووەو لە دیوار ڕاماوە.
لەخوار پلیکانەکان، خاتوونی خاوەن ماڵ گوتی: لەبەیانییەوە لەژوورێ دایە، پێم وایە نەخۆش بێت. من پێم وت، جەنابی ئاندێرسۆن بۆ ناچن بۆ دەرێ و لەڕۆژێکی ئاوا خۆشی پایزدا پیاسە ناکەن، بەڵام ئەو حەز بە پیاسە کردن ناکات.
-: گەرەکی نییە لە ژوورێ بچێتەدەر.
ژنە گوتی: بەداخم لەوەی کە وەزعی باش نییە، پیاوێکی زۆر باشە. ئەو پێشتر کێبەرکێی دەکرد، دەزانی؟
-: بەڵێ.
-: ئەو شتە ئاوا لێی دیار ناکات، مەگەر سەیری دەم و چاوی بکەی. پیاوێکی زۆر هێورە. ئەوان لەدەرەوەی ماڵ، لای شەقام وێستابوون و قسەیان دەکرد. لەپاشان نیک گوتی:
دەی، شەوخۆش خاتوو هیرچ.
ژنە گوتی: من خاتوو هیرچ نیم، ئەو خاوەنی ماڵەکەیە، بەڵام من تەنیا بەڕێوەبەری ئێرەم، ناوم (بێل)ە.
نیک گوتی: شەوخۆش خاتوو بێل.
-: شەو خۆش.
نیک بەپێیان لەتاریکاییدا بۆ لای گڵۆپ چوو و پاشان درێژایی شەقامی گرتەبەر تاوەکو گەیشتە ژووری خواردنگە. جۆرج لە پشتەوەی شووشە بەندەکە لێی پرسی:
- چاوت بە (ئال) کەوت؟
نیک: بەڵێ، لە ژوورەکەی دابوو و لەماڵ نەدەهاتەدەر.
چێشت لێنەر کە گوێی لە دەنگی نیک ببوو، دەرگای کردەوە و گوتی:
«من هەر گوێ لەو شتانە ڕاناگرم». و ئینجا دەرگای داخست.
جۆرج پرسیاری کرد: سەبارەت بەوشتە بۆت باس کرد؟
نیک: بەڵێ، ئاگای لە هەموو شتێک بوو...
-: دەیهەوێ چ بکات؟
-: هیچ.
-: دەیکوژن.
-: منیش وابیردەکەمەوە، بەڵێ.
-: حەقەن لە شیکاگۆ تووشی ڕووداوێک بووە.
نیک: پێم وایە تووشی کارێکی گەورە هاتووە.
جۆرج نووشتایەوە و خاولییەکی بۆ خاوێن کردنەوەی شووشە بەندەکە هەڵگرت و گوتی:
(ئەوانەی بەدواییەوەی بوون، هیچ باسیان لەم شتە نەکرد.)
: پێم سەیرە! ئەو کابرایە چی کردووە؟ ئاخۆ ناپاکی بەکەسێ کردووە، لام وایە هۆیەکەی هەر ئەمە بووبێت کە دەیانهەویست بیکوژن.
نیک: من لەو شارە دەڕۆم.
جۆرج: بەڵێ، کارێکی باش دەکەی.
-: ناتوانم بیر لەوە بکەمەوە کە ئەو لە دیوەکەیدا چاوەڕوانە و دەزانێ کە دەیکوژن، تاقەت بهێنم. زۆر سامناکە.
جۆرج: باشتروایە بیری لێ نەکەیەوە.

**سەرچاوە:**

The Golden ARGOSY
printed in the united states of America
March 1956.

# پێداچوونەوە بە بیروڕایەک سەبارەت بە گۆرانی و مۆسیقای کوردیمان


وریا ئەحمەد
(هۆڵەندا)


بەر لەوەی هونەر جیهانی بێت، دەبێ نەتەوەیی بێ.
(خاچادۆریان)

پاش دوا نووسینم لە (ژمارە(١)ی گۆڤاری (هونەری نوێ)دا، هەندێ کەس تارادەیەک بە هەڵە لە هەندێ بیروبۆچوونم گەیشتبوون! (جا من ئەو مافە بەخۆم رەوا دەبینم کە لێرانەدا هونەرمەند (زەکەریا) بە نموونە بهێنمەوە (چونکە لە یەکێک لە خولەکانی مووزیک فێربووندا قوتابیم بووە و شایانی باسە، دواتریش پێکەوە مووزیکمان ژەندووە)! من یەکێکم لەو خەڵکانەی کە بە پەرۆشەوە گوێ لە بەرهەمەکانی گۆرانیبێژ (زەکەریا) دەگرم و بەڕای من ئەو هونەرمەندە جۆرە (هونەرکاریەکی نوێی گوتن)ی خستە سەر خەرمانی ئەوانەی زووترمان، ئەویش بەو شێوە گوتنە نوێیە کە هەرگیز ڕستەیەکی مووزیک دوو جار بە هەمان شێوە دووبارە ناکاتەوە، بەڵکو هەوڵ دەدات هەموو توانای قوڕگ و دەنگی بخاتە گەڕ و تا دەکرێت شیرینتر بیخوێنێت، (لەراندنەوەی دەنگ و جوانکاری و فۆرتێ و پیانۆ بەکارهێنان و فێبراتۆ و...تاد) بەشێوەیەک هەموو هەست و هۆشی گوێگر بۆ لای خۆی ڕابکێشێت؟ ئەمە جگە لەو مووزیکەی کە بۆی دەژەنرێت کە لووتکەی جوانکاری و هونەرمەندی تیادا بەدی دەکرێت، ئەو مووزیژەنانە بلیمەتن و ژیانیان لە ڕێگەی مووزیژەنینەوە دابین دەکەن و شەو و ڕۆژ پیشەیانە و ڕۆژ دوای ڕۆژیش هونەر کاری نوێ دێننە ئاراوە بۆ ئەوەی برەو بە هونەرەکەیان بدەن و گرووپی دی، نەتوانن دەستیان لێ بستێنن! بەتایبەتی ئەو مووزیکەی لە دوایین دوو (CD) لە تورکیا بۆی ژەندراوە، بەڵام ئایا ئەو مووزیکە کوردییە؟ کەسێکی (هۆڵەندی) هەیە بەناوی (San Graatsma) ئەو کەسەم لە ڕێگەی ڕێکخراوی (AIDA)وە ناسی. کاتێک ساڵی (١٩٩٨) بووم بە ئەندامیان و ئەوانیش داوای (SAN)یان کرد و ڕۆژی دیاریکراو هات و لە بارەگای (AIDA) لە (ئەمستردام) چاوپێکەوتنێکی لەگەڵا کردم و بڕیاریان دا کتێبی یەکەمم واتە (ئامێرەکانی مۆسیقای کوردی) وەربگێڕن بۆ سەر زمانی (هۆڵەندی). هەر ئەو کەسەش بوو دواتر یارمەتی دام لە دامەزراندنی گرووپێکی مووزیکی کوردی لە (هۆڵەندا) و ناوم نا (گرووپی شەهابە)، ئەو پیاوە لە بارەگاکەیدا ژوورێکی نیشاندام، چەندین هەزار (CD)ی میللەتانی ڕۆژهەڵاتی تیایە و تارادەیەکی باشیش ئاگاداری گرووپ و مووزیژەنە باشەکانی ڕۆژهەڵاتە بۆ نموونە (رافی شانکار کە مووزیژەنی وڵاتی هیندوستانە و مونیر بەشیر عوودژەنی عیراقە و گرووپی کامکاری خۆشمان دەناسێت) لە یەکێک لەو سەفەرانەمان لەگەڵ هونەرمەند (شازاد خانم) بۆ لایان یەکێک لەو (CD)یانەی (زەکەریا)م بۆدانا؟ کەچی یەکسەر گوتی ئەمە (تورکی)یە؟! کەواتە من وەک هەندێ کەس وا لێم تێگەییون، من ناڵێم ئەو بەرهەمانەی لە (تورکیا)یانیش (ئێران) تۆمار دەکرێن هەموویان هونەری نین یان خۆش

نین، بەڵکو دەڵێم (کوردی نین)!؟ هونەرمەند (زەکەریا) وەک گوتم قوتابی خۆمە و لەوەتەی لە دەرەوەم زیاد لە جارێک تەلەفۆنی بۆ کردووم و ئاواتیشی خواستووە لە نزیک یەک بووینایە و ئاوازم بۆی دانابایە، بەش بەحاڵی خۆم (زەکەریا) بە قوتابخانە دەزانم، چونکە ئەمڕۆ زیاد لە یەکێک لەسەر شێوازی ئەو دەڕۆن، مەبەستم ئەو (ئەداکردن)ەی ئەو دەیکات (کە لەگوتنی کوردیدا نوێیە)، هەوڵدەدەن بیکەن و هەندێکیان تیادا سەرکەوتنیشیان وەدەست هێناوە.

بەڵام وەک ڕۆژهەڵاتناس (تۆما بوا)ی فەرەنسی نووسیویە (سەردەمی ساسانیەکان کوردان لە شارستانیەتی مووزیکا دەستی باڵایان هەبووە و میللەتانی دەر و دراوسێش سوودیان لێ وەرگرتوون؟!) کەچی لەگەڵ بە ئیسلام بوونی کورد، وەک شەهیدی نەمر مامۆستا (شاکر فەتاح) فەرموویەتی: (کورد ئامێرەکانی مووزیکی خۆیان پشتگوێ خست و هەندێ کەسی ناشی و نەفامیش وایان خستە گوێی خەڵکی سادەوە کە گوایە، (نەک هەر مووزیک ژەنین بگرە، گوێگرتنیش لە مووزیک حەرامە و خواوەند حەزی لە مووزیک نییە). و...تاد لەو قسە حەلەق و بەلەقانە؟

ئەوکاتەی قەشەی فەرەنسی باسی لێوە دەکات، گەر هەڵە نەبم پێش (١٤٣٠) ساڵێک پێش ئەمڕۆکەیە؟! کاتێک کورد بە گوێرەی قسەکەی (تۆما بوا) خاوەنی ئەو ئاستە بەرزەی مووزیک بووە، جارێ (تورک) نەهاتبوونە ئەو شوێنەی ئەمڕۆ ناوی (تورکیا)یە، کەچی دوای ئەو سەدان ساڵانە ئەمجارەیان، ئێمە بێین لاسایی ئەوان بکەینەوە... سەیرە؟!

شتێکی لۆجیکە گەر پارچە زەوییەکت نەبێت، ناتوانی باڵاخانەیەک بەرزکەیتەوە؟ بۆیە هونەرمەندانی نەوەی ئێمە لە کۆتایی شەستەکانەوە بەر لە ئێمەش هونەرمەندانێکی وەک نەمر (قادر دیلان) و هاوەڵانی، هەوڵیان داوە ئەو زەمینەیە کە ساڵەهای ساڵە وەک خاوەنەکەی لەژێر هەڕەشە و گوشار ڕاونان و ماڵ وێران کردن و قەتل و عام دابووە و، بە هەوڵی شوانی شمشاڵژەن و دەروێشی دەفژەن و زوڕناژەن و دەهۆڵ کوتی شایی گەرم کار و گۆرانیەکانی ڕەسەنی دروێنە و دەستاڕ و مەشکەژەنی و جلیتانێ و گۆرانی نزمگری شایی سووسکەیی و چۆپەیی و شێخانی و گوڵشێنی فەقێیانی و ئایشۆکێ و هەزار و یەک نەزمی دی، هەروەها ئەو گوتن و شێوە گوتنە ڕەسەنانەی کە بەدەنگی کەڵە هونەرمەندانی وەک (سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی و سێوە و کاویس ئاغا و مەلا کەریم و سەعیداغای جزیری و مریەم خان و دایکی جەماڵ و..تاد)... سوودیان لێ وەرگرین و هەوڵی ئەوە دەدەین لەسەر ئەو بناغە ڕەسەن و خۆماڵیانە شتی نوێ دروست بکەین و باڵاخانەی هونەری خۆمان ڕۆژ دوای ڕۆژ جوانتر و باڵاتر و پان و بەرینتر کەین. هەرواش بوو لە حەفتاکان لە هەر تیپێکی مووزیکدا، لیژنەی هونەری هەبوو بۆ ئەوەی بڕیاردات کام ئاواز دەبێ نیشان درێت و کامەیشیان جارێ نا، هەوڵمان دەدا لە ئاوازی نوێدا تا دەکرێت ڕیتمی کوردی بەکاربێنین، ئەمڕۆ دوای ماوە ڕەخسان و تێکەڵبوونی هونەرمەندانی بەشە جیاجیاکانی نیشتمانی بەش بەشکراو، چەندین ڕەزمی کوردیمان بە گوێ ئاشنابوو کە تا ماوەیەک لەمەوبەر هیچ خەبەرێکمان لێیان نەبوو، واتە ئەمڕۆ گۆڕەپانی ئاوازدانان لەبارتر و پڕ کەرەستەترە لە ساڵانی زوو، هەروەها ئامێری ڕەسەنی کوردی وەک (باڵەبان و نەی و تاڕادەیەک فلووت، چونکە دەنگی نزیکە لە دەنگی شمشاڵی ئاسن و کلارنێت کە دەنگی نزیکە لەباڵەبانی زڕو و تەنبوور و سەنتوور و بەربەت (عوود) قانوون و زەرب و دەفی دەروێشی و دەهۆڵ و دوو تەپڵی و سەنج و.. تاد سوڵۆیان ببێت، هەروەها تا بکرێت ئاوازەکان تام و بۆ و ڕوخساری کوردییان پێوە دیاربێت!

هەر میللەتێک کولتووری خۆی هەیە و جیایە لەهی میللەتێکی دی! هونەرمەندانی ناوداری دنیا هەمیشە هەوڵیان داوە پارچە ئاوازی ڕەسەن بخەنە ناو کاری مەزنیان هەر بۆ ئەوەی مووزیکیان ڕوخساری نەتەوەیی پێوە دیاربێت بۆ نموونە پارچەی چوارەمی سیمفۆنی ژمارە(٩)ی (بتهۆڤن) بریتییە لە ئاوازێکی ڕەسەنی ئۆستەری کە لەلایەن (کوڕ)ەوە دەگوترێت، هاتووە پەرەی پێداوە و بۆی زیاد کردووە و دەوڵەمەندی کردووە، هەر بۆ ئەوەی کارەکە ڕوخساری خۆماڵی لەخۆ بگرێت!

ساڵەهای ساڵە کورد هەوڵی ئەوەیەتی ببێتە خاوەن دەسەڵات بەسەر ماڵ و موڵک و زەوی و بەراوی خۆیدا بتوانی ئەو کەرەسە خاوانەی هەیەتی بۆ بەرژەوەندی و خێروخۆشی خۆی بەکاریان بهێنێت و بەشداری بکات لە تەک هەموو مرۆڤایەتیدا، بۆ خێر و خۆشی و هێنانەدی جیهانێکی پڕ ئاسوودەگی و دوور لە چەوساندنەوە و بە زۆر سەپاندنی زوڵم و ناڕەوایی بەسەر خەڵکدا لە هەر ڕەگەز و ئاینێک و دەڤەرێک بن، جا کوردستان تایبەتمەندی خۆی هەیە.

بۆ نموونە کەسێک کە لە (بەغدا)وە بەرەو (هەولێر) یا (سلێمانی) دەکەوێتە ڕێ، هەر زوو لە (حەمرین)ەوە هەست بە گۆڕانی عاردی ژێری دەکات کە لە (ناوچەیەکی

بیابان)ەوە بەرەو (هەوراز و گردو شاخ)، هەڵ دەخشێت و لە چایخانەکەی (دووزخورماتوو) شەوە، سەیر دەکەیت زمانیش گۆڕا و هەواش نەختێ فەرقی کرد و، جل و بەرگیش هەمان جل و بەرگی خەڵکی بەغدا نییە و...
ئیتر! ئەی کەوایە بۆچی لە ڕادیۆی چایخانە و چێشتخانەکانیشەوە، گوێمان لە گۆرانی ڕەسەنی خۆماڵی نەبێت کە بەدەست و پەنجەی مووزیژەنانی خۆمانەوە ژەنرابن؟ بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە ئێمە خاوەنی مووزیژەنی پەنجەزێڕینین و نەتەوەیەکی جیاین من حەز دەکەم بە هونەرمەند (زەکەریا) و ئەوانەیش کە لە ئاستێکی بەرزی هونەردان، بڵێم (من بەهیچ جۆرێک خوانەخواستە مەبەستم ئەوە نییە لە نرخیان بێنمە خوار، بەڵکو لە دڵەوە حەز دەکەم ئێوەی بەهرەمەند کە خەڵکی بە پەرۆشەوە گوێتان لێ دەگرن، وردتر و وشیارترین! ئەمڕۆ من وەک کەسێکی دڵسۆز بۆ هونەری گوتن و مووزیکی نەتەوەکەم و وەک هونەرمەندێکی خاوەن ئەزموون، داواتان لێدەکەم ئەم قسانەم بە وردی بخوێننەوە و گەر بە دڵیشتان نییە با گوێم لە وەڵامتان بێت، چونکە ئەمە هونەرە و موڵکی میللەتێکە و ڕۆژگاریش ناوەستێت، وەرن با خەڵک بەهونەری ڕەسەنی خۆمان گۆش بکەین، بە تایبەتی منداڵ کە گوێچکەی وەک کاغەزێکی سپییەو هەر چییەکی بەرگوێ کەوێت (بەتایبەتی هونەری بەرز) دەیقۆزێتەوە، منداڵ هۆشی ئەوەی نییە بزانێت کام گوتن و مووزیک ڕەسەنە و کامەیشیان فڕی بەسەر تام و بۆ و مۆرکی کوردەوارییەوە نییە، بۆیە تا زووە و کارەکەش لە سەرەتا دایە با سنوورێکی بۆ دابنێین و هەوڵدەین بگەڕێینەوە ناو باوەشی (لاوک و حەیران و هۆرە و ئای ئای قەتار و پایزە و بوهار و گەلۆ و نیوەشەو و ئەوەلسەحەرە و ئەڵلاوەیسی و خورشیدی و مەنسووری و سەفەر و هیجران و یار غەزال..تاد. لەلایەک و لەلایەکەی دی سەدان گۆرانی ڕەسەن و فۆلکلۆریمان وگۆرانی ڕەسەنی گۆرانیبێژە نەمرو دێرینەکانمان... بکەین بە بەردی بناغە بۆ هونەری نوێمان بۆ ئاوازی لە دایکبوومان بەدەست و پەنجەی دەیان مووزیژەنانی بلیمەتی خۆمان.. بۆ بنیاتنانی هونەری نوێمان و پەروەردە و گۆشکردنی گوێچکەی نەوەی نوێمان بە هونەری ڕاستەقینە نەک لاساییکاری و خزمەتکردنی شارستانیەتی گوتن و مووزیکی میللەتانی دی کە خۆیان خاوەنی هونەرن و پێویستیان بەوەی ئێمە نییە و منەتباریش نین؟!



# (محەمەد عارف)ی هونەرمەند (١٩٣٧)

بورهان هەژار
(ئەڵمانیا)

هەروەک بەڵێنمان دا هەر جارەی کورتە نووسینێکی هونەری لەسەر نیگارمەندێکی بەتوانا و لێهاتووی هاوچەرخمان بنووسین و کەمێک لەسەریان بدوێین، کە لە نێوەندی بزاڤی شێوەکاری هاوچەرخماندا ئەسپی سەلیقەیی و بەهرەی ڕەسەنی بەپێزی خۆیان تاوداوە و بوونەتە کۆڵەگەیەکی ئەستوور و پتەو لە جۆشدانی چالاکی و هەبوون و ئامادەیی بەردەوامیان لە ڕەوتەکەدا هەبووە، بەبێ پسانەوە.. کە ئامانجی هونەرییان کردۆتە ئاوێنەیەکی گەشی ڕاستەقینە لە ڕەنگدانەوەی دیاردە و سیما گەشەکانی کولتووری نەتەوەکەیان کە گوڕوتەکانێکی بەهێزیان بەخشیوەتە گیانی پیرۆزی هونەر و بەهرەی ڕەسەن و خامەی پڕ بەهایان شەپۆلی تەوژمەکەیان بەرفراوانتر کرد، کە فەرهەنگی مێژووی هاوچەرخ بەرێز و نەوازشەوە لە ئامێز و هەناویان بگرێت.. سەرباری وی، ئاشکراشە کە بزاڤی هونەری شێوەکاری هاوچەرخمان هێندە تەمەن درێژ نییە و مێژووەکەی وەک هەوڵ و کۆششی تاکوتەرا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ساڵانی (١٩٠٠).. ئەویش بەشێوەیەکی سست و پچڕ پچڕ، کە چەند نیگارمەندێک، لێرە و لەوێ بە هەوڵی تاکی خۆیان برەویان بەم میتۆدە هونەرییە داوە.. گەرچی تاڕادەیەک بە دوور بووە لە بنەما زانستییەکانی هونەر و خۆڕسکی بوون.. لەگەڵ ئەمەشدا تا ئێستا هیچ هەنگاوێکی زانستی و ئەکادیمی بۆ نەنراوە لە نووسینەوەی ڕووکارێکی مێژووییانەی هاتنەکایەوە و دەستپێکردنی لە تۆکمە بوون و بناخە داکوتینی بزاڤی شێوەکاری هاوچەرخ، بەشێوەیەکی زانستی ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی تیروتەسەلی سەبارەت خرابێتە ڕوو.. دەتوانین بێژین بە ڕاشکاویش پێ لەسەر ئەوە دابگرین سەرباری ئەم تەمەن کورتییە بە بەراورد لەگەڵ هونەری وڵاتانی دراوسێ و دنیا کە هێشتا هونەرمەندانی داهێنەر و ڕەسەنمان کەمە و هەنگاوی پڕ بە پێستی تەواوی بۆ نەنراوە کە ڕەهەندەکە پانتاییەکی بەرفراوانتری داگیربکردایە، لە دەرکەوتنی تایبەتمەندی و مۆرک و ناسنامەیەکی سەربەخۆی نەتەوەیی وەلێ هەرگیز خامە و پەردموچی چەندان هونەرمەندی بەتواناش لەبیرناکرێن لە نێوەندەکەدا، کە دەلوێ بە کۆڵەگەی ڕاگری بزاڤەکە

بژمێردرێ و بەرهەم و شاکارەکانیان گەواهی ئەم ڕاستییەمان بۆ دەسەلمێنن.. ئیدی ئەمجارە باسێک لەسەر هونەرمەندی خامە ڕەنگین و بە سەلیقەی بەهرە ڕەسەن مامۆستا «محەمەد عارف سیامەنسووری» دەخەینە ڕوو.

## هەنگاوەکانی سەرەتا

ئەم هونەرمەندە مەزنە خامە ڕەنگین و بەهرە ڕەسەنە بە درێژایی زیاد لە چل ساڵی تەمەنی خەبات و تێکۆشانی نەپساوەی، بە بەردەوامی بوون و ئامادەیی خۆی بە دیارخستووە لەبەردەم جەماوەری هونەردا و خاوەنی زەمینەیەکی پانوبەرینە لەنێوەندی بزاڤی هونەری شێوەکاری هاوچەرخدا و دەتوانین بێ دوودڵی و گومانێک، ببێژین کە محەمەد عارف تاکە هونەرمەندێکی نیگارمەندی شۆڕە سوار و بە سەلیقەیە کە هەنگاوی لەسەر بناخەیەکی ئەکادیمی و زانستییانە، نابێت.. کە هەڵگری ڕەسەنی خۆماڵی بێت لە بەرجەستەکردن و «تەوزیف» کردنی بەرهەمی هونەری لە ڕووی چۆنیەتی خوڵقاندنی کەشوهەوایەکی جوانکاری بە پێز کە گشت بنەما هونەرییەکان ڕەچاو بکات.. وەک گرنگیدان و سەربەستی بە بەهاو جوانکاری و گرێدانی پێوەندی شێوە و ناوەرۆک لە دەربڕین و گوزارشت کردنیان ئەگەر چی خولیا و ئەشق و تامەزرۆبوونی کاری هونەری لای «محەمەد عارفی» هونەرمەند دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی پەنجاکان کە دەچێتە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا، کە ئەویش زیاتر بەهاندان و یارمەتیدان و برەودانی بە هونەر لەلایەن هونەرمەندی بەتوانا و لەخۆبووردوو مامۆستا «سلێمان شاکردەوە» بوو کە ئەوکاتە، «سلێمان شاکر» بەهرەمەندتر و شارەزاتر بوو لە «محەمەد عارف» ئەمەش ڕێگە خۆشکردن و والایەک بوو لەبەردەم و فراوانبوون و گەشەکردنی ئاسۆی هونەری کە ئیتر بە تەواوی سەرقاڵی کاری هونەر بێت و بەناخ و بنج و بنەوانی ئەم دەریا قووڵە هەنگاوبنێت و بینای خۆی بخوڵقێنێ... هەوڵدانی بەردەوام خۆ خەریککردن بەکاری هونەری نیگارسازییەوە ئەو ڕاستییەی لای هونەرمەند سەلماند کە دەبێت لە ئایندە نیگارمەندێکی نموونەیی لێ دەربچێت و زۆر سەرکەوتووانە خوێندنی هونەر تەواو بکات. ئەم پەروەردە بوون و خۆگەشکردنە لەبەردەوامی گەڕان و سەرقاڵی بوونی بە هونەرەوە، ئەزموونێکی بە برشتی پێبەخشی کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە نهێنییەکانی هونەر بگات و سەرەتا هەنگاوەکانی بەچڕوپڕی بنیات بنێ و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی بە بڕوا و هێزێکی پتەوەوە ببڕێت. وێڕای ئەمانەش ناشکرێ نکۆڵی لە هەڵکەوتنی بارودۆخی ژیانی خێزانی و بنەماڵەیی هونەرمەند، لە بیربکرێت کە ئەو دەرگایەی لەبەردەم کردەوە بۆ برەودان و نزیکبوونەوە لەو کەشوهەوا ڕۆشنبیرییە، لەسات و ڕۆژگارێک کە هێشتا کۆمەڵگای کوردی پابەندی سیستەمێکی کۆنەپەرست و دواکەوتوو بوون. هیچ نرخێک بۆ ئەم کارە پیرۆزە بە هەند نەگیراوە.. هەڵبەتە لە ڕۆژگاری «محەمەد عارف» خوێندنی لەسەر دەستی کۆمەڵێ لە مامۆستا و لە هونەرمەندانی ئێراقی وەک «جەواد سەلیم، فایەق حەسەن، حافز دروبی و فەرەج عەبود»..تاد. تەواو بکات و سوودێکی باشیان لێ وەربگرێت و لەو قۆناخە ڕەگوڕیشەی تەواو (دابکوتێ) و بەشێوەیەکی دروست لە چەمکی هونەریدا بگات و وەچەرخانێک لە ژیانی هونەری دروست بکات.

بە دەستهێنان و تەواوکردنی خوێندنی پەیمانگا بە پلەی «ئیمتیاز» لەبەردەم کەسێکدا کە هەموو تەمەنی هونەری تەنیا ئەو «پێنج» ساڵەی خوێندنی پەیمانگای بووبێ، دیارە هەروا کارێکی سانا و سەرپێی نەبێ و دەبێت بەهرەیەکی ئەزەلی و خۆڕسکی شاراوەی لەخۆگرتبێ کە پێشتر هەستی پێنەکراوە چ وەک خودی خۆی یان ڕەنگدانەوەی لە دەرەوەی کەسایەتی لە بابەتدا.. گەرچی هونەریش بە تەنیا بەهرە نییە و هەروەها ڕاهێنان و بەردەوامی.. بەڵکە دوو جەمسەری گرێدراون و یەکتر تەواو دەکەن.. پاش چەند ساڵێ لە تەواوکردنی خوێندن و بوون بە مامۆستا، تامەزرۆیی و پەرەسەندنی ئاستی هونەری هونەرمەند لە گەشەکردن و هەڵچوونابووەو بەرەو ڕەهەندێکی گەش و بەرفراوانتر کە بتوانێ هەل و فرسەتێک بخوازرێ بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا.. ئەو ڕۆژگارەی ژیانی کوردستان و ئێراق کە گۆڕانکارییەکی «ڕیشەیی» بەسەردا هاتبوو بە هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی نوێ و ئەمانی ڕژێمی پاشایەتی و هوشیاربوونەوەی خەڵک، شەپۆلی چوونە دەرەوە بۆ خوێندن بەرەو وڵاتانی ئەورووپا دەرگایەکی فراوانی خستە سەرپشت لەبەردەم هەموو کەسێکدا لە گشت لایەنەکانی خوێندندا... «محەمەد عارفی» هونەرمەندیش ئەو هەلەی لە کیس خۆی نەدا وەک هەزاران قوتابی تر کە هەنگاو بنێت بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە دەرەوەی وڵات و بتوانێ خزمەتێکی سەرکەوتووانە بە هونەری شێوەکاری کوردی بەخشێ.



## دنیای دەرەکی و هەنگاوی ئەفراندن

گەیشتنە یەکێتی سۆڤێت و وەرگرتنی زەماڵەی خوێندن بۆ ماوەی (٦-٧) ساڵ بۆ مامۆستا «محەمەد عارف» بە قۆناخێکی گرنگ و ئەزموونێکی دەوڵەمەند دەژمێردرێ.. کە بە ڕاستی بە «بازدانێکی هاو جۆری» دەناسرێ و توانی جەسوورانە و سەربەرزانە سوود لەو دنیا دەرەکییە وەربگرێ لە خوێندنی هونەر و چاو بە گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی هونەرییدا هەڵبێنێ لە چەمکی هونەری وڵاتانی یەکێتی سۆڤێت کە پێشەنگی قوتابخانەی ڕیالیستی سۆسیالیستی بوون لە جیهاندا. ئاشکرێ تەبایی و هاونزیکی هزر و ئایدیۆلۆژییەتی «محەمەد عارف» لەگەڵ ئایدیۆلۆژییەتی ڕژێم و هاوڵاتیانی سۆڤێت بە دوور بگرین بەتایبەتیش ڕێباز و قوتابخانە هونەرییەکەی «ڕیالیستی سۆسیالیستی» کە زادەی هزری هەڵهێنجراوی فەلسەفەی مارکسیزمە، کە ئەوکات سیستەمێکی کۆمۆنیستی بە باڵایاندا بڕابوو.. لێرەشدا من مەبەستم لەوەنییە کە بێژم، گوایە هونەرمەند «کۆمۆنیست» بووە.. گەرچی لە هەمان کاتدا هەموو مرۆڤێک سەربەست و ئازادە لە چۆنیەتی هەڵبژاردنی بیر و هزر و فەلسەفەی ژیانی.. ئالێرەوە هەنگاوی ئەفراندن و شۆڕبوونەوە لەسەر بنەمایەکی پتەو دەرکەوت و ئاستی داهێنانی بەرهەمێکی ڕەسەن تەقییەوە.. کە مۆرک و ناسنامەیەکی هونەری خاوێن بنەخشێنە گیانی شێوازی تایبەتمەندی خۆی کە هەڵگری سیمایەکی نەتەوەیی تێدا بەرجەستە بکات.. ئەمیش برەو و گرنگی خۆی بە ڕێبازی «ڕیالیستی سۆسیالیستی»دا، لە بەکارهێنانی زمانی دەربڕین و گوزارشت لە بەرهەمەکانیدا.. ئەمە وێڕای کاریگەری هونەری سۆڤێتی بەسەر هونەرمەندەوە کە زیرەکانە توانی سوودیان لێ وەربگرێت و هونەرمەندانە بەهرەی ڕەسەنی خۆی تیاشەن بکات و شێوازی خۆی تێدا بڕژێت. ئەز پێموایە «محەمەد عارفی» نیگارمەندی ڕەسەن تاکە هونەرمەندێکی کوردە تا ئێستا بەشێوەیەکی ئەکادیمی و زانستی ئاوڕی لە بووژاندنەوەی داستان و بەسەرهاتە مێژووییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی کوردیدا بێتەوە و زۆر سەرکەوتووانە بەخامە و بەهرە ڕەسەنەکەی چەندین بەرهەم و شاکاری نەخشاندبێ و گیانی نەمری و زیندووبوونەوەی بەهاونرخی ناوەڕۆکی ئەو بابەتانەی پاراستبێ، کە بە شێوەی دیمەنی تراژیدی ڕووداوی داستانەکانی خستۆتە ڕوو... ئیدی ئەمەش دەلالەت لە زیرەکی و شۆڕبوونەوەی ئاگایی و زانیاری و بەڵەدی تەواوی هونەرمەندە لەسەر هەندێ لە ڕووداوەکانی ڕەوتی مێژوویی نەتەوەکەی.. دەبینین هەر لە ساڵانی خوێندنی باڵای لە مۆسکۆ چەندین تابلۆی نیگاری قەڵای دمدم و (قارەمانێتی سەلاحەدین و مەم و زین) و چەندانی تر لەبەرهەمی بەپێزی ڕیالیستی کە باس لە پاڵەوانێتی مرۆڤی کورد و شۆڕشگێڕێتی و حەز بە ئاشتی ژیان و لایەنی کۆمەڵایەتی و نەداری و هەژاری.. تاد دەکەن. سەرەتای شێوازی هونەری نیگارمەند بە هۆگری و خۆشەویستی ڕیالیست بووە کە ئەمەش هاوگرێدراوی بنەمای هزری فەلسەفەی خودی خۆی بووە و لەو دەلاقەیەوە تێڕوانینی هەژاندووە. پاشان لە قۆناخێکی تردا بەرەو ڕیالیستی سۆسیالیستی هەنگاوی ناوە و بەرهەم و شاکارێکی زۆری بەرهەم هێناوە. ئەمە سەرەڕای بە تەنگەوە هاتن و سوود وەرگرتنێکی زۆری لە دیمەنی سروشتی ڕەنگینی کوردستان لە زۆربەی کاروبەرهەمە هونەرییەکانی. لێرەدا دەلوێ ئاماژە بۆ وتەیەکی جوانی «لیۆنارد دافنتشی» بلیمەت بکەین کە دەبێژێت «گەر متمانە نەکەیتە سەر سروشت ئەوا کارەکەت بێ کەڵک دەبێت» بەواتا سروشت خۆی لە خۆیدا بۆ هونەرمەند و نیگارمەندی خامە ڕەنگین سەرچاوەیەکی بەکەڵک و سوود بەخشە لە چۆنیەتی پەیداکردنی شارەزایی و توانایی و هێزی دەسەڵات شکاندن بەسەر گرنگی مامەڵەکردنی ڕەنگ و خوڵقاندنی

بەهاو جوانی و دەستەبەرکردنی چێژی ڕەنگ لەهاوجووت بوون و پێوەندی و دارشتن لە فەزای دیمەنەکاندا.. بێگومان ئەم سیما گەشەش لە تێکڕای بەرهەمە بە پێزکانی هونەرمەندەوە دیار و ئاشکرایە لە دەوڵەمەندبوونی ئەزموونی بەپێزی. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بیێژین کە بە ڕاستی هونەرمەند، لێهاتووانە پانۆرامایەکی موزیکی لە دوو توێی تابلۆکانیدا بهەژێنێ و هەستی بینەر بەرەو پانتاییەک لە خەیاڵ و خەنیبوون بەرێت. کە دڵرفێنی و نەشئە ئامێزی بگرنەخۆ، کە ئەمەش ئەوپەڕی تواناو سەلیقەیی سیحری هونەری بەهرەی هونەرمەندە لە کارەکانیدا لە چۆنیەتی بەستنەوەی یەکەیەکی بابەتی.... دەبینین زمانی دەربڕین و ڕاستگۆیی، بناخەی هەنگاونان و داهێنانی بەردەوام و نەپساوی هونەرمەندە لە شۆربوونەوەی بە گەڕان و پشکنین و سۆراخبوونی لە نهێنی گەیاندنی پەیامەکەی بە جەماوەر. هونەرمەند پەروەردەی ڕیالیستێکی کۆمەڵایەتی ناو کۆمەڵگایەکی کولتووری ئیسلامی و ڕۆژهەڵاتییە، ئەویش کۆمەڵگای کوردییە. هەرگیز ئامادە نییە بە هونەرەکەی نامۆیی و دوورکەوتنەوە لەنێوان خودی خۆی و هونەرەکەی لەلایەک و جەماوەر لەلایەکی ترەوە دروست بکات.

هەتا ناتێگەیشتن و دوورە پەرێزییەک بسازێنێ.. زمانی ڕاستەقینە لای هونەرمەندا ڕەنگدانەوەی ژیانی ریالیست و باری کۆمەڵایەتییە کە زمانێکی پاکی گوزارشت لە هەناوید بهەژێنی کە هاوشانی چمکی بیرکردنەوە و تێڕوانینەکان بێت لە پێچەوانە کردنەوەی دیاردەکان بە ڕوونی لە بەرگێکی هونەریدا کە داهێنان بە دووی خۆیدا ڕاپێچ بکات، هەر بۆیە دەتوانین زۆر بە ڕاشکاوی ئاماژە بەوە بکەین کە هونەرەکەی «محەمەد عارف» گەواهی سەردەمەکەی خۆیەتی و هاوتای بزاڤی ژیانی کۆمەڵگای کوردی هاوچەرخە..

پاش تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە مۆسکۆ و هاتنەوەی بۆ وڵات بە بڕوانامەی «ماستەرەوە»، کە وەک ئەز بزانم یەکەمین قوتابی کورد بوو، کە لە ساڵانی شەستەکاندا چووە هەندەران و بڕوانامەی خوێندنی باڵای بەدەست هێنا... لە حەفتاکانیش بوو بە مامۆستا لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدا و چەندین قوتابی باش پەروەردە کرد و بەردەوام بوو لە بەخشش و داهێنان و گەنجینەیەکی بەپێز و دەوڵەمەندی خستە سەر بەرهەمی هونەری کوردی، یەکێ لەو بەرهەمە دانسقانە کە مێژووی هونەری شێوەکاری هاوچەرخی کوردیمان، سەری ڕێز و نەوازشی لە ئاست دادەنەوێنێت... نیگای تابلۆی «دوازدە سوارەی مەریوان»، کە ئەوپەڕی ئەفراندنی لەخۆ گرتووە بەشێوەیەکی بازنەیی لە ئاستی بینینی بەرەو خوار کە سەلیقەیی و هێزێکی بە توانای تێدا دەرخستووە لە دارشتنی تاکێتی فۆرمی کەسەکان و دەرکەوتنی هێڵی دەرەکی نیگارەکان کە بە هاوسانی و ڕێکوپێکی دیمەنەکە دارێژراوە، ئەوە وێڕای بەهای هونەری و هێزی جوانکاری بەرهەمەکە لە ڕووی پێوەندی ڕەنگ و تێکرژانی فیگەرەکان بە یەکتری... ئەم تابلۆ بە نرخە گیانی داهێنانی بە ئەزموونی هونەرمەند بە پێزکرد لەسەر ئاستی هونەری ئێراقی و کوردی. ئیدی گەر بمانەوێ ئاوڕێکی تێروتەسەل و وێژدانانە لە تەک تێکڕای خەبات و هەوڵ تێکۆشانی نەپساوی ئەو قۆناخە دوورو درێژەی لەمەڕ هونەرمەندی ڕەسەن و بلیمەت «محەمەد عارف» بڕۆین، پێویستمان بە نووسینێکی زۆرتر و هەڵسەنگاندنێکی ورد و زانستییانەتر هەیە کە ئاماژە بۆ هەموو لایەنەکان بکەین. گەرچی زۆربەی بەرهەم و شاکارەکانی لە مۆزەخانەی نیشتمانی بەغدا و چەندین وڵاتی تر پارێزراون... ئەمانە تێکڕا شایەتی لێکۆڵینەوەی زانستی و ڕەخنەی بەپێزن کە ئاستی بەهرەی تێدا شەنوکەو بکرێ. ئەمە وێڕای ئاستی بەتوانای لایەنی ئەکادیمی نیگارەکانی کە چێژ و بەهای جوانکاری سەرکەوتووانەی پێکاوە و هاوتای ئەم لایەنەی لە بزاڤی شێوەکاری هاوچەرخماندا دەگمەنە و ئەم هونەرمەندە خامە ڕەسەنە زۆرتر هەڵدەگرێ لەسەری بدوێین و وێستگەیەکی لەسەر بکەین.



# فۆتۆگرافی دیجیتاڵی

**فارس سەعدی**

**(١-٢)**

بۆ ئەوەی زیاتر قووڵ بیتەوە لەنێو جیهانی وێنەگەری دیجیتاڵی، نابێ بەوەندە بوەستی ئەو شتە ئامادەکراوانەی لەناو کامیرای دیجیتاڵی بۆت دانراوەتەوە لەسەریان برۆی و پەیرەویان بکەی، بەڵکو هەندێ جار پێویستیت بەوە دەبێ هەندێ لە مۆدەکان واتە پرۆگرامەکان ئاڵوگۆڕی تیا بکەی، کارێکی وابکەی بەپێی ویست و خواستی خۆت وێنەکان بگری.

زۆربەی کامیراکان کلیلی پرۆگرامەکانی بە دوگمەی (Menu) دەکرێنەوەو دەچیتە نێو بڕگەکانی، هەرچەندە زۆربەی وێنەگران. ئەمەیان بەلاوە کارێکی سەختە، بەڵام ئاشکرایە هەر شتێکی نوێ مرۆڤ لە ئاستیدا ئەم حاڵەتەی بەسەر دێ، بۆیە چەند جارێک بەکاری بێنی ئولفەت لەگەڵی پەیدا دەکەی و لەگەڵی رادێیت.

یەکێک لە شتە گرنگەکان چۆنیەتی مامەڵەکردنە لەگەڵ گەرمی رەنگەکانی رووناکی، کە ئەمەشیان بە پرۆگرامەکانی (WB) وایت بەلانس چارەسەر دەکرێت، یان کەبسکردنی ئەو وێنانەی دەیگری تا زیاتر لەنێو بیرخەرەوە (Memory) کامیراکە جێیان بێتەوەو لەگەڵ چەند خەسڵەتی تر.

**ئەو شتانە چین کە بەکاردەهێنرێن؟**

* قەبارەی وێنەو ریزۆلیوشنەکەیان Resolution/ size

گەر بتەوێ وێنە بگری بە باشترین دیقەت، لێرەدا قەبارەی وێنەکە لەنێو پانتایی بیرخەرەوەی (Mem- ory) کامیراکەت جێگایەکی زۆر داگیر دەکات، بۆیە ناتوانی ژمارەیەکی زۆری وێنەی پێ بگری، بەڵام ئەم جۆرە وێنانە کە قەبارەکانیان گەورەیە، دەتوانرێن زۆر گەورە بکرێن لەکاتی چاپکردنیان بێ ئەوەی دیقەتیان لەدەست بدرێ و یا دەنک دەنکەو مۆزائیک لەنێو وێنەکە روو بدات.

بۆیە ئەگەر ویستت هەردەم وێنەی بەدیقەتی زۆر واتە (Fine) بگری پێویستیت بە بیرخەرەوەیەکی گەورە دەبێت جا لەشێوەی (Memory stick) بێت یان (Flash card) یان شێوەی تر وەک (cf card) بۆ نموونە فراوانی ئەو کارتانە [512 mb, 256 mb, 128mb, 64mb] ئەو ژمارانە نیشانەی فراوانی ئەو کارتانەن، تا چەند ژمارەکان گەورەتر بن هێندە جێی وێنەی زیاتر دەبێتەوە، کەواتە ئەگەر بە بەردەوامی وێنەی بەدیقەتی بەرز بگری واچاکە میمۆری (512) میگا بایتت هەبێ و بخەیتە ناو کامیراکەت، بەڵام ئەگەر وێنەی بەقەبارە پۆسکارت گەورە بکەی پێویستیت بە دیقەتی زۆر نییە، لێرەدا بیرخەرەوەیەکی کەمیش چارەسەری کێشەکەت دەکات.

وەک جۆری (64mb) میگابایت. دەبێ ئەوەش بزانی چەندێ ئەو کارتە فراوان بێت هێندە نرخەکەی گرانترە بۆ نموونە ئێستا (میمۆری ستیک)ێک کە فراوانییەکەی (512) میگابایت بێت لە (١٠٠) دۆلار بەسەرەوەیە.

تۆ دەتوانی گۆڕان لەنێو وێنەکانت بکەی، واتە هەندێ وێنەی گرنگ بەدیقەتی بەرز بگری، کە مەبەستتە زۆر گەورەیان بکەی، لە هەمان کاتدا بە دوگمە دیقەتەکە دەگۆڕی و کەم دەکەیتەوەو سایزی وێنەکە بچووک دەکەیتەوە بۆ ئەو وێنانەی دواتر وێنەیان دەگری. بۆ نموونە وێنەی بەدیقەتی بەرز سایزەکەی (١٩٢٠ × ٢٥٦٠) پیکسڵە، بەڵام بەدیقەتی کەمتر لەوەیە (٤٨٠ × ٦٤٠) پیکسڵ بێت و لەوەش کەمتر هەیە، ئەوانەی لەوە کەمترن دەست دەدەن بۆ ئەوەی بەنێو تۆڕی ئینتەرنێتەوە رەوانەی شوێنی مەبەست بکەی، یان بۆ عەرزی ئاسایی لەنێو شاشەی مۆنیتەری کۆمپیوتەرەکەت.

زۆرو کەمی ئەو پیکسلانە پێی دەگوترێ ریزۆلیوشن، ئینجا ریزۆلیوشنی بەرز دەبێ پیکسڵەکان زۆربن واتە دیقەتی وێنەکانیشی بەرز دەبنەوە، ئەو وێنانەی کە



ڕیزۆلیوشنەکانیان یەک ملیۆن پێکسڵە ئەمانەن دەست دەدەن بۆ ناردن بەنێو تۆڕی ئینتەرنێتەوە.

* فایل فۆرمات File formats

هەر چەندە ئەمەش دەکەوێتە ژێر خانەی کوالەتی وێنەوە لەمیانی مینۆ (Minu)وە دەستنیشان دەکرێ. ئەمە لە ڕیزۆلیوشن جیا دەکرێتەوە، ئەمە پێوەندی بە گەورەیی و بچووکی ئەو فایلەوە هەیە کە هەر وێنەیەکی لەسەر تۆمار دەکرێ، چونکە هەر وێنەیەک فایلێکی بۆ دەکرێتەوە، فایلەکانیش گەورەو بچووکیان هەیە بەگوێرەی جۆری داکردنی وێنەکان تیایاندا.

باوترین فۆرمات بۆ داکردنی وێنەکان لەسەر شێوەی (JPEG) دادەکرێن، لێرەدا وێنەکان بەشێوەیەکی ئاسان کەبس دەکرێن و هێنانە دەرەوەیان ئاسانە، جۆری کەبسکردنەکە بە چەند شێوەیەک دەبێت لەژێر چەند ناوێک (باش، باشتر، نایاب) ئەمانە لەناو (Menu)دا نیشان دەکرێن. لەحاڵەتی (نایاب)دا کەبس کردنەکە زۆر کەمە و وێنەکە زۆر زەرەری پێ ناکەوێ و ناشێوێ، بۆیە کوالەتی وێنەکە زۆر باش دەبێت.

ئەگەر میمۆریەکەی کامیراکەت جێی زۆر بگرێت یا جێی زۆری تیا بێتەوە واچاکە وێنەکانی دەگری بەم شێوازە لەژێر ئەم حاڵەتە وێنەکە بگری، چونکە بەم فایلە جێی زۆر داگیر دەکرێ. لەو کاتەی ئەگەر وێنەکانت زۆر کەبس کردن واتە زۆرت بردنە باریەکتری، لێرەدا کوالەتی وێنەکە زۆر لە دەست دەدرێت، کاتێک فایلی وێنەکە دەکەیتەوە ئەمە زیاتر لە ڕووبەرە ڕەنگە زۆرەکانی وێنەکە وەک شینایی ئاسمان بەدەردەکەوێ، هەست دەکەی بلۆکێکی شینی ئاسمان دەبینی نەک ئەو پلەپلەییەی کە لەنێو ئاسماندا بەدی دەکەی.

ئەگەر بتەوێ باشترین کوالەتی بۆ وێنەکانت بەدەست بێنی، واچاکە بەشێوازی (TIFF) وێنەکان دابکەی، لێرەدا وێنەکان کەبس ناکرێن بەبێ کەبسکردن داکراون.

لێرەدا وێنەکە هیچ لە کوالەتیەکانی لەدەست نادات، بۆ گەورەکردنی وێنەکەش بەجوانی ئەنجام دەدرێت، بەڵام ئەوەیە ئەمانە فایلەکانیان زۆر گەورە دەبێت، لە کۆمپیوتەر درەنگ دەکرێنەوە بەسستی مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ، واتە بەخێرایی ئیشیان لەسەر ناکرێ، مەگەر کۆمپیوتەرەکە (ڕام)ی زۆر گەورە بێت و هێرتزەکەشی بەرز بێت.

هەندێ کامیرا زیاتر لەمانەشی تێدایە، وەک داکردنی وێنە بەشێوازی (RAW) فۆرمات. لێرەدا وێنەکان ڕاستەوخۆ لە شاشەی (CCD)یەوە وەردەگیرێ بێ ئەوەی بەهیچ پرۆسەیەکدا ڕەت بێت وەک حاڵەتەکانی پێشوو، یا بەشێوازەکانی پێشوو دەبێ پرۆسە بکرێن ئینجا وێنەکان لەسەر فایل تۆماردەکرێن. واتە لێرەدا ناتوانرێ ئەو پرۆسانەی وەک (Sharpening) و گۆڕینی ڕەنگەکان لەسەری ئەنجام بدەی واتە وێنەکان وەک خۆی دادەکرێن، بەڵام بەشێوازەکانی تر دەکرێ وێنەکە بکرێتە نێگەتیف، یا ڕەش و سپی، یا سیپیا یا سۆلە ڕایزێشن (واتە جۆری پۆستەری).

بەم شێوازەی (RAW) بواری ئەوەت دەدات وێنەکە بە تۆنی بەرزو دیقەتی بەرز لەنێو کۆمپیوتەرەکەت دابکەی.

بەڵام بۆ مامەڵەکردن لەسەری بەهۆی پرۆگرامەکانی کۆمپیوتەرەوە بەسستی مامەڵەی لەسەر دەکرێ. ئەگەر وێنەیەک بەهەمان دیقەت و کوالەتی شێوازی (TIFF) بەشێوازی (RAW) بگری ئەوا فایلەکەی لەوەی پێشوو بچووکترە و جێی کەمتر دەگرێت.

* هەستەوەری ISO

هەروەک کامیرای ئەنەلۆگ یا کلاسیکی چۆن مامەڵە لەگەڵ هەستەوەری فیلمی جیاجیا دەکات واتە بۆ ڕووناکی نزم و کز فیلمی هەستەوەر بەرز وەک (ISO - 1600) بەکاردێت و بۆ ڕووناکی بەرزیش فیلمی (ISO - 100) بەکاردێت. لە کامیرای دیجیتاڵیش هەمان شت بەکاردێت، دەتوانی بەڕێگای (Menu) (ISO)ی کامیراکە بەرزو نزم بکەیت، بەڵام نابێ ئەوە لەبیر بکەیت لێرەشدا چەندی هەستەوەری (ISO) بەرز بکەیتەوە ئەوا وێنەکان دەنک دەنکەیان لەسەر دروست دەبێت وەک بارانەی وێنەی تەلەفزیۆنی بەدی دەکرێن، واتە زۆر ناچار نەبیت نابێ هەستەوەری بەرز بەکاربێنی، بەڵام بۆ وێنەی جووڵەی زۆر خێراو وێنەی وەرزشی ناچاری هەستەوەری بەرز بەکاربێنی. بەپێچەوانەی ئەمەش بۆ وێنەی تر وەک خوڕەی ئاو تا وەک هەور دەرکەوێ لێرەدا هەستەوەری نزم لەپاڵ خێرایی کەمی شەتەر بەکاربێنی، ئەنجامی چاکت دەست دەکەوێ.

سەرچاوە:

* **Practical Photography, June 2003.**

# درامانووسانی جیهان

مەهدی مەجید جاف
(سوید)

بەشی پێنجەم و کۆتایی

خوێندنی ناوەندی تەواو دەکات و لە ساڵی ١٩٢٤ ز، لە شاری پاریس دەست بە خوێندنی فەلسەفە دەکات و لە ساڵی ١٩٣٩ز، دکتۆرا لە فەلسەفەدا وەردەگرێت، لەدواییشدا دەست بە گوتنەوەی وانەی فەلسەفە لە قوتابخانە ناوەندیەکانی شارەکانی لوهاوۆر و لائون پاریس دەکات. لە رۆژانی خوێندنیدا لە زانکۆ بە (سیمون دوبوڤوار) کە سێ ساڵ لە خۆی بچووکتر دەبێت، ئاشنا دەبێت و تەمەنێکی درێژ پێکەوە بە سەر دەبەن، ئەمیش لە دواییدا وەک مامۆستا دەست بە کار دەکات.



## ٤٢ - ژان پاول سارتەر

درامانووس و چیرۆکنووس و وتار نووس و فەیلەسووفی بەناوبانگی فەرەنسی ژان پۆل سارتەر، لە ساڵی ١٩٠٥ز، لە شاری پاریس چاوی بە دنیا هەڵهێناوە. باوکی ئەفسەرێکی هێزی دەریایی دەبێت لە چین و هیندستان لەوێ تووشی نەخۆش دەبێت و دەمرێت، ژانی دوو ساڵە رەنگی بێ باوکی لە رووی دەنیشێت باپیری کە مامۆستای زمانی ئەڵمانی دەبێت ژان دەگرێتە خۆی و ئەرکی ژیانی دەکێشێت . کاتێک کە تەمەنی یازدە ساڵان دەبێت دایک شوو دەکاتەوە و سارتەر لەتەک خۆیدا بۆ شاری لاروشل دەبات، لەوێ

لەو ماوەیەدا کورتە چیرۆکی (دیوار) دەنووسێت و دەبێتە هۆی گفتوگۆیەکی فراوان و ناوبانگی سارتەر بڵاودەکاتەوە. بەرپابوونی شەری شومی دووەمی جیهانی، کار لە بیروبۆچوونی فەلسەفی سارتەر دەکات، سەرەتا لە لە دەزگای هەواناسی دەست بە خزمەت دەکات و زۆر نابات لە لایەن داگیرکەرانی ئەڵمانیەوە لە هاوینی ساڵی ١٩٤٠ز، بەند دەکرێت، پاش ماوەک بە بیانووی ئەوەی کە نەخۆشە، ئازاد دەکرێت و بۆ فەرەنسای دەیگەرێننەوە. لە پاشان پەیوەندی بە بزووتنەوەی بەرگری میللی فراسەوە دەکات و چالاکانە خەبات دەکات، لە ساڵی ١٩٤٣ز، بە هاریکاری گرووپێکی رۆشنبیری

دەست بە بلاوکردنەوەی بەرهەمە فەلسەفیەکانی دەکات.

هەر لە ڕۆژانەدا دەبێت کە شانۆنامەی (مێشەکان) دەنووسێت. لە ساڵی ١٩٤٤ز، شانۆنامەی (دەرگا داخراوەکان) دەنووسێت و پاش ئازاد کردنی پاریس لە سەر شانۆ پێشکەش دەکرێت و لە ساڵی ١٩٤٦ز، یەکەمین ژمارەی گۆڤاری (سەردەمی نوێ) بلاو دەکاتەوە. لە ساڵی ١٩٤٦ز، شانۆنامەی (سۆزانی شەرافەتمەند) و ساڵێ پاشتر (حاڵەت) و (ئەدەبیات چییە؟) و (بودلێر) و (بۆچوون سەبارەت بە مەسەلەی یەهوود) دەنووسێت. لەساڵی ١٩٤٨ز، شانۆنامەی (مردووە بێ گۆڕەکان) و کتێبی فەلسەفی (ئیگزیستانیسیالسم و ڕەسەنی مرۆڤ) و شانۆنامەی (دەستە پیسەکان) و (بێزاری) و (ڕێگای ئازادی) و شانۆنامەی (شەیتان و خوا) و لە ساڵی ١٩٥١ز، شانۆنامەی (ژان مقدس) و ساڵێ دواتر شانۆنامەی (کین) و لەساڵی ١٩٥٥ز، شانۆنامەی (نێکراسف) و لەساڵی ١٩٥٩ز، شانۆنامەی (گۆشەنشینەکانی ئاڵتونا) و لە ساڵی ١٩٦٥ز، شانۆنامەی (ژنانی تەروادە) دەنووسێت.

سارتەر لە ساڵی ١٩٥٩ز، بۆ کوبا سەفەر دەکات و لە لایەن ڕۆشنبیرانەوە پێشوازییەکی گەرمی لێ دەکرێت. لە دوای ئەو سەفەرە دووەمین کتێبی فەلسەفی بەناوی (ڕەخنەی عەقڵی دیالێکتی) و لەدوایشدا کتێبی (هەیت و نیت) دەنووسێت. لە ساڵی ١٩٦٤ز، سارتەری مەزن کتێبی بە ناوبانگی (وشەکان) کە سەبارەت بە بیرەوەریەکانی سەردەمی منداڵیەتی دەنووسێت و ئەکادیمیای سویدی خەڵاتی بەرزی نۆبڵی لە ئەدەبیاتدا پێدەبەخشێت، بەڵام سارتەر بە بیانووی ئەوەی کە ئەو خەڵاتە لە لایەن بلاوکەرەوەی ئایدۆلۆژی بورژوازیەوەیە، قبووڵ ناکات و وەرگرتنی ڕەت دەکاتەوە.

پاش شەڕی یەکەمی جیهانی دووەم فەلسەفی ئیگزیستانسیالیزم گەشەی کرد و سارتەر بە بیر و باوەڕی نیچە و فەیلەسووفانی ئەو ڕێبازە وەک مارتین هایدگر و سورین کیر کیرکیگارد کاریگەر دەبێت. سارتەری مەزن لە ساڵی ١٩٨٠ز، لە تەمەنی ٧٥ ساڵیداماڵئاوای لە ژیان و دنیای ئەدەب و هونەر دەکات.

### ٤٣ - ئالبێر کامو

ئالبێر کامو لە حەوتی مانگی تشرینی دووەمی ١٩١٣ز، لە گوندی مۆندۆڤی لە وڵاتی ئەلجەزائر لە دایک بووە، (لوسین کامو) ی باوکی لە ڕەسەندا لە خەڵکانی (ئالزاس)ی فەرەنسا دەبێت، باوکی یەکێک دەبێت لە سەربازانی فەرەنسی و لە شەڕی (مارن) دا بە خەستی بریندار دەبێت و دەمرێت. هەروەها دایکی زەحمەتکێش و نەخوێندەواری لە ڕەسەندا ئیسپانی دەبێت. هەژاری ڕوویان تێ دەکات و دایکی بە ناچاری ژیانی منداڵەکانی و نەنکیان بە خزمەتکاری مسۆگەر دەکات و کامو دەڕواتە قوتابخانە و زۆر زیرەکانە دەست بە خوێندن دەکات، پاشان بە یارمەتی یەکێک لە مامۆستا دڵسۆزەکانی لە قوتابخانەی ناوەندی شاری ئەلجەزائردا دەست بە خوێندن دەکات.

کامو لە تەمەنی سێزدە ساڵیەوە دەست بە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی (ئاندرێ ژید) و (مۆنتلان) و (ئەندرێ مالرۆ) دەکات، لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا توشی نەخۆشی سیل دەبێت. پاش دوو ساڵ حاڵی باشتر دەبێت و دەست بە خوێندن لە زانکۆی ئەلجەزائر لە شاری جەزائر دەکات.

زوڵم و زۆری فەرەنسیە داگیر کەرەکان لە گەلی جەزائر و سەر هەڵدانی نازیەکان لە ئەوروپا، دەبێتە هۆی دروستبوونی بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیری نوێ دژ بە فاشستیەت کە لەلایەن هونەرمەندان هێنری باربۆس و ڕۆمین ڕۆلانەوە دروست کرا بوو.

ئەلبێر کاموی پڕ هەست لە ساڵی ١٩٣٣ز پەیوەندیان پێوە دەگرێت و دەبێتە هاودەنگیان. لە ساڵی ١٩٣٤ز، ژن دەهێنێت و هەر پاش چەند مانگێک لە یەکتر جیا دەبنەوە. لە کۆتایی هەمان ساڵدا دەبێتە ئەندامی پارتی کۆمۆنیست و دەبێتە لایەنگری عەرەبە شۆڕشگێڕەکان و پاشان دەبێتە سەرۆکی یانەی ڕۆشنبیری لە شاری ئەلجەزائر، لەساڵی ١٩٣٧ز، واز لە پارتی کۆمۆنیست



دەهێنێت و بۆ ماوەیەک لە زانکۆی ئەلجەزائیردا دەست بە خوێندنی فەلسەفە دەکات.

لە دواییدا تیپی شانۆی (ئەکیپ) دروست دەکات و شانۆنامەی (برایانی کارامازۆف) کە لە ڕۆمانە بە ناوبانگەکەی دیستۆیفسکییەوە ئامادەی کردبوو، لەسەر شانۆ پێشکەشی دەکات

کامۆ ئەرکی ڕێژەسۆیری و وەک ئەکتەریش ڕۆڵی ئیڤانیش لە شانۆگەریەکەدا دەبینێت. پاشان لەگەڵ گرووپی گەڕۆکی ئەکتەرانی ڕادیۆیی ئەلجەزائیردا دەست بەکار دەکات و پاش ماوەیەکی کەم لە ڕۆژنامەی (کۆماری ئەلجەزائردا) دەست بە کار دەکات. لە ساڵی ۱۹۳۷ز، کۆمەڵێک لە وتارەکانی بە ناوی (ژن و مێردایەتی) لە دوو توێی کتێبێکدا بڵاودەکاتەوە، لە ساڵی ۱۹۳۸ز، شانۆنامەی بە ناوبانگی (کالیگۆلا) دەنووسێت، و دەست بە نووسینی چەند وتارێک سەبارەت بە بۆچوونی ڕێبازی (بێهوودەیی) لە ئەدەبیاتدا دەکات و لە دوایشدا بە ناوی (ئەفسانەی سیزیفەوە) بڵاوی دەکاتەوە.

بەناوبانگترین بەرهەمی کاموی مەزن ڕۆمانی (بێگانەیە) کە بە ڕاسپاردەی ئەندرێی مارلۆ لە ساڵی ۱۹٤۲ز، لەو کاتە کە فەرانسە داگیر کراو دەبێت، بڵاو دەکاتەوە و پێشوازیەکی گەرمی لە لایەن خوێنەرانەوە لێ دەکرێت. لە پاش ئازادکردنی فەرانسە، دەبێتە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (نەبەرد)، ئەلبێر کامو هەمیشە دەیویست وەک فەرەنسیەکی جەزائیری بێت.

لە ساڵی ۱۹٤۳ز، بە نووسەر و فەیلەسووفی بە ناوبانگی فەرەنسی ژان پۆل سارتەر ئاشنا دەبێت و دەبنە هاوبیر و هاوپیشەی یەکتر، ئەم ئاشنایەتیە تا ساڵی ۱۹٤۸ز، درێژە دەکێشێت، پاشان جیاوازی فەلسەفی فکری لە نێوانیاندا پەیدا دەبێت، بە تایبەتی لە ساڵی ۱۹٥۱ز، کاتێک کە کامو کتێبی (مرۆڤی ستەمکار) بڵاو دەکاتەوە، سارتەر لە گۆڤاری (سەردەمی نوێدا) ڕەخنەی زۆری لێ دەگرێت، ئەم بۆچونە فەلسەفیە جیاوازەی نێوانیان تاماوەیەک دەبێتە هۆی گفتوگۆی فەلسەفی و مشتومڕی تیژ.

لە ساڵی ۱۹٤٤ز، شانۆنامەی (بە هەڵە تێگەیشتن) و لە ساڵی ۱۹٤۸ ز، شانۆنامەی (حکومەتی سەربازی) و لە ساڵی ۱۹٤۸ز، شانۆنامەی (دادپەروەرەکان) بڵاو دەکاتەوە. شانۆنامەی (حکومەتی سەربازی) ناوبانگی کامو فرەتر بە جیهاندا بڵاو دەکاتەوە و ئەکادیمیایی سویدی لە ساڵی ۱۹٥۷ز، خەڵاتی نۆبڵ لە ئەدەبیاتدا بە کامو دەبەخشێت. کامو جگە لەوەی شانۆنامە، چیرۆکیش دەنووسێت وەک (پشت و ڕوو) و (چەژنەکان) و (ڕیالیستیەکان) و (تاعوون) و (ڕووخان) و (هاوین).

کامۆی نەمر لە تەمەنی ٤٧ ساڵیدا، لە چواری مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹٦۰ ز، بە ڕووداوی ئۆتۆمۆبێل لە فەرانسا گیانی لە دەست دەدات و ماڵئاوایی لە ژیان و هونەر دەکات.

## ٤٤ - جیمس جۆیس

درامانووسی بەناوبانگی ئیرلەندی جیمس ئاوگوستین ئالۆژیوس جۆیس لە دووی مانگی فێبریواری ۱۸۸۲ز، لەشاری دوبلنی پایتەختی وڵاتی ئیرلەند، لەو شارەی کە چل ساڵی ڕەبەق بە نووسینەکانی بە شان و باڵیدا هەڵ دەدا لە دایک بووە. لە خێزانێک هەژار بووە، لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیەوە دوور لە شارە دڵگیرەکەی دەژێت. بێجگە لە نۆ منداڵی تریان دەبێت، جیمیز بچووکترینیان دەبێت، زۆر سەخت دەبێت بۆ باوکی کە ژیانی دوازدە کەس دابین بکات.

باوکی بڕیار دەدات کە جیمس جۆیس بێتە قەشە و بۆ ماوەی سێزدە ساڵ خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە قوتابخانەی ئایینی یەسوعیاندا لە شاری دوبلین وانە ئایینەکان دەخوێنێت، لەو ماوەیەدا پەیڕە و یاسا گرژەکانی کاتۆلیکی بە سەختی ئازاری پێدەگەیەنن، لە ساڵانی ۱۸۹۸ تا ۱۹۰٤ز، لە زانکۆی دوبلن درێژە بە خوێندن دەدات، سەرەتا وەک شاعیرێک دێتە گۆڕەپانی ئەدەبیاتەوە.

پیاوانی ئایینی دەمارگیر نووسینەکانی بە کفر لە قەڵەم دەدەن و بە ناچاری بۆ شاری پاریس لە فەرەنسا کۆچ دەکات، لە زانکۆی پاریس دەست بە خوێندنی پزیشکی دەکات و دەبێتە دکتۆر، هەر زوو بێزار و بێهوودە دەبێت و تێدەگات کە حەز و ئارەزووی لەم پیشەیە نییە، هەر لە بەر ئەوە دەست بە خوێندن و خوێندنەوە لە بەشی ئەدەبیاتدا دەکات، لەو ماوەیەدا دەست بە نووسینی زنجیرە باسێک سەبارەت بە دراما دەکات و بڵاویان دەکاتەوە، هەروەها چەند وتارێک لە سەر درامانووسی بەناوبانگی نەرویجی هێنریک ئەبسن دەنووسێت پاش ماوەیەک جیمس جۆیس ئاگادار دەکرێتەوە کە دایکی لە سەرەمەرگدایە، لەبەر ئەوە شاری پاریس بەجێ دەهێڵێت و بۆ ئیرلاند دەگەڕێتەوە بە هیوای ئەوەی بۆ هەمیشە تێیدا بژێت، لە ئیرلاند بە خانمێک کە ناوی (نورا بارنێسێل) ئاشنا دەبێت و دەیخوازێت. هەر دووکیان بۆ هەتا هەتایی ئیرلاند بەجێ دەهێڵن و لە شاری (ترێستە)

بۆ مــاوەی دەســاڵ نیــشــتــەجێ دەبن و لەوێ دوو منداڵیشیان بە نسیب دەبێت.

لە ماوەی ژیانیدا لە زوریخ و تریستە و ڕۆم دەژێت، بۆ دابینکردنی ژیانی ڕۆژانەی دەست بە گـوتنەوەی زمـانی ئینگلیزی دەکات. لە ساڵی ١٩٠٧ز، کتێبی (مۆزیکی مەجلیسی) بڵاودەکاتەوە. هەر لە هەمان ساڵدا کۆمەڵە چیـرۆکـێک بە ناوی (دۆبلینیـەکـان) دەنووسـێت. شانۆنامەی (دوورخراوەکان) تەنها شانۆنامەیەکە کە لە سـاڵی ١٩١٨ز، چاپی دەکـات، لە دواییـدا بەرهەمی (شێوەی هونەرمەندێک لە تەمەنی لاویدا) و چیرۆکی بەناوبانگی (ئۆلیس) کـە لە بەرهەمـێکی حـەمـاسی ئۆدسەی شاعیری گەورەی یۆنانی کۆنەوە وەرگیراوە.

ئەم بەرهەمــە ســەرەتا لە شــاری پاریس لە ســاڵی ١٩٣٢ز، چاپ دەکـــرێت. لـە ســـاڵی ١٩٣٩ز، دوا بەرهەمی بەناوی (بێــداری فــینگان) بڵاودەکـاتەوە. جیمس جۆیسی مەزن جگە لەو بەرهەمانەی ئاماژەمان بۆ کـردن، کـۆمـەڵە شـیـعـرێکی زۆریشی نووسـیـوە، ئەوەی شایانی باسـە کـە جـیـمس جـۆیس باوەڕی بە ڕێبـازی سـوریالیـست دەبێت و بۆ نووسـراوەکـانی پەیڕەوی ئەم ڕێبازە دەکات.

جـیـمـسی نەمـر لە مـاوەی ژیانیـدا سـەفـەری زۆر بۆ وڵاتانی ئەوروپا دەکات و کاری مامۆستایی لە بەشەکانی فـەلسـەفـە و کـۆمـەڵناسـیـدا دەکات. بە دەست پێکردنی شەڕی شومی دووەمی جیـهـانی جیـمـس جـۆیس هێز و توانای لێ دەبڕێت و پێش ئەوەی کــە تـەمــەنی لە چل بەهاری ژیان بدات، لاوازی چاوی بەرەو کـزبوون دەچێت و پاش چەند جار نەشتەر کاری بە یەکجاری کوێر دەبێت و دنیای پڕ لە ڕەنگاو ڕەنگی لە بەرچاو تاریک دەبێت و لە سـێـزدەی کـانوونی دووەمی سـاڵی ١٩٤١ز، و پێش ئەوەی تەمـەنی ببـێـتـە پەنجا ساڵ، لە ژووری هوتێلێکی شـاری (زیورخ) لە ئەڵمـانیـا کـۆچی دوایی دەکـات و مـاڵـئـاوای لە دنیـای هونەر و ئەدەبیـات دەکـات و هەر لەوێ بە خاک دەسپێرێت.

## ٤٥ - سامۆئل بێکت

درامانووسی بەناوبانگی ئیرلەندی سامۆئل بێکت لە سێـزدەی نیـسـانی ١٩٠٦ز، لە گـەڕەکی فـۆکس ڕۆک لە باشوری شاری دوبلنی پایتەختی ئیرلەند لە خێـزانێکی مـامناوەندی و سـەر بە مـەزهەبی پرۆتسـتـان لە دایک بووە. لە تەمـەنی چواردە ساڵیـدا لە قـوتابخـانەیەکی (شەو و ڕۆژیدا) لە دوبلن درێژە بە خوێندن دەدات و لە ساڵی ١٩٢٣ز، لە خوێندنگەی بەرزی ترینتی دوبلن لە بەشی فـێربوونی زمانی فەرەنسی و ئیـتـالیـدا دەست بە خوێندن دەکـات و لە سـاڵی ١٩٢٧ز، بە سـەرکـەوتوویی تەواوی دەکات.

پاش تەواو کردنی خوێندن ماوەیەک لە بلفاست دەست بە دەرس گـوتنەوە دەکات، لە سـاڵی ١٩٢٨ز، بۆ شـاری پاریس لە فـەرەنسـە سـەفـەر دەکات، لە سـاڵی ١٩٢٨ تا ١٩٣٠ز، لە شـاری پاریس دەبێـتـە مـامـۆسـتـای زبانی ئینگلیزی و خـەڵاتێکی ئەدەبی لە شیـعـرێکیدا بە ناوی (ڕۆژگار) پێ دەبەخشرێت و وەک شاعیرێک دەناسرێت. لە شاری پاریس لە ساڵی ١٩٣١ ز، نامیلکەیەکی پڕ لە مەبەست لەسەر (مارسێل پروست) دەنووسێت. هەر لەم ساڵانەدا بە جیمس جۆیس ئاشنا دەبێت.

لە سـاڵی ١٩٣٠ دەگـەڕێتـەوە بەریـتـانیـاو لە سـاڵی ١٩٣١ز، و لە تەمەنی بیست و چوار ساڵیدا بڕوانامەی لیـسـانس وەردەگـرێت. لە مـاوەی چوار تەرمـیندا دەرسی زمـانی فـەرەنسی لە خـوێندنگەی بەرزدا دەڵێـتـەوە. لە سـاڵی ١٩٣٧ ز، لە شـاری پاریس نیـشـتـەجێ دەبێت، پاش هەڵگیـرسـانی شـەڕی شـومی دووەمی جیـهـانی، بەگـەرمی و توندی دژی دەبێت و بڕیار دەدات بە زمـانی فەرەنسی بنووسێت، کۆمەڵێک بەرهەمی ئەدەبی بە چاپ دەگەیەنێت، کە ناوبانگ و شکۆداری پێ دەردەکات.

لە سـاڵی ١٩٤٣ز، دووەمین بەرهەمی خـۆی بەناوی (کـات) بەزمـانی ئینگلیـزی دەنووسـێت، لەسـاڵی ١٩٥١ز، چیـرۆکـێکی سێ بەشی بە ناوی مـولاوی (و) مــالـون دەمــرێت (و) بێ نـاو (بە زمـانی ئینگلیـزی بڵاودەکـاتەوە. سـامـۆیل بیکێت لە پاش شـەڕی شـومی جیهانی دەگەڕێتەوە شاری پاریس و بەزمانی فـەرەنسی دەست بە نووسین دەکات. لە ساڵی ١٩٥٢ز، شانۆنامەی بەناوبانگی (لە چاوەڕوانی گـۆدۆدا) بڵاو دەکـاتەوە، بیکێت لەڕێی ئەم شـانۆگـەریەوە ناوبانگی جیـهـانی دەردەکات.

لە بەرهەکـانی تری سـامـۆیل بیکێت وەک: (کـۆتاریی گەمە)، (ڕۆژە خۆشەکان)، (گەمەکان)، (شیعر بە زمانی ئینگلیزی)، (ڕامێنە ڕا)، (پرۆست و سێ گفتوگۆ لە گەڵ ژۆرژ دو توبی)، و ڕۆمانی (مورفی). بیکێت هەمیشە لە بەرهەمەکانیدا ئەم پرسیارانە دەکات، من کێم؟، کات و شوێن چییە؟، بیر و مادە چییە؟، ڕیالیزم چییە؟

لە سـاڵی ١٩٧٣ز، شـانۆنامـەی (من نا) دەنووسـێت. سامۆیل بیکێتی مەزن و ناودار لە تەمەنی هەشتاو سێ سـاڵیـدا و لە سـاڵی ١٩٨٩ ز، مـاڵـئـاوایی لە هونەر و ئەدەبیات دەکات.

## ٤٦ - ئۆژین یونسکۆ

درامانووسی بە ناوبانگی ڕۆمانی - فەرەنسی ئۆژین یونسکۆ لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩١٢ز، لە باشووری ڕۆمانیا لە دایک بووە. دایکی لە ڕەسەندا فەرەنسی دەبێت. یونسکۆ لە تەمەنی یەک سالیدا دەبێت کە بە مالەوە بۆ فەرەنسا سەفەر دەکەن، کاتێک کە یونسکۆ لە تەمەنی نۆ سالیدا دەبێت خۆی و دایک خوشکێکی بۆ گوندی (شاپل ئانتەر) کۆچ دەکەن، لە تەمەنی منداڵیدا هەمیشە ئاواتی ئەوە دەبێت لە پاشەڕۆژدا ببێتە قەشە. تاتەمەنی سێزدە سالی لە فەرەنسا دەمێنێتەوە، پاشان بۆ ڕۆمانیا دەگەڕێتەوە، دەست بە فێربوونی زمانی ڕۆمانی دەکات. پاش ماوەیەک دایک و باوکی لەیەکتر جیا دەبنەوە و خێزانەکەی تووشی گرفتاری دەبێت.

یونسکۆ لە زانکۆی شاری بوخارست دەست بە خوێندنی ئەدەبیاتی فەرەنسی دەکات و بە سەرکەوتوویی بڕوانامەش لە زمانی فەرەنسیدا وەردەگرێت. (گلەیی شاعیرانە) کۆمەڵە شیعرێک و یەکەمین بەرهەمی دەبێت کە لە تەمەنی هەژدە سالیدا دەیانووسێت. لە سالی ١٩٣٦ز، کیژە قوتابییەکی بە فەلسەفە دەخوازێت و لە سالی ١٩٣٨ز، بۆ تەواوکردنی پلەی دکتۆرا لە ئەدەبیاتی فەرەنسیدا بۆ شاری پاریس سەفەر دەکات. لە سالی ١٩٣٩ز، نوێبەرەی ئەدەبی خۆی لە گۆڤاری (زوریاک) دا بلاودەکاتەوە. کە شەڕی شومی دووەمی جیهانی دەست پێدەکات یونسکۆ لە (مارسی) دەبێت، پاشان بۆ شاری پاریس دەگەڕێتەوە لە یەکێک لە دەزگا بلاوکراوەکاندا کار بە دەست دەهێنێت، تێدەگات کە زمان زانین چەند بە کەڵکە و دەست بە فێربوونی زمانی ئینگلیزی دەکات.

لە تەمەنی سی و شەش سالیدا شانۆنامەی (گۆرانی بێژی تاوس) دەنووسێت و بۆ یەکەمین جار لە سالی ١٩٥١ز، لەسەر تەختەی شانۆ نیشان دەدرێت. لە سالی ١٩٥١ز، شانۆنامەی (وانە) دەنووسێت و لەسەر شانۆ نیشان دەدرێت. سێیەمین شانۆنامەی خۆی بەناوی (کورسییەکان) لە سالی ١٩٥١ز، دەنووسێت. شانۆنامەی (قوربانییەکانی ئەرک) یەکێکە لە شانۆگەریە بەناوبانگەکانی یونسکۆ کە قسە و باسێکی زۆری لەسەر کراوە.

شانۆنامەی (کرێچی نوێ) یەکێکە لە شانۆنامە یەک پەردەییەکانی، دوا بە دوای ئەوانە شانۆنامەی (وڕێنەی دوو کەس) و شانۆنامەی (پیاوکوژی خۆڕایی) دەنووسێت. بە ناوبانگترین شانۆنامەی یونسکۆ شانۆنامەی (کەرکەدەن)ە کە لە سالی ١٩٥٩ز، بلاوی دەکاتەوە و هەر بە زوویی لەسەر تەختەی شانۆ بەناوبانگەکانی ئەورووپا پیشانی جەماوەرانی شانۆ دەدرێت.

هەندێ لە توێژەرەوەکان باوەڕیان وایە کە شانۆنامەی کەرکەدەن، ڕەنگدانەوەی هەستی یونسکۆی مەزن بێت، پاش ئەوەی کە ڕۆمانیا بەجێ دەهێڵێت؛ ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێیانی و ئاشنایانی لەو دەمەدا دەچنە ڕیزی بەرەی بزووتنەوەی فاشستی (قەرەوڵی ئاسنینەوە). شانۆنامەی بە پێزی کەرکەدەن، دەبێتە سەرەتایەکی سەرکەوتوو بۆ یونسکۆ و وەک درامانووسێکی جیهانی ناوبانگ دەردەکات. لە شانۆنامە بەناوبانگەکانی تری یونسکۆ وەک:

١ - (برسێتی و تینوێتی).
٢ - (پاشا دەمرێت).
٣ - (تابلۆ).
٤ - (داهاتوو لە هێلکەی مریشکدایە).
٥ - (گەمەی کوشتار بە کۆمەڵ).
٦ - (کەمی).
٨ - (ئەوریفلام).

## ٤٧ - ئارتۆر ئاداموّڤ

درامانووسی فەرنسی (بە ڕەسەن ڕووسی) ئارتۆر ئاداموّڤ لە سالی ١٩٠٨ز، لە کیسلۆڤۆدیسکی، لە ناوچەی قەفقاز لە دایک بووە. باوکی یەکێک لە خانەدان و دەوڵەمەندەکانی قەفقاز و خاوەنی بیرێکی نەوت دەبێت. ئارتۆر ئاداموّڤ هەر بە منداڵی بە مەبەستی ئەوەی لە سەر شێوەی ئەورووپی پەروەردە و فێری خوێندەواری بێت، ڕەوانەی دەرەوەی ڕووسیای دەکەن، ئەو سەردەمە ڕووسە خانەدانەکان منداڵانی خۆیان لەسەر شێوەی فەرەنسی پەروەردە دەکرد. ئارتۆر ئاداموّڤ زمانی فەرەنسی فێر دەبێت و دەسەڵاتی بەسەردا دەبێت و بە بەرهەمەکانی بالزاک ئاشنا دەبێت و دەست بە خوێندنەوەی ڕۆمانە فەرەنسیەکان دەکات.

لە سالی ١٩١٤ز، لە سەرەتای دەست پێکردنی شەڕی شومی یەکەمی جیهانی، بەڕەزامەندی خێزانەکەی لە ناوچەی (فرودنئیشتارت) کە دەکەوێتە ئەڵمانیای ڕۆژهەلات، دەبێتە پەنابەر و لە دواییدا پادشای ولایەتی ڤیتربێری کە لەگەڵ باوکی ئادۆمۆڤدا ئاشنا دەبێت دێتە مەسەلەکە و بۆ ئەوەی لە دەستی دوژمن دوور بێت مۆڵەتی دەدەنێ کە بۆ سویسرا سەفەر بکات و لە شاری (ژنێڤ) جێگیر بێت. ئاداموّڤ لە سویسرا و پاشان لە

ئەڵمانیا درێژە بە خوێندنەکەی دەدات.

لە تەمەنی شازدەساڵیدا بۆ شاری پاریس سەفەر دەکات و لەوێ بە هونەر و هونەرمەندانی ڕێبازی سوریالستی ئاشنا دەبێت و کاریگەری لەسەری دادەنێت و دەبێتە هاوڕێبازیان، دەست بە نووسینی شیعر دەکات و هەندێ لە شیعرەکانی لە بلاوکراوەیەکدا بە ناوی (پێشڕەو) بلاودەکاتەوە. لەو ڕۆژانەدا بە شاعیری بە ناوبانگی فەرەنسی (پۆل ئیدوارد) ئاشنا دەبێت. ئەم ناسینەش سیمای شێوەیەکی تازە بە کاروانی ئەدەبی ئادامۆف دەدات. پاشان بۆ ماوەیەک دەست لە نووسین بەردەدات.

لە ساڵی ١٩٣٨ز، نامیلکەیەک بە ناوی (دانپێدانان) بلاودەکاتەوە و خۆی لەو ئازارە دەروونییە و ئەو ماوە مت بوونە ئەدەبییە ڕزگار دەکات کە سوریالیستەکان کاریان تێکرد بوو. لە کۆتایی ساڵانی شەڕی شومی جیهانیەوە دەست بە نووسینی شانۆنامە و خوێندنەوەی بەرهەمەکانی نووسەری ناوداری سویدی ئاوگوست ستریندبێری دەکات. شانۆنامەی (سەنگر) یەکەمین بەرهەمی شانۆییەتی و دوا بە دوای ئەویش شانۆنامەی (هێرش) و شانۆنامەی (ڕێپێوانی گەورە و بچووک) دەنووسێت.

لە ساڵی ١٩٥١ز، شانۆنامەی تارانی پرۆفیسۆر (دەنووسێت، ئەم شانۆنامەیە بە خاڵی وەرچەرخاو لە پێشڕەوی بەرهەمی سەرکەوتووی ئەدامۆف دادەنرێت. ئادامۆف لە شانۆنامەی (-Comme Nous Aron sete we were) و شانۆنامەی (بینراوەکان) دا باس و خواست لە باری دەروونی کەسایەتیەکانی دەکات، بەلام شانۆنامەی (پینگ پونگ) بە یەکێکی تر لە بەرهەمە بە پێزەکانی سەر بە ڕێبازی شانۆی بێهوودە دادەنرێت.

لەساڵی ١٩٥٥ز شانۆنامەی (پائو لۆپائی) دەنووسێت و لە ساڵی ١٩٥٧ز، بلاوی دەکاتەوە، لەم شانۆنامەیەدا ئادامۆف لە شانۆی بێهوودە دوور دەبێتەوە و شێوە و ڕێبازی ئەدەبی خۆی دەگۆڕێت. لەو ماوەیەدا نوێکاریەک لە شێوە نووسینی بەرهەمەکانیدا دەکات و بە ڕێبازی شانۆی فێرکردن و حەماسی برتۆلد برێخت کاریگەر دەبێت، ئەم کاریگەریەش لە شانۆنامەی (برچیلان) دا کە شانۆنامەیەکی حەماسیە دەر دەکەوێت.

لە شانۆنامەکانی تری ئادامۆف وەک :

١ - (هاوسۆزی).
٢ - (سامی پیاوی گاڵتە چر).
٣ - (من فەرەنسی نیم).
٤ - (ئەوروپای پیرۆز).
٥ - (بەهاری حەفتا و یەک).

ئادامۆڤی مەزن جگە لەوەی درامای دەنووسێت، کاری وەرگێرانی لەسەر بەرهەمەکانی دیستۆیفسکی و بۆخنەر و گۆرکی و چیخۆف دەکات. ئارتور ئادامۆڤی مەزن لە ساڵی ١٩٧٠ز، کۆچی دوایی دەکات و ماڵئاوایی لە دنیای ئەدەب و هونەر دەکات.

## ٤٨ - جان ئازبرن

درامانووسی بەناوبانگی بەریتانی جان ئازبرن لە ساڵی ١٩٢٩ز، لە شاری لەندن لە دایک بووە. پاش تەواوکردنی خوێندنی ناوەندی کاری هونەری شانۆیی دەکاتە پیشە، بۆ پیشاندانی کارە شانۆییەکان بۆ چەند شار و شارۆچکەیەکی بەریتانیا سەفەر دەکات. هەر زوو دەرک بەوە دەکات کە زیاتر حەزی لە نووسینی شانۆنامەیە وەک لە هونەری نواندن.

لەو ماوەیەدا کە وەک ئەکتەر لەسەر شانۆ دەردەکەوێت، دەست بە نووسینی شانۆنامەش دەکات. شانۆنامەی (شەیتانی کە لە ئەودا بوونی هەیە) و شانۆنامەی (دوژمنی تایبەتی) دەنووسێت و لەسەر تەختەی شانۆی لەندەن و چەند شاری تر پێشکەش بە بینەران دەکرێت.

لە ساڵی ١٩٥٦ز،شانۆنامەی (بەزۆر یادهێنانەوە) دەنووسێت و ئەم شانۆنامەیە دەرگای ناوبانگی لە گۆرەپانی نووسیندا لەسەر ئابزن دەکاتەوە، قارەمانی ئەم شانۆنامەیە ناوی (جیمی پورێترە) و نوێنەری نەوەکانی پاش شەڕی شومی دووەمی جیهانی و وێرانکاریەکانیەتی، هیوا و ئومێدەکانی بابردووانە و ناهومێدانە دەبینێت و دەنگی نارەزایی و تاریکبینانەی بێپەروا و بە بەردەوامی بلند دەکاتەوە، ئەم بەرهەمە شانۆییە نایابە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بە کۆمەڵێکی نوێ لە نووسەران و هونەرمەندانی لاوی ئینگلیزی ئاشنا دەبێت، کە هەموویان دژی کۆت و بەندی یاسا کۆمەلایەتیە کۆنەکان دەبن و بە (لاوانی تووڕە) ناوبانگ دەناسرێن.

ئابزن خۆی بە یەکێک لە لایەنگران و پێشڕەوانی پەیڕەوی ڕێبازی (برتۆڵد برێخت) دادەنێت و شانۆنامەی (لوثەر) لە ساڵی ١٩٦١ز، لەژێر کاریگەری شانۆی حەماسی برێختدا دەنووسێت، لە چەند بەرهەمی تریدا ئەم کاریگەریە وەک ڕۆژ دیارە. ئابزن لەم بەرهەمە شانۆییەیدا چیرۆکی ژیانی (مارتین لوثەر) قەشە و ڕاستکەرەوەی مەزهەبی لە سەدەی پازدەمدا باس دەکات، لوتێر دژایەتی لەگەڵ ڕابەری ئایینی و قەشەکانی

مەزهەبی کاتۆلیکدا دەکات کە لە خەڵکی پارە و باجیان وەردەگرت و دژ بە خواستی ڕابەر، کتێبی ئینجیل بۆ زمانی ئاڵمانی وەردەگێڕێت.

لە ساڵی ١٩٦٤ز، شانۆنامەی (بەڵگەنامەی نەگونجاو) و شانۆنامەی (نیشتمانپەروەرێک بۆ من) دەنووسێت. جان ئابزن، نەک هەر کاری شانۆ دەکات، بەڵکو کاری ڕێکخستنی سیناریۆ بۆ سینەما دەکات، وەک سیناریۆی (خۆنیشاندەر) و سیناریۆی (تۆم جۆن) کە نووسەری ناسراو (هێنری فیێلدنیگ) نووسیویەتی بە ناوی (مافلاندۆز) بۆ سینەما ئامادەی دەکات.

لە شانۆنامەکانی تری جان ئابزن وەک :

١ - (نووسینێک بۆ سەرگۆڕی جۆرج دلین).
٢ - (خۆنیشاندەر).
٣ - (دنیای پاوڵ سلکی).
٤ - (هۆی ڕیسوایی و نیگەرانی).
٥ - (لە لەفافی سادەدا).
٦ - (بەڵگەنامەی نەگونجاو).
٧ - (نیشتمانپەروەرێک بۆ من).

## ٤٩ - هارۆلد پینتێر

درامانووسی بەناوبانگی بەبەریتانی هارۆلد پینتێر لە ساڵی ١٩٣٠ز، لە ڕۆژهەڵاتی شاری لەندەن لە دایک بووە. باوکی یەهوودیەکی بەرگدروو دەبێت، هارۆلد پینتێر لە تەمەنی لاویدا شیعر دەنووسێت بۆ گۆڤارە ناوچەییەکانی دەنێرێت، لە کاتێکدا کە تەمەنی لە هەژدە بەهار تێناپەڕێت، بۆ خزمەتی سەربازی بانگ دەکرێت و سەرپێچی لەو بڕیارە دەکات و ناڕوات، لەبەر ئەوە دەدرێت بە دادگا و لە باتی ئەوەی کە زیندانی بکرێت بە بڕە پارەیەک تاوانبار دەکرێت کە بیدات.

هارۆلد پینتێر لە ئەکادیمیای سەڵتەنەتی هونەرە درامیەکانی لەندەن وەردەگیرێت و دەست بە خوێندنی هونەری دراما دەکات. ماوەیەک بە ناوی خواستراوی (داڤید بارون)ەوە دێتە گۆڕەپانی هونەری شانۆوە، ماوەیەکیش لەتەک گرووپێکی شانۆییدا دەست بە کاری نواندن دەکات و سەرتاسەری وڵاتی ئینگلستان و ئیرلەند دەکەن و ئەم گرووپە بەرهەمە شانۆییەکانی ولیام شکسپیر پێشکەش بە بینەرانی شانۆ دەکەن. لەساڵی ١٩٥٦ز، ژن دەهێنێت، ماوەیەک سەرگەرم دەبێت بە نووسینی ڕۆمانێک بە ناوی (کورتەبنەکان) و بە تەواوی دڵی لە شانۆنامە نووسین سارد دەبێتەوە. لەساڵی ١٩٥٧ز، یەکەمین شانۆنامەی خۆی بە ناوی (ژوور) لەسەر شانۆی زانکۆی (بریستل) پێشکەش دەکات، پاش ئەو، شانۆنامەی (شاگردی ئالی) و (چەژنی لە دایکبوون) دەنووسێت.

لە نیسانی ١٩٥٨ز، شانۆنامەی (چەژنی لەدایک بوون) لەسەر شانۆی هونەری (کمبریج) و پاشان لەسەر شانۆی (لیریک) ی لەندەن پێشکەش دەکرێت و پاش هەفتەیەک فرۆشتنی بلیت نابێت و بینەران پێشوازی لێ ناکەن، ڕووخانی ئەم شانۆنامەیە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هارۆلد پینتێر دەست بە نووسینی شانۆنامەی ڕادیۆیی بکات، هەر زوو چەند شانۆنامەیەک بۆ ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن دەنووسێت، لەوانە (ئازاری سووک) و (شەوێک لە دەرەوە) و (قوتابخانەی شەوانە) پینتێر لەڕێی ئەم بەرهەمە درامیانەوە ناوبانگ دەردەکات.

لە ساڵی ١٩٥٩ز، شانۆنامەی (کاروانسەراچی) دەنووسێت، ئەمە بە یەکەمین بەرهەمی بە پێز و سەرکەوتووی ئەو دادەنرێت و خەڵاتی باشترین شانۆنامەی لە ساڵی ١٩٦٠ز، پێ دەبەخشرێت. لە دواییدا شانۆنامەی (ڕێکخستنەوە) دەنووسێت و ساڵی ١٩٦١ز لەسەر شانۆ پێشکەش دەکرێت و پاشانیش لە ڕێگەی گرووپی شانۆیی (ڕوئیال شکسپیر) ە وە بۆ تەلەفزیۆنی لەندەن ئامادە دەکرێت و بڵاودەکرێتەوە. شانۆنامەی (داوێن پیس) بەرهەمێکی تری پینتێرە کە بۆ تەلەڤزیۆنی دەنووسێت و پاشان بۆ شانۆ ئامادە دەکرێت و گرووپی (ئارت تیاتر) لەسەر تەختەی شانۆی شاری لەندەن پێشکەش دەکرێت.

بە هاوکاری ڕێژەسۆری ئینگلیزی (پیتەر هال) شانۆنامەکانی پینتێربۆ شانۆ جۆراو جۆرەکان ڕێژەسۆری دەکات و پیشان دەدرێن، هێدی هێدی شانۆنامەکانی زیاتر سەرنجی بینەرانی شانۆ ڕادەکێشن، لە دواییشدا لەسەر شانۆکانی ئەمەریکا پێشکەش بە بینەران دەکرێن و سەرکەوتن بەدەست دەهێنن.

لە ساڵی ١٩٦١ز، دەست بە سیناریۆ نووسین بۆ سینەما و تەلەڤزیۆن دەکات، یەکەمین فلیمنامەی بە ناوی (پێشخزمەت) بەهاوکاری جۆزیف لۆزی (ڕێژەسۆر ئامادە دەکرێت. لەساڵی ١٩٦٣ز، سیناریۆی (کاروانسەراچی) و لە ساڵی ١٩٦٤ز، سیناریۆی (ناوک -کولکە خۆرەکان) و لە ساڵی ١٩٦٦ز، سیناریۆی (یادگارەکانی کوئلۆ) و لە ساڵی ١٩٦٧ز، سیناریۆی (ڕێکەوت) و لە ساڵی ١٩٦٨ز، سیناریۆی (جەژنی لە دایکبوون) و لە ساڵی ١٩٧١ز، سیناریۆی (نێوان گر) و لە ساڵی ١٩٧٦ز، سیناریۆی (دوا نوێنەر) بۆ سینەما ئامادە دەکرێن. هارۆلد پینتێر لە ساڵی ١٩٦٦ز، خەڵاتی شانازی لە لایەن دەسەڵاتی پاشاییەوە پێ دەبەخشرێت.

هەندێ لە زانایان هارۆلد پینتێر بە درامانووسێکی (ئیگزیستانسیالیست) و بێهوودە دەناسن، هەندێکی تر بە بەدرامانووسێکی تاکڕەوی دادەنێن، خۆیشی بەوە قایلە کە کاریگەری (فرانتس کافکا) و (ساموێل بیکێت)ی لە بیر و هۆشدایە.

**٥٠ - ئێدوارد ئالبی**

درامانووسی بەناوبانگی ئەمەریکی ئێدوارد ئالبی لە دوازدەی مانگی ئاداری ١٩٢٨ز، لە شاری نیویورک لە ئەمەریکا لە دایک بووە. کاتێک کە تەمەنی لە دوو هەفتە تێناپەڕێت، دایک و باوکی بە خێزانێکی تری دەسپێرن، ئەو خێزانەی کە پەروەردەی دەکەن بە خێزانی (ئالبی) دەناسرێن ؛ خێزانێکی دەوڵەمەند و بەناوبانگ دەبێت، باوکی ئەو خێزانە (ڕید ئالبی) خاوەنی چەند تەماشاخانە و هاوسەرەکەی بیست و سێ ساڵ لەو بچووکتر دەبێت ئێدوارد ئالبی لەم خێزانەدا بەناز و نیعمەتەوە پەروەردە دەبێت و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە قوتابخانە گرانبەها و باشەکانی ئەمەریکادا تەواو دەکات.

لە ماوەی خوێندنی ناوەندیدا دەست بە نووسینی چیرۆک و شیعر دەکات. لە تەمەنی بیست ساڵیدا لە خێزانەکەی جیا دەبێتەوە و دەست بە کۆمەڵە ئیشێک دەکات، وەک : شاگردی و دەستفرۆشی و نامەبەر، ماوی دەساڵ مەمرە و مەژی لە گوندی (گرینویچ) ژیان بەسەر دەبات. پاشان بەشێوەیەکی جدیتر دەست بە نووسین دەکاتەوە و درامانووسی ئەمەریکی (تۆرنتون ڤایلدێر) هانی دەدات کە درامانووسین بکاتە پیشەی خۆی. لە ساڵی ١٩٥٨ز، یەکەمین شانۆنامەی خۆی بە ناوی (ڕووداوی باخی ئاژەڵ) دەنووسێت و وەک دیاریەک بۆ یادی سی ساڵ لەدایکبوونی پێشکەش بە خۆی دەکات.

لە پێشدا گرووپە شانۆییەکانی ئەمەریکا گرنگیان بەم شانۆنامەیە نەدا، تا پاش چەند مانگێک لەتەک شانۆنامەیەکی ساموێل بیکێتدا لەسەر شانۆی بەرلین پێشکەش بە بینەران دەکرێت و ناوی ئێدوارد ئالبی دەچێتە لیستی درامانووسانی سەر بە ڕێبازی (بێهوودە). پاشان شانۆنامەی (مەرگی بسی سمیت) دەنووسێت کە دەربارەی ژیانی بسمی سمیتی ڕەش پێس و چیرۆک بێژە کە دەبێتە قوربانی جیاوازی ڕەگەزایەتی لە لایەن ڕەگەز پەرستەکانەوە، بۆ یەکەمین جار لەسەر شانۆی شاری بەرلین پێشکەش دەکرێت لە ساڵی ١٩٦١ز، شانۆنامەی(خەونی ئەمەریکایی) دەنووسێت، ئەم درامایە دەبێتە هۆی ئەوەی ئالبی لە ئەمەریکادا ناوبانگ دەرکات و بێتە یەکێک لە ئەندامە چالاکەکانی بزووتنەوەی شانۆی پێشڕەو. لە ساڵی ١٩٦٢ز، شانۆنامەی (کێ لە ڤیرجینیا والف دەترسێت) دەنووسێت و ناوبانگی جیهانی پێ دەردەکات، پاش ئەوەی بەسەرکەوتوویی لەسەر شانۆ پێشکەش دەکرێت، لەلایەن دەزگای سینەمایی (هالیود) ەوە دەکرێتە فیلم.

لەساڵی ١٩٦٤ز، شانۆنامەی (ئالیسی گچکۆکە) و لە ساڵی ١٩٦٦ز، شانۆنامەی (باری ناسک) و شانۆنامەی (سندووقی زیخ) دەنووسێت و لەهەمان ساڵدا لەسەر تەختەی شانۆ پێشکەش دەکرێت. ئالبی هەر وەک نووسەرانی تری سەر بە ڕێباز و باوەڕی (بێهوودە)یی هەوڵ دەدات بوونی سروشتی مرۆڤ لە شانۆنامەکانیدا وێنە بکێشێت، هەر بە هەمان بۆچوونی سارتەر، کامو، بیکێت، یونسکۆ، ژنە و پینتەر کە ئەو ڕیالیستیە لە مەنتیقی تایبەتی فەلسەفەی بێهوودەدا نیشانی دەدەن.

بە بۆچوونی نووسەرە ئەورووپییەکاندا بێهوودەیی و بێ هیوایی سروشتێکی فیزیاییە، بەڵام لای ئالبی دنیا کە هیچە لەبەر ئەوەی بنەما ئەخلاقی و ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان لە قەیراندان.

پاشان خۆی لەم ڕێبازە دەکشێنێتەوە و سەرقاڵی ئەزموونگەرییەکی ئاشکرا و چڕی کۆمەڵایەتی و خواستەکانی دەبێت، ئالبی دەزگا و لایەنە نەفرەت لێکراوەکانی کۆمەڵگای ئەمەریکی دەخاتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە. ئەوەی شایانی باسە لە بەرهەمەکانی ئالبیدا مەسەلە ناوچەییەکان گرنگیان کەمتر پێ دەدرێت تا جیهانیەکان، ئەو دنیایەی ئەو لە دراماکانیدا وێنەی دەکێشێت، هەموو جێگایەکە و هیچ جێگایەکیش نییە و جیهانیە تا تایبەت بە شوێنێکی دیاری کراوەوە.

# کۆمیدیای کەرایەتی

**لێدوانی: عەبدولڕەزاق بیمار**
**(بەغدا)**

خوێنەری خۆشەویست دەزانێ خۆ هونەر بە گشتی و ئەدەب بەتایبەتی هەر بریتی نییە لە ڕووی گرژ و فرمێسک و هەناسە و ڕوانینی ژیرانەی لەسەر لۆژیک دامەزراو. هەر بریتی نییە لە لایەنی مژاویی ژیان و خوتبەخوێنی و ئامۆژگاری و ڕاخوڕین! بەڵکو دیویکی تری هونەر و ئەدەب، ڕووناکی و خەندە بەخشین و دڵخۆشی و تەوس و پلار و پێکەنینە.

ئەگەر ئاوڕێکی مێژوویی لە ئەدەبێکی کۆنی وەکو ئەدەبی یۆنان بدەینەوە، دەبینین ئەفلاتوون لە هەموو جێیەکی (شارە مایەدارە)کەیدا، بە شوێن خەڵکی ڕووخۆش و پێکەنین هێن و شتی گاڵتەبازیدا گەڕاوە، چونکە پێکەنین لە سەرەتای بوونەوە خواستێکی مرۆڤانە بووە.. شا و گەدا و گاڵتەنەزان و گاڵتەجاڕ لە سێبەریدا هەموو لە یەک ئاستدا دەبن.

هەروەها ئەرستۆ وتوویەتی: هونەری کۆمیدیاش وەکو هونەری مەرگەسات، دەروون پاک دەکاتەوە و دەیگەیەنێتە (کاتارسیدس). جا لەو یۆنانەدا لە تەک شانۆگەریی بەناوبانگی مەرگەساتدا، کۆمەڵێک شانۆگەریی کۆمیدیاش لەو ساوە تائێستا ماوەتەوە و جێی ڕێز و شانازین.

شکسپیری مەزنیش شان بەشانی شانۆگەریی تراژیدیا بەناوبانگەکانی، کۆمەڵێک شانۆنامەی پێکەنین هێن و کۆمیدیای هەیە.

لە ڕاستیی ژیانیشدا وا دەبینم زۆربەی کەس دەتوانن خەڵک خەمبار بکەن و تاڕادەی گریان هەڵیان پێچن، بەڵام کەمیان دەتوانن دڵی خەڵک شاد بکەن و بیانخەنە پێکەنین. زۆر ئاسانە خەڵک زیز یان خەمبار بکەیت، بەڵام زەحمەتە بتوانی بە خەندەی لێو دڵیان ڕووناک بکەیتەوە.

لە لایەنی داهێنانیشەوە ئەدەبی کۆمیدیایی هیچی لە ئەدەبی دی کەمتر نییە، بەڵکو وەکو شارەزایان دەڵێن لە ژیانی خەڵک نزیکترە و چاکتر دەتوانێ خەم و خەیاڵ و هەڵسوکەوتی مرۆڤان بخاتە چوارچێوەیەوە، چونکە هەژار و پاڵەوانی ژین و گوزەران دەگرێتە بەرچاو و بەند نییە بە وێنەگرتنی پاشایان و سەرکردە و ئەندامانی چینە بەرزەکان.

بوونی ئەم جۆرە هونەرە کارێکی سروشتی و پێویستە، چونکە مرۆڤ پێویستی بە بینینی دیمەنی سەیر و بیستنی قسەی خۆش و ڕەخنەی بە تەوس و لاساییکردنەوەی نێسک سووکانە و کاریکاتۆر و نوکتە و هەموو ئەو شتانەیە کە پێکەنین پەیدا دەکەن. مرۆڤ بەبێ پێکەنین هەڵناکات و زانا و فەیلەسووفان وەکو نان و ئاو حیسابیان بۆ کردووە.

(مەکدوگل) دەڵێ: پێکەنین غەریزەیەکی گرنگە و زۆر سوودی زیندوو بەخشی هەیە، خەم و پەژارە لادەبات. (ئەمرسون) دەڵێ: ئەگەر پێنەکەنی زۆربەی بەدی و خەوش و هەڵەکانت دەخەیتە ڕوو، ژیان چ دەهێنێ ئەگەر خەندەی تێدا نەمێنێ!؟ چونکە ژیان بەبێ پێکەنین وەکو سەحرایەکی وشک و برنگێن وایە نە ڕووناکی و نە ژینی تێدا نییە.



پێکەنینیش هەر لە ئارەزوویەکی هەوایی و بێ بناغەوە نایەت، بەڵکو زۆرجار لەسەر بناغەی فیکر و رەخنەگرتن و چاکسازی و چارە دەکرێت، هەروەها تێکەڵ بە سیاسەتیش دەبێت و لە کۆڕی خەباتدا دەور دەگێڕێت. هەر پێکەنین خۆی هەڵدەگرێ هەر بۆ رابواردن و قسەی فێنک بێت هەڵدەگرێ مەبەستێکیشی لەژێردا بێت و ئامانجێک بپێکێت.. ئەمەش لە مەیدانی هونەردا بە روونی لە کاریکاتۆردا دەردەکەوێت.

وا بزانم هەر گەلە و ئەدەبەکەی بریتییە لە کۆمیدیا و تراژیدیا. هەڵوێستی گاڵتەنەزان و گاڵتەجار، جا ئەمیان کەمتر و ئەویان زۆرترە یان بە پێچەوانەوە، بەڵام دروست نییە و ناکرێ هەریەک لایەنی هەبێت! بەتایبەتیتر بڵێین لایەنی گاڵتە و پێکەنینی نەبێت.

گەلی ئێمە رەنگە لەبەر باری ژینگە و رووداو و کارەساتی مێژوویی بەرهەمی خەم و گریانمان زۆر و بە برشت بێت.. حەیرانمان، لاوکمان، مەقام و هەندێ سترانمان خەماوین تارادەی گریان. حیکایەت و بەیت و چیرۆکی هۆنراوە ئەگەر نەڵێم هەمووی بەڵکو زۆربەی زۆری هەڵوێستی بەراستی و گاڵتەنەزان و تراژیدیایان گرتووەتە بەر. دیوانی شاعیرانمان هەر لە مەلای جزیرییەوە تا شاعیرانی سەدەی نۆزدەمین هیچ پەنجەرەیەکیان بۆ شەماڵی گاڵتە و پێکەنین نەکردووەتەوە. تەنانەت هەڵبەستی هەجوشمان کەمە.

بێگومان باری ژیان و ژینگە و رەنگدانەوەی لە دەروونی گەلی کورددا بە روونی دیارە، دوور و نزیک، هەستیان بەو جۆرە ژیانە و بەو بارە دەروونییە کردووە، ئەوەتا نووسەرێکی رۆژاوایی جواناڤان راندل بەم جۆرە دەربارەی کورد دواوە:

«لە هەڵبەستێکی کۆندا هاتووە کورد لە چارەی نووسراوە. هەزار خەم و کەسەر هەڵگرێ، هەزار فرمێسک بڕێژێ، هەزار شۆڕش بەرپا بکات و هەزار هیوا دابگیرسێنێ.»

بەڵام لەسەر ئەوەشەوە گەلەکەمان حەز لە پێکەنین دەکات... ئەگەر وانەبوایە دیوانی شێخ رەزا ئاوەها ئاگری نەدەکردەوە و لای خەڵکی بەرێز و خۆشەویست نەدەبوو، سەرەرای ئەو هەموو سەر گوزەشتە و قسەی خۆش و لە کۆڕ و دیوەخاناندا دەگێڕدرێتەوە و سوحبەت لەگەڵ یەکتردا دەکرێت. هەروەها لە هەندێ لاوک و دیلانە و چیرۆکی میللیدا دیمەنی کۆمیدی بەرچاو دەکەوێ. لە سەردەمی تازەشدا رۆژنامەکان هەندێ وتاری گاڵتەجاری و تەوس و پلار و گۆشەی پێکەنینیان بلاوکردەوە. پاشان کەم کەم چیرۆکی تەمسیلی سەر رادیۆ و شانۆیی کۆمیدیایی پەیدا بوو.

لەم بوارەدا، کتێبی (کۆمیدیای کەرایەتی)ی نووسەری رۆژنامەنووس مەحموود زامدار کارێکی دیار و رەنگینە، نیشانەی بەهرەداری و گاڵتە دۆستی و رۆح سووکییە. ئەم کتێبە ساڵی (١٩٩٤) بە چاپێکی رێکوپێک و چەندین وێنەوە بلاوکراوەتەوە.

کتێبەکە پێشکەش کراوە بە کەر. کەرایەتی، کە ریلۆژیا، کەریالیزم و کەرانی دی... دوای زەرین واتا (پێشەکی) بە پێناسەی کەر دەست پێدەکا کەوا «دەعبایەکی (هێمن) و (هەژار) و (ناکام)ە مع سبق الاصراریش گەوج و ترەفام و گەلۆرە، دانیشتووانی کەر لەسەر رووی گۆی زەوی بەپێی (احصائیة)یەکی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە نا یەکگرتووەکان و یۆنسکۆ (٦٥) ملیۆن کەرە.» ئیتر دێتە سەر باسی کەریۆلۆژی و دێتە سەر ناوی کەر بە دوازدە زمانان و چۆنیەتیی ئەو زمانەی کەر لێی تێدەگات و مەقامی زەرە و رەوشتی کەر و کۆمەڵایەتی و ئارایشت و مەسەلەی زایندەیی کەر.

بەڵام نیشانەی رەسەنیی کەر فەلسەفییانە باس دەکا. کە گوایە کەری رەسەن (خاڵێک بە قەد پەنجاییەک بە دەستییەوەیە و مووی لێ نایە و دەکەوێتە دیوی ناوەوەی دەستی لە ژوور چۆکییەوە) ئەنجا دەڵێ: «لام وایە هەر ئەمەیشە کێشەی ئەبستمیو کەرایەتی لەنێو ئەنتلجنسیای ئێمەدا بەرپا کردووە. جا ئەگەر کەر ئەم هەموو ئەدگار و خاسیەتانەی هەبێت و (ئەنتولۆژیای) کەرایەتی نەبێ.. کەس نەتوانێ دەرکی پێ بکات»..

پاشان دێتە سەر ئەوەی لە کوردەواری و زمانی کوردیدا، هەروەها لە زمانانی بیانیدا دەربارەی کەر چی وتراوە، لەم رووەوە، گەلێ شتی سەیر و سەمەرە دەگێڕێتەوە، بەڵام سەیر و سەیران لە باسی کەر و دیپلوماسییەتدایە کەوا باڵیۆزی دەوڵەتان بە شێوەزاری زمان و نەریتی خۆیان قسە دەکەن.

وا چاکە ئەم برگەیە بۆ خوێنەرانی بەرێز دووبارە بکەینەوە:

باڵیۆزی ژاپۆنی: چەندیها کەریان چەندیهاها.

باڵیۆزی ئیتالی: سنیۆر ئەمیلیو کەرۆ.

باڵیۆزی رووسی: کەریا ترسۆڤ و خاتوونەکەی کوزکی قەشاویشۆڤ.

باڵیۆزی ئەمریکایی: مستەر کەندیرا و خاتوونەکەی سوزان مێکێر.

باڵیۆزی فەرەنسی: مسیۆ ژۆژو و کەرکی و خاتوونەکەی کوزها سمدار.

باڵیۆزی ئینگلیزی: مستەر ئەپۆ کێر و کەر و خاتوونەکەی ئۆڤیلیا کێردار.

باڵیۆزی ڤێتنامی: گام کوز کەر گام.
باڵیۆزی چینی: کەرنای گاک.
باڵیۆزی کوێتی: احمير فريخ آل الصباح
باڵیۆزی ئوردونی: عبدالماجد الحماميري.
باڵیۆزی جەزایری: مصنیاک بوحمیر.
باڵیۆزی تورکی: رفعت ايشك اوغلو.
باڵیۆزی ئێرانی: إنتصا بی قائم خر.
باڵیۆزی بەحرانی: عبدالله زب الحمير.
باڵیۆزی سعودی: مظروط المصيريط.
باڵیۆزی زامبی: داود ناڵ ناڵ.
سەرۆکی کۆنگرەی بێ لایەن: جیوجو کرش کرش.

ئەمجا بابەتی کتێبە ڕەنگاڵەکە دێتە سەر ئەو هەڵبەستانەی بۆ کەر وتراون وەکو بێکەس، شێخ ڕەزا، کانی، دیلان، حاجی، حەمەسدیق، بێ بەش، شێخ سەلام و شاعیرانی تریش کە ناویان نەنووسراوە و نموونەی هەڵبەستەکانیان نووسراوە و بە (ترە شاعیر) و (بێ نەدەبێک) و (پیرەکەر) و هی دی... پێشکەشیان دەکات. دەبینی شاعیرێک شیوەن بۆ کەرە مردووەکەی دەکات، شاعیرێکی تر بە پێچەوانەوە بەم شێوەیە هەجووی کەر و بەرەبابی کەران دەکات:

**کورتانی جاشێ بکەی لە حەریر**
**ئاخوڕی پڕکەی لە خورما و پەنیر**
**خواردنی ئاو و شەکراو و شیر بێ**
**کەرەوانەکەی زۆر سرک و ژیر بێ**
**جوبرائیل بدا ئالیک و ئاوی**
**تێری خوارد لە جۆ هەڵئەتیزێنێ**
**سەر و گوێلاکی خەلقی ئەشکێنێ.**

ئیتر پەلویۆ و قولنچک و بنی گیرفانەکانی شتی سەیرو ئالو والای زۆری تێدایە و (٥٨) لاپەڕەیە. پاش ئەمە وەکو پاشکۆ گۆڤارێکی کۆمیدیا دەست پێدەکا کە نووسراوە: «ژمارە سفری گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی گشتی کەر بازاڕی» پڕە لە کورتە هەواڵ و ستوون و گۆشە و هونەری ڕۆژنامەنووسی و شایانی خەنین و خوێندنەوەیە. لەم گۆڤارەشدا، نموونەیەک شیعری بیانی نووسیوە کە شیعری کەریلۆڤیچە، بە زمانێک نووسراوە هەموو کەسێک تێی دەگا.

ئەمە کۆیلەی یەکەمیەتی:

**ریکا ل سوسیا ل کەراتیخۆف**
**ئەنگلو کەرکوول تراوی**
**کەر تا تیخوف.. چروودی چروودی دیموکرات**
**کەرانیخا.. میللۆ، تریللۆ، سمیللۆ**
**ریکال ریکال سوسیالیزم**
**کەرەشمودی.. کەریترۆکا، سوسیال.**

هەرچۆنێک بێت، ئەم کتێبە ڕەنگینە بەرهەمێکی بوێرانە و پڕ لە داهێنان و وردەکاری و هونەر نواندنە لە کۆڕی قسەی خۆش و پێکەنین و گاڵتەجاڕیدا، بەڵام ئەگەر بە چاوی ڕەخنەگرانەوە هەڵی سەنگێنین، وا پێویست دەکا لە چەند لایەنێکەوە لێی بکۆڵینەوە:

- کتێبەکە لەنێوان پێکەنین و گاڵتە پێکردندا، یان لەنێوان گاڵتە و گەپی بێ مەبەست و ڕەخنەگرتن و تەوسدا.
- وشەی شەرم هێن و کۆمەڵ پەسند نەکەر، مەسەلەی جینس بەزەقی.. ئایا دەبێ بۆچی لە باسی کەردا مەسەلەی زایندەیی سەربار بکرێ، دەبێ لەبەر ئەوەبێ کە کەر لەبەر هێز و زەرەزەری بووبێتە سیمبۆلی جینس؟
- تێکەڵ بوون، هەندێ جاریش ونبوونی مەبەست و ڕێبازی نووسەر.

لێرەدا درێژە بەشیکردنەوەی ئەم سەرنجانە نادەین و نموونە لە کتێبەکە ناهێنینەوە، بەڵام هەر بە کورتی دەڵێین لە زۆر شوێن پێکەنین تێکەڵ بە گاڵتە پێکردن دەبێت کەوا ڕەخنەی کۆمەڵایەتی، تەنانەت سیاسیشی دەچێتە ناو بەڵکو دەبێتە برپراگەی گاڵتەکە.. نووسەر چ بە دەستی ئەنقەست یان بەبێ ئاگایی زۆرجار هەردوولا تێکەڵ بە یەک دەکات، یان کە لایەنە ڕەخنەییەکە هەیە مەبەستی تەواوی نووسەر و بیر و بۆچوونی خۆی دیاری ناکات، زۆر جاریش وەکو دەڵێن «لە ناڵیش دەدا و لە بزماریش». جاری وا هەموو لایەنەکان دەداتە بەر گورزی پەلامار. هەندێ جار گاڵتەکە سەر دەکا و دەگاتە ئاستی (جوێن) و پەلامار.

لایەنێکی گرنگ و بەرفراوانی کتێبەکە، مەسەلەی جینسە.. کە لە هەموو بابەتاکاندا پیاو زاڵ و سەرکەوتوو دیارە و شەرم و بێ ئابڕوویییەکە ژنان دەگرێتەوە.. گەلێ بابەتی وای تێدا هاتووە کە تۆ ناتوانیت لە کۆمەڵی پیاو و ژناندا بەبێ شەرم و هەست بریندارکردن باسیان بکەیت.. پەردەپۆشی و هونەر نواندن لە گێڕانەوەی قسەی خۆشدا پێویستە. ئەمڕۆ گاڵتە و تەوس و هەجوو کاری لە جوێن و باسی توخمبازی و وشەی ڕەوشت رووشێن ڕزگاریان بووە..

کتێبی (کۆمیدیای کەرایەتی) بەڕای من یەکێ لەسەر ئەم جۆرە شێوازە دڕ و بازاڕییانە نەکەوتووە، چونکە جگە لەو بابەتەش ئەوەی باسی کردووە شایانە ببێتە کۆڵەکەی نەلەرزیوی کۆمیدی بابەت.

# هەژانی بەرد

**لێدوانی: کەریم دەشتی**

(١)

نەوزاد ڕەفعەت، یەکێکە لە شاعیرە ناودارەکانی کوردستان و تا ئێستا بەدیوانی دارستانی ئەو بنارەو دیوانی نیگەرانی و بەفری گەرم، ڕەوتی شیعری نوێی کوردی بە ڕێچکە شیعرییەکی تایبەت بەخۆی ئاوەدان کردۆتەوە. لە ڕاستیشدا هەر لە حەفتاکانەوەو لەو شیعرەیەوە کە بە ناوی (فڕینی ئەسپێکی بێ باڵ) بوو و لە ژمارە (٨)ی ساڵی (١٩٧٣)ی گۆڤاری (بەیان)دا بڵاوی کردەوە، توانی بەتەواوی هەموو هێماو ئاماژەو بونیاتی قۆناغی بەر لە خۆی ببەزێنێ و بە وشە و ڕستەو دەستەواژەی جیاواز بێتە مەیدانەوە. (نەوزاد)، بە بەشدارییەکی هێمنانە و دوور لە قسەی گەورەو ئیددیعائات شتەکانی خۆی خستۆتە بەردەست خوێنەرانەوە؛ لەم دواییەدا دیوانی (هەژانی بەرد)ی بەچاپ گەیاند کە بریتییە لە (٦٩) لاپەڕەی قەوارە مام ناوەندی و (٢٥) شیعری کورت و درێژ، هونەرمەند (نامیق عەلی قادر)یش نیگاری بەرگی بۆ کێشاوە، وا لە خوارەوە بەشێوەیەکی کورت باس لە هەندێ لایەنی ئەو دیوانە دەکەم.

(٢)

پرۆسەی نووسین لای شاعیر وەک دابەزینە لەناو دوورگەیەک کە یەکەمین جارە بۆی دەچێ، هەندێ جار ئەم دوورگەیە جگە لە چەمک و واتا هیچ ڕەهەندێکی دیکەی نابێ، هەر بۆیەش شاعیر هەوڵ دەدات ئەم چەمک و واتایانە بگرێ و دۆڵی شیعری بۆ بکاتەوە، بەڵام کە بەرێشمەی ئەم چەمک و واتایانەدا دەچێتە ناو دنیای شیعر، هەموو گیانی دەبێتە پرسیار: کە لەسەرجەمی ئەم دیوانەدا بە دیاردەکەوێ وەک:

**کەس نیوچەوانی بەرامبەر خۆڵەمێشیان گرژ دەکا ؟**
**کەس هەڵاڵەی گوڵی گەردنلار هەڵدەمژێ؟**
**حاجی لەقلەقی دڵشکاو بێتەوە کوێ؟**
**بێنەوە کوێ؟**

*

**بۆ چڵە زەیتوون عادزە؟**
**بۆ چامەنووسی بەوەفا لانەوازە؟**
**بۆ دەمولێو وەک پێشوو خۆڵ ڕاناموسێ؟**
**ژنێ، بەردێ لە سینگ و سیما هەڵناسوێ؟**
**بۆ دەفزەنانی ئەڵقەی سۆز،**
**موریدانی ڕووگەی هەق و خێر خەمبارن؟**
**بۆ مامزە قوچزێڕە میسکدارەکان بریندارن؟**

*

**ئەی کێ کۆترە تاوسییە بێ باڵ سوورەکان هەڵبدا؟**



کێ بەدوای پشیلۆکە پایزەی نامەبەری
دەم بەقلە جۆدا غاریدا؟

*

سەر هەڵبڕێ و بەترسەوەو لە دوورەوە بۆی پێبکەنێ؟
بەدزی پڕ هەردوو گیرفان
مورتکی مۆرهەڵگەڕاوی تۆزلێنیشتووی
ئەمبەرو ئەوبەر شەقامی بەلەنجەولاری بۆ بڕنێ؟
هۆدا.... بۆ فرفرۆکەی من باش ناسووڕێ؟
بۆ خاڵخاڵۆکە لە پەنجەی من نانیشێ؟

*

هەنگی مێرگی خۆڵەمێشین کوێ هەڵمژێ؟
جەمشید لە جامی بەتاڵدا چۆن بڕوانێ؟
(خەییام)ی تینووتر لەلم
لە نێو سواڵەتی کووپەدا چی بیژێ؟
کوڕپەی بەر مەمکی مۆمیاژن کەی شیر بژێ؟

*

کەس شەپۆڕ و کفن دەکڕێ؟
لە کوێ لاوک و سەردولکەی کارساتی تر بنووسین؟
کوێی لەشولاری پەیکەری خەڵووزی پەتی ڕامووسین؟
تێناگەم بۆ ناخ بەکینە و زۆر دەتەنرێ؟
بەچەند نوێژی لە دڵڕا پاک دەبنەوە؟
ئاوا بێ باکانە مێگەل پەرە دەکا؟

*

چەکوشی کێ دڵڕەقیی دیوانی پێ نەرم دەکرێ؟
ئاخۆ ئێستا لەم چرکەیەدا لە کوێیە؟

*

دۆزەخی ترن یا.... نیرۆن؟

*

ئەو منداڵە چەتوونە غەریبانە کێن؟
ئەی هاوڕێکانی من لە کوێن؟

*

چ ئەفسوونێ
دەسەلاتی دێوی چ بەهرەو ئەزموونێ
ئەم نژارەی بنیات ناوە؟
هێلانەی وورد وورد نەخشاوی کام هوزارە؟

*

تازە سترانی لاوێنی و عیشق دەچڕی؟

*

نازانم بۆ بازی هەستی من دەبیینێ هی ئەوان نا؟

*

قەیناغی پەنجەی چ بەد بینییێ بینی گرتووە؟

*

چ گورگێ خۆی بۆ دەرفەت لە حەشار ناوە؟

*

چەندیان، چەندیان گینگڵدان و هاواری بوێ؟

*

بەقـــــەدەر من بـەبێ و پەلـکەزێڕینـەی ئەم زەنـوێرە بەختەوەرە؟

*

چۆن دەگــاتە پلەی ئۆخــژن مــوریدێ پەرداخی بەتاڵ هەڵبدا؟

*

چییە دیسان نیگەرانی؟

*

یاخود بەخوێن پێیان ببەخشم نەمری؟

*

یاگۆی سەری گوڵشەمزێن و ئەڵقە لە گوێم
لە تەرازوویێ دادەنا؟
بەم جۆرەو هێندە دەشەمزا؟

*

ئاوا دەریای سووری هەژانی تێبزێ؟

*

هەنگاوی هەڵنەدەهێنا؟

بەمــجـۆرە دەبـینین ســەرجـەم دیوانی (هەژانی بەرد)ی نەوزاد ڕەفعەت شەڵاڵی پرسیارەو وەڵامیش هەرگیز لە نێو دارستانی چڕی ئەم دوورگەیەدا نادۆزرێتەوە جگە لەو چەمک و مانایانەی کە خۆی لە هەر لق و گەڵاو جۆگەو بەردو ئاو و خــاک و خــۆڵێ هەڵدەهێنجێ، ئەو هەمــوو پرســیــارەی شــاعــیــر هەڵبــەت لە پای ئەو گــومــانە گەورەیەوەیە کە شاعیر لە دەوروبەرو زاتی خـۆیدا بۆی دروست بووە، کـە هەر هەمـوویان پرسـیـارن لە خـود، لە بوون، لە کەینوونە، هەندێ جار مامەڵەی شاعیر لەناو ئێمەی مرۆڤدا دەکەوێتە سەختەندازو ناچار پەنا بۆ دنیای نائاقڵی ئاژەڵان دەباو بە موفرەدانی ئەوان مامەڵە لەگەڵ شیعر دەکات و باڵدارو مەل و ڕووەکان دەگرێ:

هوما، شاتاوس، چۆلەکە، مێرووله، کوکوختی، کۆتر، لەقلەق، چلــە زەیتــوون، مـامـزی قـۆچزێڕ، باخ، سـێـو، هەنگوین، ئیردم، دێو، شـامامـز، گـیای ژیان، سیمرخ، هێلکەی پیس، تەوتەم، داڵاش، گـوڵەلیـمـۆ، هەناری دانەمــرواری، درکــەڵان، کــەروێشکی ڕاونراو، گــوێ شەیتـانۆکە، پشـیلۆکەی دەم بەقلەجۆ، مورتک، بلبلی هەزار ئاواز، خاڵخاڵۆکە، گوڵی چاو قـەوزە، ئەژدیها، گاران، شاپەری، پەری قوو، گوڵزار، ئەسپە ئاوی، شای ئەجندان، تاڵیـشک، مـاسـیگرە، عـەزیا، کـەڵەشـێـر، ئاسک، مۆرانە، قورینگ، قۆچی سیسرکە، ماینێکی بژ بەقـور، بازی بێـچـوودزراو، مـێگەل، هەسپی کـەحـێڵ، چەقــەڵ، هەڵۆ، پڵنگ، کــارژۆڵە، دێـوەزمــە، کـناچە، گـوڵەمـێـخـەک، بەران، ئاو، ئاگـر، هەوا، خـۆڵ، پەپووە

سلێمانە، ڕەنگاڵە، نێرگس، گوڵاڵە، تەیر، ماینە حدوود، تیتروانک، گورگ، هەنجیر، شینە شاهۆ، درندە، هوزار، هەرمێ، ڕیشۆڵە، کولیک، پەلکەزێڕینە، زەنوێر، کانیاو، دارکونکەرە، پونگجاڕ، بەلاڵووک، کولیلک.

(٣)

پەنا بردنی شاعیر بۆ دنیای گیاندارو ڕووەک، گەڕانەوەیەکی زۆر بە بڕستە بەرەو ئەو سروشتەی کە دەیەوێ لەگەڵیدا بێ، گەڕانەوەی نەوزاد ڕەفعەت، گەڕانەوەی ئەدیبانی دنیا نییە بۆ وەدەستهێنانی ئەو زەمەنەی کە لە دەستی چووە، بەڵکو گەڕانەوەیە بۆ ئەوەی ببێتەوە هەمان ئەو بنجە گیایەی کە لەسەریدا خولقاوەو دووبارە لەگەڵ سروشت یەکتر بگرنەوە... هەر بۆیەش ناچارە پەنا بەرێتە بەر ئەو سیمبولانەی کە ئەم چەمکە لەکاتی مامەڵەکردنی شیعریدا دروست بکەن وەک:

جان فال جان، مۆنالیزا، جەمشید، میدیا، ئاناتۆس، ئایرۆس، حەللاج، ئاوی میری، ڕێست هاوس، ئینانا، کافکا، نالی، بداغ سوڵتان، ئەنتیگۆنا، شایلۆک، ئۆدیب، فۆبیا، ئیرەم، زیۆس، ئەنکیدۆ، هێنری باربۆس، دۆنکیخۆت.

(٤)

شاعیر هەربەوەندە ناوەستێ، بۆ زیاتر پەیبردن بەم چەمک و واتایەی نێو دوورگەی ئەم داستانە، بەناچاری بەدوای وشەدا دەگەڕێ، کە زۆربەیان لە زمانی قسەکردنی ڕۆژانە دوورن، ئەو لە نێو باخی زماندا بەدوایاندا دەگەڕێ و دەیانچنێ وەک:

میسکدار، نکال، کرێت، پەرجوو، بارژن، تانۆک، بنێس، داروەکاز، خەنیم، خونکار، گەچران، تیردان، خازبیانە، ڕمووزن، کناچە، داوەڵ، شووری سمئەڵماس، پشقۆژە، پزیسک، نماوی، ئاومالک، خێوڕەوێن، دەفشکێن.

(٥)

دیوانی (هەژانی بەرد) پڕیەتی لە شیعری جوان، ئەو شیعرەی کە شاعیر دوای شەونخوونییەکی زۆر و هەڵگێڕو وەرگێڕکردنی لاپەڕەکان و لێکدانەوە، خستوونیەتە بەردەستی ئێمە. (نەوزاد ڕەفعەت)، چ لەڕووی بەواتا کردنی بابەتەکانەوە چ لەڕووی هەڵبژاردنی وشە و ڕستەوە شاعیرێکە لەگەڵ سەرجەم شاعیرانی نەوەی خۆیدا جیایە. شاعیر وشە لەبەرد دادەتاشێ و ڕۆحیان دەقەبەڵ دەکات.

دەستخۆشی لە هاوڕێی شاعیرم (نەوزاد ڕەفعەت) دەکەم و لە چاوەڕوانیی بەرهەمی نوێتریداین.

# جوولەکەکانی کوردستان

لێدوانی: عەباس سلێمان سمایل

جوولەکەکانی کوردستان کتێبێکی قەوارە گچکەی (١٣٢) لاپەڕەیە، لەنووسینی (ئەحمەد باوەڕ)ەو لەساڵی (٢٠٠٠) لەسلێمانی لەچاپ دراوە، نووسەر لەنووسینی ئەم کتێبە سەرەڕای سوود وەرگرتن لەژمارەیەکی زۆر لەکتێب و گۆڤارو ڕۆژنامە کە پێوەندییان بەم باسەوە هەیە، ڕەنجێکی زۆریشی کێشاوە بەوەی ناوچەکانی کوردستان گەڕاوە بەتایبەتی خانەقین و کفری و سلێمانی، کە ژمارەیەکی زۆری جوولەکەی تێدا نیشتەجێ بووەو دیمانەی لەگەڵ ژمارەیەک لەو کەسانە سازداوە کە لەگەڵ جوولەکەکانی ئەم ناوچانە ژیاون و تا توانیویەتی بەرهەمێکی باش بخاتە بەردەست کە بووەتە جێگای ڕێزو سوپاس.

## بەشەکانی

### بەشی یەکەم
### کورتەیەک دەربارەی کێشەی جوولەکەو سەرهەڵدانیان لەڕۆژهەلات و کوردستاندا

بەهۆی ئەوەی تا ساڵی (١٨٩٧) جوولەکەش وەک گەلانی دیکەی ڕۆژهەلات هەستێکی نەتەوایەتی ئەوتۆیان نەبووە کە مێژووی خۆیان بنووسنەوە و کۆمەڵەو ڕێکخراو دروست بکەن و بیر لە دروستکردنی کیانێکی سەربەخۆ بکەنەوە، ئەوی نووسرابێتەوەش لەلایەن مالم و پیاوانی ئایینی بە هەستێکی ئایینی نووسراوەتەوە، بۆیە ئەمڕۆ مێژووی جوولەکەی کوردستان شتێکی ئەوتۆی لێ نازاندرێت.

هەروەها یەک لەهۆیەکانی نەنووسرانەوەی مێژووی جوولەکەکانی کوردستان، جێگیرنەبوونیانە لەگوندێک، یان شارێک و بەردەوام جێ گۆڕکێیان کردووە و بەدوای شوێنی باشتر گەڕاون بۆ کاری بازرگانی و پیشەی دەستی، هەروەها ژمارەشیان زیادی نەکردووە بەهۆی بەردەوام بوونیان لە هاتنە سەر ئایینی مەسیحی و ئایینی ئیسلام، دوژمنکاریشیان لەگەڵ ئەو کەسانە، یا ئەو بنەماڵانەی کە لە ئایینی جوولەکە وەردەگەڕان، یا ئەو کچانەی کە شوویان بە موسلمان، یا مەسیحی دەکردو دەبوونە ئیسلام، یا مەسیحی نەدەکرد.. نموونەش لەسەر ئەم بنەماڵانەی کە بوونەتە مەسیحی و موسلمان زۆرن کە لەنێو ئیسلام بەمانە وتراوە (بن جوو).

وڵاتانی دەرەوەش هەوڵیان بۆ نەداون لە قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ کۆیان بکەنەوە، هەروەها باروودۆخیش لەبارنەبووە، تا ئەوکاتی یەکەم کۆنگرەی جیهانی لەشاری (پاڵ)ی سویسرا بەسترا لەمانگی ئابی (١٨٩٧)دا بەسەرۆکایەتی یەکەمین سەرکردەی ڕۆحی جوولەکە، لەوکات بەدواوە کێشەی جوولەکەکانی جیهان وەک کێشەیەکی ئەوتۆ هاتەکایەوە بەردەوام لەکۆڕو نێوەندە نێودەوڵەتییەکان باسی لێوە دەکراو بەتایبەتی لەلایەن سیاسەتمەدارانی بەریتانیاو ئەمریکا زۆربایەخی پێدراو حیسابێکی تایبەتیان بۆ کردبوو بەمەبەستی سوودوەرگرتن لەدوارۆژ.

### بەشی دووەم
### ڕەگەزە سەرەکییەکانی جوولەکە لەجیهانداو شێوازی دابەش بوونیان لەکوردستانی باشووردا

نووسەر لەم بەشەدا جوولەکەکانی جیهانی دابەشی سەر ئەم بەشانە کردووە.

١- جوولەکەی سفاردیم: ئەمانەش بەزۆری ئەو جوولەکانە دەگرێتەوە کە لە وڵاتی ئیسپانیاو دورگەی ئیبری ژیاون، بەتایبەتی لەسەدە ناوەنجییەکاندا (٤٧٦-١٤٥٣ز)، دوای ئەوەی لەساڵی (١٤٩٢ز)وە وەدەرنراون و لەوێوەش ڕوویان کردۆتە وڵاتانی وەک فەرەنسا، هۆڵەندە، ئینگلتەرە، یۆنان، باکووری ئەفریقیا و تورکیا و ئەمەریکا و وڵاتانی دیکە.



جا جوولەکەکان لەم وڵاتانەدا توانیویانە زمان و دابونەریت و ئایینەکەیان بپارێزن، زمانەکەشیان بەزمانی (لادیتۆ) ناسرابوو، کەشێوەیەکە لەشێوە زمانەکانی ئیسپانی، ژمارەیەکی زۆری وشەی (عیبری)شی لەگەڵ تێکەڵاو بوو بەخەتی (عیبری)یش دەنووسرایەوە.

٢- جوولەکەی ئەشکەنیزم:

ئەوانە بە بنەچە دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی ئەڵمانیا و بەشێوەیەکی ئەڵمانی کۆن قسە دەکەن بەناوی زمانی (یدیش) و کەوتۆتە ژێر کاریگەری زمانی عیبری و خەتی (عیبری)یش بەکاردەهێنن لەنووسینی زمانەکەیان.

ئەم جوولەکانە لەسەدە ناوەندییەکان بەوڵاتانی دەوروبەری ئەڵمانیا بڵاوبوونەوە.

٣- جوولەکەی دۆنمە بەرەسەن یۆنانینەو لەدوای ساڵی (١٦٢٦) بەهۆی داهێنانی بیروڕایەکی نوێ لەئایینی جوولەکە، گەیشتنە وڵاتی تورکیا. هەندێک لەمێژوو نووسەکانیش هەر بە ڕەسەنی جوولەکەی ئەسپانیان داناون.

٤- جوولەکەکانی ڕۆژهەڵات و کوردستان.

ئەوانەش جوولەکەکانی کوردستان- عیراق، ئێران و دەوروبەریان دەگرێتەوە کە بەزمانێکی ئارامی نوێ قسە دەکەن و بەزمانی (تارگۆم) ناسراوە.

بۆ یەکەمین جار پاشای ئاشووری (شەلمانسەری سێیەم) (٨٥٨-٨٢٤) پ ز) دوای داگیرکردنی فەلەستین ژمارەیەکی لەجوولەکەکان گواستەوە کوردستان و دوابەدوای ئاشوورییەکان پاشای کلدانی بوخت نەسری (٥٩٧-٥٨٦ پ ز) بەدووجار ژمارەیەکی زۆری لەجوولەکەکانی فەلەستین گواستەوە ناوەڕاستی عیراق و پاشان بە باشووری عیراق و لورستان بڵاوبوونەوە تا هەمەدان و خۆزستان دوای ئەوەی ئەخمینییەکان ئیمپراتۆریەتی میدیا دەڕووخێنن و ڕێگا بەگەڕانەوەی جوولەکەکان دەدەن بۆ فەلەستین، تەنیا (٤٠,٠٠٠) هەزار یان دەگەڕێنەوە. هەروەها لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتاب ژمارەیەکی دیکەی جوولەکە ئاوارەی عیراق دەبن.

جا ئەو جوولەکانەی هاوردنیان بۆ کوردستان لە هەموو وڵات بڵاوبوونەوە و بەردەوام کاسبیان کردووەو دوژمنکاریان لەگەڵ هیچ ئایین و مەزهەبێک نەکردووە و هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئایینی جوولەکەشیان نەداوە، مەگەر ئی وا هەبێ خۆی ئەم ئایینەی قەبووڵ کردبێ، هەر لەکۆنەوەش مەڵبەندی سەرەکییان هەولێرو مووسڵ بووە، دوای ئەوەی بنەماڵەی فەرمانڕەوایی ئەدیابین (حدیاب) کە بەرەسەن سکایی بوون، دەبتە جوولەکەو پاڵپشتی ئەم ئایینە، ئینجا دانیشتووانی هەولێر بەجارەکی دەبن بەجوولەکە، بەڵام ئەم ئیمارەتە لەکۆتایی ساڵی (١١٥ز) بەدەستی (تراجان)ی ڕۆمانی دەڕووخێ و پاشانیش هەولێر دەکەوێتەوە ژێر دەستی ئەشکانیەکان. شاری (مووسڵ)یش هەر لەکۆنەوە ناوەندێکی خوێندنی باڵای جوولەکەکانی ڕۆژهەڵات بووە تا ئەوکاتی لەساڵانی (١٩٤٨-١٩٥١) دەگەڕێنەوە فەلەستین.

هەروەها نووسەر لەسەر چۆنیەتی ژیان و دابونەریت و کارو پیشەیان دواوە بەتایبەتی جوولەکەکانی خانەقین و کفری و سلێمانی، کە زیاتر بە بازرگانی و جۆرەها پیشەی دەستی خەریک بووینە وەک تەونکاری و خمچیاتی، بەردەوام زیارەتی گۆڕە پیرۆزەکانیان کردووە، لە ئاهەنگەکانیشیان هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ کورد نەبووە لە هەڵپەڕکێ و گۆرانی وتنیان بەزمانی کوردی. دوای ئەوەی گەڕانەوە ئیسرائیل تاکو ئەمڕۆش جلی کوردی لەبەردەکەن و ئاهەنگی کوردی دەگێڕن و گۆرانی کوردی دەچڕن. خۆشیان بەڕەگەزی کورد دادەنێن، لەوانە (ئیسحاق مەردخا)ی وەزیری بەرگری ئیسرائیلە کە دەڵێ، من کوردێکی (ئاکرێ)ی کوردستانم.

لەکۆتایی ئەم بەشە، نووسەر لەگۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەدوێ وەک نەبی دانیاڵ و نەبی ناحوم کە ساڵانە بۆ حەج کردن دەچنە زیارەتیان، دانیاڵ لە (کەرکووک)ەو (ناحوم) لە ئەڵقوش، سەرەڕای زیارەتی گۆڕی هەندێ لەپیاو چاکەکانیان وەک گۆڕی (بێ هەزان) لە ئامێدی.

## بەشی سێیەم
## هۆکارەکانی کۆچکردنی جوولەکەو جوولەکەکانی ڕۆژهەڵات و کوردستان بۆ ئیسرائیل

هەر لەدێرزەمانەوە گەلان بەهۆی نەهاتی و شەڕو بڵاوکردنەوەی ئایینی و ڕەڤین لەبەردەم داگیرکەران و کۆچ و کۆچبارییەوە لە شوێنێکەوە چوونەتە شوێنێکی دیکە. جا هەندێک لەو بڕوایەدان کە جوولەکە هەر لەکۆنەوە کۆچەر بووینە، بەڵام پێچەوانەی قەرەجەکان بووینە، کاسب و دەست پاک و پارێزگاری زمان و ئایین و دابونەریتیان کردووە، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت جوولەکە لە فەلەستین خاوەنی ئیمارەت بووینەو هەمیشە ژێر دەستەییان قەبووڵ نەکردووە، بۆیە لەلایەن دوژمنەکانیانەوە دەربەدەرکراون، بەڵام حەزرەتی موسا لەگەڵ ژمارەیەک لەپێرەوەکانی کە کۆچی کرد لە میسر بۆ فەلەستین، بۆ گەیاندنی پەیامەکەی بوو بۆ دانیشتووانی ئەو وڵاتە، نەک بۆ کاری دیکە، وەک چۆن پێغەمبەر زەردەشت ئازربایجانی بەجێ هێشت و لە شاری بەلخ (ئەفغانستانی ئەمڕۆ) ئایینەکەی بڵاوکردەوە و حەزرەتی ئیبراهیم-یش لەکوردستانەوە چووە جزیرەی عەرەبی و پێغەمبەر محەمەد (د.خ) بۆ پاراستنی گیانی موسڵمانەکان چووە لای نەجاشی پاشای حەبەشەو پاشان بۆ شاری مەدینە کۆچی کرد و لەوێوە ئایینی ئیسلام بەشێوەیەکی فراوان بڵاوبووەوە.

کەواتە جوولەکە لەئەنجامی شەڕو شکستیان ئاوارە بوون یا بەدیل گیراون و گواستراونەتەوە. جا ئەو ئاوارەبوونە وای لێکردن کە جۆرە سۆزێک لەنێوانیان

دروست بێت و ڕاست و دەستپاک بن لەگەڵ یەک و هەمیشە بیریان لەگەڕانەوە بۆ فەلەستین دەکرد. دوای جەنگی یەکەمی جیهانیش کە بارودۆخ لەبار دەبێت بۆ گەڕانەوەیان، ژمارەیەکی کەم لەجوولەکەی ئەوروپا گەڕانەوە لەگەڵ جوولەکەی فەلاشای حەبەشەو جوولەکەی دەوروبەری دەریاچەی قەزوین کە لە ڕەگەزی (تورک و مەغۆل)ن و هەموو جوولەکەکانی عیراق و کوردستان گەڕانەوە، تەنیا بەشێک لە جوولەکەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات نەگەڕانەوە.

جا بەهۆی ئەوەی جوولەکەکانی کوردستان زۆر ڕێزیان گیراوە لەلایەن گەلی کورد، ناوچەو شارو گوندەکانیان زۆر خۆشدەویست و ژمارەیەکی زۆریان ئارەزوویان لەگەڕانەوە نەبوو، بەڵام دیاربوو فەرمانیان پێ کرابوو هەردەبێ بگەڕێنەوە فەلەستین، بۆیە بەگریان و دوعا بوون لەهاوسێکانیان باریان دەکردو دەڕۆیشتن. تاکو ئەمڕۆش خەون بەکوردستان دەبینن و چاویان لە شارو گوندەکان و دوکان و باخ و بێستان و مەڕو ماڵاتەکانیانە.

گەڕانەوەشیان لەساڵانی نێوان (١٩٤٨-١٩٥١) بووە، بەڕێگای ئێران، تورکیا، جوولەکەکانی مووسڵ و کەرکووک و هەولێریش لەڕێگەی بەغداد و وڵاتی ئوردەن-دوە دەگەڕانەوە فەلەستین. دامەزراندنی دەوڵەتەکەشیان بیرۆکەی جوولەکەیەکی بەڕەگەز ڕووسی بوو بەناوی (حایم وایزمان)، لە ئەنجامدا بەڵێنی (ئارثەر جێمس بلفۆر)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیای لێ کەوتەوە، سەبارەت بەپێک هێنانی دەوڵەتی ئیسرائیل، ئینجا دەست کرا بەگواستنەوەی جوولەکە لەسەرەتای ساڵی (١٩١٩) تا ساڵی (١٩٧٣).

**پەراوێزەکان:**

نووسەر هەرچەندە کتێبەکەی بەناوی جوولەکەکانی کوردستانەو پوختەیەکی باشی لەمێژوو و دابونەریتیان خستۆتەڕوو، بەڵام ئەم بابەتە زۆر فراوانەو بەدەیان کتێبی وەک ئەمە هەڵدەگرێت. گەلێک کە زیاتر لە (٢٥٠٠) ساڵ لەکوردستان نیشتەجێ بێت مێژوویەکی پڕ لە خەبات و کارەسات و ڕووداوی هەیە و خاوەنی دابونەریت و زمان و جۆرەها بەندو سەرگوزشتەیە هەر بوارێکی لە بوارەکانی ئاییینی و قۆناغەکانی ناوی مرۆڤی و ڕەوشتی ژیانیان پڕە لەگەوهەر.

تەنانەت جوولەکەکانی شاری هەولێرو دەشتەکەی هەروەک بەساڵاچووەکان لێیان دەگێڕنەوە لەگوندەکانیان (شارە) و (شابان) و (عەوێنە) و گوندی دیکە بەلێکۆڵینەوەی مەیدانی بەچەند کتێبێک تەواو نابێت، لەزۆر بەساڵاچووم گوێ لێ بووە کە جاران جوولەکەی ناوشاری هەولێر هەموویان لەسەر قەڵات نیشتەجێ بوون و دەوروبەری (٢٥٠) ساڵ-یش دەبێت حکومەتی عوسمانی ئەوانی گواستەوە بۆ خوارەوە و گەڕەکێکیان لەنزیک گەڕەکی کورەچییەکان لەسەر بەستەکە دروست کرد بەناوی گەڕەکی جوولەکان، ئەوکاتی مەسیحی-یش لەخوارەوەی قەڵات هەبووەو چەند کەنیسەیەکیشیان هەبووە، لەوانە دێر بریشەیە تا ساڵانی سییەکانیش کاولگەکەی هەر مابوو لەنزیک مزگەوتی شێخی چۆلی ئەمڕۆ بووە.

هەروەها جوولەکەی هەولێر چەندەها مرۆڤیان لێ هەڵکەوتووە کە خزمەتی کوردیان کردووە لەوانە مامۆستا (دانیال قەساب)ی نیگارکێشە کە قوتابیەکی زۆری کوردی کردە نیگارکێش لەوانە مامۆستایان (نەژاد بەرزنجی، سلێمان شاکر)ن، هەروەها تابلۆکانی مامۆستا دانیال هەمووی تەعبیر لە کۆمەڵگای کورد دەکات.

* بێجگە لەم جۆرە جوولەکانەی کە نووسەر باسی کردوون، جۆرێکی دیکەش هەن لەپاکستان و ئەفغانستان، بەڵام ئەمڕۆ هەموویان بوون بە موسڵمان مەگەر بەدەگمەنیان لەسەر ئاییینی جوولەکە مابن ئەمانەش لەجوولەکەکانی (خەیبەر)ن دوای شەڕی خەیبەر، بەڕێگای دەریای سوورو زەریای هیندی گەیشتوونەتە ئەوێ، ئاسەواری ئەمانەش زۆر دۆزراوەتەوە بەزمانی عیبری، جوولەکەکان دەڵێن سەرپۆشی ئافرەتانی ئەفغانستان-یش، سەرپۆشی ژنانی جوولەکە بووە.

* ژمارەیەک لەمەسیحییەکانی ئەلقوش لەڕەگەزی جوولەکەن وەک بنەماڵەی (لشکیتە و شکوانا).

* ئیشکناز: ناوی کوڕێکی حەزرەتی نووح بووە، حەزرەتی (نووح)یش لەڕەگەزی سۆمەری بووەو لەنووسینە بسمارییەکان ناوی بە ئوتوناپشتم هاتووە.

* چەند جارێک لەکەناڵی تەلەفزیۆنی ئیسرائیل دیومە کە ڕیشەی جوولەکەیان بردۆتەوە سەرنەوەی حەزرەتی ئیبراهیم، حەزرەتی ئیبراهیم-یش هەروەک سەلماوە لەکوردستان و باشووری عیراقەوە چووەتە فەلەستین و نیوە دورگەی عەرەبی، کەواتە جوولەکە دەبێت لە ڕەگەزی گەلانی میسۆبۆتامیاو زاگرۆس بن و وەک کاشیەکان زمانی ئەکەدیان کردۆتە زمانی ڕەسمی دەوڵەت و بازرگانی.

* جوولەکەی کوردستان بەشێکی زۆری ناوی مرۆڤیان کوردییە وەک: ئەستێر، یان ئەستێرە، بنەوشە، خوازە، ماریە، شینە، سەیدۆ، میرۆ، گابای، گەور، بادۆ، نیسان، میر، دەرویش، زلوف، مراوی، تەتۆ، مادۆ، جاوید،..

**سەرچاوەکان:**

١- مێژووی جووە کوردەکان، و: لە ئینگلیزییەوە زەردەشت موکریانی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژ(١٧).

٢- حەمکێ تۆڤێ، د. مەسعوود کتانی، چاپی یەکەم، ٢٠٠٠.

# وەڵامێک بۆ ڕەخنەیەک!

د. موحسین ئەحمەد عومەر

.... کورد دەمێکە ئەو کێشەیەی سەر بە ئەقڵ و ئاوەزی براندۆتەوە و دەڵێ: ئەوەی لەشەڕ نەبێ شیری تیژە. ئەمە تەواو هەڵکەوتی هەموو ئەوکەسانەیە کە لەسەر ماندووبوون و شەونخوونی کەسانی دیکە، دەیانەوێ، ئیتر ناوبانگ بێ یان دروستکردنی جیهانێکی لە کارتۆن بێ، بۆ خۆیان دروست بکەن، د. کەمال مستەفا مەعرووف ئایا چاوی بابەتەکانی د. محەمەد موکری بینیوە؟ ئەگەر بینیویەتی بۆچی بۆخۆی وەریان ناگێرێ بۆ زمانی کوردی، بۆ دەبێ، ئاگایی ئەو لەناکاو لە ڕێگای بابەتێک من وەرمگێڕاوە قیت بێتەوە لێمان و ببێتە ڕەخنەگر و دانەری ئەبەدی دەستووری زمانی کوردی و یاسا و ڕێسای ڕێزمانی کوردی و ئەلفوبێی کوردی. کوا ئەو لێکۆڵینەوە نایابانەی دەربارەی هەموو ئەم بابەتانە، تا منێکی کە بە تەوازوعەوە خەریکی تەرجەمەم لەبەر ڕۆشناییان سوود وەرگرم و فێری زمانی کوردی بم، چۆن دەتوانم ڕەخنە لە خەڵک و لە نووسراوی خەڵک بگرم ئەگەر بۆ خۆم کوردیزانییەکەم پوخت و گونجاو نەبێ، ئایا ئەمە هەڵکەوتی ئێوە نییە، بۆ ئەوەی بەردێکت لەو دامەیە هەبێ، سەر ئێشە بۆ خوێنەرانی کورد دروست دەکەی، ئەگینا کوا ئەو بابەتانەی، ئەو ڕۆمانانەی، ئەو لێکۆڵینەوانەی ئێوە وەرتانگێڕابێ و بوونی بەرابەر و ڕێ پیشاندەری هونەری وەرگێران، تا منێکی نەشارەزا بیانکەم بە ڕابەری خۆم؟

د. کەمال بە هیچ شێوەیەک زەحمەتی نەداوەتەبەر خۆی گوایە ئەو فرەنسی زانە بچێ وەرگێرانەکەی من بە ئەسڵەکەی بەراورد بکا، ئایا من لە کوێ هەڵەم کردووە، ڕاستەوخۆ ملی لەبەر کوردییەکە ناوە و بە ئارەزووی خۆی ڕێسا و یاسا دادەنێ، لەبەر ڕۆشنایی هەڵەکانی من دەستوور بۆ زمانی کوردی دادەنێ، لەکاتێکدا زمانەکەی ئێمە ئەوەندە پەرپووتە، لە دنیادا چل ملیۆن کورد بە کوردی دەئاخڤن بە هەڵەدا ناچین ئەگەر بڵێین چل ملیۆن زمانی کوردیش هەیە، لەو باوەڕەشم ئەو دەڤەرەی ئەو لێی فێری زمانی کوردی بووە، سەرچاوە و زاری ستانداردی کوردی نییە، ئیتر ئەم ڕێسا دانانە لە پای چی!؟

هەڵبەت لێرەدا بواری ئەوە نییە وەڵامی دوور و درێژی د. کەمال بدەمەوە و منیش یەکە بەیەکەی سەرنجەکانی شی بکەمەوە، کە دڵنیام وەڵامم بۆ گشتیان هەیە، بەڵام هەوڵ دەدەم هەموو ئەو خاڵە بەرچاوانە پیشان بدەم کە بەڕای من دەشێ وەک نوێشکێک و نموونەیەک بن بۆ وەڵامەکانی ئەو.

د. کەمال زۆر باسی پاشگری(دا) دەکا لە زمانی کوردی، تا ئێستا ئەم بابەتە لە ڕێزمانی کوردیدا ساغ

نەبۆتەوە، زمانناسەکان زۆر گفتوگۆی لەسەر دەکەن و د. کەمالیش لەخۆڕایی خۆی لێمان کردۆتە عالیمولغەیپ.

د. کەمال دەڵێ (لەناوچەی موکری) هەڵەیە (ڕاستییەکەی لە ناوچەی موکریاندا) ڕاستە. مامۆستا موکری خۆی لە باسەکەی کە بە فەرەنسی نووسراوە: دەڵێ: Dans la region Mokri. ئیتر بۆ دەبێ من بیکەمە موکریان، لە کاتێکدا وشەی موکریان هیچ ئەسڵ و ئەساسێکی لە زمانی کوردیدا نییە، خۆی مامۆستا موکری لە شوێنێکی دیکەدا، لە بابەتێکی زمانناسی باسی ئەم وشەیە دەکا و دەڵێ (عیبارەتی موکریان هیچ ڕاست نییە و لەلایەن چەند نووسەر و مێژوونووسێکی نەشارەزای کوردی عێراق دروست کراوە).

لە شوێنێکی دیکە د. کەمال دەڵێ نابێ (لەدایک بوون) بۆ با بەکاربهێنرێ هەروەکو لە تێکستەکەی مندا هاتووە. د. کەمال دەبوایە بگەڕێتەوە سەر سەرچاوە فەرەنسییەکە، مامۆستا موکری خۆی دەڵێ: Il naisse، واتە لە دایک دەبێ، هەڵبەت بە مەبەستی زانینی شوێنی دروستبوونە، ئینجا دواتر هەڵدەکا. د. کەمال دەڵێ وشەی دڵگیر بۆ با هەڵەیە کە من بەکارم هێناوە، دەبوایە بنووسم فێنک، نووسەر بۆ خۆی دەڵێ (Agreable) ئیتر بۆ دەبێ من ئەمە بکەمە فێنک کە پراوپڕ بە مانای دڵگیر دێ، لە کاتێکدا لە ئەسڵەکە وشەی (Frais) بەکار نەهاتووە کە بە مانای فێنک دێ. د. کەمال دەڵێ بەکارهێنانی وشەی (خەبات) بە هەڵە هاتووە، لە خۆیەوە وشەی (پێشبڕکێی) داناوە کە لەگەڵ فەرەنسییەکە ناگونجێ. مامۆستا موکری لە لێکۆڵینەوەی وشەی (Combat)ی بەکارهێناوە بۆ تێکەڵبوون و کەوتنە بەرامبەر یەکتری دوو جۆر بای بەهێز، کە پراوپڕ بە مانای خەبات و (صراع) دێ نەک پێشبڕکێ، کە ئەمەی دوایی بە فەرەنسی بریتییە لە (Concourance) کە لەگەڵ مەبەستی ئەسڵی ناگونجێ.

لەلایەکی دیکە د. کەمال ڕەخنە دەگرێ و دەڵێ. (بای گەورە) هەڵەیە دەبێ. بای توند یان توندەبا بەکاربهێنرێ، د. کەمال ئەگەر زەحمەتی بکێشابایە و لەگەڵ فەرەنسییەکەی بەراورد. بکردایە قەت ئەو قسەیەی نەدەکرد، بەڵام دیارە جەنابی هەموو تێکستە فەرەنسییەکەی لەبەرە، چونکە دەزانم نەک هەر نییەتی، بەڵکو هەر نەشی بینیوە. مامۆستا موکری لە کتێبەکەی وشەی (grand vent)ی بەکارهێناوە نەک (Vent fort)، کە هی یەکەمیان دەکاتە بای گەورە یان زلەبا، هی دووەمیان بای توند یان بای بەهێز. د. کەمال بۆ ئەوەی نەکەوێتە ناو ئەم هەڵە گەورە و زلە دەبوایە بۆ ئەسڵە فەرەنسییەکە بگەڕابایەوە.

دوا شت ئەو هاندەرەی کە بۆتە هۆی خوێندنەوەی ئەم کتێبە لەلایەن د. کەمالەوە، بە پلەی یەکەم کێشەیەکی ڕۆشنبیری و ڕاست نووسین نییە، چونکە ئەو لەو ئاستەدا نییە ئەم شتانە فێری خەڵک بکا، بەڵکو کێشەیەکی دەروونی-یە بەرامبەر بە هەندێ نووسەر و وەرگێڕ، زۆر کەس هەڵکەوتی لەم جۆرەی هەیە، بەو مانایەی کە ڕەخنە دەگرێ، گوایە ڕەخنە دەگرێ، دەچێتە سەرەوەی وجودی ڕوحی و ڕۆشنبیری و توانای ئەوکەسەی ڕەخنەی لێ گیراوە، ئەمە دووەمین جارە هەڵوەستەی لەم جۆرە بەرامبەر کارەکانی من دەکرێ کە لە ڕوانگەیەکی دیکەی دەروونی تایبەتەوە هاتووە، نەک ساغکردنەوەی شتێک بە هاوکاری لەگەڵ نووسەر، یانیش بۆ گەیشتن بە حەقیقەتێک لە ڕێگای نیەتێکی پاک، چونکە دیارە ئەم ڕێگایە، خراپترین ڕێگای داهێنانە، تەنیا ئەوانەی سەر بە گرێ دەروونییەکانن خۆیانی لێ دەدەن.





# نامەیەک: لە عەلی فەتاح دزەییەوە بۆ مەلا خەلیلی موخلیس

پاش ئەوەی موخلیس لە (١٩٤٣-١٩٤٤) ئیجازەی مەلایەتی لە لایەن مامۆستا مەلا سالّحی کۆزەپانکە لەمزگەوتی تەکیەی شێخ نوردین لە هەولێر وەردەگرێ، ئیتر لە گوندی دووسەرەی فەتاح ئاغا دەبێتە مەلا و مورشیدی ئایینی و سالآنێکی زۆر لەم گوندە دلگیرە دەمێنێتەوە تا لە سالّی (١٩٧٥) بە یەکجاری دووسەرە بەجێ دێلّێ و ڕوو لەمزگەوتی شێخ مستەفای نەقشبەندی دەکات لەهەولێر.

فەتاح ئاغای دووسەرە کە باوکی عەلی فەتاح دزەیی شاعیرە، پیاوێکی ڕۆشنبیرو ئەدەب دۆست بوو، زۆربەی شیعرەکانی حەزرەتی نالی و کاکی هیرانی و وەفایی ئەزبەر کردبوو، وەک دەلّێن ڕۆژانە چەند جارێک شیعری «شیرین تەشی دەرێسی» لەمەجلیسی دۆستان دەخوێندەوەو هەر لەبەر خاتری خۆشەویستی ئەم زاتەش بۆ ئەو شیعرە، موخلیس شیعری (کە قارە قارێ مەرهات)ی نووسی، دۆستایەتی نێوان ئەم دوو زاتە ئەوەندە بەهێز بوو کە بەدەگمەن لەیەکتر جیادەبوونەوە، تا ئەو ڕادەیەی هەردووکیان وەسیەتیان کرد لەدوای مردن گۆڕەکەیان لەتەنیشت یەکتربێت، لەسەر گردی (پیرداود) بەرامبەر بەگوندی دووسەرە. ئەوە بوو وەسیەتەکەیان بەجێ گەیاندن و تا هەتایە ئاوێزانی یەکتر بوون.

لەنێوان ئەو خۆشەویستی و ڕێزو میهرە بێ کۆتاییەدا، عەلی فەتاح دزەیی شاعیر چاوی بۆ ژیان هەلّێناو بەرۆحێکی کوردانە پەروەردە بوو، لەحوجرەی مزگەوت و لەدیوەخان هەردەم لەتەنیشت موخلیس دادەنیشت و شیعرەکانی دەخوێندەوەو گوێی لە ئامۆژگارییەکانی دەگرت، تارادەیەک (عەلی و ئەحمەد)ی فەتاح ئاغاو (حەمەدەمین و محەمەد و تەها)ی کورانی موخلیس بەیەکەوە وەک برا لەیەک خێزان گەورەبوون، بۆیە عەلی فەتاح دزەیی لەشیعرەکانیدا ئەو خۆشەویستییەی موخلیسی فەرامۆش نەکردووەو لەزۆر جێگادا بەوپەڕی ستایشەوە ناوی دێنێ و تەنانەت لە ڕۆژانی دوورکەوتنەوەیدا لە (دووسەرە) نامەی شیعری بۆ ڕەوانە دەکات و بیرەوەری ساتەوەختە بەپێزەکانی ڕۆژگاری دەخاتەوە یاد.

لەباسی گوندی (دووسەرە) و ژیان و گوزەران و ئەو دۆستایەتییە بەهێزەدا موخلیس لەچامەی «ولآت هەی ولآت»دا دەلّێ:

**کە جێی ئیدارەم بوو بە دووسەرە**
**زۆر سەر تولەی کرد ئەک بە دووسەرە**
**گەرچی ناسازبوو لەلای ناسازان**
**ئەمما زۆر سازبوو بۆ ئەهلی ڕازان**
**ئەهالی وێندەر قەومێکی چاک بوون**
**دەتگوت بۆ بەهەشت ئیجاد کرابوون**
**عەبدولفەتاح- بوو ئاغای خۆش مێربوو**
**فەتتاحی قوفلّی ئەبوابی خێر بوو**
**دوو کوڕی هەبوو کوڕ دەبی وابی**
**ئاو قەرآنی وان زەحمەت پەیدابی**
**(عەلی و ئەحمەد)ن گەورەو بچووکیان**
**بەو تەرتیبەیە هەر وەکو گۆتران**
**لەبۆ پێشکەوتن چوست و چالآکن**
**زۆر سینە ساف و زێدە دلّ پاکن**
**میللەت پەروەرن بە ڕوح و بەگیان**
**چاو نەترووکێنن لەڕۆژی مەیدان**

پێوەندی نێوان «عەلی فەتاح دزەیی» و «موخلیس» پێوەندی کوڕو باوکایەتی بوو، لەبیرمە کە (١٦/٧/١٩٨٥) لەچلەی موخلیس لەهۆلّی ڕۆشنبیری کۆڕێکم سازداو لەلایەن (محەموود زامدار)ەوە سەرپەرشتی دەکرا، یەکێ لە ئامادەبووان خوالێخۆشبوو عەلی فەتاح دزەیی بوو، کە هەلّسایە سەرپێ و گوتی: «تا موخلیس لەژیاندا مابوو. هەستم بەوە نەدەکرد کە بێ باوکم، بەلآم ئێستاکە وا هەست دەکەم کە خۆشەویستترین کەسم لێ دابڕا».

عەلی فەتاح دزەیی ڕادەی خۆشەویستی خۆی بۆ موخلیس و گوندی دووسەرە بەم شێوەیە دەردەبڕێ:

**دووسەرە گەر تۆ نەبوویتایە لەوێ**
**دوور نەبوو چاوم ئیتر پێی نەکەوێ**
**کۆی یارانم ئەمێستاکە دەڵێن**
**کوندە بۆی تێدا شەو و ڕۆژ دەسرەوێ**
**هەر وڵاتێک خۆشەویستی لێ نەما**
**قەت گوڵی میهرو وەفایی ناپشکوێ**
**یێک دڵۆپە کە ڕژا ئاوی ڕووان**
**لەدڵان، دڕکی جەفای بێ دەڕووێ**
**هێندە ژەنگی بێ وەفایی گرتووە**
**دڵ سپی نابێتەوە سەرلەنوێ**
**ئەم دڵەی من وەکو مەنسوورە مەگەر**
**خوێنی لێ دەڕژێ و لەگەڵ حەق دەدوێ**

هەروا لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ:

**بەڕاستی شاعیرێکی بێ میسالە موخلیسی خۆمان**
**بەڕاستی ڕابەرێکی شارەزای ڕێی عشقی یەزدانە**
**مەلایە، گۆشەگیرە، حاجییە، سنجاوییە تیرەی**
**بەڵام خۆش تەبع و پەروەردەی هەواو خاکی دزەییانە**

(عەلی فەتاح دزەیی) ئەوکاتەی کە لەسەرەتای ساڵانی شەستەکان قایمقامی پێنجوێن بوو، هەردەم دڵی لای موخلیس و گوندی دووسەرە بوو، بۆیە ئەم خۆشەویستییەی لەدووتوێی نامەیەکی شیعری دەربڕی و لە (٢٩/١/١٩٦١) لەپێنجوێنەوە نامەیەکی بۆ موخلیس ڕەوانەکرد و هەستی خۆی بەرامبەر بەو دوورکەوتنەوەیە دەردەبڕێ و گلەیی و گازاندەش لەدۆست و برادەران دەکات و بەبێ وەفایان لەقەڵەم دەدا، واپێدەچێ دڵی ڕەنجابێ و لەبێ وەفایی زەمانە بێزاربێ، بەڵام هەرخۆشی لەکۆتایی نامەکەیدا دەڵێ: «هەرچەندە سەرتاپا نقوومی نەگبەتم، بەڵام من زێڕی بێ غەشم و ناڕزم».

بۆ مامۆستا موخلیس
«حاجی مەلا خەلیلی سنجاوی»

**موخلیسا ئای چەند پەشێوو عاجزم**
**دوور لەیارانی وەفادار زۆر کزم**
**ساڵەکە ئاگام لەئەحواڵتان نییە**
**عومرەکە دووچاری دەردی پایزم**
**شەرمەزاری با وەفایی ئێوەمە**
**سەیری بۆیێ ڕەش بووە ڕووی کاغەزم**
**ئەی خەزینەی پڕ لە گەنجینەی وەفا**
**بێ بەشم، ڕێم دە کەمێکت لێدزم**
**بێ وەفایی بوو بە ئەخلاقی زەمان**
**کێ دەپرسی کوانی دۆست و کواخزم**
**ئەوکەسەی پاروومی دەنایە نێو دەمی**
**پێم دەڵێ ڕۆژ وایە وەک سەگ دەتگەزم**
**تف لەئەخلاق و ڕەوشتی ناتەواو**
**تف لەدنیای ناڵەبارو ناحەزم**
**گوێ مەدە بەزمی زەمانە چاوەکەم**
**کێو بەلەقەی پیاوی کەر نابێ نزم**
**گەرچی سەرتاپا نقوومی نەگبەتیم**
**مەعدەنی زێڕی خوڵاسەم ناڕزم**

**ئا: جەلال سنجاوی**

**پەراوێزو سەرچاوەکان:**

١- **عەلی فەتاح دزەیی:** لەساڵی (١٩٢٨) لەگوندی دووسەرەی سەر بەناحیەی قوشتەپە هاتۆتە دنیاوە. لەساڵی (١٩٤٨) قۆناغی دواناوەندی لە هەولێر تەواو کردووەو پاشان ساڵی (١٩٥٨) کۆلێژی مافی لەدیمەشق تەواو کردووە. لەژیاندا چەندین وەزیفەی دیوە وەک بەڕێوەبەری شارۆچکەی برادۆست و قایمقامی شارباژێڕو دەربەندیخان.

لەساڵی (١٩٧٤) دەستی لەکاری وەزیفی کێشاوەتەوە و پێوەندی بەشۆڕشی کورد کردووە. لەساڵی (١٩٧٥) دیسان گەڕاوەتەوە وەزیفەو بۆ شاری (دیوانیە) گوێزراوەتەوە. لەساڵی (١٩٨٣) خانەنشین کراوە. لەساڵی (١٩٩٢) بەنەخۆشی شێرپەنجەی قوڕگ گیانی پاکی سپاردووە، دیوانێکی شیعری لەپاش بەجێ ماوە بەناوی (خرۆشان و ڕامان) جگە لە چەندین وتارو بلاوکراوە دەربارەی وەرگێڕان و لێکۆڵینەوەی مێژوویی و ئەدەبی. بەم دواییەش بەڕێز «بەکر شاکر عەبدوڵلا» بروانامەی ماستەری لەسەر شیعرەکانی عەلی فەتاح دزەیی وەرگرت، نامەکەش بەناونیشانی «عەلی فەتاح دزەیی (١٩٢٨-١٩٩٢) شاعیرو نووسەر» بوو کەبەسەرپەرشتی دکتۆر ئیبراهیم ئەحمەد شوان پێشکەش بە کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین کرا.

٢- **موخلیس:** ناوی حاجی مەلا خەلیل کوڕی فەقێ ڕەسووڵ کوڕی حاجی مستەفایە و لەخێڵی گەورەی سنجاوییە، لەساڵی (١٩١٠) لەدەشتی قەراج لە ڕەشماڵان لەدایک بووە، شاعیرێکی بەرزو بەتوانا بوو، دیوانێکی گەورەی دەستخەتی لەپاش بەجێ ماوە، لە (٥/٦/١٩٨٥) کۆچی دوایی کردووە. لەساڵی (١٩٨٩) دکتۆر ئیبراهیم ئەحمەد شوان بروانامەی ماستەری لەشیعرەکانی موخلیس وەرگرت بەناونیشانی: (دیوانی موخلیس، باغی لاوان لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە).

٣- خرۆشان و ڕامان- دیوانی شیعر- عەلی فەتاح دزەیی-١٩٨٧.

٤- دیوانە دەستخەتەکەی موخلیس کە لەلایەن مامۆستا مەلا تاهیری کەندارە قەلی پارێزراوە.

## فریشته:
# نەمهێشتووە هۆنراوەکانم مۆسیقا و ئیقاع لەدەست بدەن



فریشته نازناوی شیعریی و بزووتنەوەی نیشتمانیی شاعیر و خەباتگێڕی ئافرەتی لێهاتووی کورد، خەدیجەی کچی مستەفاغای کوڕی حەماغای حەوێزییە، لە ساڵی (١٩٢٦) لە گەڕەکی هەواو لە شاری کۆیە، شاری ئەدەب و هونەر و خەباتی کوردایەتی لەدایک بووە. لە بنەماڵەیەکی ئەدەبپەروەر سەری هەڵداوە و خوشکی شاعیران ئەحمەد دڵزار و کەریم شارەزایە و مستەفاغای باوکی فارسی زانێکی باش و ئەدەبدۆستێکی شارەزای داستانی کوردی و فارسی بووە و خاتوو سوراحی دایکی باوکیشی، شاعیرێکی میللی بووە و ئەمین ئاغای خاڵی باوکی ناسراو بە (ئەختەر) شاعیرێکی بەهرەداری غەزەلی کوردی و مەقامشناسێکی گەورەی کورد بووە و ئەو ژینگەیە بەرەو شیعر و ئەدەبیاتیان بردووە.

فریشته لە ناوەراستی چلەکانی سەدەی بیستەمەوە بەهرەی شاعیریی گەشەی کردووە و گەلێک هۆنراوەی لە شیعری کۆمەڵایەتی و نیشتمانی هۆنیوەتەوە و لە ساڵی (١٩٤٨)دا تێکەڵی ڕێکخراوی نیشتمانیی پێشکەوتنخواز بووە و لە ساڵی (١٩٥٢)شدا دەورێکی دیاری بووە لە دروستبوونی کۆمەڵەی ئافرەتانی عراق و هوشیارکردنەوەی ئافرەتی کورد بۆ وەدەستهێنانی مافی کۆمەڵایەتی و سیاسی خۆی.

لە دوای بەرپابوونی شۆڕشی (١٤)ی تەممووزی (١٩٥٨) کراوە بە ئەندام لە دەستەی باڵای کۆمەڵەی ئافرەتان و لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی (١٩٥٩)دا لەسەر بانگهێشتی یەکێتی ئافرەتانی چینی میللی، لەناو شاندێکی ئافرەتانی عیراق کە بریتی بووە لە (٥) ئافرەتی عەرەب و (٢) ئافرەتی کورد، چوون بۆ پەکین و لەوێشەوە سەردانی ڤیەتنام و کۆریای دیموکراتییان کردووە. لە سەردەمی حوکمی بەعس چ لە ساڵی (١٩٦٣) و چ لە ساڵانی (١٩٧٩) بەم لاوە پێشمەرگەی کوردستان بووە و ئێستاکە لە گەڕەکی ڕووناکی لە شاری هەولێردا دەژی و کۆمەڵە شیعرێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی لەگەڵ دوو پاشکۆی یادداشت و شیعریی میللی لەژێر چاپدایە. جا بۆ ئەوەی خوێنەری بەرێز لە نزیکەوە ئاگاداری توانا و بەهرەی شاعیری و دەوری لە خەباتی نیشتمانیدا بێ، ئەم دیمانەیەمان لە ماڵەکەی خۆیدا لەگەڵ سازدا.

* فریشتە کۆیی کێیە؟ ژیانی منداڵی چۆن بەسەربردووە؟

– من ناوی تەواوم خەدیجە مستەفا محەمەد ئاغای حەوێزییە و نازناوم (فریشتە)یە. هەشت ساڵ دوای تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهانی، لە ڕۆژێکی ساردی مانگی شوباتی ساڵی (١٩٢٦) لە گەڕەکی هەواو لە شاری کۆیە هاتوومەتە دنیایەکی زۆر ناخۆش، چونکە جاری تەنگوچەڵەمەی جەنگی گەورەی بەسەرەوە مابوو، باری ئابووری خەڵکەکە زۆر ئاڵۆز بوو. باوکم کە لە دوای ئەو جەنگە لە سەربازیی گەڕایەوە کۆیە هیچ دەستمایەیەکی بەدەستەوە نەمابوو، بۆیە ناچار بووە بچێتە سەر یەکێک لە دوو باخەکەی کە لە دایکییەوە بۆی بەجێمابوو، بۆیە ئێمەش ژیانمان لە پایز و زستان و بەهار لە شار بەسەر دەبرد و هاوینانیش باخەوان بووین و بە ئارەقەی نێوچەوانمان نانی خۆمان پەیدا دەکرد.

* باری خوێندەواریت چۆنە و چ سوودێکت لە ڕۆشنبیریی باوکت و براکانت وەرگرتووە؟

– کاتێک کە لە پایزی (١٩٣٣)دا یەکەمین قوتابخانەی سەرەتایی کچان لە کۆیە کرایەوە بۆم نەلوا بچمە بەر خوێندن، بەڵام لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردووەوە لە ڕێگەی قوتابخانەی ئێواران کە خۆم داوام کرد لە کۆیە بۆ ئافرەتان بکرێتەوە، فێری خوێندنەوە بووم و وردە وردە پەرەم بە خوێندەوارییەکەم دا و سوودێکی زۆرم لە ڕۆشنبیریی باوکم وەک حیکایەتخوانێکی مەعلان و لە ڕۆشنبیریی کاک دڵزاری برا گەورەم و کەریم شارەزای برا بچووکم وەرگرت و خۆیشم توانایەکی باشم هەیە لە ئەزبەرکردنی شیعر و هەر هۆنراوەیەکم دوو سێ

جار گوێ لێ بێت دێته بەرم و لە بیرم ناچێتەوە.

* چ ڕۆژنامە و گۆڤارێکی کوردی کاری تێکردووی بەتایبەتی لە چلەکانی سەدەی ڕابردوودا؟

– شیعر و بابەتەکانی گۆڤاری گەلاوێژ کارێکی زۆریان تێکردووم دوای ئەویش ڕۆژنامە و گۆڤاری ژین و دەنگی گێتی تازە، کە کاکە دڵزارم بۆی دەخوێندمەوە گەلێک سوودمەند بووم و هەستم دەکرد شاعیریم لەلا دەخولقێ.

* لەکەیەوە دەستت بە شیعردانان کردووە و چ جۆرە شیعرێکت دادەنا؟

– لە گەرمەی جەنگی دووەمی جیهانییەوە دەستم بە شیعر دانان کرد، یەکەم جار شیعری کۆمەڵایەتیم دانا، ئینجا کەوتمە سەر شیعری نیشتمانی و سیاسی و لە پەنجاکان و لە دوای شۆڕشی (١٤)ی تەمموزی (١٩٥٨)یشدا، هۆنراوەی دوور و درێژی سیاسیم لە گەلێ بۆنەی جیاوازدا داناوە، وەک شاعیرێکی ئافرەتی کورد خۆم بە ئەدەب دۆستان ناساندووە.

* دەورت لە پارتە سیاسییەکانی کوردستان و عیراق چ بووە و هەست و هەڵوێستت بەرامبەر دامەزراندنی کۆماری دیموکراتی مەهاباد و ڕووخاندنی و لە سێدارەدانی پێشەوا قازی نەمر چۆن بووە؟

– کاتێ حزبی هیوا لەناو گەنجانی شارەکەم پەرەی سەند لە ڕێگەی کاکە دڵزارم شتێکم لە پرەنسیپەکانی وەرگرت و شەیدای کوردایەتی بووم. کاتێکیش کە کۆماری دیموکراتی مەهاباد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە سەرۆکایەتی قازی محەمەد لە (٢٢/ ١/ ١٩٤٦)دا دامەزرا وەخت بوو لە خۆشیان بفڕم و کاتێکیش کە نموونەی ئاڵای کوردستانم کەوتە دەست، ڕۆژانە بە دەرزی و داوی ئاوریشمی ڕەنگاوڕەنگ ئاڵایەکی بچکۆلەم لەسەر قوماش دەچنی و دەمدا لاوە تێکۆشەرەکان تاکو لە یەخەیان بدەن و وەختێکیش کە ئەو کۆمارە ساوایەی کورد ڕووخێنرا، یەکجار غەمبار بووم، خۆ کە لە (٣٠/ ئاداری / ١٩٤٧)دا پێشەوا قازی محەمەد و هاوڕێکانی لە سێدارە دران و من و دەستەیەک لە ئافرەتان بە نهێنی لە ماڵی خەجاوە خانی ژنی کاک ئاغای حەویزی پرسەمان بۆ دانا و شیوەنمان بۆ گێڕا.

کاتێک کە پارتی دیموکراتی کورد بە سەرۆکایەتی بارزانی مستەفا لە (١٩٤٦/٨/١٦)دا دامەزرا، من بووم بە لایەنگرێکی دڵسۆزی ئەم حزبە، بەڵام لە دوای ڕاپەرینە نیشتمانییەکەی عیراق کە لە مانگی کانوونی دووەمی (١٩٤٨) دا هەڵگیرسا بوومە لایەنگری حزبی شیوعی عیراق و لە دوایی بە ئەندام وەرگیرام و تاکو ئێستاکەش بەردەوامم و لە حزبی شیوعی کوردستان کاردەکەم و لەسەر ئەم هەڵوێستە سیاسییەم تووشی گەلێک ڕاوەدوونان و گرتن و دەربەدەری و ژیانی پێشمەرگەیی بووم و ئەشکەنجە و ئازارێکی زۆرم چەشتووە.

* دەورت لە بزووتنەوەی مافی ئافرەتان چی بووە و



شاندی ئافرەتانی عیراق (کورد و عەرەب) لە ئامۆژگای کەمەندەتەوایەتییەکان لە «پەکین» – حوزەیرانی ١٩٥٩

ئایا بەشداریت لە هیچ شاندێکی ئافرەتانەوە کردووە بۆ دەرەوەی کوردستان و عیراق؟

– لە سەرەتای (١٩٥٢)دا دەورێکی تەواوم بووە لە دامەزراندنی کۆمەڵەی ئافرەتانی عیراق و لە دوای شۆڕشی (١٤)ی تەمموزی (١٩٥٨) بە ئەندامی لیژنەی باڵای کۆمەڵەی ئافرەتان هەڵبژێردرام و لە (١)ی حوزەیرانی (١٩٥٩)دا لەگەڵ شاندێکی ئافرەتانی عیراق کە بریتی بوون لە (٢) ئەندامی کورد و (٥) ئەندامی عەرەب لەسەر بانگهێشتی یەکێتی گشتی ئافرەتانی چینی میللی، بۆ ماوەی دوو مانگ سەردانی چینی میللی و ڤیەتنام و کۆریای دیموکراتی و یەکێتی شۆرەویم کرد و لە کۆتایی مانگی تەممووزدا گەڕاینەوە و لەو گەشتەماندا چاومان بە (شو ئین لای) سەرۆک وەزیرانی چین کەوت و شیعرم بەرەو ڕووی خوێندەوە کە پێشتر کرابووە عەرەبی و وەرگێردرایە سەر زمانی چینی و بە جلوبەرگی ئافرەتی کوردییەوە ئەو گەشتەم کرد و سەرنجی خەڵکی ئەو وڵاتانەم بۆ کورد و دەستووری پۆشاک و قسە و ئاخاوتنی ڕاکێشا.

* کاتێک کە بارزانی مستەفا لە دوای شۆڕشی (١٤)ی تەمموز گەڕایەوە عیراق هەستت چی بوو و چ هۆنراوەیەکت لەو بۆنە خۆشەدا دانا؟

– کاتێک کە بیستم بارزانی نەمر لە چیکۆسلۆفاکیاوە برووسکەی پیرۆزبایی بۆ سەرکردەی شۆڕشی تەمموز عەبدولکەریم قاسم لێداوە و داوای گەڕانەوەی کردووە بۆ عیراق و کوردستان، ئەم هۆنراوەیەم دانا و دەڵێم:

**مژدەتان لێ، گەلی کوردان مژدەتان لێ**
**وا هات تەلگرافی شادی گەیشتە جێ!**
**هی کێ هی کێ؟ هی مەلا مستەفای بارزان،**
**بۆ کێ بۆ کێ؟ بە بەرێز سەرۆک وەزیران**
**لە کوێ لە کوێ؟ لە چیکۆسلۆفاکیاوە دێ**
**چەند ڕۆژی دی چاوەڕوانین بکاتە جێ!!**



فریشتە و ناهیدە شێخ سەلام
(٢٠٠٢/١٢/١٠)

ئەمە سەرەتای هۆنراوەکەمە کە خۆشی و شادی لێ دەبارێ بۆ هاتنەوەی بارزانی نەمر.

بە بۆنەی بەرپابوونی شۆڕشی (١٤)ی تەممووزی (١٩٥٨)یش ئەم شیعرەم دانا کە شەش خشتەکییە لەسەر دێڕە شیعرێکی شاعیری کوردی ناسراو بە (مامەند کەرکووکی) و سەرەتاکەی بەم جۆرە دەست پێدەکات:

**ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە دووسەد جەژنی بە قوربان**
**نەورۆزی کەلە چواردەیی تەمموزە برایان**
**بۆ هەر کوێ دەچی خوتبەیی شێرانە لە مەیدان**
**هاوارە لە هەرلاوە بەدەم پڕ بە دڵ و گیان!!**
**«ئەم ڕۆژەیە: ڕۆژی فەرەح و شادی و خەندان**
**ئەم ڕۆژەیە، دەشکێنی هەموو بەند و کەلەپچان!!**

* ئایا فریشتە هەر شیعری سەرواداری داناوە و بە لای شیعری ئازاد نەچووە؟

– من لە سەرەتادا هەر شیعری سەروادارم دادەنا، کەچی لە ساڵی (١٩٦٢)ەوە دەستم دایە هۆنینەوەی شیعری ئازاد، بەڵام نەمهێشت هۆنراوەکانم مۆسیقا و ئیقاعی خۆیان لەدەست بدەن. بۆ نموونە سەرنجێک بدەینە ئەم هۆنراوەیەم کە بە ناوی (کاروان) دامناوە و لەو سەردەمە دەدوێم کە عەبدولکەریم قاسم لە ڕێبازی دیموکراتیی خۆی پاشگەز بۆوە و بەندی سێیەمی دەستووری کاتی پشتگوێ خست کە مافی نەتەوەیی کوردی دابین دەکرد و ئەمە بەشێکە لە هۆنراوەکەم:

**هێشتا مابوی بەرەبەیان**
**کر و کپ، بێ هەست بوو کاروان**
**سپێدەیدا لە ڕۆخ ئاسۆ**
**ئەستێرەی ڕۆژ بە درۆ هەڵات**
**گەل کەوتە خۆ**
**دەنگی (هەستە میللەت) دەهات**
**لە هەموو لایەکی وڵات**
**دەیان گوت: هەستە بەیانە**
**دەی هەستن کاتی کاروانە!!**

دوای ئەم سەرەتایەش لە هەنگاوی دووەمی هۆنراوەکەمەدا ئەم ڕاستییە بۆ میللەتی تێکۆشەرم دەردەبڕم کە کاروانی میللەت بە هەڵەدا چوو کە باوەڕی بەو ئازادییە درۆزنەیە کرد، تاکو لە ئەنجامدا بۆیان دەرکەوت کە سپێدەکەی ژیانی نوێی جەماوەر سپێدەکی درۆزنە بوو:

**کاروانییەکان**
**بەرەو قۆناغی ژین دەچوون**
**بە هیوا بوون**
**بە ئاوات و ئامانج بگەن**
**بەڵام کاروان بە هەڵەچوو**
**سپێدەکە: سپێدەی درۆزنە بوو**
**ئەستێرەکەش:**
**ئەستێرەی کاروان کوژە بوو!!**

* ڕات بەرامبەر بەم کەسایەتییانە چۆنە؟

شەرەفخانی بدلیسی: باوکی مێژووناسانی کوردە.

بارزانی نەمر: سەرکردەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردە.

قازی محەمەد: یەکەمین سەر کۆماری کورد و پێشەوایەکی مەزنی کوردستانە.

حاجی قادری کۆیی: یەکەمین شاعیری نەتەوەیی کوردە لە دوای خانی.

گۆران: شاعیری مەزنی کوردە و نوێکەرەوەی شیعری هاوچەرخمانە.

هەژار: پتر مێژوونووس و زمانزانە لەوەی شاعیرێکی هونەرمەند بێ.

هێمن: بە هەموو مانایەکی وشە شاعیری هەست و سۆزە.

دڵدار: تا کورد مابێ دڵدار و ئەی ڕەقیب بە نەمریی دەمێننەوە.

دڵزار: شاعیرێکی گەورەی شیعری چینایەتی و نیشتمانییە.

ناهیدە شێخ سەلام: دەستەخوشکمە و تێکۆشەرێکی ئافرەتی کوردستانە.

* زۆر سوپاس بۆ ئەرک و ماندووبوونت لە بواری ئەدەب و خەباتی نیشتمانیدا.

– سوپاسی ئێوەش دەکەم بۆ پێشخستنی کاروانی ئەدەب و هونەر و ڕۆشنبیریی کوردی.

**ئا: لێزان**




# ڕێکخراوی باڵندەباران و دەزگای ئاراس و ئینستیوتی فەڕەنسی لە هەولێر بەشوێن پردێکن لە نێوان کوردستان و دەرەوەدا

بە ئامادەبوونی جەماوەرێکی زۆری هونەرمەند و هونەردۆست، ڕۆژی (٢٠٠٤/٩/١٩) دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس بە هاوکاری ئینستیوتی فەڕەنسی لە هۆڵی میدیا پێشانگایەکی هونەری خۆشنووسییان بەناونیشانی (پردێک لەنێوان ئێمە و کوردستاندا) بۆ چەند هونەرمەندێکی کوردستان و چینی و فەڕەنسی کردەوە.

ئەم هونەرمەندانە، کە لەژێر چەتری ڕێکخراوی باڵندەباران کۆبوونەتەوە، چەند کەڤاڵێکی خۆشنووسییان نمایش کرد، کە دەربڕی داهێنان و کولتووری جۆراوجۆر بوون.

ئامانج لەم چالاکییەش پرۆژەیەکی ڕێکخراوی باڵندەبارانە بۆ بەستنی پردێک لەنێوان کوردستان و دەرەوەدا.

ئاڵوگۆڕی کاری هونەریی و ئاشنابوونی ئەم دەڤەرە بە پرۆژە هونەرییە جیهانییەکان. ئەم ڕێکخراوەش ساڵی (١٩٩٤) لەشاری لیل لە فەڕەنسا دامەزراوە، دامەزرێنەرانی ڕێکخراوەکە بریتین لە ڕێبوار سەعید و ئیدیت هێنری و کارینا واشۆ. باڵندەبارانیش ئاماژەیە بۆ کیمیابارانی دێیەکی کوردستان، کە باڵندەکانی بە ئاسمانەوە شەهید دەبوون.

بۆ پێشانگای ئەم ڕێکخراوە لە کوردستان، خاتوو ئیدیت هێنری ئامادەبوو، کە هونەرمەندێکی فەڕەنسییە لەساڵی (١٩٨٤) کۆلێژی هونەرەجوانەکانی تەواو کردووە، بۆ ماوەی (١٠)ساڵە ئەم ئافرەتە هونەرمەندە سەرۆکی ڕێکخراوی باڵندەبارانە و کار بۆ ناساندنی هونەری کوردی دەکات لە ئەوروپا. ئەم هونەرمەندە لە بارەی کەڤاڵەکانی خۆی گوتی: ویستوومە بەر لەوەی کەسەکان ببینم وێنەیان بکەم، دەمەوێ لە کۆکردنەوەی ئەو کەرەستە سەرەتاییە ڕۆژانەییانەی، کە پێوەندییان لەگەڵ دەبەستین، من کەرستەیەکی هونەری لێوە دروست بکەم لە پەڕەیەک، لە نامەیەک، لە فۆتۆیەک، کە دواتر من لەناو کارە هونەرییەکانی خۆمدا دەیانتوێنمەوە بۆ بەستنی پردێک لەنێوان هونەرەکەم و کوردستان.

کەڤاڵەکانی ئەم پێشانگایە هەریەکەی بۆ خۆی دەربڕی قوتابخانە و ڕێبازێکی هونەرییە، کارەکانی خاتوو ئیدت هێنری باس لە کەرەستە جیاوازەکانی چین و کوردستان دەکات، کە تەوزیفی کردۆتە ناو کارە هونەرییەکانی، دیارە هەوڵدان بۆ بزاوتێکی بەردەوام لەناو کارەکتەرەکانیدا و بەکارهێنانی سیستمێکی تایبەت بۆ پیشاندانی بەرهەمەکان، کە لە پێشانگەی تەقلیدی دەچێتە دەردوە، ئەمەش پشت ئەستوور بە تەجرەبەکانی هونەرمەندە کە لە بوارەکانی شانۆ و دیزاین و فۆتۆگرافیدا درێژ بۆتەوە، بۆ نموونە لە کەڤاڵی خۆرهەڵات، دیمەنەکانی بەم شێوەیە وێنا دەکات: خاڵ دەمانگەیەنێتە هێڵ، هێڵ بۆ پیت لەوێشەوە بۆ وشە، وشە دەبێتە ڕستە، ڕستەش نووسینی بەرهەم دەهێنێ. ئەمڕۆ سەردەمی تەکنەلۆژیای زانیارییەکان و پێشکەوتنی سەدا و سیما و تەکنیکی مۆدێرنە، خۆشنووسی هاوچەرخ بەشێک لە ڕۆڵی خۆی لە دەست دا، بەڵام خۆشنووسی هەمیشە بۆ نیگاری تازە دەگەڕێت بۆ پێشخستنی هونەری نووسین. هەر بۆیە خۆشنووسی هەمیشە بەزیندوویی دەمێنێتەوە، خۆشنووس تابلۆ دەکات، بەڵام بە شێوەکار ناو نابرێت، دەنووسێت، بە نووسەر ناو نابرێت، هێڵەکان دەکێشێت، بەڵام نەخشەساز نییە، لە لاپەڕەکاندا داهێنان دەکات، مەرەکەب و ڕەنگەکان وەک هونەرمەند تێکەڵ دەکات.

**شوان عومەر**




# تارمایی جەنگی ئیسماعیل خەیات

بە ئامادەبوونی جەماوەرێکی زۆری هونەرمەند و هونەردۆستی شاری هەولێر ڕۆژی ٥/١٠/٢٠٠٤ لە هۆڵی میدیا بەڕێوەبەرایەتی هونەری شێوەکاری سەر بەوەزارەتی ڕۆشنبیری پێشانگایەکی شێوەکاری بەناونیشانی تارمایی جەنگ بۆ هونەرمەند ئیسماعیل خەیات کردەوە.

پێشانگاکە لە پاڵ چەند تابلۆی بچوک و گەورە تابلۆیەکی گەورەی پڕ بە هۆڵەکە نمایش کردبوو، کە پێشتریش بەناوی تارمایی جەنگی ئایندە لە سلێمانی پیشانی دابوو و نووسینێکی زۆری ڕۆژنامەنووسیشی لە ناوەوەو دەرەوەی کوردستان لەسەر کرابوو، وەک هونەرمەند خەیات گوتی: تەنانەت فیلمێکی دیکۆمێنتیشی لە ژاپۆن لەسەر کرابوو، بەڵام ئەوە نەبێ، کە ئەم جارە گەورەتری کردبوو بۆ ئەوەی پڕ بە پڕی هۆڵی میدیا بێت، کە تیایدا پێشانی دابوو، وا بڕیاریشە ئەم پێشانگایە بچێ بۆ دهۆک و دواتریش بۆ کەرکوک.

دوای ئەوەش لە مەراسیمێکدا تابلۆیەکە لەت دەکات و لەتێکی بە ئامادەبوونی وەزیری ڕۆشنبیری و ڕۆشنبیرانی هەولێر دەسووتێنێ و بەشەکەی دیکەشی لەڕێی وەزارەتی ڕۆشنبیری ئیدارەی سلێمانی بەهەمان شێوە دەسووتێنێ و لەمەشدا گەرەکیەتی سیمبولێکی دیکەی، کە نەفرەتە بۆ شەڕ بەبەردا ببڕێت، بەڵام نەک جەنگی ئازادکردنی عیراق، کە شەڕێکی زۆر زۆر پێویست بوو بۆ لەناوبردنی ڕژێمێکی دکتاتۆری فاشی، ئەگەر بەم شێوەیە نەبایە نە دەگۆڕا، بەڵام هونەرمەند ئیسماعیل خەیات لەگەڵ ئەمەشدا ئەو وەک هونەرمەند، وەکو مرۆڤێک دژی شەڕە و لەگەڵ ئاشتی و تەباییە. ڕوون و ئاشکراشە، کە ئیشەکە هەمووی بەکەرستەی جیاواز و لەسەر کاغەز کراوەو پێشاندانیشی لەسەر زەوی، کە بووە مایەی ڕەخنە لەلایەن تەنانەت هەندێک مامۆستا و هونەرمەندی ئەکادیمیشەوە و کەچی خەیات هۆی ئەمەی بۆ ئەو واقیعە گێڕایەوە، کە بەڕاستی پاش شەڕ هەموو شتێک دەڕووخێت، دوای شەڕ مرۆڤ بەناو کەلاوەی شەڕدا دەگەڕێت، ئەوجا گوتی ئەو ئیشەی من وەک پانۆرامایەک وایە، کە بیرەوەرییەکانم لەسەر شەڕەکانی دیکە کۆدەکاتەوە، وەک ئەنفال وکیمیابارانی هەڵەبجە و هەندێ لەو شەڕانەی، کە لە کوردستان ڕوویانداوە هەتا ئاسەواری شەڕی ناوخۆشی پێوەیە، هەر بۆیە هەوڵم داوە ڕەنگەکانیش دوو سێ ڕەنگ بێت سوور و ڕەش و خۆڵەمێشی، کە: سوور ڕەنگی تەقەمەنی و ئاگر و خوێنە و، ڕەشیش دووکەڵی ئەو تەقەمەنییانە و، ئەوجا ڕەنگی خۆڵەمێشیش واتە ڕووخان و سووتانی ئەو هەموو شتانەی کە دواتر دەبێ بەخۆڵەمێش، ئەگەرچی هونەرمەند بۆ شێواز و بابەتەکانی لە واقیع دوورکەوتۆتەوە، بەڵام بە وردەکاری زۆر شتی تێدایە، کە بینەر دەتوانێ بە ئازادی بۆ ئەو شتانە بگەڕێ، کە خۆی مەبەستیەتی پێکی بەستێتەوە، یان بیرۆکەیەکی هەبێت لەسەری گرنگ ئەوەیە ئەو بینەرەی کە دێتە ژوورەوە چاوەڕوانی ئەوە دەکات تابلۆکان لەسەر دیوار هەڵواسرابێت وەک لەسەرەتادا ئاماژەمان بۆ کرد، بەڵام ئیسماعیل خەیات لەم بارەیەوە دەڵێت: من لەم پێشانگایەمدا ئەوەشم پێشانداوە، کە کۆمەڵێک تابلۆ بە پێشانگاکەشەوە لەسەر زەوی دامناوە، وەکو بڵێی هۆڵێکی پێشانگایە پاش شەڕو دیسانەوە ئەوەش چۆتە سەر زەوییەکەو بۆتە بەشێک لە بیرۆکەکە و ئەمەشم لەبەر ئەوەیە، کە هەوڵ دەدەم لە دوا پرۆژەکانم مانایەک بدەم بەهونەر، وەک وەختی خۆی بۆ ئاشتی و بۆ کوردستان پرۆژەیەکم لە (پیرەدر) کرد ئێستاش واتە ئەم بەرهەمە، کە هەر لەسەر شەڕەو دەمەوێ لەمەشدا پێشانی بدەم شەڕ ئەو هەواو کەشە بە ئێش و ئازارەت بۆ بەجێ دێڵێت وەک لەسەرەتادا ئاماژەم بۆ کرد، هەروەها سەبارەت ئەم پرۆژەیەش هاوسەرم گەزیزەو منداڵەکانیش ئیشیان تێدا کردووە ئەمەش هەر بیرۆکەیەکی تازەیە، کە چۆتە ناو بابەتەکەو بە هیوام ئەو شتانەی، کە باسم کرد و ئەو شتانەی، کە کردوومە بگاتە بینەر، گرنگی خۆی، کارتێکردنی خۆی هەبێت لەلای.

هەر بۆیە ئەم جۆرە پرۆژانە گرنگن بۆ هونەری کوردی، کە نوێخوازییەکی تێدایە لە شێوەی پێشاندانی، لەشێوەی تەکنیکی و دیارە هونەرمەند ئیسماعیل خەیات و ئەوانەی بەدواداچوونیان هەیە بۆ کارەکانی وەک خەیات دەڵێت: دەزانن پرۆژەکانم هەردەم نوێکاری تێدا هەیە لە سیستمی پێشاندانی، لە سیستمی تەکنیکی و هەرچەندە ئەم تەکنیکەش سەرچاوەکانی لە ئیشەکانی پێشتری خۆمم وەرگرتووە بەس بەشێوازێکی دیکەو بەکەرستەیەکی دیکە.

ش.ع





# دووەمین پێشانگای تایبەتی خۆشنووسی زیاد موهەندیس

ڕۆژی (٢٥/٩/٢٠٠٤)، بەڕێوەبەرایەتی هونەری شێوەکاری، دووەمین پێشانگای تایبەتی هونەرمەند (زیاد موهەندیس)ی لە هۆڵی میدیا لەشاری هەولێر کردەوە.

زیاد حەیدەر عەبدوڵلا ناسراو بە (زیاد موهەندیس)، یەکێکە لە خۆشنووسە دیارەکانی کورد، کە ساڵی ١٩٨٣ سەرەتای دەستپێکردنی کاری هونەرییەتی، جیا لە پێشانگا هاوبەشەکان لە ناوەوەو لە دەرەوەی کوردستان، یەکەمین پێشانگای تایبەتی لەشاری هەولێر ساڵی ١٩٩٦ کردووەتەوەو خەڵاتی یەکەم و دووەمی لەسەر ئاستی جیهان لەساڵەکانی ١٩٩٣- ١٩٩٧ جگە لە پاداشتەکان، کە ژمارەیان (٧)-ە لەشاری ئەستەنبوڵ وەرگرتووە، بۆ دووجاریش خەڵاتی کوفەی لە فێستیڤاڵی جیهانی لەشاری بەغدا وەرگرتووە. هەروەها جگە لە مۆڵەتی هونەری ژمارەیەک لە بڕوانامەو پیرۆزبایی وەرگرتووە. شایەنی باسە تابلۆکانی دووەمینی پێشانگای تایبەتی ناوبراو بە خەتی خۆشی چەندان کۆپلە شیعر و وتەی بەپێز و دروشمی نیشتمانی لەدوو توێی تابلۆکانی خستبووە ڕوو، ئەگەرچی بابەتی تابلۆکانی، کە زۆربەیان دروشم ئامێزن و ڕوون و ئاشکراشە، کە لەم زەمەنەی ئەمڕۆدا مۆدێلی نەماوەو بەسەر چووە، بەڵام کاکی موهەندیس، کە ئەم پێشانگایە دووەمین پێشانگای تایبەتییەتی، کەچی چوارساڵ لەمەوبەر ، وەک خۆی گوتی: «بیرم لەوە کردۆتەوە، کەوا پێشانگایەک بکەمەوە، چونکە بەلای منەوە پێشانگا دەبێت ئامانجی هونەرمەندی تێدابێت، یا ئایا کاتێک پێشانگا دەکاتەوە چ پەیامێک دەگەیەنێتە بینەر؟

دیارە هونەرمەندی خۆشنووس پێی وایە ئەم لەو پێشانگایەی زیاتر بایەخی بە تەکنیک داوە، نەوەک خوێندنەوە. هەروەها ویستوویەتی بە بینەر بڵێت، کەوا هونەری خۆشنووسی تەنها بۆ خوێندنەوە نییە، بەڵکو تابلۆیەکی شێوەکارییە بینەر خۆی دەتوانێت سوودی لێوەرگرێت و لە مانا هونەرییەکەی بگات.

هەر بۆیە ئەگەر تەماشای ڤۆلدەری پێشانگاکە بکەین دەبینین هونەرمەند ئەوەی نووسیوبەتی لەسەر تابلۆکان لە ڤۆلدەرەکە ڕوونی کردۆتەوە. ئەمەش بەهیچ شێوەیەک لایەنە هونەرییەکەی لە دەست نادات، وەک ئێمە لە پرسیارێکدا ئاراستەی هونەرمەندمان کرد، چونکە تابلۆ لەلای هەر کەسێک خوێندنەوەی جیاوازی هەیە و بەپێی ڕۆشنبیری ئەو کەسە دەگۆڕێت.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم پرسیارەش زیاد موهەندیس پەیامی خۆی لەم پێشانگایە بە نموونە هێنایەوەو گوتی: «لەگەڵ ئەوەی ناوم لە زۆربەی تابلۆکان ناوە و بە نووسین ڕوونم کردۆتەوە پەیامی من لەم پێشانگایە شتێکی دیکەیە و دەمەوێت:

١- بە بینەر بڵێم هونەری خۆشنووسی هونەری شێوەکارییە.

٢- هەروەها بینەر بۆ پێشانگای خۆشنووسی ڕادەکێشم و لە ڕێگای ڕەنگەکانەوە کوردستان بۆ خەڵک شی دەکەمەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە هونەری خۆشنووسی لقێکی زیندووی هونەری شێوەکارییە، چونکە هەموو زانستەکانی هونەری شێوەکاری تێدا بەدی دەکرێت بەتایبەتی ڕەنگەکان، کە دەتوانرێ بەشێوازێکی زۆر جوان لەناو تابلۆی هونەری خۆشنووسی بەکار بهێنرێن، جگە لەوە لە ناوەڕۆکەوە، وەکو تابلۆی ڕەسم پەیامێکی دیکە دەگەیەنێت و ئەمانەش بناغەی هونەری شێوەکارین، بۆیە من ئێستا دەزانم چی دەکەم و هەنگاوی یەکەمم تەواو بوو ئەم پێشانگایە هەنگاوی دووەمەو سەرەتای دەستپێکردنە بەرەو ئەفراندن.

هەرچەندە ئاستی خۆشنووسی لە کوردستان لە پێشکەوتندایە، بەڵام پێویستمان بەکارێکی زۆر هەیە تا وەکو بتوانرێ شێوازێک بۆ خۆشنووسانی کوردستان پێک بهێنرێت، چونکە تاوەکو ئێستا قوتابخانەیەکمان نییە، کە گرنگی بەم هونەرە بدات، وەکو هونەر، نەوەکو نووسین، وەک هونەرمەند بۆی چوو ئەم پێشانگایەی

هونەرمـــەند یەکـــەمین هەنگاوە، ئەمـــەشی لەوەدا بۆ بەدیارکەوت لەبەر ئەوەی بینەر بەگشـتی حەزی لەشتی نوێیـــە هەر بۆیە لەم پێـشـــانگایە بینەر بە دڵخـۆشی هۆڵەکەی بەجـێـهـێـشت، بەڵام وەک ئامـاژەی بۆ کـرد پێـویـســتـمـــان بەکـــاری زۆر هەیە بۆ ئەوەی بینەر بە بەردەوامی بهێنینە ناو هۆڵەکان.

نابێت ئەوەش لەیاد بکرێت، کـە هەسـتـیـش دەکـرا هونەرمـەند سـوودی لە هونەری کـۆلاژ وەرگـرتبـوو، بەڵام هونەرمەند زیاد موهەندیس ئەم بۆچوونەی بە شێوەیەکی دیکە لێکدایەوە، لەبەر ئەوەی کـــۆلاژەکـــەش هەر دەسـتکردی خـۆی بوو جـیـا لە هونەرمـەندانی دیکە، کـە چەند کارێکی دەردەوە لەگەڵ یەک کۆلاژ دەکەن، هەروەها بەڕای ئەمیش هونەری کۆلاژ سـەلیقـەیەکی بەرزی دەوێت و هونەرێکی گـەورەیە. لەوانەیە، هونەرمـەند بە چەند خولەکێک تابلۆیەک بە ئەنجام بگەیەنێت، بەڵام لەوانەشە لە ماوەی ساڵێک بیری لێکردبێتەوە. ڕەنگە هەر ئەمەش بێت وا لە هونەرمـەندی ناوبراو بکات پاش کـردنەوەی یەکەمین پێشانگای تایبەتی ساڵی ١٩٩٦، پێشانگای دووەمی تایبەتی ساڵی ٢٠٠٤ بکاتەوە، بێگومان، وەک خـۆشی گـوتی: دەیتـوانی لەنێوان ئەم مـاوەیەدا چەندین پێـشـانگا بکاتەوە، بەڵام گـوتی: «ئایا دەمـتـوانی سـەر کەوتووبم؟ هەر بۆیە من ئەوەندە ساڵە بیرم کردەوە تاوەکو ئەم پێـشـانگایە هاتەدی» هەر ئەمـەشـە وای لێـدەکـات بڵـێت: خـوا دەزانێ دوای چەند سـاڵی دیکە پێـشـانگا دەکـاتەوە، هەروەکـو پێـشـتـریش باسی کـرد، کـە دەبێت هونەرمەند پەیامی هەبێت.

## نمایشی
## لە خوا بپاڕێرەوە دڵت بکا بە بەرد

ڕۆژانی (٥ بۆ ٧/ ١٠/ ٢٠٠٤) لە هۆڵی ڕۆشنبـیـری سلێمانی، شانۆیی (لە خوا بپاڕێرەوە دڵت بکا بە بەرد) نمایش کـرا ئەم نمایشـــە لە دەقی (بەدحـــاڵی بوون)ی نووســەری فـەڕەنسی (ئەلبـێـر کـامـۆ) وەرگـێـراوەو (حـەمـەکەریم عـارف) کـردوویەتی بەکـوردی و کـۆمـەڵە شـانۆکـارێکی لاو کـە هەمـوویان دەرچووی بەشی شـانۆن نمایشـیـان کـرد و گـرووپەکـەش بریتی بوون لە (کـامـەران سوبحـان و گـۆران عـەلی کەریم: دەرهێنەر،سـەفین ئەنوەر شـوکـری، ڕۆشنا جـەمـال، ڕۆزا ئومـێـد، شـادان عـەلی، ئەکتەر.

دەقی ئەم شانۆگـەرییە ڕەنگە پێـویسـتی بە باسکردن و گێڕانەوە نەبێت چونکە ئەم دەقە دیارترین دەقی کامۆیەو تا هەنووکـە خـوێندنەوەی زۆری بۆ کـراوەو قـووڵتـرین فەلسەفەی بوونگەرایی و عەدەمیەتی کامۆی تێدا تەرح کـراوە، بەتایبەتی کێشە وجودیەکانی مرۆڤی هاوچەرخ، هەر لەسەرەتای ئیشکردنی ئەم گرووپەوە هەوڵی ئەوەیان داوە بە فـۆرمێک کاری هونەر بکەن کە جیـاوازبێت لەو کارکـردنەباوەی کە شانۆکـاران ئیشی لەسـەردەکەن، ئەم قسەیە بەو قسانەدێت کە هەردوو دەرهێنەر و ئەکتەرەکان پێش نمایشـەکـە لەسـەر کـارکـردنی هونەریی خۆیان لێی دوان، بەتایبـەتیـتـریش ئەو دووەمانفـێسـتـەی کـە وەک پێـشـینـەیەک لە ئەدەب و هونەری کـوردسـتـانی نوێدا بڵاویان کـردەوە، بەدەر لەمـەش ئەم نمایشـە کـۆمـەڵێک گۆڕانی هونەریانەی جوانی تێدابوو بەتایبـەتی لە ئیقاعی نمایشـــەکـــە و ئـسـلوبی نواندن و تەکنیـکی دەرهێنان، نواندنیـش زیاتر لای سـەفین ئەنوەر شـوکـری کـە دوای وەنبـوونی چەندین سـاڵەی، ئێـسـتـا بەفـۆرمـێکی نوێ و تەکنیـکێکی جـیـاوازترەوە دەرکـەوتەوە، ئەمـەش وای کـردبوو وەک مـەلیکی نمایش ببینرێت، هەرچەند هەندێ هەوڵدرابوو لەلایەن هەردوو دەرهێنەرەوە کـــە بلانسی نمایش ڕابگیـرێت بەڵام تا ڕادەیەک ئەم جـیـاوازیە لە نواندندا دەبینرا.

لایەنێکی تری ئەم دەقە ڕیتمی گشتی نمایشە، یان ئەو چیرۆکەیە کە شانۆیەکەی لەسەر بونیاد نراوە کەشێکی زۆر مەرگدۆستیانەیەو سەرجەمی شانۆیەکەش مردن باڵی بەسەردا کێشاوە، بۆیە ئەم مەرگە لەسەرجەم کارەکەدا ڕەنگی دابوویەوەو بەردەوام لەو نمایشـەدا ئەکـتـەرەکـان دەیانویست گـوزارشت لەمـەرگ بکەن و دواجـار تووشی بێئومێدی نا دڵنیایی دەبوون، ئەو نادڵنیـایی و قەلەقەش سەرتاپای شانۆکەی گرتبوو.

ئەم هەسـتـەش نەک لای ئەمـان، بەڵکو سـەرجـەم شانۆییەکانی کامۆ ئەم شێوازەیان هەیە، ئەمە جگە لەوەی





دەقەکانی کامۆ ریتمێکی تێدایە کە گوزارشت لەماهیەتی مرۆڤ دەکات، کە لەم شانۆیە رەگەزی مرۆڤ چەقی هەموو شتەکانە و دواتر هەمووشتێ بۆ لای مرۆڤ دەگەرێتەوە، رەنگە لێکنەگەیشتنی مرۆڤ لە هاوەڵەکەی بەرامبەری گەورەترین ئیشکردنی نووسەر بێت، ئەم دوودەرهێنەرەش زۆرکاریان لەسەر ئەم مەفهومە کردبوو وەک لە نمایشەکەدا بینیمان ئەکتەرەکان بەردەوام لەومانایە دەگەران بۆچی ناتوانن زمانی هاوەڵەکەیان بدۆزنەوە و گفتوگۆ بکەن، بەڵام لە ئەنجامدا لە نائومێدی و رەشبینیەوە سەریان دەرهێناو هەموویان بەرەو مەرگ چوون..

لای کامۆ هێندەی فەلسەفەی زمانەوانی زاڵە هێندەی زمان کار لە ئیستاتیکای چیرۆک وتەکنیک دەکات هێندە بیرۆکە یان کارەکتەر یان رەگەزەکانی تر زاڵ نین ئەمانیش زۆرکاریان لەسەر ئیشکردنێکی زمانەوانی و فەلسەفیانە کردبوو کە زاڵترین رەگەز تێیدا وشە بوو نەک وێنە کە ئەمەش دیارترین رەگەزی کارکردنی کامۆیە لەناو دەقەکانیدا، بەڵام هەندێ حاڵەت هەبوو بەهۆی رووناکی و جەستەی ئەکتەرەوە هەوڵی کوتلەی هونەری درابوو بەڵام ئەمەش لە هەندێ حاڵەتدا فەلسەفەی دەقەکەی بەرەو ئاراستەیەکی تر ئەبرد، هەرچەندە ئەم گرووپە خۆیان لە مانفێستەکەیاندا ئەوەیان خستووەتە روو کەکارکردنی ئەوان لەم کارە هونەریەدا کارکردنە بە ئاراستەیەک کە لەوەو پێش کاری لەسەر نەکراوە ئەویش تێکشکاندنی مانای (ئەکتەر، دەرهێنەر) بەڵکو لەم کارەدا دەرهێنەر تەنها وەزیفەی کارکردنە بۆ رێکخستنی سەرجەم رەگەزە هونەریەکان و تەنها چاودێری هونەریانەی ئەکتەر دەکەن و ئەکتەر خۆی سەربەستە لە کارکردن و خۆی هەوڵی ئەزموون دەدات لەسەر شانۆ و تا ئەوساتەی چاودێری (دەرهێنەر) دەبێتە رێکخەری کارەکانی ئەو، ئەمەش ئازادیەکی رەها بەجوولەو دەنگی ئەکتەر دەبەخشێت بۆ داهێنان، دواتریش ئەکتەر بەدوور دەبێت لەهەموو جۆرە کارێکی ساختە و تەسەنوعێک..

دیارە ئەم کارکردنە بۆ گرووپێک کە هەموویان لەبوارەکەی خۆیان ئەکادیمی بن شتێکی پر بایەخەو دەکرێت لە داهاتووشدا هەوڵەکانیان بەرفراوانترکەن، جوانی ئەم هەوڵە لەوەدایە کە ئەمانە شانبەشانی لایەنی پراکتیکی گرنگی بەلایەنی (تیۆری)ش ئەدەن کە ئەمە خزمەتێکی باش بەم رەوتەی شانۆ دەکات، کە لەمرۆدا حاڵەتی رەخنەو نووسین لەسەر شانۆ لەبارێکی زۆر نادروستدایە و دەکرێت رەخنەی زانستی و ئەکادیمی تەکانێک بەم لایەنە بدات، ئەوەی مایەی خۆشحاڵی بوو لەماوەی ئەو سێ رۆژە لە نمایش هۆڵەکە جمەی دەهات لە بینەران کە ئەمە یەکێکە لەو حاڵەتە دڵخۆشکەرانەی کە ماوەیەکە هۆڵەکانی شانۆ چۆڵیەکی زۆریان پێوە دیارە و بەهیواین ئەمە ببێتە دەروازەیەک بۆ ئاشتبوونەوەی شانۆ و بینەران.

**هەرێم عەلی**
**(سلێمانی)**

## هەفتەیەکی هونەری بۆ هونەرمەندانی (چین و فەرەنسا) لە سلێمانی




لە هەوڵێکی نوێدا بە ئاراستەی خزمەتکردن بە رەوتی شێوەکاری کوردی بۆ ماوەی هەفتەیەک لە رۆژی ٢٠٠٤/٩/١١ رێکخراوی باڵندەباران هەفتەیەکی رۆشنبیری و هونەری لە سلێمانی گێرا کە لە هەرسێ بەشی [خۆشنووسی- فۆتۆگراف- شێوەکاری] لەخۆ گرتبوو. بەرنامەی کارەکانیشی لە چەند شوێنێکی سلێمانی بەرێوەبرد لەوانە:

* گەلەری ئارام عەلی.
* گەلەری مۆزەخانە.
گەلەری زاموا.
* هۆڵی ئەمنەسوورەکە.

لەم هەفتەیەدا سلێمانی وەک رێورەسمێکی هونەری گەورە وابوو کە تێکرای هونەرمەندان و رۆشنبیران بەشێوەیەکی بەرفراوان بەشداری چالاکیەکانیان دەکرد، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا گوروتینێکی گەورەی بەم هەفتە هونەرییە بەخشیبوو، ئەمە جگە لەو دیالۆگ و گفتوگۆ بەرفراوانەی لەدوای هەر چالاکییەک لەلایەن ئامادەبووانەوە ساز دەکرا.

هونەرمەندە بەشداربووەکانی ئەم هەفتە هونەرییە پێکهاتبوون لە ژنە شێوەکاری فەرەنسی (ئیدیت هێنری) سەرۆکی رێکخراوی باڵندەباران و فۆتۆگراف و رۆژنامەنووس (ئۆلیڤەتۆگۆن) رێبوار سەعید بەپرۆژەی

باڵندەباران لینگ فێی فۆتۆگراف.

لینگ فێ فـــۆتۆگـــرافـــەرێکی زۆر دیاری (چین)ە حیکایەتی ڕۆژە سەیرو سەمەرەکانی (چین)مان بە فۆتۆ بۆ دەگێـڕێتـەوە بە شـێـوازێک منی بینەر هەست بکەم (چین) بە هەموو حیکایەتەکانیەوە بەشێکە لەمن، یان (چین) پڕە لە وێنەو شتی سەیر، شتانێک کە ڕەنگ بێ بەس لەوێ هەبێت..

فۆتۆکانی هێندە سەرنج ڕاکێشن ناکرێت لەبەردەم هەر تابلۆیەکـدا هەڵوێسـتـە نەکـەیت و بیـر لەو ژیانە پڕ لە لوغزەی ئەوێندەر نەکەیتەوە.

لینگ فێ لە ساڵی ١٩٥٣ لە پەکین لە دایک بووە لە ساڵی ١٩٨٥ دبلۆمی هونەری فۆتۆگرافی لە دانیشگای پەکین وەردەگرێ و پاشان دەبێتە مامۆستای فۆتۆگراف.

ئیدیت هێنری لە ساڵی ١٩٥٧ لە فەڕەنسا لە دایک بووە، سـاڵی ١٩٨٤ کـۆلیـژی هونەرەجـوانەکـان تەواو دەکـات، لەوسـاڵەوە بە بەردەوام لە وڵاتانی بەلجـیکا و پۆلۆنیا و بەریتانیا و چین پێشانگەی کردۆتەوە.

سەبارەت بەم پرۆژە و هەفتە هونەرییەی کە لەژێر ناوی [پردێ لەنێوان ئێـمەو کـوردسـتـان]دابوو، ئەوان دەڵێن: پرۆژەی ڕێکخـــراوی باڵندەباران کـــە پێکهـــاتووە لە هەفـتـەیەکی هونەری لەشـاری سلێـمـانـی و هەوڵێـر بۆ بەسـتـنەوەی پردێک لەنێـوان کـوردوسـتـــان و دەرەوەدا، ڕێکخراوی باڵندەباران ڕێکخراوێکی فەڕەنسی کوردییە و لەساڵی ١٩٩٤ لەشاری لیل لە فەڕەنسا دامـەزراوە، دامـەزرێنەری ئەم ڕێکخـراوە سێ هونەرمـەند (ڕێبـوار سـەعـیـدی کـورد و ئیدیت هێنری فـەڕەنسی و کـارینا واشکۆی پۆلۆنی بوون ناوی باڵندەباران ئامـــاژەیە بۆ کیمیا بارانی دێی سەرگەلۆو و شەهیدبوونی باڵندەکان بوون بە ئاسمانەوە.

ئامـانجی ئەم ڕێکخـــراوەش گـۆڕینەوەی ئەزمـوونی هونەری و کـولتـووری نێـوان مـیللەتانە و تا هەنووکـە چەندین پێـــشـــانگە و پرۆژەی هاوبەشی هونەری و کولتووری ئەنجام داوە لە ئەورووپا و چین...

گـرنگتـرین بەشـێـشی جگە لە فـۆتۆگـرافـەکـان ئەو پێشـانگە [خـۆشنووسـیـە]بوو کـە زیاتر بایەخی خـەت بەگـشـتی و هونەری کـولتـووری خۆرهەڵاتی بەتایبـەتی خرابووە ڕوو لە ئەهمیەت و جوانکاریدا زیاتر پڕ لە شەوق و جوانی بوو.

**کاروان سەعید**
**(سلێمانی)**

# گرووپی (ئەفکار)
# پێشانگایەک لە سلێمانی

ڕۆژانـــی ١-١٠ بـــۆ ١٠-١٠-٢٠٠٤ لـــە شـــاری سلێـــمـــانی بەهاوکـــاری وەزارەتی مـافی مـرۆڤی عـیـراق یەکـەمین فـسـتـیـڤاڵی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە ڕێـک خـــــرا، لـەم فـسـتـیـڤاڵەدا چەندین چـالاکـی هـونـەری و ڕۆشنبیری و کولتووری ساز کرا، لەوانە چالاکی مۆزیکی و هەڵپـەڕکـێی مـیللی و فـۆتۆگـراف و گفتوگۆی ڕۆشنبیری و سیاسی تاد...




لەناو ئەم فستیڤاڵەدا بە ئامـادەبوونی (٢٩) شـێـوەکـاری گـرووپی ئەفکار پێشـانگایەکی هاوبەش لەگـــەڵەری مـۆزەخـانە کـرایەوە، لەم پێـشـــانگایەدا ئەم (٢٩) هونەرمـەندە بە جـیـاوازی بەرهەم و بابەت و تەکنیکی هونەرییەوە کۆمەڵێک بەرهەمیان نمایش کرد، ئەگەرچی خـاڵی هاوبەش لەنێـوان ئەم (٢٩) هونەرمـەندەدا بۆ ئیشکردن تەنها ژیان و گفتوگۆی نێوان مرۆڤ بوو، لە هەمـان کاتدا هەریەکـەیان بە ئسلوب و مـادەی جـیـاواز کاریان کردبوو، کە زۆربەیان هەوڵیـان دابوو تابلۆکانیـان گوزارشت بێت لەو پێکەوە ژیانەی لە عـیـراقی ئایندەدا میللەتەکان خەونی پێوە دەبینن.

وەک خۆشیان لە دەلیلی پێشانگاکەدا باس لەوە دەکەن کە ڕەنگەکانیـان گوزارشتە لە خۆشی و گەشبینی و هیوا بەداهاتوو.

یەکـێک لەو (٢٩) هونەرمـەندە کە لە پێـشـانگاکـەدا بەشـداربوو سـەبارەت بەم کـارە هاوبەشـەیان دەڵێت: (بەرهەمـەکانمان لە گرووپی ئەفکار بریتـیـیە لە تابلۆ و سـیـرامـیـک و پەیکەر، کـە هەمـوویان هەوڵێکن بۆ دۆزینەوەی پردێک لەنێـوان بەغـداد و کـوردسـتـانـدا بەهیـوایین ئەو پردە سەردتاکەی هونەر و خۆشەویستی و ڕۆشنبیری بێت.

مـەبەسـتـیـشـمـان لەم پێـشـانگایە ئاشناکـردنی هونەرمـــەندان و بینەرانی کـــوردە بە تەکنیـک و ئیشکردنێک کە ئێمە لەم گرووپەدا پەیڕەوی دەکەین، بە ئومێدین ئەم هەوڵە سەرەتایەک بێت بۆ پرۆژەی گەورەتر و فراوانتر.

**سامان حوسێن**
**(سلێمانی)**

# سیرامیکە ساردەکانی خاتوو حەنان سالح محەمەد

حەنان سالح محەمەد یەکێکە لە خاتوونە دیارەکانی بواری سیرامیکی سارد و لەساڵی ١٩٨٥-ەوە تا ئێستا لە زۆربەی بوارە هونەرییەکان کاردەکات و لەساڵی ١٩٩٦-ەوە کاری سیرامیکی سارد و گەرم دەکات و لە ساڵی (٢٠٠٣)-وە لە بواری کریستاڵ و شووشەش کاردەکات. هەروەها مامۆستای پەروەردەی پیشەییە لە قوتابخانە دواناوەندییەکانی هەولێر و ئێستاش مامۆستای هونەری سیرامیکە لە قوتابخانەی دواناوەندی چناری کچان لە هەولێر. شیاوی ئاماژە بۆکردنە خاتوو حەنان لەساڵی ١٩٩٠ لە بەغدا بەشداری لە پێشانگایەکی نێودەوڵەتی کردووەو لەساڵی (١٩٩٢)-ەوە بەردەوام بەشداری سەرجەم چالاکی قوتابخانە پیشەییەکانی هەولێری کردووە. بەم دواییەش لە ٢٠٠٤/١٠/١٠ پێشانگایەکی تایبەتی بە سیرامیکی ساردی لە هەولێری پایتەخت کردەوە، کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری و هونەری پارێزگای هەولێر لە گەلەری کوردستان بۆی سازکرابوو، کە پتر لە (١٣٠) پارچە سیرامیکی ساردی لە جۆرەکانی گوڵ و، (٤٠) تابلۆی شووشە و، (٥٥) پارچە کریستاڵ و، (١٠) سەبەتەی گوڵ و، (١٢) سەبەتەی میوەی تێدا نمایش کردبوو و سەبارەت بە سیرامیکی سارد بە گشتی و پێکهاتەکانی ئەم هونەرە پاک و بێگەردە خاتوو حەنان دەڵێت: «پێکهاتەکانی سیرامیکی سارد بریتییە لە ئارد و نیشاستەو غەڕەو بە تێکەڵکردنی ئەمانە هەویرێک

به چاودێری بەڕێز سامی شۆڕش وەزیری رۆشنبیری
حكومەتی هەرێمی كوردستان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی ی رۆشنبیری و هونەر
بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری و هونەری پارێزگای هەولێر



دروست دەبێت و بەپێی پێویستیش هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکەم؛ واتە ئەگەر ویستم ڕەنگی لەگەڵ تێکەڵ دەکەم و، ئەگەر پێویستیشی نەکرد دواتر پاش تەواوبوونی تابلۆکە، یان بەرهەمەکە ڕەنگی دەکەم» هەروەها بۆ دروستکردنی گوڵێکیش دوو ڕۆژی پێویستە، چونکە وەک خۆی تیشکی خستە سەر، گوڵ وشکبوونەوەی دەوێت، واتە ڕۆژێک بەس گەڵاکان دروست دەکات و ڕۆژێکیش پێکەوەی دەنووسێنێت و ئەمەش وای لێکردووە دووساڵ و نیو خەریک بێت بۆ دروستکردنی ئەو (١٣٠) تابلۆیە و لەتەک ئەمەشدا ئیشی قوتابخانەشی ئەنجام داوە و ئاشکراشە، کە بەشداری لە هەموو پێشانگاکانی قوتابخانەکان کردووە لەسەر ئاستی هەولێر.

نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێت، کە ماوەی سێ مانگیشی پێ چووە هەتا جۆرە تەنسیقێکی لە نێوانیاندا دروست کردووە.

ئەگەرچی لە زۆربەی تابلۆکانیشدا جۆرە گەشبینییەک و دواڕۆژێکی گەش بۆ میللەت و وڵاتەکەمان دەنەخشێنێت، یان بەدی دەکرێت بەتایبەتی لە تابلۆی مۆم و گوڵە ڕەنگ ڕەنگەکاندا و ڕەنگە لەتەک ئەم لایەنە ئەبەرەش کارونیشە شووشەیی و کریستاڵییەکانیش لایەنی دیکەی لەباری ئەم پێشانگا تایبەتییەی خاتوو حەنان بێت، کە (٣٥) پارچە شووشەکەیە لە هەردوو ڕوویدا بەدیار دەکەویت و کریستاڵەکانیش وەک ناوبراو پێی وایە و وا دەزانێت کەس نەیکردووە و تازەیە.

ئەگەرچیش دوو سێ پارچە سیرامیکی گەرمیش لەشێوەی گۆزە و مەرکان لە پێشانگاکە بەرچاو دەکەوێت و بەلایەنێکی دیکەی لەباری پێشانگاکە دەژمێردرێت لەگەڵ ئەمەشدا بینەران پێیان وابوو ئامادە نەبوونی سیرامیکی گەرم لەناو پێشانگاکەدا جۆرە کەموکوڕییەکی بە پێشانگاکە بەخشیبوو و خاتوو حەنان ئەمەشی بۆ قورس و گرانی و نەبوونی پێداویستی هونەری سیرامیکی گەرم وەک فڕنی و قوڕ و کەرەستەی تایبەت بەم هونەرە گێڕایەوە. هەروەها پاک و خاوێنی سیرامیکی ساردیش هۆیەکی دیکەیە بۆ بایەخدانی زیاتری بەم جۆرە سیرامیکە و لەبەر ئەوەی هەر کاتێک ئیشی پێی نەما دەتوانێت هەڵیبگرێت و دواتر ئیشی لەسەر بکاتەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا هەرکەس و بینەرێک ئەو پێشانگای سیرامیکە ساردەی بینیبێت وێڕای هەستکردن بە ژیانەوە و گەرم و گوڕییەکی لە ڕادەبەدەری ئەم هونەرە ساردە، لەوەش حاڵی دەبێت، ئەگەر هونەرمەندێکی وەک خاتوو حەنان بەشێلانی ئەو هەویرە ساردە توانیوبەتی ئەم گەرم و گوڕییە بەدڵ و دەروونی بینەرانی سیرامیکی سارد ببەخشێت ئەوکاتە لەوە حاڵی دەبێت، کە هەرێمی کوردستان لەچ ڕۆژێکی گەشدا دەژێت و چ پاشەڕۆژێکی ڕووناکیش چاوەڕوانی دەکات.

**شوان سەرابی**



## شیرین غەفوور.. پێشانگایەک لەگەلەری زاموا

ڕۆژی ١٥- ٩-٢٠٠٤ لە گەلەری زاموا سێیەمین پێشانگای تایبەتی خاتوو شیرین غەفوور کرایەوە، لەم پێشانگایەدا خاتوو شیرین بە فۆرمێکی تایبەتمەندییانە کاری کردبوو، بەشێوازێک کە سەرجەم تابلۆکان یەکەیەکی تەبا هەبوو لەنێوانیاندا کە ئەو یەکەیە لەناوخۆیدا چیرۆکێکی دەگێڕایەوە چیرۆکەکەش گوزارشت بوو لە دیدێکی کوردانە، کە ئەو دیدەش لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی ئەزموونێکی بەرفراوان لای هونەرمەند دێتە بەرهەم، کە لەوەوپێش بنەمایەکی ئەکادیمییانەی هەبووە کە ڕەنگە سەرەتاکەی بۆ ئەزموونی پێنج ساڵی لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان بگەڕێتەوە.

ڕەنگە ئیشکردنی شیرین غەفوور تاکە ئەزموون نەبێت لەناو نەریتە باو و کولتوورییەکانی میللەتی کورددا کە پێشتر چەندین هونەرمەندی تر بە هەمان تەکنیک، بەڵام بە فۆرم و فیگەری جیاواز کاریان کردووە پێ دەچێ ناونانی سەرجەم تابلۆکانی خاتوو شیرین بۆخۆی سەرەتایەکی باش بێت بۆ قسەکردنی ئێمە لەسەر شێوازی کارکردنی کە تابلۆکانیش سەرجەمیان مێژوویەکی کوردەواریانەیان هەیە، وەکو (ساوەر، بێشکە، خۆشەویستی، نان کردن، بان گردێن، گۆزە، غارغارێن، مەم و زین، بەهار) ئەمانە هەمووی ناوی تابلۆکانی هونەرمەند بوون، کە هەریەکێک لەم ناوانە پێشینەیەکی مێژینەی لە داب و نەریتی کوردیدا هەیەو هونەرمەندیش بۆ هەریەکەیان چیرۆکێکی لەڕێی تابلۆوە خوڵقاندووە، بەتایبەتی شکڵ و ڕوخساری فیگەرەکانی زۆر تایبەتمەندێتی کوردیان پێوە دیارە کە ئەمە یەکێکە لە دیارترین سیماکانی کارکردنی هونەرمەند، ئەمە جگە لە بەکارهێنانی پانتاییەکی بەرفراوان لە ڕەنگ و دارشتنی شوێن و کەرەستە هونەرییەکانی ناو تابلۆکە کە سەرجەمیان ئەو کەرەستانە بوون کە لە کولتووری میللیدا قورساییەکی گەورەیان هەیە.

ماوەتەوە بڵێین هونەرمەند شیرین غەفوور ساڵی ١٩٧٤ لە سلێمانی لەدایک بووە، ساڵی ١٩٩٤ پەیمانگای هونەرەجوانەکانی سلێمانی تەواوکردووە.

لە (١٠) پێشانگای هاوبەشدا بەشداری کردووەو، ئەمەش سێیەمین پێشانگای تایبەتی هونەرمەندە لە پاش دەرچوونی لە پەیمانگا.

**هەردی عەلی**
**(سلێمانی)**



## گەمەی ڕێوی بەرهەمێکی نوێی تیپی هونەری منداڵانی سلێمانی

تیپی هونەری منداڵانی سلێمانی یەکێکە لەوتیپە چالاکانەی ماوەی دە ساڵە بەبێ دابڕان، بەرهەمی هونەری لە هەموو بوارەکاندا پێشکەش بە منداڵان دەکات، وەک بواری (گۆرانی و مۆسیقا، شانۆگەری، وێنەکێشان) و لە زۆربەی بەرهەمەکانیشیان لایەنی پەروەردەیی دیارترین ڕەگەزە، هەر بۆ ئەمە پێویستە منداڵانی کورد زیاتر سەیری بەرهەمەکانی ئەم تیپە بکەن و سوودیان لێوەربگرن..

وەک بەرهەمێ بۆ ساڵی نوێی خوێندن، دوای پێشکەشکردن، چەند گۆرانییەکی منداڵان بۆ تەلەفزیۆن و شانۆگەرییەکی جوان و قەشەنگیشیان نمایش کرد، بەناوی (گەمەی ڕێوی) ئەم شانۆیە لە نووسین و دەرهێنانی (مۆفەق لهۆنی)بوو، هونەرمەندان (بەرزان ئەحمەد و نەسرین فەتاح) کاری دیکۆریان بۆ بەئەنجام گەیاندبوو..

گەمەی ڕێوی لە ڕۆژانی ١٢- ١٧/٩/٢٠٠٤ لەهۆڵی

شانۆی پەیمانگەی هونەرەجوانەکانی سلێمانی پێشکەش کراو هەموو ڕۆژەکان هۆڵەکە جمەی دەهات لە منداڵان وزۆرجاریش منداڵان لەگەڵ ڕووداوی نمایشەکە تێکەڵاودەبوون و دەبوونە بەشێک لە نمایشەکە، لەناوی شانۆییەکەوە، نووسەر دەیەوێت ئەو ترسە لە منداڵان دووربخاتەوە کە گیانداران هۆکارێکن بۆ ترسی مرۆڤ بەڵکو ئەوڕۆحی خۆشەویستی نێوان مرۆڤ و گیانداران بەهێزتر دەکات، پێم وایە ئەمە سەرەتایترین کاری هونەر و شانۆی منداڵانە، ئەمە جگە لەو فەنتازیایەی دەرهێنەر لە نمایشەکەدا خولقاندبووی بۆ ئەوەی زیاتر منداڵان چێژ لەشانۆیەکە وەرگرن..

کاری دیکۆر لەبەرهەمی منداڵاندا ڕەگەزێکی زۆر گرنگە هەر بۆیە دەرهێنەر ئەم کارەی بەدوو هونەرمەندی شێوەکاری سپاردبوو ئەوانیش زۆر سەرنجڕاکێشانە دیکۆرەکەیان نەخشاندبوو، بۆیە دەڵێین گەر ئەم نمایشە ئەو دیکۆرە سەرنجڕاکێشەیەی نەبوایە ئەوە هەرگیز ئەمەندە منداڵان تامەزرۆی بینینی نەدەبوون، دیارە ئەمەش بەدەرەجەی یەکەم بۆ جوهدی دەرهێنەر دەگەڕێتەوە کە ماوەیەکی زۆرە خۆی بۆ کاری منداڵان تەرخانکردووەو بریا دەرفەت دەبوو وەک ئەکادیمیەک لەو بوارەدا زیاتر سەرقاڵ بوایە..

بەلای منداڵانی هۆڵەکەشەوە ئەم دیاریەی تیپی هونەری منداڵان جوانترین دیاریە بۆسەری ساڵی نوێی خوێندن، بریارە ئەم نمایشەش بۆ منداڵانی هەولێر و چەند شارێکی تری کوردستانیش پێشکەش بکرێت.

**ئەردەڵان ساڵح**
**(سلێمانی)**

---

# شانۆگەری شازادەی گوێدرێژ

ڕۆژانی (٢٤-٢٥/٨/٢٠٠٤) کاتژمێر ٦ی ئێوارە بەشی شانۆی مەڵبەندی منداڵانی خەبات، بە ئامادەیی ژمارەیەکی بەرچاو لە بینەران شانۆگەری «شازادەی گوێدرێژ»ی لە هۆڵی سلێمانی نمایش کرد، دەقی شانۆگەریەکە ئەفسانەیەکی ئیسپانییە و «فارووق هۆمەر» وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و دەرهێنانیش «سەروەر محەمەد ئەمین» پێی هەستاوە، ئەم شانۆگەرییە پاش هەوڵ و کۆششێکی زۆر لە مەشق و پرۆڤە لەلایەن دەرهێنەر و دەستەیەک لە منداڵانی گەڕەکە هەژار نشینەکانی سلێمانی کە ژمارەیان (٢٣) منداڵ دەبوو، هاتە بەرهەم.

شانۆگەرییەکە لەسەر زاری «لەنیا عەبدوڵلا»ی دایکەوە کە چیرۆک بێژە دیمەنەکانی دەردەکەوێت، چیرۆک بێژی دایک دەیەوێت بەم چیرۆکە منداڵەکەی بخاتە خەو.

ناوەرۆکی چیرۆکە ئەفسانەییەکە دەڵێت: پاشایەک منداڵی نەدەبوو، ئەمەش لای ئەو بوو بووە گرێ و خولیاو خوودانە منداڵان و فەرامۆشکردنی کاروباری کۆشک و مەملەکەت، تا ئەو ئەندازەی کە ئەم باسە هەموو وڵاتی گرتبۆوە، پاشا دڵتەنگ بوو لەوەی کە منداڵێکی نییە جێگەی بگرێتەوەو لە پاش خۆی مەملەکەتەکەی بپارێزێت، تا ئەوەی چەند فریشتەیەک دێنە خەوی و سێوێکی ئەفسووناوی پێ دەدەن و منداڵی دەبێت، ئیدی پاشا سوپاسی فریشتەکان دەکات و ئەوانیش هەریەکەیان لەلایەن خۆیانەوە دیارییەک پێشکەش شازادە دەکەن، فریشتەی یەکەم جوانی پێدەبەخشێت و فریشتەی دووەم زیرەکی، بەڵام فریشتەی سێیەم پێی وایە کە ئەگەر بێت و شازادە جوانترین و زیرەکترین منداڵ بێت ئەوە لەخۆی بایی دەبێت، بۆیە ئەو بریار دەدات کە دوو گوێی درێژ ببەخشێتە شازادە، هەرچەندە پاشا تکای پاشگەزبوونەوەی ئەم بریارە لە فریشتەکە و فریشتەکانی دیکەش دەکات، بەڵام داد نادات، ئیدی لێرەوە ستەمی شا، بۆ سەر شازادەی منداڵ و بێگەرد و درێژ دەبێتەوە، بۆ ئەوەی کەسێک نەزانێت کە شازادە خاوەنی دوو گوێی درێژەو پلەوپایەی شا لەکەدار نەبێت، ناهێڵێت تێکەڵی منداڵان ببێت و سروشتی منداڵانەی خۆی بنوێنێت، تەنانەت ئەم ڕازە (ڕازی گوێدرێژی شازادە) هێندە پەردەپۆش دەکرێت کە پاسەوانەکانی کۆشکیش نایزانن.

شازادە لەشای باوکی دەخوازێت کە مامۆستایەکی بۆ بگرێت، بەڵام باوک ترسی لە ئاشکرابوونی ڕازەکە هەیە، ئیدی شاژن پێشنیاری ئەوە دەکات کە مامۆستای بۆ بگرێت، بەڵام بەڵێن لە مامۆستاکە وەربگرێت کە ڕازی گوێدرێژی شازادە نەدرکێنێت، وەگەرنا ئەوا ڕووبەڕووی سزای سەخت و توندی شا دەبێتەوە.

بەڵێندانی مامۆستا، لەسەر دڵ و دەروونی قورس دەبێت و دەبێتە گرێیەک لە هەناویدا، دواجار خێزانی پێشنیاری ئەوەی بۆ دەکات کە بچێتە دەرەوەی شارو ڕازەکە بە ڕووی قامیشەکاندا بدرکێنێت، بەمەش نەکەس لە ڕازەکە دەزانێت و ئەویش بۆخۆی لەوگرێ دەروونییە ڕزگاری دەبێت، بەڵام قامیشەکان کە دەکرێنە شمشاڵ و دەست خەڵک و منداڵان دەکەون، ڕازەکە دەدرکێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە مامۆستا ڕووبەڕووی سزا ببێتەوە، چونکە ناپاکی لەبەرامبەر بەڵێنەکەدا نواندووە کە بە پاشای دابوو، بەڵام شازادەی ژیر داکۆکی و پارێزگاری لە مامۆستاکەی دەکات و لە سزای شای باوکی دەیپارێزێت، بەمەش دواجار کە فریشتەکان دەبینن شازادە مرۆڤێکی خاکییەو هیچ لە خۆبایی نەبووە دوو گوێیە درێژەکەی لێ دەسەننەوە.

ئەم چیرۆکە چیرۆکێکی پەروەردەییەو چەندین نموونەی جوان دەبەخشێتە منداڵان و باس لە خاکیبوونی شازادە و ستەمی شای باوک دەکات کە ناسروشتی بوونی منداڵەکەی بەعەیب و عارێک دەزانێت لەسەر پلەوپایەی شاهانەی، ئیدی سروشتی پاکی منداڵانەی شازادە دەکاتە قوربانی حەزی نەفسییەکانی خۆی و لە دنیای منداڵانی دادەبڕێت.

**ئا: جەمال هەڵەبجەیی**

## هونەرمەندی فۆتۆگرافی محەمەد نەبی لە یەکەم پێشانگەی تایبەتیدا

بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری و هونەری پارێزگای هەولێر یەکەمین پێشانگەی فۆتۆگرافی تایبەتی بۆ هونەرمەندی لاو محەمەد نەبی لەژێر ناونیشانی «کورتە دواندنێکی سروشت» لە رۆژانی (٢-٣/١٠/٢٠٠٤) لە گەلەری میدیا لە هەولێر کردەوە. هونەرمەند لەم پێشانگەیەیدا زیاتر لە (٤٠) گرتەی فۆتۆگرافی جۆراوجۆری سروشتی رەنگینی کوردستان، بە چەندین گۆشە نیگاو لە کەژی جیاجیادا خستبووە روو، کە بەنێو پێشانگەکەدا رەت بووم، هەستم بەوە دەکرد نزیکبوونەوەیەکی زۆر لە جیهانی براکەی بەکر نەبی هەیە، پاشان دەرکەوت ئەمە وەنەبێ کاریگەری ئەو بەسەر ئەمەوە هەبێ، بەڵکو وا رێکەوتووە بەیەکەوە گەشتیان بۆ زۆربەی شوێنەکان کردووە و بەیەکەوە فلتەریان بەکارهێناوە وەک تەکنیکی فۆتۆگرافی، بەهەر حاڵ هەست ناسکی و سەلیقەی



هونەری لەنێو گرتەکانیدا بەدی دەکرێ، پایزەکانی و گەلارێزانەکانی پارچە سەمفۆنیان. لەیەکەم تاقیکردنەوەیدا توانستی هونەری بەدی دەکرێ، ئەگەرچی لە هەندێ گرتەی تردا لە رووی هونەری هەندێ لاوازییان پێوە دیاربوو، دەکرا لەکاتی گەورەکردنی وێنەکان، چارەسەری بکردنایە. بە هەرحاڵ ئەمە یەکەم هەنگاویەتی، بەردەوامی و تاقیکردنەوەی داهاتووی ئومێدی ئەوەی لێ دەکرێ هەنگاوی لەبارتر بهاوێژێ لەنێو جیهانی هونەری فۆتۆگرافدا.

**ئا: رامان**

## هونەرمەند محەمەد خەتاب لەنێوان رابردوو و ئێستادا

بەڕێوەبەرایەتی هونەری شێوەکاری بە هاوکاری کۆمەڵەی وێنەگرانی کوردستان، سێیەمین پێشانگەی فۆتۆ-شێوەکاری هونەرمەند (محەمەد خەتاب)ی لە رۆژانی (٩-١١/١٠/٢٠٠٤) لە کۆشکی هونەر کردەوە لەژێر ناونیشانی «هونەرمەند لەنێوان رابردوو و ئێستادا» (٧٢) تابلۆی رەنگینی خستبووە روو، بەشی زۆریان وێنەی فۆتۆگرافی بوون بە قەبارەی (٣٠×٤٠)سم و رەنگاو رەنگ بوون، ئەم وێنانە نیوەی بریتی بوون لە ستیل لایفی گوڵ و گوڵدان بە چەندین شێواز و کۆمپۆزیشن وێنەی گرتبوون، کارامەیی و لێهاتوویی هونەرمەندی پێوە دیار بوو، ئەگەرچی گوڵەکان خۆیی نەبوون، بەڵکو هی هەندەران



(مانهایم) بوون، بەلام ناسکی و قەشەنگی گرتەکان لە هەواو کەشی خۆمانی نزیک کردبووەوە. بەشەکەی تری گرتەکان زیاتر لایەنی بیناسازی لەخانووە کولتووریەکانی قەلای هەولێر بوون، لەوانە خانووی شێخ جەمیل ئەفەندی بەرلەوەی ئەو خانووە دێرینە بەر گوللە تۆپی رژێمی بەعس بکەوێ، کامێرای محەمەد خەتاب توانی ئەو زەخرەفە جوان و وردەکارییە بیناسازییەی ئەو خانووە لە گۆشەنیگای جیاجیادا بەرجەستە بکات. لەلایەکی ترەوە، دیمەنێکی شارۆچکەی گەلالەی گرتبوو بەرلەوەی وێران بکرێ، وەک بەڵگەیەکی زیندووی ئەو گوندە ناوداره. لایەکەی تری ئەم پێشانگایە بریتی بوو لە کۆمەڵە تابلۆیەکی دەستی، نیگارکێش کرابوون کەرەستەی زۆر سادەی تیا بەکارهێنابوو، بەلام وردەکارییەکی زۆریان پێوە دیار بوو، ئەمانیش هەندێکیان ستیل لایف بوون و هەندێکی تریان تابلۆی تەعبیری بوون، باستیل و قەڵەم تەختەی تیا بەکارهێنابوو. دیارە هونەرمەند باکگراوندێکی شێوەکاریشی هەیە، چونکە لە رابردوودا لە تافی لاوێتیدا دەست رەنگین بووە لە رەنگکردنی وێنەی رەش و سپی، هەر بۆ سەلماندن ئەم سێ وێنەی دیمەنی سروشتی رەش و سپی بەدەست رەنگ کردبوون، هی سالانی حەفتاکان بوون، لەم پێشانگەیەدا عەرزی کردبوون.

مامۆستا محەمەد خەتاب سەرەرای ئەم کارانەشی، مامۆستای وانەی هونەر بووە و چەندین قوتابی پێگەیاندووە و چەندین سالیش سەرۆکی کۆمەڵەی وێنەگرانی عێراقی بووە و لە زیاتر لە (٢٠) پێشانگای هاوبەش بەشداری کردووە.

**ئا: ب. هەوراز**

# دیتنی هونەری نواندنی کوردی لە چەند دەروازەیەکەوە

بۆشایی کاری هونەری وەک نمایشی شانۆیی و فیلمی سینەمایی بەتەواوەتی هەستی پێ دەکرێت، تەنانەت لە کەناڵە تەلەفزیۆنییە ئاسمانی و خۆماڵییەکانیشدا هەست بە کەمی کاری درامای هونەری و کورتە فیلم دەکرێت، ئەمە جگە لەوەی لە ڕووی هەبوونی دەقی شانۆیی خۆماڵی و دەقی سینەمایی و درامی خۆماڵی کەم و کوڕیمان هەیە، خۆ دەکرێت تێکەڵییەک و نوێکردنەوەیەک لەنێو دەقە فۆلکلۆری و ئەفسانەیی و میللییەکاندا بکەین.

ئیزافاتیان بخەینە سەرو لەبەرگێکی تردا لەکاری هونەریدا نیشانیان بدەین، یاخود نمایشیان بکەین، ئێستا لە هەموو کاتێک زیاتر ڕکابەرایەتی هونەری و ڕۆشنبیری هەیە، بەتایبەتی لە ڕێگەی کەناڵەکانی سەتەلایتەوە کە جۆرەها کار و بەرهەمی هونەری بە زمانی جیاجیا و بەبۆن و بەرامی جیاجیا نیشان دەدەن، کە کاریگەری خۆیان دەخەنە سەر بینەر، لەم چەند ساڵەدا چەند دیاردەیەکی هونەری پەیدابوو دوای ئەوەی خەریک بوو بەرهەمە هونەرییە تورکی و فارسی و عەرەبی و ئینگلیزی و... تاد بەتەواوەتی مێشک و دەروونی بینەران و گوێگران بگرتەوە، لەو کاتەدا زۆر دیاردەی هونەری سەردەمانەی وەک (زەکەریا)و چەندانی تر پەیدا بوون، ئەمە جگە لەوەی لە بواری شانۆدا دیاردەی وەک (نیگار حەسیب قەرەداغی) و لە سینەمادا دیاردەی وەک (هونەر دیلمان) پەیدابوون، کە هونەری کوردیان بەرەو ئاقارێکی تر بردووە، لەنێو گیانی ئەو سەردەمەدا تواندیانەوە، کە بێگومان ئەم دیاردانە دانسقەیەو لەوانەیە نەتوانن بە تەواوەتی ئەو خامۆشییەی هونەری کوردی لابەرن، بینەری شانۆ و سینەما لەلای ئێمەدا زۆر کزبووە، وەک ئەوە وایە بەدوای سەرابێکدا بگەڕێین، تەنیا بینەر، بینەری شتە بازاڕی و بازرگانی و کرچ و کاڵەکانە، بۆیە جارێکی دیکە بایەخدان بە تەلەفزیۆن و ڕادیۆکان کارێکی گرنگە، ئەمەش بە هەوڵدان بۆ نووسینەوەی دەقی خۆماڵی و هەبوونی کاری درامی و کورتە فیلم و فیلمی بەڵگەنامەیی و کلیپی گۆرانی کە لە ئاستی هونەری بەرزدابن، پێویستمان بە چەندین کاری هونەری درامی وەک (مەمی ئالان، ڕەشەی پۆلیس و گەمەی خەونە ئازادەکان) و چەندانی لەم چەشن و شێوەیە هەیە، چونکە دەتوانین لە ڕێگەی تەلەفزیۆن و ڕادیۆکانەوە بۆشاییەکانی دراماو شانۆ و کورتە فیلم پڕبکەینەوە، بەڵام بەدەقی خۆماڵی و دەقی زیندوو و سەردەمانەو بەبێ ئەوەی دوێنێ و بەیانی لەبیر بکەین، چونکە بەشی هەرە زۆری بینەران، بینەری تەلەفزیۆن و گوێگری ڕادیۆکانن، ئەو هەموو فیلمەی سکرین و فیلمی سەر (CD) ناتوانن قەیرانی دراماو شانۆ و سینەمای کوردی چارەسەر بکەن و هونەری نواندن بگەیەننە ئاستێکی تر لە نمایش و کارە هونەرییەکان.

لە ڕووی هونەری سینەماشەوە چەندین هەوڵی سینەما هەیە لەوانە هەوڵەکانی (بەهمەنی قوبادی، مەهدی ئومێد، جانۆ ڕۆژبەیانی، ئەنوەر سندی، هونەر دیلمان) کە ئەمانە هەوڵی جدین بۆ گەیشتنی کورد بەهونەری حەوتەم و پەیداکردنی ناسنامەی سینەمای کوردی و بەرجەستەکردنی مرۆڤی کوردو خەونی کورد لەنێو ئەو هونەرە بەرفراوان و شارستانییەدا، کە ئەمڕۆ لە جیهاندا کاریگەرییەکی بەرفراوانی هەیە کە هەر ئەو هونەرەش پێویستی بە دەق و سیناریۆی خۆماڵی هەیەو سوودوەرگرتنی لەو شتە شاراوەو کەرەستە خاوە هونەرییانەی کە کولتوورێکی شاراوەی دەوڵەمەندە، بەڵام ئایا ئێمە لە بواری سینەمادا قەیرانی بینەرمان نییە؟ بێگومان قەیرانی بینەرمان هەیە و تەنانەت چەند ساڵێکە ساڵۆنەکانی سینەما بوونەتە شوێنی فیلمی سکرین کە هیچ هەلومەرجێکی هونەری و تەکنیکیان تێدا نییەو زیاتر وا لە بینەر دەکات سینەما لەبیر بکات و ببێتە یادگارییەک.

دەکرێ بەهەمان شێوە بەهۆی دەقی خۆماڵی و تەوزیفکردنی دەقە بیانییەکان بۆ میزاج و زەوقی کوردی و پەیدابوونی شانۆیەکی پڕ لە ئاهەنگسازی و گەمەی هونەری و مۆسیقاو بەکارهێنانی تەکنیکی تازەو پێگەیاندن و پەروەردەکردنی ئەکتەری چوست و بەتوانا تا ڕادەیەک شانۆی کوردی لەو بارە سستییەی بێتەدەرەوەو جارێکی دیکە بینەر بۆ شانۆ بگەڕێندرێتەوە، بەڵام شانۆ لەبەرگێکی تازەدا، کە لەگەڵ بینەری ئێستادا بگونجێ.

پڕکردنەوەی بۆشایی هونەری دراماو نواندن و بەرزکردنەوەی ئاستی زەوق و چێژو بیستن و لە هەموو شتێک زیاتر لە ڕێگەی تەلەفزیۆن و ڕادیۆکانەوە دەکرێت، چونکە بینەری کورد ڕاستەوخۆ پێوەندی لەگەڵ تەلەفزیۆن و ڕادیۆکاندا هەیەو لە هەموو ماڵێکدا ئامادەیەو بەشێکە لە ژیانی. ئەگەر نا، ئەو هەموو کەناڵە جۆراوجۆرو پێشکەوتووە دەبنە جێگەی بایەخی بینەران، نەوەک کەناڵە خۆماڵییەکان، بەم پێیەش کەناڵە تەلەفزیۆنەکانمان بە ئاسمانی و بە ئەرزیەوە پێویستیان بە هەمەجۆری و چڕوپڕی و ڕەنگاوڕەنگی هەیە.

کە بۆ جۆرەها ئاست و زەوق و ئاستی ڕۆشنبیری بێت و ئەمە جگە لە کارە دەستەبژێرییەکان کە بۆ خەڵکێکی دیاریکراوە.

**سەفەر عەلی**

# شەمسی خانێ

**گوتنی: تاهیر عەبۆ زاخۆلی**



ئاخ دەوەرە ودرە، ودرە، لێلێ گدی، بێژە، وەرە، وەرە، وەرە، وەرە، ئاخ، لاوکۆ دینۆ، ئاخ بێژە، گدی، وەرە، گدی، شەمسی خانێ، شەمسی خانێ، گدیێ، وەزێ سویند بخۆم، ڕەبەنێ، ب قورعانێ، بەلێ، پشتی بە ژنەکە بلند، دێمەکی سۆر گولی، ل من حەرام بێ، کولیکا کەسرەوانی، لێ، یۆ، یۆ، یۆ، ئاخ، ددوەرە لاوکۆ، منێ سوێند خاری، لێلێ، لێلێ، ب سەرێ تەیە، سەرێ تەیە، ڕەبەنۆ، ئاخ، وەزێ (قۆلانا زێڕا)، گرێ نادم، گدیۆ، بەژنو بالا خۆیە، بەژنا خۆیە، لێلێ، لێلێ، لێلێ.
بەلێ، پشتی بەژنەکا زراڤ دێمەکی سۆر گولی، ئاخ، (مەهرا)، مال و مێرا، لێ م تۆبەیە، ڕەبەنۆ، یۆ، یۆ، یۆ، ئاخ.
دەوەرە، ودرە، ودرە، لێلێ، لێلێ، ودرە، بەلێ، کوڕۆ، منێ سوێند خوارۆ، ب خودێ ناکەم مێرە، ڕەبەنێ، وەزێ (ڕیویا) گرێ نادم، گدیێ، دەوسا (شێرە)، ددوسا شێرە، لێلێ.

وەزێ وێ سبێ (بارگینا)، گدیێ، ناکێشم سەر ئاخوڕێ (کحێلا)، دکحێلا، یۆ، یۆ، یۆ، ئاخ.

**فەرهەنگۆک:**

١- شەمسی خان: ناوی ئافرەتێکە.
٢- گدی: گلەیی کردن.
٣- دێم: دەم و لێو.
٤- کولیلکا کەسرەوانێ: جۆرە شەددیەکی بەگولێنگەی ژنانە.
٥- قۆلانا زێڕ: جۆرە خشلێکی ئافرەتانە.
٦- مەهر: مارەکردنی ئافرەت لە پیاو، ماردیی.
٧- ڕیوی: ڕێوی.
٨- دەوس: جێ و شوێنی پێی شێر.
٩- بارگین: ئەسپی بارهەلگرتن.
١٠- ئاخوڕ: شوێنی ئالیکدانی ئەسپ.
١١- کحێل: باشترین ڕەسەنی ئەسپ و ماینە.

* ئەو لاوکە بەسۆزە نموونەیەکی ئەڤینداری و خۆشەویستی و دلسۆزی ڕاستەقینەی پاک و بێگەردی ئافرەتی کوردە، کە بەلێن و پەیمان بەخۆشەویستەکەی دەدات، کە لە پاش دلدارەکەی شوو نەکات و خۆشی ژیان لەخۆی بێ بەش بکات، هەر بۆیە دەلێت: «ڕیوی ناهێنمە جێگای دلدارەکەم کە وەک شێر بووە» یان دەلێت «بارگینا ناهێنمە شوێن و دەوسێ، ئەسپێ دکحێلا».

** تاهیر سەعید عەبۆ: ناوی تەواوی هونەرمەند (تاهیر سەعیدی کوڕی عەبدوللا)یە بەتاهیرعەبۆ بەنێوبانگە ناوبراو لە بنەماڵەی (قوجەبەگی)یەو لەخێلی (باتی)یە، لە گەڕەکی (گوندکێ) لەشاری زاخۆکا ڕەنگین ئاکنجی بووە.
لە ساڵی ١٩٠٨ لەشاری زاخۆ لە دایک بوودو لەساڵی ١٩٧٠ چووەتە بەر دلۆڤانی خودێ و لە گۆڕستانی زاخۆ نێژراوە..
ئەو هونەرمەندە گەلێک لاوکی مێژوویی و ئەڤینی لە بەغدا لە کۆمپانیای (بەیزافۆن) لە ساڵی ١٩٣٢ تۆمار کردووە، وەک لاوکی (تەنگا بانکێ، شەمسی خان، چەتۆ) تاد...

**سەرچاوەکان:**


١- دیمانە لەگەڵ (باوکی مێڤان)، خاوەنی تۆمارگەی (محەمەد عارف جزیری) لەشاری زاخۆ لە ڕێکەوتی ٢٠٠٠/٨/٣٠.
٢- کاسێتی تۆمارکراوی هونەرمەند.


**ئا: جەلال مەلا حەسەن خۆشناو**

# بەرەو دامەزراندنی نوێخوازی

ئازاد عەبدولواحید



* ئێمە وەک میللەتێک لەوەتەی هەین بەردەوامین لە چوونە ناو ئەزموون و تاقیکردنەوەکانەوە، هەر ئەوەشە پێم وایە یەکێک لە نهێنییەکانی مانەوەمان، چونکە بە قەدەر قەبارەی هێز و توانامان خۆمان لە قەرەی ئەزموون و تاقیمانە نوێیەکان دەدەین، مەبەستم ئەوەیە بڵێم موغامەرەی داهێنان لە ئاستی تاکە کەسیشدا بێ نەکوژاوەتەوە، چونکە دەبینین ئێمەی کورد بە مەبەستی جیاکردنەوەی ماڵی داهێنانی خۆمان لە ساتەکانی شکست و قەڵاچۆکردن و نائومێدیشدا هەر لە غەمی داهێنان و تێپەڕاندن و پرسیارکردن دا بووینە، بەمەش هەوڵ دراوە نەکەوینە دەرەوەی مێژوو، بگرە لەناو پێداویستی شارستانی و مێژوویی و نەتەوەیی و جوانیلۆژیی خۆماندا کار بکەین و لە ئاستی (نوێ بوونەوە) دەستەوستان نەبین.

* هەر بۆخۆی مانەوەی کورد بەو شێوەیەی ئەمڕۆکە پێی گەیشتووە مەزنترین شاکارێکە تۆماری کردبێ، بۆیە ئەمڕۆکەش کە ئەمڕۆیە و لەبەردەمی قۆناغێکی چارەنووسسازداین، لەسەر هەموو ئاستەکاندا دیسانەوە دەبێ بیر لە قۆناغی دامەزراندن بکەینەوە، بەتایبەتی لە بواری تیۆریک و تەنزیردا کار بکەین، چونکە قۆناغێکی سەخت و گرانە کە ئەویش پێویستی بە جۆرێکی دیکەی دامەزراندنی نوێخوازی و داهێنانی نوێیە و دەبێ بە بیروبۆچوونێکی کوردانەوە ڕەنگ بۆ ئەو قۆناغە بڕێژن، ئەم کارەش بە دوور نازانرێ، چونکە لە هەموو چاخ و سەردەم و قۆناغەکاندا کورد جێ دەستی دیار بووە، تەنانەت بە هەموو قورسایی خۆیەوە بەشداری لە دروستکردن و پێشخستنی شارستانیەتی عەرەب و ئیسلام و گەلانی دەرو دراوسێدا کردووە و لە هەموو بوار و کایەیەکی فیکری و مەعریفی و هونەریدا جێ دەستی دیار بووە، ئەمڕۆکەش لە دامەزراندنی ئەم سەرەتایەدا کە هەوڵی بۆ دەدات نوقڵانەی نوێبوونەوە و دەسپێکێکی دیکە دەبێ بۆ کەشوهەوا و واقیعێکی هاوچەرخ و سەردەمانە و بەرچاو ڕوون کردنەوەی نەتەوەکەمان.

* ئایندە هەموو ڕۆژێ بەشێوە و فۆرمێکی نوێ لە دەرگاکانمان دەدات، ئێمەش وەک میللەتێک دەبێ چاومان لەوەبێ بۆ ساتێکیش لەو کەشوهەوا و واقیعە مەعریفی و داهێنەرانە نوێیە جیهانییە دانەبڕێین. پێویستە بەردەوام لەخۆمان بپرسین: چی لە مێژووی خۆمان فێربووین؟ هەڵوێستمان بەرانبەر مێژوومان چی بووە؟ چەند دەتوانین کاریگەریمان بەسەر ماجەرای ڕووداوەکانەوە هەبێ؟ لە خۆمان بپرسین: چی لەو ڕابردووەمان زیندوو و نوێیە و بەکەڵکی ئەمڕۆمان دێ؟ یان لە فیکر و فەلسەفەی هاوچەرخدا چیمان وەرگرتووە و چۆن هەڵوێستمان لێ وەگرتووە؟ چیمان بەلاوە ناوە و چی وەرناگرین، یان بپرسین: ئێمە چەند لە زمانی سەردەمەوە نزیکین، یان چەند لێیەوە دوورین؟ بپرسین: لەو سەردەمەدا لەسەر ئاستی چەمکی ڕۆشنبیری و کولتووری گشتی و لەسەر ئاستی تایبەتمەندیی خۆمان چیمان کردووە؟ چ ڕۆڵێکمان لەوەدا گێڕاوە کە زمانێکی تایبەت بە خۆمان هەبێ؟ زمانێک کە لە ڕابردووەوە نەخوازرابێتەوە کە تێیدا ناژین، زمانێکیش لە دەرەوەی خۆمانەوە بەدەست نەهاتبێ، چونکە ئەویش بەروبوومی عەقڵ و ڕۆشنبیری خۆمان نییە!

* لەو سەردەمەدا کە «نوێخوازی» زۆر قۆناغ بەجێی هێشتووین، پێویستمان بە کەسانێکە ئەو قەڵای خوڵەمێشە ڕابماڵێ و لە بارەی پرسە ناسک و هەستیارەکان قسەی هەبێ تا دەگەینە پەروەردەیەکی نوێ. (ژان بیاژێ) پێی وابوو کە پێویستە لەسەر ئەوە بگیرسێینەوە توانای (بیرکردنەوە) لەلای منداڵ دروست بکەین، واتە منداڵ فێر بکرێ چۆن بیر بکاتەوە، نەک چۆن شتەکان ئەزبەر بکات و بڵێتەوە. فێر بکرێ چۆن پیلە و موناقەشە بکات، نەک تەلقین دابدرێ.

